مارتین ڤان برونەسن






# ئاغاو شێخو دەولەت

د.کوردۆ عەلی
لەئاڵەمانییەوە کردوویە بە کوردی

مارتین ڤان برونەسن

# ئاغاو شێخو دەوڵەت

د.کوردۆ عەلی
لەئاڵەمانییەوە کردوویە بە کوردی

۲۰۱۰

بەرگی یەکەم

مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ک)
سلێمانی ـ گەڕەکی سەرچنار ـ ۱۲۱
کۆڵانی ـ ٤٤
ژ.خانوو ـ ۱

www.hoshiari.org
govarynovin@yahoo.com

* **ناوی کتێب:** ئاغاو شێخو دەوڵەت

* **نووسەر:** مارتین ڤان برونەسن

* **و. لەئاڵمانییەوە: د.گوردۆ عەلی**

* **نەخشەسازیو بەرگ:** فەهمی جەلال

* **تایپ:** نیاز، شانیا

* **تیراژ:** ٢٠٠٠ دانە

* **ژمارەی سپاردن:** (١٢٣٤) ی لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان پێدراوە

* **ژمارەی زنجیرە:** (٣٣١)

* **چاپ:** دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی

لەبڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك). ساڵی ٢٠١٠

پێشکەشە بە گیانی شەیدای:

کاکە جەلالی حاجی حسێن

یەکێک لە پێشەنگ و پێشقەرەوڵی

خەباتکەرانی رێگەی تەبایی و برایەتی

ئەنگاوتە و پێکراوی دەستی چەپەڵ و بیری گەندەڵی

پاڵەوانانی شەڕی خێڵایەتی

## پێشەکی

هەرچەندە مێژووی کوردناسی لەوڵاتانی ئاڵەمانزماندا، هەروەك زۆربەی وڵاتانی ئەوروپایی دی، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی دێرینو ژمارەیەکی هێجگار زۆر گوتارو کتێبان دەربارەی کۆمەڵگەی کوردەواریی و کێشەی کورد نوسراونو بلاوکراونەوە، لێ مەخابن پشکی هەرە زۆریان دەچنە خانەی ئەو هەواڵنامەو گەشتنامە سادەو سەرپێیانەوە، کە رۆژنامەنووسێك، گەڕیدەیەك، کاربەدەستێك، بەمەبەست بووبێت یاخود بە رێکەوت، رێگەی هەڵەکردووەو گەیشتۆتە کوردستان. پاشان کە گەڕاوەتەوە، هەگبەیەك باسوخواسی سەیرو سەمەرەی میللەتەکەی (کارل مای)[1] یی کردۆتە دیاری دەستی.

ئیدی بەدەگمەن کەسێکیان دەبینیت بەناخی مەسەلەکەدا رۆچووبێتو توانیبێتی هیچ نەبێت بەر لەهەرکەس خۆی بایی پێویست لەکێشەو گرفتەکانی کورد بگات، ئەوجا کرۆكو نێوەرۆکی مەسەلەکە بۆ خوێنەرانی کاکڵەو پوختە بکات.

برێکیان زۆر گێلانەو بێ ویژدانانە درۆو بوختانی دوژمنانو داگیرکەران کاوێژدەکەنەوەو کورد هێشتا بە دزو جەردە رێگرو پیاوکوژو فەلەکوژ تاوانبار دەکەن.

زۆربەیان هێشتا دەستبەرداری وشەی (Wild)ی (کارل مای) نەبوون، کە بەواتای "درندە" یاخود "کێویلە" دێتو ئێستەش بەو پەڕی تامەزرۆییو تاسووقەوە وەك پاشگرو جووتبەندێکی نێوی کورد پاتەیدەکەنەوە. دەستەیەکیان لەزاری داگیرکەرانەوە، بێ ئەوەی هەست بە سادەییو نەزانیو دواکەوتوویی خۆ بکەن، دەنا دەبا لەخۆیان پرسیبا: راستە پشکی زۆری کورد نەزانو دواکەوتوو خێڵەکین، لێ گەلۆ داخۆ تاوانی کێیە کە کورد ئاوها بەو سەرکوێرییە، وا حەوت بەرد بە دووی

سەدەی بیستەمدا، سەدەی تاوانو خوێنو بێدادی، سەدەی وەیشوومی پڕ کارەساتو مەرگەساتدا، هەڵدەداتو بەجەستەی شەلاڵی خوێنو ئەوکی پڕ لەگرینو دەستی کۆتکراوو چاوی بەستراو و زمانی گرێدراو و زگی هەڵگوشراوەوە لەزێدی بەتاڵانبراو و خاپوورو وێرانکراویدا، بە لارەملێو لانەوازیو سەرکزی، پێشوازیی لەسەدەی بیستویەکەم دەکات؟

پێموایە بەرلەوەی شەرم بێت بۆ کورد، مایەی ئەوپەڕی شوورەییو سەرشۆڕییە بۆ ئەو میللەتو دەوڵەتە سەردەستانەی بە بافیشەوە بەردەوام لافو گەزافی پێشکەوتوویيو شارستانێتیو دیموکراسێتیو برایەتیو موسڵمانێتیو مرۆڤدۆستیو هاوئاینیو هاومێژوویيو هاوچارەنووسی.... لێدەدەنو پەیدەرپەی خۆی پێهەڵدەدەنەوەو خۆی پێوەبادەدەن، کەچی کوردیان ئا بەو دەردەبردووەو شەشدەری ئومێدیان لێگرتووەو هەرچی مافێك بە مرۆڤ بڕێت، پێیڕەوا نابینن. هەتا توانای بیستنی وشەی شیرینی کوردیو نێوی کوردو کوردستانیشیان نییە.

دیارە ئالەم جیهانە جەنجاڵە چڵێسی نەوتو دۆلارەدا، زۆر بەدەگمەن هەڵدەکەوێت کەسێك سەرو مڕ ژیانو کاتی خۆی بۆ رۆشناییخستنەسەرو داکۆکیکردن لەمافی پێشێلکراوی میللەتێکی داماوی زۆر لێکراوی سەرکوێرکراو تەرخانکاتو ئامادەش بێت لەپێناوی ئەو خولیا مرۆڤدۆستانەیەیدا گیانی لەسەر لەپی دەستێت. لێ دەگەڵ گشت کەچبەختییەکیشدا، گەردوون ئەو دەرووەی لەکوردکردۆتەوەو جار جارە لێرەو لەوێ کەسانێکی مرۆڤپەروەری سەوداسەر هەڵکەوتوون، کە لە کوردەکە خۆی سووتاوتری مەسەلەکەی بوونو زانستانەو بابەتانەو بەویژدانانە کێشەکەیان توێژیوەتەوەو لەشەوەزەنگی ئەنگوستە چاوی دنیای حۆڵو کاسدا، چراخانێکی لەدەور پێکردووە. هەرچەندە مەخابن ژمارەی ئەو کەڵەمێرە دلێرە جوامێرانە لەقامکی دەستان تێپەڕناکەن، لێ نرخیان لەئەندازە نایەت، تایبەت بۆ میللەتێکی کۆیلەو مافخوراوی زۆرلێکراو و کێشەیەکی چڕو ئاڵۆزو کەمدۆستو فرە دوژمنی وەکی کورد.

ئالەو بوارەدا دەیانساڵە جێپەنجەی پیرۆزی دوو شاسوار، دوو کەڵە نووسەرو توێژەرەوەی دلۆڤان‌و هێژا، دوو عەگیدی جوانخاس‌و جەربەزەو ئازا، دوو زانستکار، دوو دۆستی مەرد، دوو شۆڕەسواری چاپوکسواری مەیدانی لیکۆڵینەوەی کۆمەڵگەی کوردەواری‌و کێشەی کورد، گەشکەش دەچریسکێنەوە. ئەو دوو دۆستە دەلال‌و ئازیزەی لەو پێناوەدا، لەڕێگەی زانست‌و هەق‌و ڕاستی‌و بەها مرۆڤایەتییەکاندا، چەندین جار ژیانی خۆیان خستۆتە تالووکەوەو یارییان بەئاگرکردووە. بە بەرهەمە بەپیت‌و پڕفەڕو فرەو بەنرخەکانیان، بە توێژینەوە بەهێزو بەپێزو قووڵ‌و زانستانەکانیان، بەرۆکی مێژووی کوردناسییان ڕازاندۆتەوەو وەك دۆستێکی شارەزاو کارامەی بەئەمەك هاتوونەتەگۆو نەتەوەکەمانیان بە هەڵمەت‌و هیممەتی مەردانەیان منەتبارو قەرزاربارکرووە. دەبێت سنگی لاپەڕە زامدارو پێکراوەکانی مێژووی کورد، سنگی پڕ لەئاخ‌و داخ‌و حەسرەتی گشت کوردپەروەرێك، ئەو دوو دۆستە زێدە کارامەو ژێهاتوو و هەرە ئازیزو میهرەبانە، هەرگیزاو هەرگیز لەیاد نەکەن:

١ـ دوکتۆر سمایل بێشکچی نووسەری مێرخاس‌و تاقانەی تورك‌و دۆستی بە بەینەت‌و بوێرو کەموێنەی کورد.

٢ـ دوکتۆر مارتین ڤان بوونەسن توێژەرەوەو زانستکارو کوردناس‌و مێرخاسی هۆڵەندیی.

ئەرێ ئەم (مارتین ڤان بوونەسن)ە، ئەم نووسەرە سەروەرە، ئەم مرۆڤپەروەرە بە جەوهەرە، ئەم دۆستە کارامە چاکە، ئەم بیرو نیازو خامە پاکە، کێیە؟

مارتین ساڵی ١٩٤٦ لەبازێری ئوترێختی هۆڵەندە لەدایك بووە. هەر لەم شارەدا قۆناغەکانی خوێندن تەواو دەکات، ئەوجا دەچێتە زانستگەکەی‌و سەرەتا فیزیا دەخوێنێت، لێ پاش سەردانێکی کورتی باکووری کوردستان، بە رادەیەك شەیدای دیمەنە دلفرێنەکانی‌و خەڵکە میواندۆستە دەست‌و دڵ واڵاکەی دەبێت، کە خولیاو ئارەزووی دەگۆڕدرێت‌و خودەداتە زانستیی کۆمەڵناسی‌و خەڵکناسی‌و دەستدەکاتە خوێندنی ئێتنۆلۆژی.

پاشـان ڕێکخراوێکـی هۆڵەنـدیی کۆمـەککاری توێژینـەوەی زانـست، زەماڵەیـەکی دووساڵانەی بۆ تەرخانـدەکات. ئـەویش کوردسـتانو کۆمەڵگەی کوردەواریی دەکاتـە ئـامرازو ئامـانجی لێکۆڵینەوەکـەیی‌و بـۆ ئـەو مەبەسـتە سـاڵانی ١٩٧٤ ـ ١٩٧٦ بـەردەوام بەڕێگـەی کوتـە جوداکـانی کوردسـتانەوە دەبێـت‌و زۆربـەی ئـەو ماوەیـە لـەوێ بەسەردەبات. ماتینی زاناو داناو بەتوانا هەر لەو ڕێگەیەوە، لەتەك ئەو نۆ زمانانەی دیدا کە پێیاندەئاخێوێت، هەردوك زاراوی کرمانجیی سەروو و خوارووش فێربووە، (هەڵبـەت سۆرانی کـەمترو کرمـانجی زێـتر). ئێـستەکە هـەر لەزانـسگەی ئوترێخـت، لـەبواری کوردناسـی‌و تورکناسـییدا، یاریـدەدەری پرۆفیـسۆرە، جگـە لـەوە ئەنـدامی دەستەی بەڕێوەبەری سێ گۆڤاری توێژینەوەی کوردەوانییە:

1- Studia Kurdica, (Paris)
2- Journal of Kurdisch Studies (Urbania - Italia)
3- The International Journal of Kurdish Studies (Brooklyn – New York). (2)

ئەم کتێبەی لەبەردەستی تۆی ئازیزدایە، بەرهـەمی دەسـتڕەنگینی‌و شـەونخوونی‌و لەخۆبووردوویی‌و کۆڵنەدانو تێکۆشانی بێوچانی ئەو دۆستە بەئەمەکە کارامەیەو کارنامەی دوکتۆرییەکەیەتی، یەکێکـە لـەو شـاکارە دانـسقە هەرەبـەنرخو نێودارانـەی لـەریزی پێـشی پێـشەوەی ئـەو توێژینەوانەدایـە، کـە تـا ئێـستا دەربـارەی کـورد نووسراون. لێوانلێوە لەزانیاری‌و بەڵگەی بەپیت‌و پڕسوود.

ئاوێنـەیەکی باڵانمای شیرازەو پێکهاتی ژیانی تیرەگەری‌و خێڵەکییانـەی دوێنێکـەی کۆمەڵگـەی کوردەوارییـە، کـە وەکـی جـامی فۆتـۆگراف، ژیـانی کۆمەڵایـەتی‌و چێشتەقولێی سیاسی‌و شـەڕەزرتانێی پارتایـەتی‌و خەسـڵەت‌و شـەقڵی ڕێبـازو ڕێـڕەو ڕێبـەرو ڕێوونکـەرانی باڵـە هاوچەشـنە لـێکترازاوە تێکبـەربووەکانی ئـەو ڕۆژگـەی بزووتنـەوەی تێکهەڵقـزاوی کوردایـەتی لەبەرگیراوەتـەوەو کفـەکفی کـەفی خـوێنی هەڵچووی لەبەرچـوویان، روون روون دەچریـسکێتەوەو بەرووومانـدا دەتریقێتـەوەو

بعفرکـه فـرك بۆسـەر بنـەما تیرەچـێتیو خێڵایەتییـە هاوبەشـە رەسـەنەکەیان دەچۆرێتەوە.

**ئەم کتێبەم چۆن دیتەوە:**

سـەرەتای سـاڵانی هەشـتا بـوو، تـازە بـە ئاڵمـانی کەوتبوومـە گرِوگـاڵ، بەوپـەڕی تامەزرۆییو تاسووقەوە سۆراخی ئەو کتێبو گوتارانەم دەکرد کـە لـەبارەی کوردەوە نوسـرابوون. لـەو سـەروبەرەدا رۆژێـك بـرای هێـژاو زێـدە ئـازیزم کاکـە سـەعدوڵلا بەخۆیو کتێبێکی قەبەی بە ئینگلیزی نوسراوەوە پەیدا بوو، گوتی: فەرموو، کە تـۆ وێڵی دووی کتێبی چاکیت، ئا ئەمە وەخوێنە.

دیـتم کـۆپی کارنامــەی دوکتــۆریی کابرایــەکی هۆڵەندییــەو بــۆ ئەنجامــدانی لێکۆڵینەوەکـەی چـەند سـاڵێکی لەکوردسـتاندا بەسـەربردووە. ئـەوە یەکـەمینجاربوو کتێبـی (ئاغـاو شـێخو دەوڵـەت) ببیـنمو نێـوی مـارتین فـان برونەسـن ببیـستم. راستییەکەی زۆری دەگەڵ خەریکبوومو کەمی تێگەییم، هەرچـەندە ئینگلیزییەکـەم قەت باش نەبووە. بەڵام ئەو سەروەختە بەهۆی فێربوونی ئاڵەمانییەکەوە هێنـدەی دی کـولو کـەلو کۆڵـەواربوو بـوو، بەڕادەیـەك بێکـەڵكو پەككەوتـە بـوو بـوو کـە درۆستی شاکاریی ئاوهای پێنەیەك. کتێبەش بۆ کن کەس بەرم.

ئیـدی بابـەتو زانیارییـەکانی ئـەو کتێبـە هـەر گرێبـوون لەدڵمـدا، تـا سـاڵی ١٩٨٩ خاتوو (هایدی گرۆبباوەر) کە کیژە نوتریشییەکەو ئەودەم پێکەوە لەبەشی زانـستە سیاسـییەکانی زانـستگەی سـالزبورگ دەمانخوێنــدو ئـەویش سـەرگەرمی کارنامـەی دوکتۆرییەکـەی بـوو لـەبارەی کـوردەوە[٣]، مـژدەی دامــێ کـە کتێبـی (ئاغـاو شـێخو دەوڵەت) کراوەتـە ئاڵەمانیو کەوتۆتـە بـازاڕەوە. دەستبەجـێ دانەیـەکم کـڕیو وەك ژەمبووردەیــەك بیــنم پێوەنــا. دیــتم هەرچــەندە لەشـێوازیدا دەچـێتە خانــەی لێکۆڵینــەوە کلاســییەکانی کۆمەڵناســییەوە، لــێ بەهــەق شــاکارێکی بەنرخــەو سەرچاوەیەکی دەگمەنو تاقانەیەو پەیاپەیدێت لەزانیاریی پڕسوود. پێم حەیف بوو خوێنەرانی کوردی ئاڵەمانیو ئینگلیزی نەزان، لەچێژی پڕتامی ئـەو شـاکارە بـەرزە

فرمتەرزە بێبەشبن، بۆیە پاش خوێندنەوەی، لەدڵی خۆمدا مرخم لەتەرجەمەی خۆشکرد. وەلێ ئەودەم خۆشم بەدەست نووسینی کارنامەی دوکتۆرییەکەمەوە شپرزەو سەرقاڵو بێکاتو بێحاڵ بووم، نەدەپەرژام خۆ بە ئەرکێکی ئاوها سەختو ئەستەمەوە خەریك بکەم، ناچار لێگەڕام، تا دەرفەتم بۆ رەخسا.

گوتم ئەرکێکی سەختو ئەستەم، دیارە لەتەجرەبەی تەرجەمەیەوە ئاوها دەڵێم، چونکە لەقەبەیی کتێبەکە خۆی، نیوەرۆكو گەلەك لەزاراوە کۆمەڵناسیو سیاسیو خەڵکناسیەکانی بە زمانی کوردی نامۆنو زۆربەیان لەکوردیدا بەرامبەریان نییەو پەیداکردنی زاراوەیەك کە پڕ بەپێستیان بێت، هێجگار سەختو دژوارە.

دیارە ناکرێت لەخوێنەری بشارمەوەو دەبێت رەپو رەوان پێ لەو راستییە بنێم کە هیچ یەکێك لەو بەرهەمانەی تا ئێستا تەرجەمەم کردوون، هێندەی ئائەمە شەکەتو ماندوو و خەریکیان نەکردووموو تا ئەو رادەیە زەحمەتم بەدەستەوە نەدیتوون. جار هەبوو مۆتەکەی نائومێدی بۆمدەچووە پەرێزەوەو لەومیدابوو نووچم پێبداتو بەرەو قووڵەی کۆڵدانو پشتساردبوونەوە راپێچمکات، لێ خۆشبەختانە هەمیشە تافی ورەبەردانم کەمخایان بوونو زێتر ئەودەمانەبوون کە لوێچە وشەو زاراوی شیرنی کوردیم چکیاندەکردو چۆڕبڕدەبوون، پاشان کەبیرمو فەرهەنگی وشەی کوردیمم لەسایەی خوێندنەوەی "چەپکێك لەگوڵزاری" شاکاری نووسەرو مامۆستایانی بەهرەداری بەکاری کوردەواریدا تیفتیفە دەداو دەمەزمردم دەکردنەوە، ئیدی تین دەزایەوە دڵمو ورەو ئاهێکم وەبەردەهاتەوە، سەرلەنوێ گوڕم دەبەستەوەو تێهەڵدەچوومەوە.

ئابەو پێوەدانگە پشکێکی چاکیم تەرجەمەکرد. لێ دیتم گەر بەو رەوتە بڕوات، دەقە کوردییەکەی هەزارو چەند سەد لاپەڕەیەك دەگرێتەوە. دیارە ئەرکو مەسرەفی چاپی کتێبێکی ئاوها قەبەش نە لەتوانای گیرفانی داچەکاوی مندایەو نە بە هەموو دەزگایەکی چاپەمەنی کوردییش هەڵدەسووڕێتو نە بە کیسەو گیرفانی هیچ خوێنەرێکی کەمدەستی کوردیش لەکڕین دێت. بۆیە بڕیارمدا بیکەمە دوو بەشو لەدوو بەرگدا چاپیبکەم.

هەر لەسەرەتاوە هەوڵمدا پەیوەندیی بە نووسەرەکەیەوە بکەمو لەنیازی خۆم ئاگاداری بکەم. زۆری خایاند تا بە کۆمەکی برای شیرینو بەنرخم کاکە (فەرهاد عەبدولقادر)و لەسایەی هیممەتی مەردانەی برای هێژاو خامە رەنگینم کاکە (حەسەنی قازی) یەوە ئەو دەرفەتەم بۆ رەخساو بەو ئاواتەم گەیشتم.

دیارە کاکی نووسەر زۆر دڵی بەوەوەنەبوو کە کتێبەکەی لەدووبەرگدا چاپبکرێت، هەرچەندە من هیچ خەوشێك لەکارەکەدا نابینم. ئەوەبوو سەرەتا نارازیبوو، پاشان نابەدڵانە رێگەیدامو خۆمی سەرپشك کرد، وەلێ مەخابن لەوادەو بەڵێنەکەی خۆی کە پێشەکییەك بۆ تەرجەمە کوردییەکە بنوسێت، پەژیوان بووەوەو تەنها لیستەی نێوی بەرهەمەکانی خۆیی بۆ ناردم.

بەپێویستی دەزانم ئەوەش بڵێم کە بۆ خۆم دەگەڵ گشت راو بۆچوونەکانی ئەم کتێبەدا نیم، رەنگە باری سەرنجم لەحاند برێك مەسەلەدا جوداوازو پێچەوانەی بیروڕای کاکی نووسەر بێت، لێ نەمویستووەو بە پێویستم نەزانیوە کتێبەکە بەپەراوێز قەبەو چڕتر بکەمو لەسەر هەر خاڵێك کە بەڕاستی نازانم بەرۆکی نووسەربگرمو داوی خەیاڵی خوێنەر بپسێنم، بۆیە تەنها لە حاند گرنگترینیاندا وە دەنگ هاتوومو باری سەرنجی خۆم دەربڕیوە.

دیارە دەبێت ئەوەش بڵێم، هەر کەموکووڕیو لەنگییەك لەتەرجەمەی کوردیی ئەم کتێبەدا هەبێت، بێگومان هەشە، من بۆخۆم لێی بەرپرسیارمو تۆباڵی لەئەستۆی مندایە، لێ هەرهێندەم لەدەستهاتووەو ئەوەندە توانام بەسەریدا شکاوە. ئێستەش هەرهێندەم لەدەست دێت کە داوای بەخشین لەنووسەرەکەیو خوێنەرانی بەرێزم بکەم، بەو ئومێدەی چاوپۆشیم لێبکەنو لەهەڵەو پەڵەم ببورنو بە تەقەلای خزمەتێکی گچکە لێم قەبوولکەن. هەر لێرەدا وەك خوێنەرێکی بەئەمەکی کورد، لەکوڵی دڵەوە ئەوپەری سوپاسو رێزو قەدرزانینی خۆم پێشکەش بە دۆستی راستەقینەو راستگۆی نەتەوەکەمان، کاکە مارتین فان برونەسن دەکەم بۆ ئەو ئەرکە زۆرەی کێشاوێتیو بۆ ئەم شاکارە ناوازە نازدارەو گشت بەرهەمە پڕ رەونەقەکانی

دیکەی. دەستەکانی خۆش و هەر بەرقەرارو سلامەت و بێ بەلاو سەرکەوتووبێت و وێنەی زێتربێت.

**کوردۆ**
Salzweg, 10.01.1996

## پەراویزەکان

(١)* باشترین سەرچاوە لەوبارەوە کتێبە نێودارەکەی مامۆستای هێژام د. جەمال نەبەزە، بڕوانە:

د. جەمال نەبەز: "کورتە مێژوویەکی کوردناسی لەئاڵەمانیادا". چاپخانەی کۆڕی زانیاریی کورد، بەغدا، ١٩٧٤.

* هەر لەم بوارو بابەتەداو وەك پشکێك لەتوێژینەوەی ئەم مەیدانە، ناشێت تەقەلای مامۆستای بەنرخم د. ئەورەحمانی حاجی مارف لەیادکەین، ئەویش گوتارێکی نایابی تێرو تەسەلی لەبارەی کورد ناسییەوە لەڕووسیا نووسیبوو، بڕوانە:

د. ئەورەحمانی حاجی مارف: "لەبارەی کوردناسییەوە لەرووسیاو یەکێتی سۆڤیەت"، گۆڤاری زانیاریی کورد، ب٢، ژ١، بەغدا، ١٩٧٤، ل ٤٩٩ - ٥٦٨.

* (کارل مای ١٨٤٢ - ١٩١٢) ئەو چیرۆکنووسە خەیاڵییە ئاڵەمانەیە کە سەدمیەك زێترە بەدەگمەن ماڵێکی ئاڵمانزمان دەبینیت سەری پێدا نەکردبێت. جێگەیەکی شیاوو بەرچاوی لەکتێبخانە تایبەتو گشتییەکاندا داگیرکردووە. یەکێك لەچیرۆکە ئەفسانەییە نێودارەکانی، چیرۆکی (Durchs Wilde Kurdistan)ە، (بەنێو کوردستانی دڕندەدا)، کە زەحمەتە ئاڵمانزمانێك بدۆزییەوە ئەو چیرۆکەی نەخوێندبێتەوە، یاخود نەیبستبێت. (کارل مای) ٧٣ چیرۆکی عەنتیکەی لەوبابەتەی نووسیوە، بڕوانە:

Karl May: "Durchs Wilds Kurde Kurdistan", Verlag Carl Ueberreuter, Wien -- Heidelberg,

(ساڵی چاپی لەسەرنییەو نازانرێت چاپی چەند هەمینێتی).

(٢) بڕوانە نامیلکەی:

Kurdologische Vorlesungsreihe an der FU Berlin WS 95/96 asta – FU.

هەروەها بڕوانە: "گۆڤاری کاروان"، ژمارە ٦٧، ئابی ١٩٨٨، ل ١٥٣و ئەو گوتارەی مارتین ڤان برونەسن دەربارەی ڕاپەڕینەکەی سمکۆ نووسیویەو مامۆستای هێژا کاك فوئاد حەمە خورشید تەرجەمەی عارەبیی کردووەو کورتەیەکی ژیانیشی نووسیوە.

(٢) خاتوو (هایدی گرۆبباوەر) هەر هەمان ساڵ کارنامەی دوکتۆرییەکەی تەواوکردو بەرهەمێکی زانستانەی نایابی لێدەرچوو، بڕوانە:

Heidi Grobbauer: "Das Kurdenproblem, Hindernisse auf dem Weg zu einer Nation" Dissertaton. Universitat Salzburg, 1989.

## بەرهەمە چاپکراوەکانی مارتین ڤان برونەسن لەبارەی کوردەوە:

١. کتێبەکانی

وەك لەپێشەکیدا گوتمان، ئەم کتێبە کارنامەی دوکتۆرییەکەیەتیو لەبنەچەدا بەئینگلیزی نوسیویەتیو هەر ئەو چەند دانەیەی لێ چاپکراوە، کە بۆ پێشکەشکردنی کارنامەی دوکتۆریی بۆ زانستگە پێویستن. نێوی کارنامەکەی ئاوهایە:

1- Agha, Sheikh, and stste. On the Social and Political Organization of Kurdistan. Dissertation, Rijksuniversiteit Utrecht, 1978.

ساڵی ١٩٨٩ کراوەتە ئاڵەمانی:

Agha, Sheich und staat. Politik und Gesellschaft Kurdistan. Berlin: Edition Parabolis, 1989.

ساڵی ١٩٩١ کراوەتە تورکی:

Aga, seyh ve devlet. Kurdistan in sosyal ve Politik orgutlenmesi. Ankere: Oz – Geyayinlari,

ساڵی ١٩٩٢ دەقە ڕەسەنە ئینگیزییەکە، پاش مشتومالکردنی بۆ یەکمنجار کراوەتە کتێب:

"Agha, Shaikh and state. The social and political structures of Kurdistan". London: Zed Books, 1992.

2- Ialam und Politik in der Turkei (Jahrbuch zur Geschichte und Gesellschaft des Vorderen und Mittleren Orients 1984) (Herausgegeben mit Jochen Blaschke). Berlin: Express Edition (Neudruck: Berlin: Parabolis, 1989).

"ئیسلام و سیاسەت لەتورکیادا". (ساڵنامەی کۆمەڵگەو مێژووی خۆرهەڵاتی دوورو نێزیك).

3- Evliya Celebi in Diyarbekir. The relevant section of the Seyahatnme edited with translation, commentary and introduction. (Herausgegeben mit H. E. Boeschoten). Leiden: E. J. Brill. Xvii, 270 pp.

"ئەولیا چەلەبی لەدیاربەکر. بەندەگرنگەکانی سیاحەتنامە بە تەرجەمەو تەعلیق و پێشەکییەوە".

4- Kurdistan uzrrrine yazilar. Istanbul: Iletisim yayinlari, 1992.

(تەرجەمەی تورکی کۆمەڵە گوتارێك دەربارەی ئاین و سیاسەت و دەربارەی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد).

**٢ـ گوتارەکانی:**

١ـ "عولەمای کوردو شاگردە ئیندونێزیاییەکانیان"، حەسەنی قازی لەئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی. گۆڤاری رووناکبیری، ژمارە ٣ ـ ٤، ل ٢٢٤ ـ ٢٥٥. ستۆکهۆڵم، ١٩٩٣.

٢ـ "مێ وەجاخی لەکوردستان، ژنە فەرمانڕەواکان لەمێژووی کورددا". حەسەنی قازی لەئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی. گۆڤاری رابوون، ژمارە ١٠ ـ ١١، ل ٩٨ ـ ١١٦. ئوپسالا، ١٩٩٤.

٣. "تەریقەتی نەخشبەندی لەکوردستانی سەدەی حەڤدەھەمدا". حەسەنی قازی لەئینگلیزییەوە کردوویە بەکوردی. گۆڤاری گزنگ، ژمارە ٥، ل ١٨ ـ ٣١. هودیکسفال، ١٩٩٤.

٤ـ "جینۆسید لەکوردستان؟ سەرکوتکردنی راپەڕینی دەرسیم لەتورکیا (١٩٣٧ ـ ١٩٣٨)و شەڕی کیمیایی لەدژی کوردەکانی عێراق (١٩٨٨)". حەسەنی قازی لەئینگلیزییەوە کردوویە بەکوردی. گۆڤاری رابوون، ژمارە ١٢، ١٩٩٤ ل ٣٠ ـ ٥٣و ژمارە ١٣، ١٩٩٥، ل ٧٩ ـ ٩٧.

٥ـ "حاجی بەکتاش، سوڵتان سەهاك، شامینا ساحێبو قاڵبەکانی دیکەی دیواری پادار". حەسەنی قازی لەئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی. گۆڤاری گزنگ، ژمارە ٤، ل ١٧ ـ ٢٤. هودیکسفال، هاوینی ١٩٩٤.

٦ـ "ناسیۆنالیزمی کوردو لایەنگری ئیتنیکی رقەبەر". حەسەنی قازی لەئینگلزییەوە کردوویە بە کوردی.

7- "Kurdish tribes and the state in Iran: the case of Simkos revolt". in Richard Tapper (ed). The Conflict of Tribe and state in Iran and Afghanistan. (London: Croom Helm, 1983 364 - 400).

دقی ئەم گوتارە تەرجەمەی فارسیو عارەبی کراوە:

* "عشایر کردو دولت ایران: مورد شۆرش سمکو" حەسەنی قازی لەئینگلیزییەوە کردوویە بە فارسی. مطالعات کردی، جلد ١ شمارە ٤، ص ٦ ـ ٣٢، پاریس، هاوینی ١٩٨٦.

* "ایرانو العشائر الکردیە... ثورە سمکو". ترجمە فواد حمە خورشید. مجلە کاروان، العدد ٦٧، (١٩٨٨)، ص ١٥٣ ـ ١٥٩، العدد ٦٨، (١٩٨٨)، ـــــــ ١٤٠ ـ ١٤٩.

8- "The Kurds between Iran and Irak", MERIP Midde East Report, no 141, (July – August 1986), 14 - 27.

"کورد لەنێوان ئێران و عیراقدا".

9- "Between guerrilla war and political murder The workers party of Kurdistan", MERIP Middle East Report no. 153 (july - August) 1988, 40- 46.

"لەنێوان شەڕی چەتەگەری و کوشتاری سیاسیدا".

**************************

# پێڕست

## ٠ ـ سەرتێ

### ٠ ـ ١ـ چۆن ئەم کتێبە هاتە بەردەمت

ئەم کتێبە تا رادەیەکی زۆر، سیمای کەشی دۆخو باری ناهەمواری ئەو پرۆژەی لێکۆڵینەوەیەی پێوە دیارە، کە بنەمای هاتنە بەرهەمێتی. گەلەك مەبەستی سەرەکیو بنجی، زادەی ئانو ساتی سەرگەرمییو تێهەڵچوونی کارەکەمن، رەنگە گەر لەبارودۆخێکی دیدا دەستبەکاربام، هەر پەیداش نەبان. بۆیە پێویستە شتێك دەربارەی ئەو بارودۆخە بڵێم.

ئارەزووی خۆخەریککردنم بە مەسەلەی کوردەوە، ساڵی ١٩٦٧، ئەو دەمەی هێشتا خوێندکاری بەشی فیزیا بووم، پاش گەشتێکی کورتی خۆرهەڵاتی نێوەند، سەریهەڵدا. وەکی گەلەك گەڕیدەی بەرلەخۆم، دەمو دەست شەیدای دیمەنی دڵفڕێنی سروشتی کوردستان بووم. میواندۆستیی خەڵکەکەی سەرسامیان کردم، باسو خواسی بزووتنەوەی نیشتمانییو راپەڕینەکانیانو مەرگەساتی چەوساندنەوەیان، زۆر کاریان تێکردم. ئەوە تەنها سەرەتای شەیدابیەکی رۆمانسیانەبوو، کە پاشان هێدی هێدی، دوای چەندین سەردانی دی، جێگەی بۆ هەڵسەنگاندنێکی بابەتانە چۆڵکرد. هۆی شەیداییەکەم زێتر ئەوبارە سیاسیە ناهەموارەیە کە کورد، لەگشت ئەو وڵاتانەی کوردستانیان بەسەردا بەخشراوەتەوە، گێنگڵی تێدا دەداتو ئەو راستییەی، کە بەردەوام لەگەڵ ئەو رژێمانەدا دەستەو ئێخە وەستاونەوە.

ئاکامێکی دیکەی گەشتەکەم ئەوەبوو، کە ئارەزووی رۆشنبیرانەمی لەزانستیی سروشتەوە بۆ کۆمەڵناسیی گۆڕی. لەژێر تاوی ئەو کەشە سیاسیو رۆشنبیرانەیەدا کە کۆتایی شێستەکان باڵی کێشابوو، بوومە عەوداڵێکی ئەو تیۆریانەی خەریکی دۆزینەوەی تاڵی پێوەندیی نێوان راپەرینی جوتیارانو بزووتنەوەی عیسایانە* و خەباتی نەتەوایەتیو هەستی چینایەتی بوون. پێموابوو مێژووی کورد چێتریز

---

* مەبەست لەو بزووتنەوانەیە کە خەون بە سەرکردایەتییەکی ئیدیالیستی عیسا ئاساییەوە دەبینن. تا جیهانێکی ئازادو یەکسانیان بۆ بهێنێتە دی.

تاقیگەیە بۆ زۆربەی ئەو تیۆریانە، چونكە كوردستان تەنها ئالەم سەدەیەدا، چەندین راپەڕینی جوتكارانی شەقڵ نەتەوانەو كرۆك دادوەرانەی بەخۆوە دیتووە.

لەگەڵ ئەوەشدا واپێدەچوو مەسەلەی كورد، لەمەسەلە ناسراوو فرەجار لەسەنگی محەكی تیۆریدراوەكانی دی جوداوازبێت. بە كورتیەكەی بە پێچەوانەی گشت بزووتنەوەیەكی جوتكارانەوە، كە دەبێت چەپڕەو بێت، ئەم وەك بزووتنەوەیەكی راستڕەو دەینواند.

ئەوەبوو تا دەهات، میللەتەكە زێترو زێتر بەشداریی لەو شۆڕشەی كوردی عیراقدا دەكرد كە ١٩٦١ دەستیپێكرد، بە زۆریی جوتكاران، چوستو چالاكانە هاوبەشیی شەڕی پێشمەرگانەیان دەكردو دژی حوكومەتە یەك لەدووی یەكەكانی عیراق دەجەنگان. گوایە سالآنی ١٩٧٤ / ١٩٧٥ ژمارەیان لەپەنجا هەزار كەسێك تێپەڕیدەكرد. لەو چەندین سەفەرەی كوردستانمدا، بۆمدەركەوت، هەتا زۆربەی ئەو كوردانەش كە لە چالاكیو خەباتی راستەوخۆ دووره پەرێزبوون، هەر خۆیان بە پێشمەرگە دەزانی. ئەمە نەك تەنها بەنیسبەت كوردی عیراقەوە، بەڵكە بەنیسبەت كوردی گشت پارچەكانی دیكەشەوە هەروابوو.

هەڵبەت گەر بە پێی ژمارەی بەشدارانی بێت، دەتوانین ئەو شۆرشەی كورد، بێ سیو دوو، بە جەنگێكی میللی، بەشۆڕشی جوتكاران نێو بەرین. لەو شەش راپەرینە دەچێت كە Wolf لەكارنامە نێودارەكەی ١٩٦٩یدا باسیان دەكات(١).

لەكاتێكدا ئەو شەش راپەرینە، پێشكەوتنخوازبوون، تاڕادەیەك جوتكاران لەسەر بنەمای بەرژەوەندیی چینایەتیان، دژی دادۆشێنەرانیان جما بوون، بزووتنەوەكانیان دژە ئیمپرالیزمو لەپێناوی نەهێشتنی بێدادییدا بوون، بزووتنەوەكەی كورد، تایبەت لە ١٩٦٦ بەدواوە، داوا رەواكانی كۆنەخوازانە، یاخود كۆنەپەرستانە دەینواند.

واپێدەچوو سەركردایەتی كورد زێتر پشتی بە دەستێوەردانی ئیمپرالیزم بەستبێت. مەلا مستەفای بارزانی چەندین جار هەستو خواستی دڵی خۆی بۆ وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەربڕیبوو، گوایە گەرەكێتی ببێتە پەنجاویەكەمین ویلایەتی ئەمریكیو لەدەستیاوی كۆمەكیاندا، نەوتی كوردیان بخاتە بەردەستەوە.

ئەوە بوو بزووتنەوەکە تەواو لەچەپڕەوان پاکژکرا، وێدەچوو ڕێبەری تەقلیدی، کە جێپێی لەلایەن لاوانی نەتەوەیی شارنشینەوە لەفکرابوو، لەهەڵپەی ئەوەدابێت بە بەشداریی لەبزووتنەوەکەدا، خۆی بەرخوردارو پلەو پایەی سەقامگیر بکات[٢].

زۆربەی هەرەزۆری کوردی عیراق، لەو مەسەلەیەدا پشتی بارزانییان گرت. چەپڕەوە دژەکانی، کەمینەیەکی کەمیان ڕەدووکەوت.

بەو پێیە گەر بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد، بەرامبەر بزووتنەوەیەکی ئازادیخوازانەی دیکە ڕاگرین، کە ئەویش پتر لەپێناوی ئامانجو خواستی تیرەیەك، کەمینەیەکی وڵاتەکەدا بووبێت، وەکی ظەففارێکانی عومان، دەبینین ئەم شۆڕەتێکی شۆڕشگێڕانەی بەرینتری هەبوو، چاپەمەنییە چەپییەکان گەلەك زێتر بایەخیان پێدەدا، بەڵام شۆڕشی کورد زێتر لەلایەن چاپەمەنییە کۆنەخوازەکانی ئینگلیزو ئەمریکاوە دەلاوێنرایەوە. ئەو جوداوازییە دوو هۆکاری ئاشکرای هەبوو: ئەویان دژی ڕژێمێکی کۆنەپەرستی سەرکوتکەری سەربەخۆرئاوا بوو، ئەمیان دژی ڕژێمێکی نۆتاریتێری ریفۆرمیستی سەرکوتکەری سەربەسۆڤیەت بوو. دیارە سەرکردایەتی هەردوو بزووتنەوەکەش دوو سەرچاوەی ئیدیۆلۆژی هەبوو.

بەڵام داخۆ تەنها ئەو دوو هۆکارە ئەو جوداوازییەیان پێهەڵدەسەنگێنرێت؟ نەخێر، دەبێت هەندەك هۆکاری نێوخۆییش بۆ ئەوە هەبن کە بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کوردی عیراق، ساڵانی ١٩٦٤ تا ١٩٦٦، ئاشکرا ملی بە هەورازی کۆنەخوازییەوە نا[٣]. تا چ رادەیەك دەزگەی خێڵەکیو هەندەك پێبەندیی میراتگرانەی دێرینەی دیکە ڕێگەیان لەجوتکاران بەستەوە، کە دەستبەرداری مافی خۆیان لەحاند سەرەکهۆزو دەرەبەگەکاندا ببنو بۆ بەرژەوەندییەك بجەنگن، کە هینی خۆیان نەبوو. ئایا ئەو پێبەندییە هەڵتەکی؟ ئەگەر وایە چۆنو لە چ بارو دۆخێکدا؟ چۆن ئیمپریالیزم کاری کردە سەر پەیوەندییە خۆڕسکەکەی کۆمەڵگەی کوردەوارییو چۆن دەتوانین تایبەتمەندییەکانی بزووتنەوەی کوردایەتی دەستنیشانکەین؟ ئەمانەو گەلەك پرسیاری دیکە لەمێشکمدا ژاوەژاویان بوو کاتێك ساڵی ١٩٧٣ دەستمدایە پرۆژە لێکۆڵینەوەم.

بۆیــه بڕیارمــدا زێــتر خۆخــەریکی مەســەلەی هێــزو دەســتەڵاته نەریتییــه نێوچەییەکانو پەرەنەستاندنی دەسەلاتی دەوڵەتو تێکەڵبوونی بەبازاڕی جیهانیو ڕەنگدانــەوەی لەسـەر پەیوەندییــە چینایەتییەکانو هەسـتی چینایەتی، بەتایبـەت لەسەر توێژی جوتکارە مامنێوەندیو هەژارەکان، بکەم.

بــەنیازم ئەمــە زێــتر لەچوارچــێوەی توێژینەوەیــەکی مەیــدانیی کۆمەڵناســیو مرۆڤناسییدا ئەنجامدەم، بەوەی ماوەیەکی دیاریکراو (زێتر لەساڵێك) لەنێوچەیەکدا بمێنمـەوەو لـەبریتی ئـەو هەڵسەنگاندنە هەرەمەکیانـەی تایبـەت بـە کـورد دا هـەن، هۆکارە ڕاستەقینەکان وەدۆزم.

مەخابن چەندین قۆرتی سیاسی، بوونـە تەگـەرەو کۆسپی سـەر ڕێگـەی نێوچـەی هەڵبــژاردەی ئــەم لێکۆڵینەوەیــەم. واچـاوەڕواندەکرا لــه بــەهاری ١٩٧٤دا هەمدیــسان شــەڕی نێــوان کــوردو ڕژێمــی عــێراق دەســتپێبکاتەوە، دیــارە لــەو حاڵەتــەدا کــەس خۆشهاتن له من ناکات. خۆ تورکیاش چارەی هیچ کۆمەڵناسێکی ناوێت کە خـۆی بـه مەســەلەی کــوردەوە خــەریك کــات. ئــەوەبوو ســاڵی ١٩٧٢، کۆمەڵناســی تــورك سمایــل بێشکچی، لەسەر لێکۆڵینەوەیەکی کۆمەڵناسانەو سیاسیانە دەربارەی کورد، کـه وەکـی پروپاگەندەیەکی جوداخوازانه تێیدەڕوانرا، به سێزدەساڵ حوکمدرا[4].

بەو هۆیـەوە وێدەچوو کوردستانی ئێران تـەنها جێگـەی شیاوی ئـەم کـارە بێـت. پێـشان دوو سـەردانی کـورتی ئـەوێم کردبـوو، نێوچـەیەکی لـەبارم هەڵبـژاردبوو کـه چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکرا بتوانم لایەنی کـەم، هەنـد لـەو دیاردانـەی مـن عـەوداڵیان بووم، بیانتوێژمـەوە، جگـه لـەوە، تـا ئەندازەیـەك لەسنووری عیراقیـشەوە دووربـوو، چونکه دەمەویـست لەشـەڕی چاوەڕوانکراوی کـوردو عیراقـەوە نـەگلێم، شـەڕێك کـه دیاربوو ئێران دەستی تێدا هـەبوو (هەرچـەندە ئـەو دەمـە هێـشتا نەمـدەزانی تـا چ مەودایەك). داواکاریی ودمی پرۆژەیەکی لێکۆڵینەوەم دایه ئێران.

کاتێك هیچ وەرامێکی ئەرێنیم چنگ نەکەوتەوە، لەیولی ١٩٧٤دا چـوومه تـاران، بـه ئومێدی ئەوەی لەوێ داواکارییەکەم زووتر ڕاپەڕێندرێت.

وەرامـی نـەریتی داوا کارییەکـەم درایـەوە، دەسـتیکم پیداهینایـەوەو جاریکی دی پیشکەشمکردەوە. ئەمە چەند جاریك دووبارەبووەوە تا لەنۆفەمبەردا بە هێجگار دایانەدواوە. لەتافی ئەو چاوەڕوانییەدا چەندین کورتە سەفەرم کرد، یەکیك بۆ کوردستانو دوان بۆ خۆراسان، لەویش ژمارەیەکی بەرچاو کوردی لییە. لەو کورتە سەفەرانەدا، کیشەیەکی دی قـۆرتمی گـرتمو پاشانیش گەلـەك جاری دی تـەنگی پیهەلچنیم. بـێوەدەمدانی کـاری لیکۆلینەوەکـەم، تـەنها دەمتـوانی وەك گـەڕالیك بسووڕیمەوە. ئەمە یانی لەهیچ جییەك نەمدەتوانی بە کامی دڵ بمینمەوە. مرۆ بۆ ماوەیەکی کورتیش لەهەرکوێ مایەوە، تەنها کاربەدەستانی ئەو مەڵبەندەی دەبیت بە تووشەوە، کە ئەوانەشی بوون بە کولکەوە، ئیدی بەدەگمەن خەلکە ڕەمەکییەکە دەبینیت. ئـەوەش هـۆی خـۆی هەیـە، کاربەدەسـتان گەرەکیانـە گشت شتیك بـزانن، دەبیت بـزانن چ لەگوندەکـەدا ڕوودەدات، کـێ دیت، کـێ دەڕوات. حەزدەکـەن گشت میوانیـك بناسـن، بەتایبـەت گـەر ئـەو میوانـە غەوارەیـەك بیـت، دەخـوازن هـۆی سەردانەکەی بزانن. دابو نەریت وایە، میوان لـەدیوەخانی ئاغـا لادەدات. کـەس بـۆی نییە لەو دابو نەریتە تەوەللا بیت.

هۆی گرنگی پەیوەندیی پتەو فرەم دەگەڵ دەوڵەمەنـدو دەسـتەلاتدارانی ئاواییـدا، ترسو پەژارەی ئـەوەم بـوو، نـەبا ڕەشـە خەلکەکە، بـەهۆی گفتوگۆوە لەگـەڵ منـدا، تووشـی گیـچەڵو دەردیسەر بـبن، چـونکە مـن وەمـی لیکۆلینـەوەم پینـەدرابوو. دەستڕۆیـشتوانو دەرفـەتی زیتریـان هەیـە دەگـەڵ بیگانـان هەڵـسنو دانیـشن. لام ڕوونبوو، ئەو پەیوەندییە ناچارییەم دەگەڵ لوتکەی قوتـە قووچەکانی کۆمەڵگەداو پەیوەندیی بەرتەسکم دەگەڵ ڕەشـە خەلکەکەدا، تارمـاییو لیلایـی بەسـەر ڕوانگـەی لیکدانەوەکانمـدا دەهیـنن. لانـی کـەم ڕەنگـە وەك زیدەبایـەخیك بـە پلـەو پایـەی دەستڕۆیـشتووانو دەسـتەلاتدارانی کۆمەلگـە لیکبدریتـەوە[5]. لەگـەڵ ئەوەشـدا هـیچ چارنەبوو، زۆربەی کاتی خۆمم دەگەڵ ئاغاو سەرەکخیلو شیخەکاندا بەسەربرد.

پاشـان دەرووبـەکم دۆزیـەوە تـا پەیوەندییـە کۆمەلایەتیەکـەم بـەرفراوانتر بکـەم: دەچوومە ئەو گوندانەی کەسیکم لیدەناسین، سا لەشوینیك دیتبوومنو ئاشنایەتیم

دەگەڵ پەیدا کردبوو. ئەمانە زێتر مامۆستای قوتابخانەی گوندەکان بوون، یاخود ئەو کورە یەکییە لادێیانەی لەشار دەیانخوێند. ئیدی کە وەکی ئاشنای کەسێك دەهاتمو تەواو بێگانە نەبووم، ئازادیی زێترم هەبوو، بواری ئەوەم دەبوو دەگەڵ هەرکەسێك دڵم دەیخواست،ە گفتوگۆ بکەم.

لەتەکێی شێخانیش، دەرفەتم هەبوو دەگەڵ خەڵکانێکی زۆر لەتوێژاڵە خوارووترەکان وتوویژ بکەم، چونکە بەردەوام ئاپۆڕەی خەڵك لەگشت چینەکان روویانتێدەکەن. لەگەڵ ئەوەشدا، دەستەڵاتداران و دەسترۆیشتووان و راوبۆچوونیان لەتۆماری یاداشتەکانمدا فرەن و لەم کتێبەشدا رەنگیانداوەتەوە.

سەردانی کوردەکانی خۆراسان بۆ یەکەمجار سەرنجیان بۆ ئەو پەیوەندییە بەرابەرەی نێوان دەزگەی خێڵەکیی و سیاسەتی فەرمانڕەوایی دەوڵەت راکێشام. یەکگرتنی خێڵەکان وەك داهێنانێکی رەسەنی دەوڵەت دەهاتە پێشچاو. سەرەکخێڵە پەسەندکراوەکان، لایەنی کەم لەسەدەی رابوردووەوە، شا بە رەسمیی ئازنێوی داونەتێ (بڕوانە بەندی سێهەم).

سەرەتا ئەوەم بە پێشهاتێکی ئاسایی لێکدایەوەو کەوتمە پشکنینی سەرچاوە مێژووییەکان، تا بزانم چ هۆیەك بەو ئاستەی گەیاندووە. پاشان بۆم روونبووەوە کە زۆربەی خێڵەکانی کورد، لەلایەن دەوڵەتەکانیانەوە، بەو شێوازە مامەڵەکراون و کاریان تێکراوە. ئەو جۆرە زانیارییانە پتر لەسەرەکخێڵەکانەوە چنگ دەوتن، نەك لەبۆرەپیاوانەوە. بەو پێودانگە زانیاریەکی فرەم خڕکردەوە. بابەتی لێکۆڵینەوەکەم بە تێڕوانینێکی رەخنەگرانەی سەرچاوە پلەیەك و پلەدووەکانی چوارسەدەی پێشوو، دەوڵەمەند کردووەو هەر لەو روانگەیەوە بەندی سێهەمی ئەم کتێبە بە بەرهەم هاتووە.

لەگەشتەکەی کوردستانی ئێرانمدا، کاتێکی چاکم دەگەڵ شێخ و دەروێشاندا بەسەربرد. کاتێك ١٩٧٥ بۆ دووهەمجار چوومەوە، گەلەك کوردی عیراقم لەوێ دیت، هەندێکیان پەنا بەربوون و ژمارەیەکیشیان بە ئەرکی نهێنیی شۆڕش لەهاتوچۆدا بوون. لەرەمزاییە کاربەدەستانی ساواك هەوڵیاندەدا بەر بە پەیوەندییم لەگەڵ

کوردی عیراقدا بگرن. بەڵام لەشارۆچکەکانی وەك سەردەشتو بانەو مەریوان دەرفەتی چاکم هەبوو، گەلەك جار رێکەوت وابوو دەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا لەژووری میوانخانەیەکدا یەکدەکەوتین. (جگە لەرۆژنامەکان)، هەر ئەوانە سەرچاوەی هەواڵی شەڕو پێشهاتەکانی کوردستانی عیراقم بوون. ئا لەو رێگەیەوە ئەندازەی دەستێوەردانی ئێرانیشم بۆ روونبووەوە، هێجگار لەوە بەرینتر بوو، کە من چاوەڕوانم دەکرد.

گەلەك لەو کوردە عیراقییانەی تووشیان هاتم. وایان بەچاکزانی داوای تلّین لەنوێنەرایەتی کوردی عیراق لەتاران بکەمو بۆ کاری لێکۆڵینەوەکەم بچمە نێوچە ئازادکراوەکانی کوردستانی عیراق. هەر کە دڵنیابووم ئێران رێگە بە لێکۆڵینەوەکەم نادات، بەو کارە هەڵستام.

نوێنەرانی کورد زۆر میهرەبانو ئامادەی گشت کۆمەڵێك بوون. پاش چەند حەوتوویەکی کەم وەرامی ئەرێتییان دامەوە. لە ٦ی فێبریوەری ١٩٧٥دا سنوورم بەزاندو چوومە بەری کوردستانی عیراق. هێشتا بە هەویا بووم چۆن لەسەرەتاوە نەخشەم کێشا بوو، هەر ئاوها کاری لێکۆڵینەوەکەم جێبەجێبکەم. هەڵبەت بەهۆی باری جەنگەوە ئازادیی جموجۆڵم بەرتەسك بوو. بەڵام لەلایەکی دییەوە ئەوە تەنها دەرفەت بوو بۆ توێژینەوەی کۆمەڵگەی کوردەواری لەهەلو مەرجی جەنگدا، هەلو مەرجێك کە بەنێزیکە لەبارو دۆخی ئاشتی ئاساییتر بوو. هەتا دەتوانم بێژم بۆ تەتەڵەکردنی مەسەلەی پێبەندیی نەتەوەییو خێڵایەتی یاخود چینایەتی، فرەشیاو گونجاو بوو.

شەش حەوتوو پاش گەیشتنم، ناچاربووم لەگەڵ گشت پێشمەرگەو بەشێکی زۆر لەدانیشتواندا، هەڵێم، ئەوەبوو شۆڕشەکە هەرەسی هێنا. ئەو شایەی بزووتنەوەی کورد قەڵای ئومێدی لەسەر هەڵچنیبوو، لەناکاو رەگەڵ دوژمنە دێرینەکەی رێککەوتو دەمو دەست گشت جۆرە یارمەتییەکی لەکورد بڕیو تووشی ئاکامێکی دڵتەزێنی کردن. کوردان خۆیان لەبەردەم دووڕیانێکدا دیتەوە، یا دەبایە تەسلیمی سوپای عیراق بان، یاخود بۆ ئێران هەڵێن. هەندەك پەسەندی درێژەدان بە شۆڕشو

شەڕی پێشمەرگانەیان کرد، سەرکردایەتی کورد ڕێگەی نەدان. لادێیەکان پۆلپۆل بۆ ئێران هەڵدەهاتن، تا ٢٠ی مارت، بەنێزیکە گشت ناوچەی باڵەکایەتی، کە خۆمی لێبووم، چۆڵکرا.

ئەو شەش حەوتووەی لەکوردستانی عیراق بەسەرمبرد، لەگشت قۆناغەکانی دیکەی خەریکبوونم بە پرۆژەی لێکۆڵینەوەکەمەوە، زێتر کاریتێکردم. ڕۆژانە لەگەڵ ئازاری خەڵکەکەدا، دەگەڵ ترس‌و دڵەڕاوکەیاندا، ڕەگەڵ نەخۆش‌و مردنیاندا، ڕووبەڕوودەبوومەوە.

هەر دەگەڵ هەرەسدا، زۆر کێشەو گرفتی نێوهەناوی کۆمەڵگەی کوردەواری‌و شۆڕشی کورد، کە تا ئەو دەمە وریایانە لێفەپۆش دەکران، کەوتنە روو. گەلەك نهێنی کۆمەڵگەی کوردەوارییم بۆ ئاشکرابوون، تەجرەبەیەکی تاڵبوو، لایەنە هەست هەژێنەکانی دڵیان جەڕاندم.

کە گەڕاشمەوە ئێران، پەیوەندیی پتەو و توندو تۆڵم لەگەڵ پەنابەرەکاندا هەرهەبوو، وتووێژی فرەم لەگەڵ خاوەن بیرە جوداکاندا کرد، گەلەکیان شتانێکیان بۆ دەگێڕامەوە، کەلەوەبەر قروقەپیان لێکردبوو.

وەك ئاکامێکی ئەو پێشهاتانە، ناچاربووم بیرێك لەداهاتووی پرۆژەی لێکۆڵینەوەکەم بکەمەوە. لام روونبوو کە چیدی ناتوانم بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەهیچ کوێ بمێنمەوە، چونکە ڕێگەم نادەن. بەڵام لەلایەکی دییەوە هەستم دەکرد، بەهۆی ماوەیەك مانەوەم لای چەندین خێڵی جوداوازو لەبڕێك شوێنی جۆربەجۆری کوردستان‌و شارەزاییم دەربارەی هەندەك بارو دۆخی تایبەت، واملێدەکەن پێشهات‌و رووداوی دیکەش تێبگەم‌و بتوانم وەك پێویست هەڵیانسەنگێنم.

ئیدی وام بەچاکزانی روو لە هەندەك نێوچەی دیکەی کوردستان بکەم، تا بتوانم سەرئەنجامێکی فرەچەشنی ئەو شیرازەی کۆمەڵایەتی‌و پرۆسێسی گۆڕانە کۆمەڵایەتییانە پوختەکەم، کە بواری پەیپێبردن دەدەن.

بۆ مەبەستێکی ئاوها، بەر لەهەمووان کوردستانی تورکیام بە لەبار زانی، چونکە لەلایەك گەورەترین کوتی کوردستانە، لەلایەکی دیکەشەوە ئەو دەمە تا ڕادەیەك

ئازادییەکی چاك بۆ هەڵس و کەوتی ڕێبواران هەبوو. پێمابوو گەر کاربەدەستە مەڵبەندییەکان ڕێگەی مانەوەم بدەن، ڕەنگە بتوانم گەلەك قۆرت هەڵتەکێنم.

بەو پێیە سەرجەمی ئەو ماوەیەی بۆ لێکۆڵینەوەکەم بەدەستەوە مابوو، (واتە لەژونی ١٩٧٥ەوە تا ئۆگوستی ١٩٧٦) (بێ لەو ماوەیەی تێیدا تووشی زەردوویی بووم)، ئیدی بەردەوام لەنێوان مەڵبەندە جۆربەجۆرەکانی کوردستانی تورکیاو سوریاو ئێراندا، بەڕێگەوەبووم. گەلەك لەو شتانەی بەدڵ ئارەزووم دەکردن، نەمتوانی بەچاوی خۆم بیانبینم. بۆیە گفتوگۆو دەمەتەقێ، پشکێکی زۆری پشکنینەکانم دەگرنەوە، هەر دەڵێیت گوایە ئەوە ئەرکی لێکۆڵەرەوەی مەیدانیی کۆمەڵناسیی و مرۆڤناسییە. بەو هۆیەوە کە خۆم عەودالی مەسەلەی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکانم، بەشێکی زۆری دەمەتەقێکانم دەربارەی ڕووداو پێشهاتە دێرینەکانن. هەرچەندە زۆربەی ئەوانەی قسەم لەگەڵ کردوون، نەیانتوانیوە مێژووی تەواو و کرۆکی ڕووداوو بەسەرهاتەکانم پڕاوپڕ بۆ کاڵ بکەن. هەر ئەوەش وایلێکردم پەنابەرمەوە بۆ سەرچاوە نووسراوەکان و لەگەڵ پشکنین و لێکۆڵینەوەکانی خۆمدا بە وردی بەراوردیان بکەم.

کێشەیەکی زەقی شێوازی لێکۆڵینەوەکەم گرانیی یاخود ناتوانایی دۆزینەوەو بەراوردکردنی زانیارییەکانن لەچەند کات و شوێنێکی جوداوازدا. چونکە بەنێزیکە لەگشت جێیەك ماوەیەکی کورت دەمامەوە. ئیدی بۆم نەدەلوا هەمیشە زانیاری بابەتانە کۆوەکەم. هەر بەو پێودانگە، دەمەتەقێ سەرپێی و لەپڕو بێ شیرازەکانم، کە بەشێك لەشێوازی کارەکەم دەگرنەوە، هەرچەندە بابەتێکی هێجگار بەربلاون، کەچی قەت زانیاریی تەواو هاوجووتیانم لەشوێنێکی دی چنگ نەکەوتوون. سەوداریی و ئارەزووی هەواڵدەرەکەم، یاخود خۆم، دەبوونە جڵەوکێشی دەمەتەقێکانمان. لەلایەکی دییەوە هەرچەندە چاوپێکەوتنەکانم زۆر ڕێك و پێك و نموونەیی نەبوون، کەچی گەلەك زانیاری بەنرخی پڕتام و چێژ و چاوەڕوان نەکراویان تێدایە. گەلەکجار باری سەرنج و بۆچوونەکانم لەلایەن هەواڵدەرەکانمەوە

بە شێوازێکی هێجگار سەیر گۆڕاون (با بەو راددەو شێوەیەش نەبووبێت کە ئەوان خواستوویانە).

پێویست بەوە ناکات بڵێم هەتا پشکنینەکانی خۆشم کەمتر شیاوی بەراوردکردنن لەگەڵ یەکدی، بۆ نموونە قەت نەبووە مرۆ لەیەك جێ زێتر، هەمان کێشەو پێشهات ببینێت. ئەوە بە نیسبەت سەرچاوە مێژووییەکانیشەوە هەروایە. ئەو هەموو کتێبە قەبە قەبانەی خوێندمنەوە، گەوهەری زۆریان تێدابوو بۆ کەسێك سەوداسەری شتی سەیرو سەمەرە بێت، بەلام بۆ کارەکەی من شتێکی ئەوتۆیان تێدا نەبوو. راستییەکەی بێبەش بوون لەو جۆرە زانیارییانەی من عەوداڵیان بووم، زانیارییەك کە بتوانم لەبەر رۆشناییدا، باری ئێستاو دێرینی پێبەراورد بکەم.

کەواتە ئەم لێکۆڵینەوەیەم زێتر پەیجوورو توێژینەوەیەکە، کە ناتوانرێت هیچ تیۆرییەکی پێتاقیبکرێتەوە. تەنها بەشێکی کەمی ئەو زانیارییانەی کۆمکردوونەوە، دەشێت پاسایەکی گشتیی وایان لێپوختەکرێت، کە وەرام بن بۆ چکێك لەو پرسیارانەی لەسەرەتادا کردمانن. لەگەڵ ئەوەشدا بابەتەکانی زۆر چڕو پڕن، دیارە وەرامی گشت پرسیارێکیشی پێنادرێتەوە، بەلام لایەنی کەم دەتوانێت یارمەتیدەربێت بۆ دۆزینەوەی گەلەك راستی.

## ٠-٢- بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەیە

کرۆکی ئەم کتێبە پێبەندییە* سەرەتاییەکەیە، وەکی Alavi لە ١٩٧٣دا نێوی دەنێت. Alavi ئەم زاراوەیە بۆ ئەوە بەکاردەهێنێت، کە وابەستەییە کۆمەلایەتییەکانی وەکی خزم خزمێنەو تاقم تاقمێنەی پێشیکاتەوە، ئەو پێبەندییەی رێگە لەوە دەبەستێتەوە کە جوتکارە هەژارەکان هەست بە جوداوازیی چینایەتی بکەن و وایان لێدەکات دژی بەرژەوەندیی راستەقینەی خۆیان رەفتاربکەن.

---

* چەندی سەرم هێناو برد، وشەیەکی کوردیی شیاوو گونجاوم بەرامبەر وشەی (Loyalitat) (الولاء) پێپەیدا نەکرا، ناچار ووشەی (پێبەندیی)م لەجێگە دانا.

Alavi پاکستانمان بە نموونە بۆ دەهێنێتەوە، کە پێبەندیی خزم خزمێنەو کاستو نوێنەرو دەمڕاست، زۆر زەق و باون.

لەکوردستاندا هەرچەندە جۆرێکی دییە، بەڵام پێبەندییە خۆڕسکەکە بەهەمان شێوازو توندتریش، کار لەژیانی سیاسی دەکات. ئەگەرچی ئەو جۆرە پێبەندییانە هێجگار کۆن و دێرینەن، وەلێ لەهەندەك کێشەو ململانێی سیاسەتی جیهانی ئەوڕۆدا، هێشتا هەر کاریگەرێتییان ماوەو حسێبیان بۆ دەکرێت. ململانێی دوو زلهێزی ئەمریکاو سۆڤیەت و ئەو کێشەیەی کە لە قەیرانی نەوت کەوتەوە، راستەوخۆتر لەکوردستاندا رەنگیداوەتەوە وەك لەهۆڵەندای زێدی خۆمدا. هەرچەندە ئەوە دیاردەیەکی نوێ نییە، بەڵام پشتگوێخستنی ئەو پێبەندییە سەرەتاییەو تین و تاوی هۆکارە دەرەکییەکان لەسەری، ساویلکەییە.

پێبەندییە خۆڕسکەکە لەکوردستاندا، وابەستەییە بەخێزان و بنەماڵەو هۆزو سەرەکهۆزو ئاغاوە. پێبەندییە ئاینیەکەش هەروایە، وابەستەییە بە شێخ و پیرو پیاوچاکان و تەریقەتە سۆفی و دەروێشیەکانەوە. هەوڵێکی زۆر دراوە رەگی ئەو پێبەندیی و وابەستەییە ریشەکێشکرێت، بەڵام بێ سەرئەنجام بووە. لەتورکیادا ئەتاتورك دەستپێشکەربوو، هەوڵیدا دەستەڵاتی ئاغاو شێخان بنکەلکات. لەم دە ساڵانەی دواییشدا، وەچەیەکی نوێ لەلاوە سۆسیالیستەکان، کۆششیانکرد جوتێران بەشیری چینایەتی فرچکدەن. لەگەڵ ئەوەشدا شوان و گاوان و جوتکارانی کورد هێشتا هەر ملکەچی فەرمانی ئاغاو شێخەکانیانن. سەرکەوتووترین پاڵێوراوی هەڵبژاردنەکان، ئاغاو شێخ و دەستنێژەکانیانن. هەرچەندە دادۆشینی رەعیەتەکە لەلایەن ئاغاوە هەر روو لەزێدەیەو ئاغا چ خێرو بێرێکی نییە، کەچی پێبەندیی و لارەمیلییەکە هەر درێژەی هەیە. گەلەکجار دەبیستین گوایە کاپیتالیزم بەتواناترین هێزە بۆ بنبڕکردنی ئەو جۆرە پێبەندییە، بەڵام دیارە ئەوە ئاوها بەزوویی وەدی نایەت. لەلایەکی دییەوە دەبێت ئەوەش بڵێین کە بوونی پێبەندییە خۆرسکەکەو تەنینەوەی، ناتوانێت بەر بە تین و تاوی هەندەك پێبەندیی دیکە بگرێت. بە پێچەوانەشەوە، پێبەندییە خۆرسکەکە، بە هاتنەکایەی پێبەندیی نوێی وەك

پێبەنـدیی نەتەوایـەتی یـاخود چـینایەتی، هـەروا ئاسـان سـەنگەر چۆڵناکاتو وزەی خـۆی لەدەسـت نـادات. جـاریش هەیـە پێبەندییـە جۆربـەجۆرەکان کـار لەیەکـدی دەکەنو یەکدی دەبوژێننـەوە، بـەڵام کامـەیان بـەهێزترو کاریگـەرترە، مەسـەلەیەکە پەیوەندیی بەو ئانو ساتو بارو دۆخەوە هەیە[٦].

لەکۆڕێکی سیاسیدا چاوم بە هەندەك کرێکاری رەوکردووی تورکیـا کـەوت، لەگـەڵ دەسـتەیەکی گـچەکەیاندا کـە سـەر بـەجڤاتی کرێکـارانی سۆسیالیـست بـوون، کردمـە دەمەتەقـی. گشتیان لەوانە بوون کە هۆشی چینایەتییان باڵابوو. کە بیـستم خـەڵکی خۆرهـەڵاتی تورکیـان، لەتورکییـەوە گـۆڕیم بـۆ کـوردی. دیـتم دەمەتەقێکـەمان دەستبەجـێ گەرمترو شیرنتر بوو. (بۆ ماوەیـەك تـەنها هـەرخۆمان بـووینو تورکمـان تێکـەڵ نـەبوو). پـاش ماوەیـەك پێمگـوتن گوایـە لەگـەڵ شـێخێکی دەسـتەڵاتداری نێوچەکەیاندا دۆستایەتیم گەرمە. مـن چـاوەڕوانی ئـەوەمبووم لـێم بـسڵەمنەوەو لـێم بتەکنـەوە، لـێ بـۆ نەهامـەتی، دیـتم رێـزو سـەرەوەریم لایـان سـەریکرد. هەرچـەندە کەسیان خاوەن ئیمانێکی ئەوتۆ نەبوون، کەچی هەستو سۆزیان بۆ شێخ بزوا.

**هەستی نەتەوایەتی کوردو پێبەنـدیی خزمایـەتیو ئـاینی، پێکـرا دوو روو و دوو رۆڵی جوداوازیان هەیە. لەلایەکەوە یەکەمین خەباتگێڕانی بزووتنەوەی نەتەوایـەتی** کورد، ئەو شێخو ئاغایانە بوون کە رۆڵـەی خانـەوادە خانـەدانـە نێـودارو بەشـۆڕەتو دەستەڵاتدارە نەریتیەکان بوون. پێبەندییـە خۆڕسکەکەی ئـەوانو بەرامبـەر ئـەوان، بەهاو نێوو شۆرەتیان، بزووتنەوەی نەتەوایەتییان دەگەیاندە ئاستێکی جەماوەریی. لەلایـەکی دییـەوە، کێـشەو هـەڵلاو ململانێـی بـەردەوامی نێـوان ئـەو سـەرکردە تەقلیدییانـە، بۆتـە هـۆی یەکنـەگرتنی ریزەکـانی کـورد تـا رۆژی ئـەوڕۆ. تـەنها بەشـداریی فلانـە سـەرەکخێڵ لەبزووتنـەوەی نەتەوایەتیـدا، بـەس بـووە بـۆ ئـەوەی دوژمـنو گوردێرەکـەی، دژی بزووتنەوەکـە بوەسـتێتەوەو خەڵکـە رەشـۆکیەکەش بـە تۆپـەڵ رەدووی کـەوتوون، بـێ ئـەوەی متـەق بکـەن. ١٩٧٤یـش، ئەودەمـەی هەسـتی نەتەوایـــەتی لەکوردســـتانی عیراقـــدا ســـەراپاییو گـــشتگر بـــوو، لەجـــەنگێکی چارەنووسسازدابوون دەگەڵ رژێمی عیراقدا، لەزۆر شوێن، تەنها سەرەکهۆز هەڵوێستی

هۆزەکەیی دەستنیشاندەکرد، داخۆ بدەنە پاڵ شۆڕش، یاخود بێلایەن بمێننەوە، یاخود بدەنە پاڵ دوژمنو چالاکانە دژی شۆڕش بجەنگن.

کەواتە ئەم کتێبە بەپلەی یەکەم خەریکی مەسەلەی پێبەندییە خۆڕسکەکەیە. باسی تیرەو هۆزو تەریقەتەکان دەکەم، هێزو گۆڕیانم لەکوردستاندا چۆن دیت، یاخود دەورو رۆڵی دێرینەیانم لەدەمەتەقێو لەسەرچاوە نووسراوەکاندا چۆن هەڵهێنجاو هەوڵدەدەم ببڕێك شیرازەو کرۆکیان روونکەمەوە، داخۆ بە چ شێوازێكو تا چ مەودایەك هۆکارە دەرەکییەکان کاریتێکردوونو دەیکات. کۆششدەکەم گەشەکردنی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردو کاریگەرێتی لەسەر ئەو پێبەندییە خۆڕسکیە و کاریگەرێتی ئەو لەسەر بزووتنەوەی کوردایەتی، شیبکەمەوە.

پاش بەندی یەکەم کە هەندەك زانیاریی گشتییە، لەدووهەم بەنددا باسێکی شیرازەی خێلایەتی کورد دەکەم، سەرەتا بە گشتی، پاشان وەك نموونە چەند هۆزێکی دیاریکراو بە پێکهاتی جۆراو جۆرەوە دەهێنمەوە. دەورو رۆڵی سەرەکخێڵ هەڵدەشێلینو پێشانی دەدەین تا چ رادەیەك سەرکردەی خێڵو کێشەو هەڵا ئاوێتەی یەکدینو پێکەوە جووتبەندن.

بایەخی شێخایەتیش پەیوەستە بە گێرمەو کێشەکانی هۆزەوە:

شێخەکان لەو بگرەو بەردانەدا هەڵوێستێکی بێلایەنانە پیشاندەدەنو پاشانیش دەبنە فریشتەی ئاشتیو بەوە هێزو دەستەڵاتی سیاسی خۆیان برەو پێدەدەن. بەندی چوارهەم خۆی بە شێخو تەریقەتەکانەوە خەریکدەکات.

لەبەر ئەوەی دەربارەی ئەو تەریقەتانە هێجگار کەم نووسراوە، بەو هۆیەشەوە کە خۆم زۆریان پێ سەرسامم، بۆیە تەنها بەخسڵەتە سیاسییە گرنگەکانیان قنیات ناکەم، بەڵکە بایەخ بە مۆرکی فەلسەفیو دابو نەریتیشیان دەدەم. روونکردنەوەیەك بۆ گەشەکردنی خێرای تەریقەتێك لەسەدەی رابوردووداو ئەو دەورەگەشەی لەو دەمەوە لەبزووتنەوەی نەتەوایەتیدا دیتوویە، پێشچاودەخەم.

بانگەشەی پێوەندیی دەگەڵ ئێزدانو هێزە پەنامەکییەکاندا، سەرچاوەی یەکێك لەدەستەڵاتە دنیاییەکانی شێخە، یەکێکی دیکەی پەیوەندییە نهێنییەکانێتی

بەوڵاتانی هاوسێوە. گەلەك سەرەكهۆزی چەتوونو دڵبزۆكو چڵێسی نێوو شۆرەت، لەرێگەی رێككەوتنی ئاشكراو نهێنییەوە رەگەڵ وڵاتە هاوسێكانیان هێزو دەستەڵاتیان لەكۆمەڵگەدا بۆ خۆ پچڕیوە. لەبەندی سێهەمدا بەڵگەی مێژوویی بۆ روونكردنەوەی ئەو تێزەم پێشچاودەخەم، كە دەمەوێت بیسەلمێنم هۆزەكانی ئەوڕۆی كورد هێزێكی سەربەخۆنیین، بەڵكە تا رادەیەك قوتكراوەی دەستی وڵاتە هاوسێكانیانن. لەبەندی پێنجەمدا، كاتێك دەربارەی یەكێك لەگرنگترین شۆڕشەكانی كورد دەدوێین، بەهوردی گشت لایەنەكانی ئەم بانگەشەیەم هەڵدەشێلین. پێبەندییە خۆڕسكەكە، پێبەندییە نەتەوەییەكە (كە بابەتێكە هێشتا بگرەو بەردەی زۆر هەڵدەگرێت)، راپەڕینی نێوان خێڵو دەوڵەت، رۆڵی هەرهەموویانو كاریگەرێتیان لەسەریەكدی دەتوێژینەوە.

ئەم كتێبە وەك پێینەكراوە گشت لایەنو كەلێنەكانی كۆمەڵگەی كوردەواریی روونكاتەوە، نەشدەكرا تەنهاو تەنها تیشك بخاتە سەر پێبەندییە خۆڕسكەكە. هەرچەندە دیاردە گرنگەكانی وەكی شارستانێتیو رەوكردن، چالاكیی پارتە سیاسییەكانو جڤاتەكان، لەوەش گرنگتر باری ئابووریی هەڵبواردووەو باسی نەكردوون. دیارە بابەتەكانی تەواو كامڵو خەملیو نیین، بەڵام بۆ تێگەیشتنی رووداوە سیاسییەكانی كوردستان لەو دەساڵانەی رابوردوودا، سوودبەخشە.

### ٠ـ ٣ـ چەند سەرنجێك دەربارەی سەرچاوەكان

بۆ گشت بەشەكانی ئەم كتێبە، گەلەك سەرچاوەم بەكارهێناوە، لەبەشی سەرنجو سەرچاوەكاندا دەستنیشانیان دەكەم. بە پێویستی دەزانم هەندەك تێبینی دەربارەی ئەو سەرچاوانە تۆمار بكەم، كە زۆر بە پرسوودیان دەزانمو خۆم گەلەكجار پەنام بۆ بردوون. دوو شاكاری گرنگ كە سوودی زۆرم لێوەرگرتوون، یەكێكیان شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسییەو ئەوی دی سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبییە*.

شەرەفنامە لەكۆتایی سەدەی شازدەهەمدا لەلایەن كۆنە میری میرنشینی بەتلیسەوە، كە بۆ كوڕەكەی دەستی لەتەختی پاشایی هەڵگرت، نووسراوە ئەمە

مێــژووی میرنــشینەکانی کــوردە، یــا راســتر وایــە بڵــێین مێــژووی خانــەوادە فەرمانڕەواکانێتی. ئەم تۆمارە شاکارە، لێوان لێوە لەپەند، واپێدەچێت نووسەرە زۆر گەڕاوو دنیادیتەکەی، گشت ژیانی بەوەوە خەریکبووبێت، ئەو زانیاریانە کۆوەکات.

گێڕانەوە هوردەکانی، وێنەیەکی گەش‌و زیندووی چالاکیی سیاسی فەرمانڕەوایانی کوردو پەیوەنــدییان لەگــەڵ هێــزە دەســتەڵاتدارەکانی وڵاتــانی هاوســێمان دێنێتــەوە پێشچاو.

دەبێــت لێــرەدا پەنجە بــۆ ئــەوە راکێــشین کــە دەقــە فارسییەکەی شــەرەفنامە بــۆ یەکــەمجار لەلایــەن (V. Veliaminov - Zernov)ەوە بڵاوکراوەتــەوە، هــەروەها تەرجەمە فەرەنــسییەکەی لەلایــەن (F. B. Charmoy) ســاڵی ١٨٦٠ تــا ســاڵی ١٨٧٥ لــە سانت پێتەرسبورگ چاپکراو ساڵی ١٩٦٩ سەر لەنوێ لەئینگلتەرە چاپکرایەوە.

سیاحەتنامەش پڕتام‌و چێژترین سەرچاوەیە، کــە دەربــارەی ژیــانی کۆمەڵایــەتی‌و سیاســی‌و ئــابووریی ســەدەی حەڤدەهــەمی ئیمپراتــۆرێتی عوسمــانی نووســراوە. نووســەرەکەی بــە تــان‌و پــۆی ئیمپراتۆرێکەدا سووڕاوەتەوەو وڵاتــانی هاوســێی وەکــی ئێران‌و ئوتریش‌و هەنگاریاش گەڕاوە. ساڵانی ١٦٥٥ و ١٦٥٦ گەشتێك بــە زۆر نێوچــەی کوردستاندا دەکات‌و هەرچی دەبینێت، تۆماری دەکات.

بەو کارەی دەریخستووە کە هێجگار ووردبین‌و شەیداو عەوداڵی گەلەك شت بووەو بەرگی چوارو پێنجی تۆمارەکانی، گەنجینەیەکی پڕ گەوهەرن. وەلێ مەخابن بەرگە چــاپکراوەکانی ســیاحەتنامە زۆر بــێ بڕشــت‌و کــەم پــیتن. یەکــەم نوســخە چاپکراوەکانی، ساڵانی ١٨٩٦ تا ١٩٣٨ لەئەستەمووڵ بڵاوکراونەوە، تا بەرگی هەشتەمی بە تیپی عارەبی‌و دوو بەرگی دواهەمی بەتیپی لاتینین. هەشت بەرگی یەکەم کە بــەتیپی عــارەبی چــاپکراون، چــاك بیرازکــراون. لــەو ڕووەوە تــەنها سانــسۆری عەبدولحەمید بەرپرسیار نییە، بەڵکە نارەزوو و هەواو هەوەسی بڵاوکەرەوەکەشی. ئــەوەی تێبینەگەیــشتووە، یــا دەریهاوێــشتووە، یــاخود گۆڕیویــە. ئیــدی نوســخەی چــاپکراوی باشــتری لەبەردەســتاندا نییــە، هەرچــەندە دەقــی دەستنووســەکەی ئــەولیا خۆشــی لــەم دواییانــەدا دۆزرایــەوەو دەتوانرێــت بەئاســانی چــاپبکرێتەوە. ماوەیــەك

لەمەوبەر چاپێکی بازاڕیی دیکەی لەلایەن (T. Temel Kuranو N. Aktas)ەوە بڵاوکرایەوە، بەڵام لەچاپی یەکەم لاینەداوە. پێویستە ئەوە ڕاگەیەنم کە ئەز لەم گەشتەمدا هەرکات پێویستم بە شاکارەکەی ئەولیا بووبێت، گەڕاومەوە سەر دەقە ڕەسەنەکە، کە بەمیکرۆفیلم لەبەر دەستمدا بوو.

لەنێو زۆربەی سەرچاوە پلە دووەکانی مێژووی عوسمانیدا، نوسینەکەی (Hammer) "مێژووی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی" تا ئێستاش گرنگترین و بە نرخترینیانە. نووسەرەکەی ژمارەیەکی بێ شومار دەقی ڕەسەنی بەڵگەنامەی دەستنووسی خڕکردۆتەوە. ئەمە پوختەیەکی پڕسوودی بەرهەمی مێژوونووسانی عوسمانییەو زۆر شتی پەیوەندیدار بە ڕووداوەکانی کوردستانەوەی تێدایە. لەزۆر لایەنەوە تا ئێستا بەرهەم نییە شان لەشانی بسوێت.

هێشتا مێژووی ئێران بەو باشییە نەتوێژراوەتەوەو ئەو بایەخەش بە کورد نەدراوە. لەگەڵێنی ئەو فەرامۆشییەوە، گوتارەکەی مینۆرسکی "کوردەکان" لە "ئینسکلۆپیدیای ئیسلام"دا، هێشتا بە دانسقە دادەنرێت و یەکێکە لەسەرچاوە بەپێزە پلەدووەکان.

هەندەك هەواڵنامەی گەشتەوەرە ئەوروپاییەکان وەك سەرچاوەیەکی پلەیەك، پڕچێژن. هێندە زۆرن، کتێبخانەیەك پڕدەکەنەوە، بۆیە لەتوانامدا نەبوو لەگشتیان بڕوانم. بەلای منەوە، بە کەڵکترینیان ئەوانەی Frascr و Layard و Rich ن.

لەیەکەم جەنگی جیهانیدا، کاتێك ئینگلیزەکان عیراقیان داگیرکرد، هەوڵیاندا دەزگەی فەرمانڕەوایی وابەستە بەخۆیان، بەچاودێری ئەفسەرە سیاسییەکانی ئینگلیزو یاریدەدەرانیان، کە خۆرهەڵاتناسی زۆریان تێدابوو، لەویلایەتەکاندا دابمەزرێننەوە. هەندێك لەوانە بیرەوەرییەکانی خۆیان لەشێوەی کتێب و گوتاردا بڵاوکردۆتەوەو زانیاریی بەنرخیان تێدایە. کتێبەکەی ١٩٥٧ ی Edmonds یەکێکە لەچێترینیان. خۆی زمانەوانێکی چاك و سەرنجدەرێکی بەتوانایەو زانیاریی فرەو بەنرخی دەربارەی کوردستان کۆکردۆتەوە.

ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا لە Public Recrord office ماددەی خاوی چاکی تێدایە، هەر لەتەلەگرافی کۆنسوڵاتەوە تا هەواڵنامەی مەیدانیی کاربەدەستان. من سوودم لەبەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوە (ئاکتی ژمارە ۳۷۱) وەرگرت، کە دەربارەی تورکیاو عیراقو ئێرانی ساڵانی ۱۹۱۷ تا ۱۹۳۸ە. ئەوانە سەرچاوەی تۆمارکراوی مێژووی نێوچەکەن. گەلەکجار لەلایەن نووسەرانی خۆو ولاتییشەوە سوودیان لێوەرگیراوە، لەوانە Firat ۱۹۷۰و Dersimi و ۱۹۵۲.

## ١ـ ١ـ جوگرافیای

کوردستان "وڵاتی کوردان"، نێوچەیەکی ستراتیژی خۆرهەڵاتی نێوەندەو گرنگترین بەشی تورکیاو ئێرانو عیراقو سوریا پێکدەهێنێت. لەمێژوودا قەت دەوڵەتێك بەو نێوەوە نەبووە.

لەسەردەمی ئیمپراتۆرێتی عوسمانیدا، کوردستان نێوی پشکێکی ئەو خاکە بوو، کە کوردی لێدەژیا، تەنها بە ویلایەتی دیاربەکر دەگوترا کوردستان. لەئێرانیش بەهەمان جۆر، تەنها بەشێك لەو خاکە بە کوردستان نێودەبرێت، کە نێزیکەی سێیەکی کوردی وڵاتەکەی لێدەژین*، نەخشەی ژمارە ٢ قەوارەیەکی نێزیکی ئەو خاکی پێشاندەدات، کە زۆربەی کوردن. بنەمای ئەو نەخشەیە نەخشەیەکە کە نیشتمانپەروەرانی کورد لە ١٩٤٨دا دایانە نەتەوەیەکگرتووەکان. هێندەی بواری بەدوواداچوونو بەراوردکارییم هەبووبێت، راستیو دروستیی ئەو نەخشەیەم بۆ روونبۆتەوە[١]. هەر کات لەم کتێبە نێوی کوردستان دێنم، مەبەستم ئەو خاکەیە، کە لەونەخشەیەدا دیاریکراوە. کوردێکی هێجگار زۆر لەدەرەوەی ئەو کوردستانە دەستنیشانکراوەدا دەژین. پەریدەیەکی زۆری کورد (چەند صەد هەزار کەسێك) لەئوستانی خۆراسانی باکوری خۆرهەڵاتی ئێران هەن، کە دەکەوێتە سەرسنووری کۆماری تورکمەنستانی سۆڤیەتی. گرنگترین کۆمەڵەپەرەوازەی دی، لەئەرمینیاو ئازربایجانی سۆڤیەتیو خۆرئاوای تورکیان. هەندێکیان لەو نێوچانەن کە پەمووی لێدەچێندرێت، بەتایبەت کەنارەکانی زەریای ئیجەو زەریای نێوڕاستو بەهۆی کۆچو رەوەوە لە بازێرە مەزنەکان بەچڕیو خێرایی روو لەزیادبوونن.

نێوجەرگەی کوردستان زنجیرە چیای سەرکەشی ئەوتۆن، کە هەمیشە قەڵاتی قایمی بەرلووتی گەلە لەشکری داگیرکەرانو مەکۆو بنەی تەڕیدەو رەدوونراوان بوون. پشکی خۆرهەڵاتی، یاخود تۆرۆسی کوردو زنجیرە چیاکانی زاگرۆس، کە بە

---

* مەبەست ئوستانی کوردستانە کە پێتەختەکەی شاری سنەیە

نێزیکە لەباکووری خۆرئاواوە بەرەو باشووری خۆرهەڵات شۆڕبوونەوە، دەبنە بڕبڕەی پشتی. لەسەمتی باشووری خۆرئاواوە چەند زنجیرەیەکی هاوتەریبی بەرزو سەخت بەرەو تەختانییەکانی مێسۆپۆتامیا دادەکشێن. لەباکوورو باکووری خۆرهەڵاتەوە خاکەکەی دەبێتە ریزە تەپۆلکەو گردەڵان. تەپۆلکەقوتەکانی سەروو گۆلە پانو بەرینەکەی ڤان، ئەو شوێنەی دیجلەو فوراتی لێهەڵدەقوڵێن، پێشان تەپۆلکەکانی ئەرمینیای پێدەگوترا، چونکە زۆربەی دانیشتوانی ئەرمەن بوون، کوردەکان ئەوها چەند صەد ساڵێکە لەوێ دەژین. پاش راگوێزانو رەشکوژیەکەی ئەرمەن لەیەکەم جەنگی جیهانیداو هەڵهاتنی بەشەکەی دیکەی، ئیدی ئەو نێوچەیە کوردی تێڕژا. نزماییەکانی باشوورو تەپۆلکەکانی خۆرهەڵات، بوونەتە سنوورێکی سروشتکردی کوردستان.

لەباکووری خۆرئاوادا سنوورێکی ئەوتۆ نییە، کوردو تورک تێکەڵن. هەروەها سنوورەکانی باشووری خۆرلاهەتیش هێند روون نیین، چونکە تیرەکانی لوڕو بەختیاری لەرووی کولتورییەوە گەلەك لێکچوونیان دەگەڵ کورددا هەیەو زۆر نەتەوەپەروەری کورد بە کوردیان دادەنێن.

ئەز تەنها ئەو تیرانەی لوڕ بە کورد حسێب دەکەم، کە بە زاراوی لەکی دەپەیڤنو بەپێچەوانەی ئەوانی دییەوە تێکڕا خۆیان بەکورد دەزانن.

بەهۆی ئاوو هەوای وشکەرۆو بەرزیی خاکەکەیەوە، زستانی کوردستان هێجگار ساردو سەختە. لەمانگی دێسامبەرەوە تافێبریوەر بەفرێکی زۆر دەکەوێتو رێگەی هامشۆی گەلەك گوند دەبەستێت. جار هەیە لەئاوریلیشدا هێشتا رێگە ناکرێتەوە. ئا ئەو زستانە سەختانە، یەکێکە لەهۆکارەکانی تێداچوونی لێرەوارەکانی کوردستان، چونکە زستانان دارێکی هێجگار زۆر دەبڕدرێتەوەو دەسووتێندرێت. (نەوت تەنها لەئێرانو عیراق هەرزانە، لەگەڵ ئەوەشدا لەوێش دار، تاقە ئاوردووە). یەکێك لەهۆکارە بەدەکانی دی، بزنە، کە تا لۆزی برکات چرۆو سەوزایی گشت دارو دەوەنێك دادەپاچێت.

هەواڵی گەڕیدەکان وادەگەیەنن کە پشکی هەرە زۆری کەژو کێوەکانی کوردستان تا سەدەیەك لەمەوبەر چڕەلێڕەواربوون. لەو لێڕەوارانە کەمیان ماون. ئاکامەکەی روونە: دارووخانو داڕووتانو داشۆرانو داخورانی زەویو شۆڕبوونەوەی خاکە بەپیتەکان بۆ نێو دۆڵو شێوەکان.

کوردستان دەکەوێتە نێوبازنەی نێوچەیەکی بوومە لەرزاوییەوە، ساڵ نییە کوتێکی بەر بوومە لەرزە نەکەوێت. قورستترینیان لەم دواییانەدا ئەوەبوو کە لە یولی ١٩٧٥دا لە لیچەیدا، کە دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی دیاربەکرەوە. لەنۆڤەمبەری ١٩٧٦یشدا لەموورادییەی سەرووی ڤانیدا. هەردووجارەکە خەڵکێکی زۆری کوشت. لەرۆژنامەکاندا باس لە ٤٠٠٠ تا ١٠٠٠٠ کورژاو دەکرا. گەلەکجار خراپیی رێگەوبانو هۆکاری سیاسی دەبنە قۆرتی دەستبەجێ گەیاندنەی کۆمەك بە لێقەوماوان (ئەگەر کۆمەك هەر هەبێت)، ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی ژمارەی قوربانییەکان.

ئەوەبوو زۆربەی قوربانییەکانی مورادییە، پاش بوومەلەرزەکە مردن، چونکە بەناچاریی دابوویانە دەشتو کێوو چادرو خێوەتیش رێگەیان گومکردنو بەوان نەگەیشتن، زۆریان رەقبوونەوە. خۆراكو کەلو پەل هەر لەنیوەی رێ سەریان تێداچوو. گەلەك لادێیی ناچاربوون مەڕو ماڵاتو گاو گۆتاڵیان بفرۆشن، چونکە چیدی ئالفیان پێدابین نەدەکرا، ئابەو جۆرە زۆر لەوانەش کە سەریان دەرکرد، ماڵوێران بوون.

## ١ـ ٢ـ باری جیۆپۆلیتیکی

سەختییو گەردنکەشیی خاکەکەیو سەهەندەییو جەربەزەییو جەنگاوەریی خەڵکەکەی، هەمیشە سنوورێکی سروشتییان لەبەردەم ئیمپراتۆرێتەکانی چواردەوریاندا قوتکردۆتەوە. هیچ یەکێك لەو ئیمپراتۆرێتانە نەیانتوانیوە لەکوتێکی کوردستان زێتر بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە. سەرئەنجامەکەی شەقو پەفکردنی کوردستان بوو لەنێوان سنووری سیاسی وڵاتە هاوسێکانیدا. جەنگەکانی

نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو فارس، ئەو بستۆکە سنوورەی ئەورۆی نێوان ئێرانو عیراقو تورکیای سەپاند. داگیرکردنی نێوچەکە لەیەکەم جەنگی جیهانیدا لەلایەن ئینگلیزو فەرانسەییەکانەوە، سوریاو عیراقی لەئیمپراتۆریەتی عوسمانی داپچڕی. سنووری دەوڵەتانی کردە چوار کوتەوە. گەلەکجار ئەو سنوورانە بە جەرگەی مەڵبەندی خێڵێکدا راکێشراون. ئەز ئەو کوتە خاکانە بە کوردستانی تورکیاو ئێرانو عیراقو سوریا نێودەبەم.

سنوورێکی دیکەی گرنگ کە کوردستان لەت ناکات، بەڵکە خۆی لێدەخشێنێت، سنووری یەکێتی سۆڤیەتە. نێزدیکی ئەم سنوورە کوردستان چ بۆ سۆڤیەتو چ بۆ وڵاتە کاپیتالیستەکان، دەکاتە نێوچەیەکی ستراتیژیی گرنگو پڕبایەخو کارێکی زۆری کردۆتە سەر مێژووی ئەم سەدەیەی. وڵاتێك کە سنووری بەکوردستانەوە نییە، بەڵام مەرامی زۆری بەم نێوچەیەیە، ئیسرائیلە. لەسەروەختی پێکداهەڵپژانی کوردو عارەباندا، کورد وەکی هاوپەیمانێکی سروشتیی ئیسرائیل دەینواند. لە ١٩٦٧ەوە، رەنگە زووتریش، ئیسرائیل باربووی بە بارزانیی سەرداری کوردەکانی عیراق دەدا.

دوو شارێگە هەن کە ئەوروپا بە ئاسیاوە دەبەستنەوە، (دیارە جگە لەوەکەی سۆڤیەت)، هەردووکیان بە کوردستاندا تێدەپەڕن. هەروەها هەردوو رێچکەی شەمەندەفەری ئەستەموڵ ـ تارانو ئەستەموڵ ـ بەغداش، کوردستان دەبڕن (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٢).

موسڵو کەرکوكو خانەقین، گرنگترین کانگای نەوتیان لێیە. هەروا بەرێکەوت نەکەوتوونە عیراقەوە. ئەوە هۆکاری راستەقینەی قوتکردنەوەی یەکێتی سیاسی خاکی عیراقە لەلایەن ئینگلیزەوە.

کانگای گچکەتر لەڕومەیلانی باکووری خۆرهەڵاتی سوریاو باتمانی تورکیا هەن (بڕوانە نەخشەی ژمارە (٢). کانە گرنگە دۆزراوەکانی دیکەی کوردستان، کرۆمو مسو ئاسنو خەڵووزی بەردن.

### ١ـ ٢ دانیشتووان

قرساندنەکانی ژمارەی کورد هێجگار لەیەکدی جوداوازن. لەسەرژمێرییەکاندا، یاخود کورد جودا ناکەنەوە، یاخود خەسڵەتو نێوی "کورد" بەجۆرێك تەنگ دەکەنەوە کە کەم کەس بگرێتەوە، (بۆ نموونە تەنها ئەوانەی کە هیچ تورکی نازانن و هەر بە کوردی دەپەیڤن). ئەوەبوو سەرژمێرەکەی ١٩٥٥ی تورکیا، لەسەرجەمی ٢٤ ملوێن کەس[٢]، ژمارەی ئاخێوەرانی کوردی مەلوێن و نێوێك دانابوو. سەرژمێرەکانی پاشتر، نێوی کورد هەرناهێنن.

لەوڵاتەکانی دیکەش هەمانجۆرە، با دان بەبوونی کوردیشدا بنێن. بۆیە مرۆ دەتوانرێت تەنها بەگۆترەکاری ژمارەیان بقرسێنێت. ئەم ژمارانەی ساڵی ١٩٧٥ پشت بە سەرژمێرە بەردەستەکانی پێشینی دەبەستێت.

### ١ـ ٢ـ ١ـ تورکیا

گەر پشت بە سەرژمێرەکەی ١٩٧٠ ببەستین و لەویلایەت بەرەو خوار بڕوانین و رێژەی کورد لەهەرنێوچەیەکدا حسێب بکەین، دەتوانین بێژین ژمارەی کورد ساڵی ١٩٧٠ لەکوردستانی تورکیادا، خۆی لەنێزیکەی ٥,٧ ملوێنێك داوە. گەر مرۆ رێژەی زۆربوونی ژمارەی سەرجەم دانیشتووان وەرگرێت، کە ١٣٪یە، ئەوا ساڵی ١٩٧٥ دەگاتە ٦,٥ ملوێنێك. لێرەدا دەبێت ژمارەی ئەو کوردانەشی بخەینە سەر، کە لە نێوچەکانی دیکەی تورکیادا دەژین.

ڤانلی* ژمارەیان لە ١٩٦٥دا بە ملوێن و نیوێك دەخەمڵێنێت، کە بۆ ١٩٧٥ دەگاتە ٢,٢ ملوێن. هەرچەندە من بواری بەدوواداچوونی ئەم خەمڵاندنەم نەبوو، بەلام لەسەردانی باژێرە مەزنەکان و نێوچەکانی کەناری دەریادا، بۆمدەرکەوت کە لایەنی کەم یەك ملوێن، یا رەنگە زۆر زێتریش لەو باژێرانە بژین. پێدەچێت قەبلاندنی ژمارەی کورد بۆ ساڵی ١٩٧٥ لەتورکیادا بە ٧,٥ ملوێن، نەك هەر زێدەڕەوی نەبێت، بەڵکە کەمیش گوترابێت. کوردەکان دەڵێن گەلەك کەس لەسەرژمێرە گشتییەکاندا

* ـ مەبەست نووسینەکانی بەڕێز (دوکتۆر عیسمەت شەریف ڤانلی) یە.

هەڵـدەبوێردرێن، بـەپێی شـێوازی سـەرژمێرییەکان، ڕێتێدەچـێت ڕاسـتبێت[3].
لەسەرژمێرییە نوێکەی ١٩٨٥ەوە دەردەکەوێت، لەگەڵ ئـەو کۆچو ڕەوە بەردەوامـەدا بـەرەو خۆرئـاوا، هێـشتا زێـدەبوونی ژمـارەی دانیـشتوانی ویلایەتـەکانی خۆرهـەڵات، گەلەك باڵاترو خێراتـرە لەدانیـشتوانی سـەرجەم ویلایەتـەکانی دی. ڕێـژەی صـەدیی ژمارەی کورد لەئاست گشت ژمارەی دانیشتواندا، لەهەڵکشانی بەردەوامدایە.

## ١ـ ٣ـ ٢ـ عیراق

هیچ سەرژمێرێکی نوێی ئەوتۆ شك نابەم کە پشتی پێبەسترێت. لەسەرژمێرەکانی سـاڵانی ١٩٢٢ تـا ١٩٢٤و ١٩٣٥یـشدا، ئـەودەمی کـە پێدەچـێت ژمـارەی کـورد هێـشتا بـێ دەستێوەردان ئاشکراکرابێت، ڕێژەیان دەگاتە ٢٣٪ی سەرجەمی دانیشتووانی عیراق[4].
ئـەو ڕێژەیـە، لـەئاکامی ئـەو هـەموو سـاڵانەی جـەنگی کوردسـتانی عیراقـداو پـاش ڕاگـوێزانو تـووڕدانی گەلـەك لـەو کوردانـەی لەتۆرەمـەی ئێرانیـی کەوتوونـەوە، بـۆ ئێران، ڕەنگە کەمێك لەکزیی دابێت.

ساڵی ١٩٧٥ سەرجەمی ژمارەی دانیشتوانی عـیراق، خـۆی لـە ١١ ملوێنێـك دەدا. ئـەز ژمـارەی کـورد لایـەنی کـەم بـە ٢ تـا ٢,٥ ملوێنێـك دەقـەبڵێنم. فـانلی، کـە پـشت بـە سەرژمێرە ڕەسمیە نوێکانو زانیاریی دەمیی دەبەستێتو ژمارە کەمەنەتەوەییـەکانی کوردسـتان بەکـەمو کـوردی جێگـەکانی دی بـە زێـتر دەقرسـێنێت، ژمـارەی کـورد دەگەیەنێتە ٣,١ ملوێن، من بۆخۆم بە زێدەڕەویی تێدەگەم[5].

**قرساندنی سەرجەم دانیشتووان بۆ سالی ١٩٧٥:**

| وڵات بەملوێن | ژمارەی دانیشتوان بەملوێن | کورد | لەسەدا |
|---|---|---|---|
| تورکیا | ٤٠,٢ | ٧,٥ | ١٩ |
| عیراق | ١٠,٥ | ٢ تا ٢,٥ | ٢٣ |
| ئێران | ٣٤ | ٣,٥ | ١٠ |
| سوریا | ٧,٣ | ٠,٦ | ٨,٥ |
| یەکێتی سۆڤیەت | | ٠,١ | |
| تێکڕا | | ١٣,٧ تا ١٤,٢ | |

**١ـ ٢ـ ٣ـ ئێران**

لەسەرژمێرەکانی ١٩٥٦ و ١٩٦٦دا، کورد بەجوادا نەژمێردراون، وەلێ وەك موسڵمانی سوننی، بە ١٠٪ی دانیشتووان دانراون[٦]. لەمەوە دیارە کە کورد بڕێك لە ١٠٪ی دانیشتووانی پتر پێکدەهێنێت. لەپاڵ کورد دا، تەنها ژمارەیەکی کەم تورکمان‌و هەندەك کەمەنەتەوەیی گچکەی دیکەی خۆرهەلاتی ئێران، سوننین. بەلام ژمارەیەکی فرە لەکوردەکانی ئوستانی کرماشان‌و خۆراسان شیعەن.

قرساندنی ژمارەی کورد بە ٣,٥ ملوێن لەلایەن سالنامەی نیوە رەسمیی ئێرانەوە(٧) لەسەرەتای حەفتاکاندا، یاخود گەر رێژەی زێدبوونی دانیشتووان حسێب بکەین، پێدەچێت لایەنی کەم ٣,٥ ملوێن بۆ سالی ١٩٧٥، جێگەی باوەڕبێت. رەنگە ژمارەی راستەقینەیان لەوەش زێتر بێت. ڤانلی کەمەك زێدەی پێوەدەنێت‌و بۆ سالی ١٩٦٥ بە ٤,٥ ملوێنی دەخەملێنێت، کە بۆ ١٩٧٥ دەگاتە ٥,٨ ملوێن.

### ١ـ ٣ـ ٤ـ سوریا

لێرەش ژمارەکان جوداوازن، وەلێ زۆربەیان بە دەوروبەری ٨٪ی دانیشتووانی دەخەملێنن، یانی بۆ ١٩٧٥ دەکاتە ٦٠٠ هەزار کەسێك[٨].

### ١ـ ٣ـ ٥ـ یەکێتی سۆڤیەت

بەحسێبی رەسمیی نێزیکەی ١٠٠ هەزار کوردێکی لێهەن.

١. ٤. باری ئابووری

١. ٤. ١. بەرهەمی وەرزێری، نیوە کۆچەر (Transhumanz)،

ئابووری شوانکارەیی رەوەندەکان

بەپێچەوانەی ئەو باوەڕەوە کە لای گەلەك کەس سەپاوە، کوردەکان ژمارەیەکی هێجگار کەمیان کۆچەرن. بەشی هەرەزۆریان خەریکی وەرزێرین، لەپاڵیشیدا چەند سەرێك ئاژەڵ رادەگرن. شیناوەردیان زێتر گەنم‌و جۆو نیسکە (ئەمانە بەرهەمی سەرەکین)، تەماتەو شووتی‌و کاڵەك‌و خەیارو پیازیش دەچێنن، سەوزەو میوەهاتیان لەنێوچەیەکەوە بۆ نێوچەیەك دەگۆڕڕێن. لەنێوچە شاخاوییەکان بەدەگمەن لەپێویستیی خۆ زێتر بە بەرهەم دێت، لەپێدەشتەکان دانەوێڵەیەکی زۆر دەکەن. دەشتاییەکانی کوردستانی عیراق‌و سوریا، عەمباری دانەوێڵەی ئەو وڵاتەن، گرنگترین بەرهەمی پووڵ پەیداکردن، توتن‌و پەموون. (توتن بە زۆری لەخۆرهەڵاتی دیاربەکرو باکووری عیراق دەچێندرێت)، پەموو تازە لەم دواییانەدا لەهەندەك شوێنی کوردستانی تورکیا دەست بەچاندنی کراوە).

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بێژین جوتکارانی نێوچە شاخاوییەکان خۆیان خاوەنی ئەو زەویەن کە دەیچێنن، بەڵام لەپێدەشتەکان زەوی ملکی کەسێکی دیکەیە، زۆرجار خاوەن ملك شارنشینەو لەزەویەکەیەوە دوورە. جوتکاری پێدەشتەکان تا ئەم ساڵانەی دواییش (تا ساڵانی پەنجاو شێستەکان). زەویەکانیان بەئیجار لەخاوەنملك دەگرت، یانی لەسەر ئەرك‌و بەرپرسیارێتی خۆیان زەویەکەیان دادەچاندو پشکێکی دیاریکراوی بەروبوومەکەی، لەنێوان ١٠٪و ٨٠٪ی بۆ خاوەنملك

بوو. هەندێکی دیکەیان لەژێر چاوەدێری خاوەنملك خۆیدا، یاخود دەمڕاستێکیدا، بەمووچەیەکی کەم بەکرێ کاریندەکرد.

لەگەڵ پەیدابوونو بەگەڕخستنی مەکینەو تراکتۆردا لەساڵەکانی پەنجاوە ئیدی هێدی هێدی دیاردەی ئیجاری ملکیش کەم بووەوە. بەو جۆرە، ووردە ئیجارکەران بوونە کرێکارێك، کە تەنها بەشێکی ساڵ کاریان چنگدەکەوت. بەمە دیاردەی کاری وەرزیو کرێکاری گەڕۆك پەیدا بوون.

هەندەك هۆکاری دی لەنێوچە شاخاوییەکان هەمان کاریگەرییان هەیە، زەوی لەوێ کەمەو لەحاڵەتی میراتیدا چونکە بەپێی شەریعەتی ئیسلام بەهاوسانیی لەنێوان کوڕەمیراتگرەکاندا دابەشدەکرێت، مولکەکان هێند بچووك دەبنەوە کە بژێوی خێزانێکیان پێهەڵناسووڕێت.

شێوانی نرخو بازاڕیش، چ بەئاڵو وێڵ بێت، یاخود بەکڕینو فرۆشتن، هێجگاری حاڵی جوتێرانی شپرێو کردووە، تا دێت دەبێت بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی وەکی (جلكو بەرگو ئامێر) یاخود تفاقی وەکی (تفەنگو رادوێ)، پووڵی زێتر بخەنە سەر دەسکەوتیان.

کەمکارییو دەستەنگیی، زۆر خێزان ناچار دەکەن چەند کەسێکیان بۆ وەرزێك یا بە هەمیشەیی بۆ ئەو شوێنانە بنێرن کە وەرزێریی زێتر لێیە، یاخود بۆ جەرگەی شوێنە پیشەسازییە گەشەکردووەکان، یانی بۆ دەرەوەی کوردستان.

هیوای باشتربوونی باری ئابووریی نێوچە شاخاوییەکان، زۆر کزە. زۆربەی بەروبوومەکان هەر لەبازاڕە مەڵبەندییەکاندا ساخدەکرێتەوە.

خراپیی رێگەوبان دەبێتە هۆی گرانیی کرێی گواستنەوە، بەرادەیەك کە ئەو بەرووبوومانە کەڵکی پێشبڕکێی نرخیان پێوەنامێنێت. خۆ داو و دەزگەی رەعەمەلهێنانی بەروبوومیش لەو نێوچانەدا نیین. رەنگە تووتن لەم حاڵە بەدەربێت. خاكو ئاووهەواکە زۆر لەبارەو تووتنی کوردییش زۆر پەسەندە. بەڵام تووتن لەو وڵاتانەدا مۆنۆپۆلی دەوڵەتەو لەکەم شوێن رێگەی چاندنی دەدرێت.

لەنێوچە شاخاوییەکان تا ئێستاش زەوی بەنیرو ئاموور دەکێڵن، کە گایەك یاخود قاترێك رایدەکێشێت، دروێنەی بەداس و مەڵەغان دەکەن. بەڵام لەتەختانی و پێدەشتەکاندا زێتر تراکتۆرو کەمباین لەگەڕدان و خستنەگەڕیان بەرووبوومیان چەندقات زیادکردووە. زۆربەی وردەمالیك و خاوەنملکە مامناوەنجییەکان تراکتۆرو کەمباینیان پێهەڵناسوورێت. بۆ خاوەنملکە گەورەکان کڕینی ئاسانە. دیاردەیەکی زەق ئەوەیە کە دەوڵەمەندە شارییەکان مەکینە دەکڕن و بەخاوەنملکەکانی بەکرێدەدەن، ٨٪ تا ١٠٪ی دەسکەوتیان لێدەستێنن. گەلەکجار ئەو دەوڵەمەندانە سوو و سەلەمیش دەکەن و بەرامبەر ئەوپووڵەی بەقەرز دەیدەنە خاوەنملك، زەویەکەی لێ ئیجاردەکەن و تاگێڕانەوەی قەرزەکە، نیوەی بەروبووم بۆخۆیان دەبەن. بەو شێوەیە کۆنە ئیجارکەرە گچکەکان سەردەمیان بەسەرچووەو کەمتر کاریان چنگدەکەوێت.

ئاژەڵیان (زێتر مەڕو بزن و جارجارەش مانگا)ن، یا مندالانیان دەیانلەوەڕێنن، یاخود شوانی بۆ رادەگرن. لادێیە نیشتەجێکان رانی گچکەیان هەیە، چونکە لەوەڕگەیان بۆ مێگەلی گەورە نییە.

بەڵام گوند هەن کە ئابوورییەکی تۆکمەو فرەچەشنیان هەیە، رانیان گەورەترەو بەهاران تەواوی گوند (یاخود پشکی زۆری) بەمەڕو ماڵاتەوە روو لەبەرزایی و لەوەڕگەی کێوەکان دەکەن و دەچنە ئێلاخ دەوارو رەشماڵی لێهەڵدەدەن. دووریی ئەو لەوەڕگانە لەگوندەوە لەنێوان چەند سائێك و چەند رۆژێکدان. کە کارو فەرمانی نێوکێڵگە دەستپێدەکاتەوە، پیاوان دەچنەوە بۆ گوندو هەر دەستیان بەتاڵبوو، دەگەڕێنەوە زۆران بۆ لای خاو و خێزان. ئەم دیاردەی نیوەکۆچەرییە لەسەرچاوە ئێتنۆگرافییەکاندا بە (Transhumanz) نێودەبرێت.

لەم کتێبەدا هەرکات باس لەنیوە کۆچەردەکەم، مەبەستم ئەو کەسانەیە کە دیاردەی (Transhumanz) دەیانگرێتەوە[٩]. ئەو گوندانەی ئەم بارە ئابوورییە بەسەریاندا زاڵە، زێتر دەکەونە نێوچە شاخاوییە نزمەکانەوە، یاخود دەکەونە داوێنی کێوەکانەوە (نەك دەشتاییەکان). هاوینی ئەو شوێنانە هێجگار گەرمە،

خەڵکەکەی دەڵێن تەنها لەبەر ئاژەڵەکانیان روو لەزەنویرو نواڵەکان ناکەن، (کە بە زاراوی سەروو زۆرانو بە زاراوی خواروو کوێستانی پێدەڵێن)، بەڵکە لەبەر فێنکیو پاکژیی هەواکەشێتی. هەتا ئەو لادێییانەی مەڕو ماڵاتیشیان نییە، پێکڕا رەگەڵ ئاژەڵدارەکان دەچنە زۆرانێ. ساڵانی زوو، خەڵکی شارەکانی وەکی ئامێدو جزیریش لەمانگە گەرمەکانی هاویندا دەچوونە شوێنە بەرزەکانو لەوێ یا دەواریان هەڵدەدا، یاخود کەپریان دەکرد.

خێڵی کۆچەری تەواو، زۆر کەمن. گەلەك لەخێڵە کۆنە کۆچەرەکان یا بەخواستی خۆیان، یاخود بە زۆری دەوڵەت نیشتەجێبوون[١٠]. خەڵکێکی زۆریش لەخێڵە هێشتا کۆچەرەکان، نیشتەنی بوون. لەعیراق هەندەك لەهەرکییەکان تا ئێستاش هەر کۆچەرن، (لەوەرگەی زستانەیان دەشتی هەولێرە)*، لەئێران قەڵخانییەکانو بەشێك لەهەندەك تیرەی هەمان نێوچەن (خۆرئاوای کرماشان، نێزیکی تخووبی عیراق). لەتورکیا چەند خێڵێکی کۆچەر هەن، یەکێك بەوانە گەرمەسێری لەنێوچەی جزیرەیە، یەکێکی دی لەئورفە - فیرانشەهرە. سەردەسێریان لەتۆرۆسی کورد (باشووری گولی ڤان)و نێوچەی شاخاوییەکانی باکووری خۆرهەلاتی دیاربەکرە[١١].

کۆچەرێتی ئەم خێلانە مەودایەکی هەیە، تەواوی زستانەکە لەشوێنێك دەیگوزەرێننو کە بەهار داهات، ئەوجا دەچنە زۆرانێ. وا پێدەچێت زۆربەی خێڵەکان تەنها دوو، یاخود ئەوپەڕی سێ لەوەرگەیان لەو کێوانە هەبێت کە یەك بەدووی یەکدا سوودیان لێوەردەگرن. ئەو رەوەندانەی من چوومە سەردانیان، دوو جۆری جوداواز خێوەتیان هەبوو: خێوەتێکی قورسی، گەرمی قەبەی، دلگیر، بۆ هەواری زستانە (کە سەرتاسەری ساڵ لەوێ هەڵدەدرێت)، چاتۆڵێکی سووکەڵە بۆ کۆچو رەو. هەردووکیان لەهەمانجۆری ئەو رەشماڵانەن کە لەگشت خۆرهەلاتی نێوەندا دەدیترێن، هەڵبەتە بە کەمەکێك جوداوازیەوە[١٢]. هەندەك لەرەوەندەکان لەجەرگەی، یاخود لەنێزدیکی هەواری زستانەیان، خانوویان قوتکردۆتەوە. بەو جۆرە جوداوازییەکی ئەوتۆ لەنێوان کۆچەرو نیوەکۆچەردا نەماوە. بەلام دەبێت

---

* . لەوەرگەی زستانەی هەرکییەکان، دەشتی موسڵە نەك دەشتی هەولێر.

ئـەوەش بڵـێین، کـە بەشـێوەیەکی گـشتی گـەر رەوەنـدەکان ناچـارنەکرێن، قـەت دەستنادەنە کشتوکاڵ. ئەو خێڵەی من لەکنی بووم، خێڵی تەییان، لەنێزیکی هـەواری زسـتانەی، کێڵگـەو شـیناوەردی چـاکی هـەبوو، بـەڵام خۆیـان دایاننەدەچـاند، بەڵکـە بەئیجار دەیاندایە جوتێرانی بێگانە بە هۆزەکە. رەوەندەکان لەنیوەکۆچەرەکان زێتر لەهـــەواری خۆیـــان دووردەکەونـــەوەو رانـــی گـــەورەتریان هەیـــە. پێدەچـــێت نیوەکۆچـەرەکان بـەهۆی کـەمی لەوەڕگەیانـەوە، نـەتوانن رانـی گـەورەتر راگـرن. لەلایەکی دییەوە، باری ئـابووری کۆچـەرایەتی وادەخوازێت ژمارەیـەکی تـەواو ئـاژەڵ راگیرێت (نێزیکەی ٨٠ تا ٢٠٠ سەرمەڕێك، ئیدی بەپێی بارو دۆخەکە).

رەوەنـــدەکان پێوەنـــدیی بازرگـــانیی بـــەردەوامیان لەگـــەڵ کاســـبکارە شـــاریو لادێییەکانـــدا هەیـــە. لەکۆنـــدا لەڕێگـــەی چـــەتەیی‌و رێگـــری‌و تـــاڵان‌و بـــڕۆوە پێویـستییەکانی خۆیـان دابینـدەکرد. ئێـستەکە پـەنیرێك، کەرەیـەك لـەبازاڕی ئـەو مەڵبەندانـەدا دەفرۆشـن، کـە کڕیـارێکی ئـەوتۆیان نییـەو نرخیـشیان زۆر هەرزانـە. پـوولی پێویـستیان لـەو خـوری‌و دابەسـتانە دەسـتدەکەوێت، کـە بـە جامبازەکانیـان دەفرۆشن، ئەوانیش لەچاو نرخی شارە گەورەکاندا، چشتێکی ئەوتۆ نیین.

### ١ـ ٤ـ باری ئابووری

### ١ـ ٤ـ ١ـ بەرهەمی وەرزێری، نیوەکۆچەر ( Transhumanz )

### ئابووری شوانکارەیی رەوەندەکان

بەپێچەوانەی ئەو باوەڕەوە کە لای گەلەك کەس سەپاوە، کوردەکان ژمارەیەکی هێجگار کەمیان کۆچەرن. بەشی هەرەزۆریان خەریکی وەرزێرین، لەپاڵیشیدا چەند سەرێك ئاژەڵ رادەگرن. شیناوەردیان زێتر گەنمو جۆو نیسکە (ئەمانە بەرهەمی سەرەکین)، تەماتەو شووتیو کاڵەكو خەیارو پیازیش دەچێنن، سەوزەو میوەهاتیان لەنێوچەیەکەوە بۆ نێوچەیەك دەگۆڕرێن. لەنێوچە شاخاویەکان بەدەگمەن لەپێویستیی خۆ زێتر بەبەرهەم دێت، لەپێدەشتەکان دانەوێڵەیەکی زۆر دەکەن. دەشتاییەکانی کوردستانی عیراقو سوریا، عەمباری دانەوێڵەی ئەو دوو وڵاتەن. گرنگترین بەرهەمی پووڵ پەیداکردن، تووتنو پەموون. (تووتن بەزۆری لەخۆرهەڵاتی دیاربەکرو باکووری عیراق دەچێندرێت)، (پەموو تازە لەم دواییانەدا لەهەندەك شوێنی کوردستانی تورکیا دەست بەچاندنی کراوە).

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بێژین جوتکارانی نێوچە شاخاوییەکان خۆیان خاوەن ئەو زەویەن کە دەیچێنن، بەڵام لەپێدەشتەکان زەوی ملکی کەسێکی دیکەیە، زۆرجار خاوەنملك شارنشینەو لەزەویەکەیەوە دوورە. جوتکاری پێدەشتەکان تا ئەم ساڵانەی دواییش (تا ساڵانی پەنجاو شێستەکان) زەویەکانیان بە ئیجار لەخاوەنملك دەگرت، یانی لەسەر ئەرکو بەرپرسیارێتی خۆیان زەویەکەیان دادەچاندو پشکێکی دیاریکراوی بەروبوومەکەی، لەنێو ١٠٪و ٨٠٪ ی بۆ خاوەنملك بوو. هەندێکی دیکەیان لەژێر چاوەدێری خاوەنملك خۆیدا، یاخود دەمراستێکیدا، بەمووچەیەکی کەم بەکرێ کاریاندەکرد.

لەگەل پەیدابوونو بەگەڕخستنی مەکینەو تراکتۆردا لەساڵەکانی پەنجاوە، ئیدی هێد هێدی دیاردەی ئیجاری ملکیش کەم بووەوە، بەو جۆرە، وردە ئیجارکەران بوونە کرێکارێك، کە تەنها بەشێکی ساڵ کاریان چنگدەکەوت. بەمە دیاردەی کاری وەرزیو کرێکاری گەڕۆك پەیدا بوون.

هەنـدەك هۆكـاری دی لەنێوچـە شـاخاوییەكان هـەمان كاریگـەرییان هەیـە. زەوی لـەوێ كەمـەو لەحاڵـەتی میراتیـدا چونكە بـەپێی شـەریعەتی ئیـسلام بـە هاوسـانیی لـەنێوان كوڕەمیراتگرەكانـدا دابەشـدەكرێت، موڵكـەكان هێنـد بـچووك دەبنـەوە، كـە بژێوی خێزانێكیان پێهەڵناسوورێت. شێوانی نـرخو بـازاڕیش، چ بـە ئـاڵو وێـڵ بێـت، یاخود بەكڕینو فرۆشتن، هێجگاری حاڵی جوتێرانی شپرێو كردووە، تا دێـت دەبێـت بۆ دابینكردنـی پێویـستییەكانی وەكـی (جلكو بـەرگو ئـامێر) یـاخود تفاقی وەكـی (تفەنگو رادوێ)، پووڵی زێتر بخەنە سەر دەسكەوتیان.

كەمكارییو دەستەنگیی زۆر خێزان ناچاردەكەن چەند كەسێكیان بـۆ وەرزێـك یـا بە هەمیشەیی بۆ ئەو شوێنانە بنێرن، كە وەرزێریی زێتری لێیە، یاخود بۆ جەرگەی شوێنە پیشەسازییە گەشەكردووەكان، یانی بۆ دەرەوەی كوردستان.

هیـوای باشـتربوونی بـاری ئـابووریی نێوچـە شـاخاوییەكان زۆر كـزە. زۆربـەی بەروبوومـەكان هـەر لـەبازاڕە مەڵبەندییەكانـدا سـاخدەكرێنەوە. خراپیـی رێگـەوبان دەبێتـە هـۆی گرانیـی كرێـی گواسـتنەوە، بەڕادەیـەك كـە ئـەو بەروبوومانـە كـەڵكی پێـشبڕكێی نرخیـان پیوەنامێنێت. خـۆ داوو دەزگـەی رەعەمـەلهێنانی بـەروبوومیش لەو نێوچانەدا نیین.

رەنگـە تـووتن لـەم حاڵـە بـەدەربێت. خـاكو ئاووهەواكـە زۆر لـەبارەو تـووتنی كوردیش زۆر پەسەندە. بەڵام تووتن لەو وڵاتانەدا مۆنۆپۆلی دەوڵەتـەو لەكـەم شـوێن رێگەی چاندنی دەدرێت.

لەنێوچە شاخاوییەكان تا ئێستاش زەوی بەنێرو ئاموور دەكێڵن، كە گایەك یـاخود قاترێـك رایدەكێـشێت، دروێنـەش بـە داسو مەڵـەغان دەكـەن. بـەڵام لەتـەختانیو پێدەشـتەكاندا زێـتر تراكتـۆرو كـەمباین لەگـەڕدانو خـستنەگەڕیان بـەرووبوومیان چەندقات زیادكردووە. زۆربەی وردەمالیـكو خاوەنمڵكە مامناوەنجییـەكان تراكتـۆرو كەمباتیان پێهەڵناسورێت. بۆ خاوەنمڵكە گەورەكان كڕینـی ئاسـانە. دیاردەیـەكی زەق ئەوەیە كە دەوڵەمەندە شارییەكان مەكینە دەكڕنو بەخاوەنمڵكەكانی بەكرێـدەدەن، ٨٪ تا ١٠٪ ی دەسكەوتیان لێدەستێنن. گەلەكجار ئەو دەوڵەمەندانە سوو و سەلەمیش

دەکـەن‌و بەرامبــەر ئەوپوولــەی بەقــەرز دەیدەنــە خاوەنملــك، زەویەکـەی لــێ ئیجاردەکـەن‌و تـا گێڕانـەوەی قەرزەکـە، نیـوەی بـەروبووم بـۆ خۆیـان دەبـەن. بـەو شـێوەیە کۆنـە ئیجارکـەرە گـچکەکان سـەردەمیان بەسەرچـووەو کـەمتر کاریـان چنگدەکەوێت.

ئاژەڵیـان (زێـتر مـەڕو بـزن‌و جارجـارەش مانگـا)ن، یـا منـداڵانیان دەیانلەوەڕێنن، یـاخود شـوانی بـۆ رادەگـرن. لادێیـە نیـشتەجێکان رانـی گـچکەیان هەیـە، چـونکە لەوەڕگـەیان بـۆ مێگـەلی گـەورە نییـە، بـەڵام گونـد هـەن کـە ئابووریيـەکی تۆکمـەو فرەچەشنیان هەیە، رانیان گەورەترەو بـەهاران تـەواوی گونـد (یـاخود پـشکی زۆری) بـە مـەڕو ماڵاتـەوە روو لەبـەرزاییی‌و لەوەڕگـەی کێوەکـان دەکـەن‌و دەچـنە ئـێلاخ‌و دەوارو رەشمـاڵی لێهەڵـدەدەن. دووریـی ئـەو لەوەڕگانـە لەگونـدەوە لـەنێوان چـەند سـاتێك‌و چـەند رۆژێکـدان، کـە کـارو فـەرمانی نێوکێڵگـە دەسـتپێدەکاتەوە، پیـاوان دەچنەوە بۆ گوندو هەر دەستیان بەتاڵبوو، دەگەڕێنەوە زۆزان بۆ لای خاو و خێزان. ئـەم دیـاردەی نێوکۆچـەرییە لەسەرچـاوە ئێتنۆگرافییەکانـدا بـە (Transhumanz) نێودەبرێت.

لەم کتێبەدا هەر کـات بـاس لـەنیوە کۆچەردەکەم ، مەبەسـتم ئـەو کەسـانەیە کـە دیـاردەی (Transhumanz) دەیانگرێتـەوە(٩). ئـەو گوندانـەی ئـەم بـارە ئابووریيـە بەسـەریاندا زاڵـە، زێـتر دەکەونـە نێوشـە شـاخاوییە نزمەکانـەوە، یـاخود دەکەونـە داوێنــی کێوەکانــەوە (نــەك دەشـتاییەکان). هـاوینی ئـەو شـوێنانە هێجگـار گەرمـە، خەڵکەکەی دەڵێن تەنها لەبەر ئاژەڵەکانیان روو لـەزەنوێر نواڵەکان ناکەن، (کـە بـە زاراوی سەروو زۆران‌و بەزاراوی خـواروو کوێـستانی پێـدەڵێن)، بەڵکەلەبـەر فێنکـی‌و پاکژیی هەواکەشێتی. هـەتا ئـەو لادێییانـەی مـەڕو ماڵاتیـشیان نییـە، پێکـڕا رەگـەڵ ئاژەڵدارەکانی دەچنە زۆرانێ. ساڵانی زوو، خەڵکی شارەکانی وەکی ئامێدو جزیـریش لەمانگە گەرمەکانی هاویندا دەچوونە شوێنە بەرزەکان‌و لەوێ یا دەواریـان هەڵـدەدا، یاخود کەپریان دەکرد.

خێڵی کۆچەری تەواو، زۆر کەمن. گەلەك لەخێڵە کۆنە کۆچەرەکان یا بەخواستی خۆیان، یاخود بە زۆری دەوڵەت نیشتەجێبوون(١٠). خەڵکێکی زۆریش لەخێڵە هێشتا کۆچەرەکان، نیشتەنی بوون. لەعیراق هەندەك لەهەرکییەکان تا ئێستاش هەر کۆچەرن، (لەوەرگەی زستانەیان دەشتی هەولێرە)*، لەئێران قەڵخانییەکانو بەشێك لەهەندەك تیرەی هەمان نێوچەن (خۆرئاوای کرماشان، نێزیکی تخووبی عیراق). لەتورکیا چەند خێڵێکی کۆچەر هەن، یەکێك لەوانە گەرمەسێری لەنێوچەی جزیرەدیە، یەکێکی دی لەئۆرفە - ڤیرانشەهرە. سەردەسێریان لەتۆرۆسی کورد (باشووری گۆلی ڤان)و نێوچە شاخاوییەکانی باکووری خۆرهەڵاتی دیاربەکرە(١١).

کۆچەرێتی ئەم خێڵانە مەودایەکی هەیە، تەواوی زستانەکە لەشوێنێك دەیگوزەرێننو کە بەهار داهات، ئەوجا دەچنە زۆزانێ. واپێدەچێت زۆربەی خێڵەکان تەنها دوو، یاخود ئەوپەڕی سێ لەوەرگەیان لەو کێوانە هەبێت، کە یەك بە دووی یەکدا سوودیان لێوەردەگرن. ئەو رەوەندانەی من چوومە سەردانیان، دوو جۆری جوداواز خێوەتیان هەبوو: خێوەتێکی قورسی، گەرمی قەبەی، دلگیر، بۆ هەواری زستانە (کە سەرتاسەری ساڵ لەوێ هەڵدەدرێت)، چاتۆڵێکی سووکەڵە بۆ کۆچو ڕەو. هەردووکیان لەهەمانجۆری ئەو رەشماڵانەن، کە لەگشت خۆرهەڵاتی نێوەنددا دەدیترێن، هەڵبەت بە کەمەکێك جوداوازییەوە(١٢). هەندەك لەرەوەندەکانی لەجەرگەی، یاخود لەنێزدیکی هەواری زستانەیان، خانوویان قوتکردۆتەوە. بەوجۆرە جوداوازییەکی ئەوتۆ لەنێوان کۆچەرو نیوەکۆچەر دانەماوە. بەڵام دەبێت ئەوەش بڵێین، کە بەشێوەیەکی گشتی گەر رەوەندەکان ناچارنەکرێن، قەت دەست نادەنە کشتوکاڵ. ئەو خێڵەی من لەکنی بووم، خێڵی تەییان، لەنێزیکی هەواری زستانەی، کێڵگەو شیناوەردی چاکی هەبوو، بەڵام خۆیان دایاننەدەچاند، بەڵکە بە ئیجار دەیاندایە جوتێرانی بێگانە بە هۆزەکە. رەوەندەکان لەنیوکۆچەرەکان زێتر لەهەواری خۆیان دووردەکەونەوەو رانی گەورەتریان هەیە. پێدەچێت نیوەکۆچەرەکان بەهۆی کەمی لەوەڕگەیانەوە، نەتوانن رانی گەورەتر

---

* لەوەرگەی زستانەی هەرکییەکان، دەشتی موسڵە نەك دەشتی هەولێر.

راگرن. لەلایەکی دیکەوە، باری ئابووری کۆچەرایەتی وا دەخوازێت ژمارەیەکی تەواو ئاژەڵ راگیرێت (نێزیکەی ٨٠ تا ٢٠٠ سەرمەرێك، ئیدی بەپێی بارودۆخەکە).

رەوەنـــدەکان پێوەنـــدیی بازرگـــانیی بـــەردەوامیان لەگـــەڵ کاســـبکارە شـــاریو لادێییەکانـــدا هەیـــە. لەکۆنـــدا لەرێگـــەی چـــەتەییو رێگـــریو تـــاڵانو بـــڕۆوە پێویـستییەکانی خۆیـان دابینـدەکرد. ئێـستەکە پـەنیرێك کەرەیـەك لـەبازاڕی ئـەو مەڵبەندانـەدا دەفرۆشـن، کـە کڕیـارێکی ئـەوتۆیان نییـەو نرخیـشیان زۆر هەرزانـە. پـووڵی پێویـستیان لـەو خـوریو دابەسـتانە دەسـتدەکەوێت، کـە بـەجامبازەکانیان دەفرۆشن، ئەوانیش لەچاو نرخی شارەگەورەکاندا چشتێکی ئەوتۆنیین.

### ١ـ ٥ـ چالاکییە ئابوورییەکانی دی

### ١ـ ٥ـ ١ـ پیشە دەستییەکان، کارو فەرمان و بازرگانی

### ـ گەشەکردوو و گەشەنەکردوو ـ

هەتا لەسەرەتاییترین بارودۆخیشدا، مرۆڤ هەموو ئەو جۆرە کەرەسانە بەکاردەهێنێت کە خۆی توانستی دروستکردنیانی نییە: وەکی جلوبەرگ، خانوو بەرە، ئامێرەکانی کشتوکاڵ، کەرەسەکانی چێشتلێنان، کەلو پەلە زێدەکان... هتد. تا سەرەتای ئەم سەدەیەش، گوندەکانی کوردستان کەلو پەل و کەرەسەی خۆماڵییان بەکاردەهێنا. ئەو کەلو پەل و کەرەسانە یا هەرماڵە بۆخۆیی دروستدەکرد، یاخود لای وەستا دەستڕەنگینەکانی گوند (یاخود گوندەکانی هاوسێ) بەدروستکردنیاندەدان. زۆربەی ئەو پیشە تایبەتانە کاری کەمینە فەلەو جووەکانی کوردستان بوون. لەگەڵ ئەوەشدا گوندەکان نەیاندەتوانی لەگشت رووبەکەوە تەنها پشت بە بەرهەمە خۆماڵییەکان ببەستن، هەمیشە رایەڵی پێوەندییەکی بازرگانیی لەنێوان ئەو گوندانەو بازێڕەکانی کوردستان و لەرێگەی ئەوانیشەوە لەگەڵ سیستێمی بازرگانیی جیهاندا بەرقەرار بووە.

دیاربەکر، بەتلیس، ڤان هەولێر موسڵ، سنەو گەلەك شاری گچکە، چەقی پیشەدەستییەکان و بازرگانیی بوون. لەڕاستییدا کورد لەگشت ئەو بازێڕانەدا زۆربەی دانیشتوانیان پێکنەدەهێنا. ئەو بازێڕانە هەر چەقی ئەو جموجۆڵە ئابوورییانە نەبوون، بەڵکە مەڵبەندی حکومەت و دەزگا دەوڵەتییەکانی وەکی پارێزگاو پۆلیس و سوپاو بنکەی قوتابخانە ئایینییەکانیش بوون.

دیارترین پیشەدەستییەکانی شار، چەخماخسازیی و زێڕەنگەریی و دەباخچێتی بوون. هەتا سەرەتای ئەم سەدەیەش پێوەندییەکی ئەوتۆ لەنێوان شار و گوندەکاندا نەبوو، زۆربەی ئامێرەکان خۆکردبوون.

دوو هۆکار بوونە هۆی لەنێوچوونی پیشەدەستییەکان ئالەم سەدەیەدا، یەکەمیان، نەمان و لەنێوچوونی گەلەك (گەر نەڵێین زۆربەی) وەستا کارامە دەستڕەنگینەکان.

وەك پێشان گوتمان زۆربەی ئەو پیشانە بەدەست کەمینە فەلەو جووەکانەوە بوون. یەکەم جەنگی جیهانی، دەرپەڕاندنی بە کۆمەڵو رەشەکوژیی ئەرمەنییەکانو رەدوونانو راگوێزانی دیانەکانی دیکەی کوردستانی بەدەمەوە بوو. ئەورۆ لەکوردستانی تورکیادا ژمارەیەکی هێجگارکەم فەلە ماون. زۆربەی جووەکانی کوردستان، یەکەوڕاست پاش دامەزراندنی ئیسرائیل، روویان لەو وڵاتە کرد. ژمارەیەکی کەم کورد هەبوون کە زانیاریی پێویستو تواناو بەهرەی ئەوەیان هەبێت، جێگەی چۆڵی ئەو وەستا کارامانە بگرنەوە.

ئەو خورییە جوانڕێسراوەی لەنێوەندی کوردستاندا جلکی میللی کوردیی، (شاڵو شەپك)ی لێدروست دەکرێت، گشت لەگشتی دەستکردی ئەو کەمە ئەرمەنییانەن، کە هێشتا لەوێ ماونەوە. کەمینە دیانەکان، شارەزایی تەواو تەواویان لەباخەوانیدا هەبوو. ئەو کوردانەی گوندەکانیان گرتنەدەست، زۆرجار تواناو لێهاتوویی ئەوەیان نەبوو ئەو کێڵگە سەکۆئاسایانەی لەو کێوانە ئەوان دروستیانکردوونو ئەو سێستێمی ئاودێرییە عەنتیکەیەی بۆیان جێهێشتوون، سوودی لێوەرگرنو پارێزگاریی بکەن. ئەمە تێبینی زۆر گەڕیدەبووە، بەتایبەت لەکوردستانی نێوەندا.

هۆکاری دووهەم، ئەو تەنە چێتر تەنراوەی ئامرازەکانی هاتوچۆیە لەسەر ئاستێکی نێودەوڵەتی. هەر لەساڵەکانی سی سەدەی نۆزدەهەمەدا، گەمێی هەڵم لەزەریای رەشدا خرایەگەڕو بازاڕەکانی ئەنەدۆل لەبەرهەمی هەرزانی ئەوروپا جمەیان دەهات.

لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەدا، شیرکەتە ئاڵەمانییەکان خەتی شەمەندەفەری بەغدایان راکێشا، کە هاتوچۆو هێنانو بردنیان بۆ خۆرئاوای کوردستان ئاسانکرد (لەسەرەتای سەدەی بیستەمەدا خەتی شەمەندەفەری گەیشتێ). بەرهەمی بێگانەی هەرزان، کە پێشان گەیشتبوونە شارەکانی ئەنەدۆل، لەوێوە رژانە بازاڕەکانی کوردستانەوەو تەنگیان بە بەرهەمی خۆماڵی هەڵچنی[١٣]. راکێشانی رێگەی ترۆمبیل، گوڕی زێتری بە مەسەلەکەداو دۆزینەوەی ماددەی داهێنراوەکان (پاش دووهەم جەنگ)، کاری لەکارترازاند. ئاسنجاو جێگەی گلێنەی گرتەوەو باغەو پلاستیك باوی

ئەویشیان نەهێشت. شاڵ بە قوماشی هەرزانی مەکینەچن جێگەی پێلێژکرا. گەلەك بەرهەمی نوێی ئەوتۆیی داهاتو گەیشتنە ئەو شوێنانە، کە ئەورۆ وەك یەکێك لەپێویستییەکانی ژیان تێیاندەڕواندرێت.

ئا بەو شێوازە، هێدی هێدی، کەرەسەو کەلوپەلی دەستکردو خۆماڵیی گوندەکان سەریان تێداچوو. لەشارەکانیشدا زۆر پیشە فەوتانو لەنێوچوون، یاخود مەکینە جێگەی گرتنەوە (وەکی قوماشچنینو رەعەمەلهێنانی چەرمو کانەکان). هەتا دێت، بۆ ئەو کارگانەش دژوارتر دەبێت، پێبەپێی کارخانە پێشکەوتووترەکانی خۆرئاوای تورکیا، بەغداو تارانو دەرەوە هەنگاوهەڵنێنو کێبەرکێیان بکەن.

نەبوونی داوو دەزگە ئابووریی‌و خزمەتگوزارییە پێویستەکان، گرانی کرێی گواستنەوەو زۆر هۆکاری دی، کارێکی نەرێتی دەکەنە سەریان. لەململانێی ژیاندا، تادێت کرێکاران لێرە خراپتر دادەدۆشرێن وەك لەوڵاتانی سەردەستە، یاساکەڵکگرە کۆمەڵایەتیەکان هێجگار بە پێچو دەورەن.

ئەم گەشەکردنە بووە هۆی زۆربوونی ژمارەی دیفەرەو دەستگێڕو وورده بازرگانان. چەرچییەکان، گوێزانی ئاڵەمانیی، بازیچەی چینی‌و هۆنگکۆنگی‌و هیندی، قوماشی هیندی‌و یابانی‌و ئینگلیزی، چرای چینی، سابوونو بسکیتو شیرینی لەپێتەخت دروستکراوو گەلەك تفاقی دیکەیان دەگەیاندە گوندەکان. ئەوان ئەم کەلوپەلانەیان لەعەتارو بازرگانانی شار دەکڕی، ئەوانیش لەبازرگانە گەورەترەکانو ئەوانیش لەو بازرگانانی شار دەکڕی، کە لەهەندەرانەوە دەیانهێنان. هەندەکجار بڕێك دەڵاڵو بازرگانە دیکەش لەنێواندا بوون. بەروبوومی گوندەکانیش ئا بەو هەڵقە بازرگانییەدا دەگەیشتنە باژێڕە گەورەکانو هەریەکە چکێك سوودی بۆخۆی بردەدا.

جۆرێکی دی لە ئاڵو وێڵکەران، وەکی لەویلایەتەکانی تورکیاو ئوستانەکانی ئێراندا دەدیترێن، بریکارو نوێنەرانی کۆمپانیا بیانییەکانن. بەکۆمەکی ئەو کۆمپانیایانە (چ باربوو چ قەباڵە) دوکانێك دەکەنەوەو تەنها بەرهەمی ئەو کۆمپانیایانە دەفرۆشن. بۆ ئەو بریکارانە، ئەمە سەرچاوەیەکی مسۆگەری بەسوودە،

بۆ کۆمپانیاکەش چێترین ئامرازە بۆ بەربەرەکانێی کۆمپانیا خۆماڵیو بیانییەکانی دی. بازرگانیی، تەنها دەزگەی کاریگەرو چوستو چالاکی بازێڕەکانە.

ئەمانە خەسڵەتی پرۆسێسێکن، کە زێتر زاراوەی پەرەنەستێنی بۆ دەشێت وەك لەپەرەنەستێن. گەشەکردنی پیشەسازیی بەرپێگیراوە. کوردستان وابەستەی چەقی وڵاتە داگیرکەرەکانێتی، لەرێگەی ئەوانیشەوە وابەستەی نێوەندە پیشەسازییەکانی جیهانە.

بەسەرنجدانێکی شیرازەی دەمارەکانی رێگەوبان، ئەو راستییەمان بەڕوونی بۆ دەردەکەوێت. تۆڕێکی ناسروشتییە، کە لەسەر بنەمای گەشەکردنە ئابوورییەکە هەڵنەستاوە، بەڵکە لەسەر دینگەی پێویستییەکانی دەستەڵاتدارێتیو نێوەندکاریی دەوڵەتی پەلیهاویشتووە.

لەنێوان زۆربەی گوندەکاندا لەتوولەڕێ زێتر، هیچ رێگەوبانێکی دیکە نییە، بەڵام زۆربەی گوندەکان بەپێتەختی نێوچەو مەڵبەندە ئیدارییەکانەوە بەستراونەوەو لەرێگەی ئەوانیشەوە بەپێتەختی هەرێمو وڵاتەکەوە. لەگوندەکانی کوردستانەوە، ئاسانتر دەگەیە ئەمستەردام وەك گەلەك گوندی چەپەری دی.

جار هەیە ئەو لادێییانەی دەچنە سەردانی خزمێکیان لەگوندێکی دی کە ١٠٠ کیلۆمەترێك دوورە، دەبێت سەرەتا بچنە پێتەختی نێوچەکەو هەرێمەکەو ئەوجا پێتەختی هەرێمو نێوچەیەکی دیو لەوێوە بۆشوێنی مەبەست، کە رەنگە ٢٠٠ تا ٣٠٠ کیلۆمەترێك رێگەببڕن. ئەو داوە بەدەی رێگەی هاتوچۆ، تەگەرەیەك بوو لەسەر رێگەی پێوەندیی هێزەکانی بزووتنەوەی ئازادیخوازی کوردی عیراقدا، چونکە پێتەختی هەرێمەکان هەمیشە بەدەست رژێمەوە بوون. ئەوەبوو نێوچەی بادینان لەزستاندا تەریك مایەوەو ئاکامەکەی کەوتنەوەی برسێتی بوو*. هەر بەو شێوازە، ئەو پێشمەرگانەی دەیانویست لەهەرێمی سلێمانییەوە بچن بۆ نێوچەی باڵەکایەتی، دەبایە بە ئێراندا تێپەڕن (بەپێتەختی مەڵبەندو نێوچەو هەرێمەکاندا)، چونکە

---

* - مەبەستی نووسەر زستانی ساڵی ١٩٧٤ە.

ڕێگەیەکی ئەوتۆ نەبوو کە پێتەختی هەرێمەکان ببوێرێتو نێوچەکان پێکەوە ببەستێتەوە.

ئا بەو شێوازە، گەلەك کورد هەن کە ئێستە لەئەستەموڵو ئاڵەمانیاو هۆڵەندا کاردەکەن، لەدەوروبەری خۆیان، لەچەند گوندێکی هاوسێیان زێتریان نەدیتووە. لەتاو بێکاریی‌و زەوی، گوندەکەی خۆیان جێهێشتووە. کوردستان پیشەسازیی ئەوتۆی لێنییە کاریان بۆ مسۆگەر بکات، بۆیە ڕەویانکردووە بۆ مەڵبەندە پیشەسازییەکان‌و (گەلێکی دی گەرەکیانە دوویانکەون)و بەشداریی لەگەشەیاندا بکەن. بۆ بەدبەختی، بەشێك لەسەرمایەی کوردیش هەمان ڕێگە تەیدەکات. دەوڵەمەندان پووڵیان بە زەویوزار دەدەن (ئەگەر زەوییان چنگکەوێت، چونکە زەوی کەمە)، مەکینە دەکڕن، پووڵیان لەبواری بازرگانیی‌و پیشەسازیی ئەو مەڵبەندانەدا دەخەنە گەڕ. ئەمە یانی پرۆلیتاری کوردو سەرمایەی کورد هەن، بەڵام هەردوو لەدەرەوەی کوردستانن. هەڵبەت ئەمەش کاریگەرێتی خۆی لەسەر بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد هەیە. بۆ نموونە ڕەنگە کرێکارانی کورد لەئەستەموڵ، زێتر لەسەر بنەمای چینایەتییان ڕەفتار بکەن‌و بدەنە پاڵ کرێکارانی تورك، وەك لەوەی بەپیر بانگەوازی نەتەوایەتییانەوە بچن. لەلایەکی دییەوە، گەشەنەکردنی کوردستان "پێبەندییە بنچییەکان" پتەوتر دەکات، دەشێت وەك هەمیشە دووی زایەڵەی ڕەنگی بزووتنەوە نەتەوەییەکە بکەون‌و کاریگەرێتی ئەو زێتربێت. تەنها مەڵبەندە پیشەسازییەکانی دەرەوەی کوردستان فراوان نەبوون، بازێڕەکانی کوردستانیش چاك گەورەبوون. جاران کورد لەو بازێڕانەدا زۆربە نەبوو، ئەوڕۆ بەژمارە لەگشت ڕەگەزەکانی دی زێترە. زۆربەی پەڕیدەکان بژێویان بەو کارانە پەیدا دەکەن، کە هیچ شارەزاییی‌و دەستڕەنگینییەکی ئەوتۆی پێناوێت، چەرچێتی‌و دەستگێڕی، بۆیاخچێتی، سووکی ئاڵو وێڵ.....هتد. هەندەك لەو پەڕیدانەی خوێندنێکیان تەواو کردووە، بە مزی کەمترو پلەی نزمتر دادەمەزرێن. لەوبازێڕانە ڕێژەی بێکاریی هێجگار باڵایە. ئاوارەی نوێ کەمتر ڕوویان تێدەکەن، خەڵکیی زێتر ڕەویان لێدەکەن، ژمارەی دانیشتووانی زۆربەیان خەریکن سەقامگیر دەبن.

**١- ٦- زمان**

کوردی زمانێکی ئێرانییەو سەر بەگروپی باکووری خۆرئاوا، یاخود باشووری خۆرئاوای ئەو خێزانە زمانەیە[١٤]. ژمارەیەکی زۆر دیالێکتی جوداوازی هەیە، کەمو زۆر بەچەند دەستەیەکی دیاریکراو نیشانە دەکرێن. ئاخێوەرانی ئەو دیالێکتە جوداوازانە، کەمتر لێکتێدەگەن.

أ - دیالێکتەکانی باکوورو باکووری خۆرئاوا، کە کرمانجییان پێدەڵێن. ئەمە بۆخۆی سەرلێشێوانێك دەسازێنێت، چونکە هەندەك تیرەو خێڵ لەباشوور هەن، بە خۆیان کرمانجو بە زاراوەیان کرمانجی دەڵێن، هەرچەندە ئەمانە سەر بە گروپی باشوورن.

ب - دیالێکتەکانی خوارووی خۆرئاوا، وەکی سنەیی، کرماشانیو لەکیی، کە لەفارسیی نوێوە نێزیکن.

ئەم زاراوانە تەنها لەڕووی لێکسیکۆلۆژیو فۆنۆلۆژییەوە جوداوازیی بەرچاویان نییە، بەڵکە لەهەندەك ئاکاری ڕێزمانیی گرنگیشدا لێکدوورن، وەکی دۆخی رابوردووی کارە تێپەڕەکان[١٥]، بوونی رەگێکی کرداری کارابزر لەزاراوەی خوارووی (کە لە زاراوەکانی دیدا نییە)، یاخود ئەو پاشگرە زەقەی / - ەوە / کە لەزاراوەی خوارووەدا فرەجار پێشچاوەدەکەوێت*. هەرچەندە دوور نییە ئەم جوداوازییانە ئاکامی کاریگەرێتی گۆرانی نەبێت لەسەر سۆرانی.

لەپاڵ ئەو سێ دیالێکتە سەرەکییەدا، دەشێت دوو دیالێکتی دیکەشر دەستنیشانبکەین، کە سەر بەلقێکی دیکەی خێزانی زمانە ئێرانییەکانن، (مەکەنزی لەڕیزی دیالێکتەکانی باکووری خۆرئاوای زمانە ئێرانییەکاندا دایاندەنێت)

---

* - بەداخەوە ئەمەی کاکی نووسەر دەیڵێت، کەم شارەزایی لەبواری زمانەوانی بەگشتیو زمانی کوردیدا بەتایبەت، دەردەخات. پێدەچێت زێتر پشتی بە راوبۆچوونە سەیرو سەمەرەکانی مەکەنزی بەستبێت. دیارە لەپەراوێزێکی وا کورتدا ناتوانم بەرپەرچی ئەو تێروانینە چەوتانە بدەمەوە، بۆیە هەڵیدەگرم بۆ کۆتاییو پاشان لەداوێنی سەرنجەکانی خۆیدا دەگەڕێمەوە سەر ئەم باسە.

ئەوانــەیش زازاو گــۆرانیین. زارا زاراوەی ژمارەیــەکی زۆر لەخێڵــەکانی بــاکووری خۆرئـاوای کوردسـتانە. بـەپێی مەڵبەنـد دەتـوانین بیکەینـە سـێ دەسـتە: دەرسـیمی گەورە (کە نێوچەی تونجەلی‌و ئـەرزنجان‌و بەشێکی بنگۆل‌و دیاربـەکر دەگرێتـەوە)، سـێڤەرك‌و مـۆدکی (مـۆدکی سـەر بـە بەتلیسەو ژمـارەی ئەوانـەی بـە زازا دەپـەیڤن کەمن، بەڵام جوداوازیی دەگەڵ دیالێکتەکانی دی، زۆرە)[١٦].

ئەوانەی بە زازا ڤساندەکەن، بە ئاسانی کرمانجی فێردەبن، بـەڵام فێربـوونی زازا بۆ کرمانجان هێجگار سەختە.

لەباشوور و باشووری خۆرهەڵاتی کوردستان، بڕێك چەپەك هەن بەچەند زاراوێـك دەپـەیڤن، کـە پێکـڕا بـە گـۆرانی یـاخود ماچـۆ ناسـراون (ماچـۆ لـەو زاراوەدا یـانی: گوتی). ئەم زمانە رەنگە لەرابوردوودا مەودایەکی جوگرافیـایی بـەرینتر هـەبووبێت، وەلێ ئەورۆ زاراوەکانی لەهەورامان‌و کێوەکانی داڵەهۆی خۆرئاوای کرماشـان‌و چـەند چەپەکێکی کوردستانی عیراق پێیدەئاخێون[١٧].

هەرچەندە بەڵگە کەمە، بەڵام وا لێکدەدرێتەوە کە زاراو گۆرانی زۆر لێکنێـزیکن. پێدەچـێت ئەمـە بڕیـارو سـەرئەنجامێکی سـەرپێیی‌و هەڵەشـە بێـت، مـن بۆخـۆم هێندەی ئەو دوو دیالێکتەم بیستووە، هەستم بەگەلـەك جـوداوازیی کـردووە. هێـشتا کەرەسەی چاپکراوی کـەم لەبەردەسـتاندان، بـە تایبـەت دەربـارەی زازا، تـا بڕیـارێکی گردەبڕ لەبارەیانەوە بدرێت.

نەخشەی ژمـارە ٤ بەنێزیکـە ئـەو نێوچـەو مەڵبەندانـە پێشاندەدات، کـە دەسـتە دیالێکتـە باسکراوەکان پێیـدەدوێن. دەبێـت ئـەوە بـزانین کـە سنوورێکی دیـاریکراو لەنێوانیانـدا نییـە. دیالێکتـەکان هێـدی هێـدی تێکـەڵی یەکـدی دەبـن، رێدەکـەوێت قسەکەرانی دیالێکتێك لەنێو زۆربەیەکی قسەکەرانی دیالێکتێکی دیدا دەژین. لە زۆر شوێن خێڵە قسەکەرەکانی زاراو کرمانجی بە یەك مەڵبەندا بڵاوبوونەتەوە.

**١ـ ٧ـ ئاین**

زۆربەی کوردەکان موسڵمانی سوونی خاوەنئیمانن‌و پەیڕەوانی چوار ڕێبازەکەی ڕێچکەی شافیعین. بەوە لەکەمەنەتەوە هاوسێکانیان جودادەکرێنەوە: تورك لەتورکیاو عارەبانی لەباشوورەوە هاوسێشیان زۆربەیان سوننین، بەڵام ئەوان پەیڕەویی ڕێچکەی حەنەفی دەکەن. تورکە ئازەرییەکان‌و فارس‌و لوڕ، شیعەن. گشت کوردەکان پەیڕەوی لەڕێچکەی شافیعی ناکەن، لەکەنارەکانی خواروو و خوارووی خۆرهەڵاتی کوردستان (لەخانەقین‌و کرماشان)، خێڵ‌و تیرەی فرەهەن، کە ڕەنگە زۆربەی دانیشتووانی کوردی ئەو نێوچەیە پێکبهێنن، شیعەی دوازدە ئیمامن، کە ئاینزای ڕەسمیی ئێرانە.

کوردە شیعەکانی ئێران لەئاستی جموجۆڵ‌و چالاکییە نەتەوەییەکانی برا سوننیەکانیاندا، وەکی بزووتنەوەکانی ساڵانی بیست‌و ١٩٤٦و ١٩٧٩، دوورەپەرێز وەستاون. لەپاڵ پەیڕەوە خاوەنئیمانەکانی ئاینزای شیعەو سوننیدا، هەندەك ڕێبازی ئاین تێکەڵەی گومڕا لەکوتە جوداوازەکانی کوردستاندا هەن، کە بنەچەیان دەچێتەوە سەر باوەڕی دێرینی ئاینە ئێرانی‌و ئاینە سامییەکان‌و هەندەك باوەڕی شیعەگەریی تیژڕەوی وەك غولاتەکان‌و بڕێك ڕێچکەی سۆفیێتی(١٨). گرنگترینیان عەلەوییەکانی باکووری خۆرئاوای کوردستانن. کزەڵی باوەڕیان جوداوازە، بڕێکیان لەمێژە لەژێر تین‌و تاوی پڕوپاگەندەی سوننیەکاندان، ئەوانی دی، بەتایبەت ئەوانەی دەوروبەری دەرسیم، بەئاستەم دەتوانرێت بە موسڵمان نێو ببرێن(١٩). گەلەکجار گوتراوە کە گوایە زۆربەی عەلەوییەکان بە زاراوەی زاوایی دەدوێن. ئەمە ڕاستە، بەڵام عەلەوییش هەن بە کرمانجی دەپەیڤن، جگە لەوە زۆربەی عەلەوییەکانی تورکیا، کورد نیین، تورکن. بە پێچەوانەشەوە پشکێکی کەمی زازاییەکان، عەلەوین.

لەخواروو و خوارووی خۆرهەڵاتی کوردستاندا، لەچەند چەپەکێکدا ئاینزایەکی دیکە هەیە کە بە ئەهلی هەق ناسراوەو لەعێراق کاکەییان پێدەڵێن. مەڵبەندی، صەحنەی (خۆرهەڵاتی کرماشان)و کەرەندی (خۆرئاوای کرماشان)و باشووری

کەرکوکە. پێدەچێت پاشماوەی کۆمەڵگەیەکی گەورەتربن‌و بە خوارووی کوردستانی ئەمڕۆو لوڕستاندا بلاوبووبنەوە. زۆربەیان بە زاراوەی گۆرانی دەدوێن، ئەمەش حاڵەتێکی لێکچووی گرنگە لەگەڵ عەلەوییەکاندا، کە بەزاراوەی زازایی دەدوێن. لێرەش پێوەندییەکە ناکامڵە: زۆر ئەهلی هەقیش هەن، کە کورد نیین، تورکی ئازەری یا فارسن. هەردوك ئاینزای عەلەوی‌و ئەهلی هەق باوەڕیان بە دۆنادۆن‌و ژیاندنەوەی ئێزدانە لەجەستەی ئادەمیزاددداو گەلەك داب‌و نەریتیان لێکدەچن[٢٠].

سێهەمین دەستەی جودا، ئێزیدییەکانن، کە زۆرجار بەناڕەواو بە تەوسەوە بە (شەیتان پەرست) یان نێودەنێن. هەرچەندە بێئاکام دەگێڕدرێنەوە سەر ڕەگەزێکی سوننی توندڕەو، بەلام لەگەلەك رووەوە لێکچوونیان دەگەڵ ڕەگەزێکی شیعەی توندڕەودا هەیەو هەتا وا پێدەچێت هەر موسڵمانیش نەبن. ئەم ئاینە تایبەتە بە کورد. ئێزیدییەکان بە کرمانجی دەدوێن[٢١]. لەوەتەی هەن، لەلایەن هاوسێ موسڵمانەکانیانەوە ڕاوەدوودەنرێن. زۆریان لەترساندا خاك‌و مەفتەنی خۆیان جێهێشتووەو برێکیشیان بەناچاریی بوونەتە موسڵمان یاخود فەلە. پێوەندییان لەگەڵ فەلەکانی دەوروبەریاندا باشترە وەك لەگەڵ موسڵماناندا، بۆیە زێتر دەبنە فەلە. بۆ خۆم زۆر بنفەلەم دیتووە، کە باووباپیرانیان کۆنە ئێزیدی بوونە.

زۆربەی ئێزیدییەکان لەکێوەکانی شەنگار (خوارووی خۆرئاوای موسڵ، بە شەفتولی بەرەو سنووری عیراق - سوریا)و نێوچەی شێخان (خۆرهەلاتی موسڵ) دەژین، کە مەزاری پیرۆزی شێخ عادی لێیە. لەسی‌و چلەکانی سەدەی رابوردوودا، زۆر ئێزیدی لەم نێوچەیەوە لەدەست زۆرو ستەم هەڵهاتن‌و لەقەوقاز گیرسانەوە. ئێستەکە شێخان‌و شەنگارو قەوقاز گرنگترین مەڵبەندەکانی ئێزیدیین. لەکوردستانی تورکیاش ئێزیدی هەن (لەکێوەکانی تۆر عابدین‌و لەباتمان). لەوێوە گەلەك ئێزیدی وەك کرێکاری رەوکردوو چوونەتە ئاڵەمانیاو لەستەمی بەردەوامی موسڵمانان خەلەسیون.

لەنێو کورداندا هەمیشە کەمینەی فەلەو جوو هەبوون، خەریکی هەندەك پیشەی تایبەت بوون. زۆربەی کات لەبواری ئابووریی‌و سیاسیدا پشتگوێ خراون، زۆر

سەرەکخێڵ وەکی ملکی خۆیان لەجوتێرو وەستا فەلەکانی گوندەکانیان روانیوە (تا ئەورۆش هەندەکیان دەڵێن: فەلەهێن من). ئەو پشتیوانیو پارێزگارییەی رووسیاو ئینگلتەرە لەفەلەکانیان دەکرد، کە دیارە بێ مەلامەت نەبوو، بووە بیانوو بۆ خوێنڕشتنی چەند جارەیان. ژمارەیەکی هێجگار کەمیان مانەوە، چونکە بەشی زۆری ئەوانەی لەکوشتن خەلەسین، هەڵهاتن.

پێش دەستێوەردانی ئەورووپاییەکان لەنێوچەکە، سێ دەستەی ئاینیو ئێتنی فەلە لەنێوکوردانەدا هەبوون: سریانەکان، کە بەزمانی ئارامی یاخود بە عارەبی دەدوان، سەر بەکلێسەی ئاسووری - ئۆرتۆدۆکسی، یاخود کلێسەی یاقووبییەکان بوون. بە زۆری لەکێوەکانی تۆرعابدینو جزیرەو هەندەك باژێڕی باکووری خۆرئاوای کوردستان دەژیان.

**ئاسوورییەکان**، ئەمانیش بە زمانی ئارامی دەدوان، بەلام سەربەکلێسەی نەستۆرییەکان بوون. ئەمانە تەواو لەفەلەکانی دیکەی خۆرهەلات جوداوازن. لەنێوەندی کوردستاندا (لەبادینانو هەکاری)و تەختانییەکانی دەوروبەری ورمێ دەژیان.

**ئەرمەنییەکان**، کە زمانو کلێسەی تایبەتی خۆیان هەبوو، کلێسەکەیان نێو کلێسەی گریگۆرییە. گەورەترین دەستەی فەلەکان بوون، بە گشت کوردستاندا بلاوبووبوونەوەو تخووبی باکووری خۆرئاواو خۆرئاوایان بەزاندبوو.

مسیۆنارە کاتۆلیکە فەرەنسییەکان، هەر لەسەدەی حەڤدەهەمەوە خەریکی بانگهێشتنو گێڕانەوەی ئەم فەلانەبوون بۆسەر راستە شەقامی کاتۆلیکی. بەو هۆیەوە کە دەرباری عوسمانی مافی پارێزگاریی کاتۆلیکەکانی ژێردەستەی سوڵتانی بەپاشای فەرەنسا دابوو، مسیۆنارەکان سەرکەوتنی چاکیان وەدەستهێنا. گەلەك ئەرمەنیو ئاسوورییەکانی دەڤەری خۆرئاوا، کە بە کلدانی ناسراون، گەڕانەوە. لەساڵەکانی سی سەدەی نۆزدەهەمدا، مسیۆنارە ئینگلیزو ئەمریکاییەکان خەریکی ئاسوورییە نەستۆرییەکان بوون. ئەمە بووە هۆی ئالۆزیو گرژبوونی پێوەندیی نێوان فەلەو موسڵمانەکانو هۆکاری رەشکوژیی نەستۆرییەکان، یەك دوو ساڵ دواتر.

مسیۆناره کاتۆلیکیو پرۆتستانەکان، لەکێوەکانی تۆرعابدینیش چالاك بوون، بەڵام بێ سەرکەوتنێکی ئەوتۆ: زۆربەی سریانەکان هەر لەسەر باوەڕی یاقووبی خۆیان مانەوە. تا یەکەم جەنگی جیهانییش لێره کوشتارێکی ئەوتۆ نەکرا. ساڵی ١٩١٤ فەرمانی راگوێزانی تەواوی ئەرمەنییەکان لەخۆرهەڵاتی ئەنەدۆڵ دەرکرا. ئەرمەنی بە یاساشکێنی تاوانبارکرانو بە کۆمەڵ لەلایەن سەربازانی تورکو کوردەکانەوە دەکوژران. هەرزوو راوەدوونان فەلەکانی دیکەشی گرتەوە. پاش جەنگ، عیراقو سوریا کەوتنە بندەستی ئینگلتەرەو فەرەنساوە، زۆر لەو فەلانەی سەریاندەرکرد، بۆ ئەوێ هەڵهاتن (بەتایبەت لەکێوەکانی تۆرعابدینو نێوەندی کوردستانەوە). دەستەڵاتداره ئینگلیزو فەرەنسییەکان، بارەکەیان گرژترکردو پێوەندیی فەلەو کوردیان خراپتر تێکدا، بەوەی هێزێکی پۆلیسی فەلەیان دامەزراند، تا کوردی پێ بەچەترسێن بکەن.

گەلەك لەو ئەرمەنییانەی بە سلامەتی دەرچوون، بۆ باشووری قەوقاز هەڵهاتن، لەوێ لە دامەزراندنی کۆمارێکی ئەرمەنیدا بەشداربوون. هەندەك ئەوڕۆ لەسوریاو عیراق دەژین، ئەوانە خۆیان یاخود بابو باپیرانیان لەلایەن تورکەوە بۆ ئەوێ دوورخراونەوە. هەندێکی دیکەیان بەتەواوی جیهاندا بلاّ وبوونەتەوە. زۆرکەمیان لەخۆرهەڵاتی تورکیا ماون. تادێت سریانییەکانی کوردستانی تورکیاش لەکەمی دەدەن. ستەمی هاوسێ موسڵمانەکانیانو نەبوونی دەرفەتی هەلگرانێکی ئابووریی، هانی زۆریاندەدات بۆ ئەستەموڵ یا دەرەوە رەوبکەن.

### ١. ٨ بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد لە ١٩٦٠ەوە تا ١٩٨٥

هەرچەندە ئەم کتێبە بەنیازنییە مێژووی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد بتوێژێتەوە، بەڵام جار جاره لێرەو لەوێ پەل بۆ ئەو لایەنەش دەهاوێت. لەبەندی چوارهەمو پێنجەمدا، لەباسی دەورو رۆڵی سیاسی شێخاندا، لە قۆناغەکانی زووی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد دەکۆڵینەوە. لەبەر ئەوەی کەمتر خۆ لەقەرەی

قۆناغەکانی دواتری دەدەین، بە پێویستی دەزانم لێرەدا بەرکورتێکی مێژووی ئەم بیست و پێنج ساڵەی دوایی پێشچاوبخەم.

سەردەمی پاش یەکەم جەنگی جیهانی، لەکوردستانیشدا وەك هەر سووچێکی دیکەی خۆرهەڵاتی نێوەند، قۆناغی چالاکیی و سەرگەرمیی جموجۆڵی سیاسی بوو. کورد نەك تەنها لەتورکیا، بەڵکە لەئێران و عیراقیش بەردەوام خەریکی شۆڕش و راپەڕین بوون، بەڵام هەرسێ وڵات توانییان بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد سەرکوتکەن[٢٣].

کوتەکانی ئێران و عیراق لەکۆتایی ساڵەکانی بیستدا هێورو ئارام بوون. تورکیا بڵێسەی دواهەمین راپەڕینی کوردی لە ١٩٣٨دا دامرکاندەوە، لێرە لەگشتیان کەمتر گوێ بۆ کێشەی کورد رادەهێڵدرا. پاش سەرکوتکردنی راپەڕینەکە، ئەوجا سیاسەتی راگوێزانی زۆرە ملی دەستپێکرد. ئاکامەکەی لێرە درێژخایەنتربوو وەك لەوڵاتانی هاوسێ. دووهەم جەنگی جیهانی بزووتنەوەی ئازادیخوازی کوردی ئێران و عیراقی بووژاندەوە. چەند پارتێك بەنهێنی دامەزران و بزووتنەوەیەکی چەکدارانە بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزانی ساڵی ١٩٤٤ / ١٩٤٥ لەژووروووی عیراق دەستیپکردو لای کوردە شارییەکانی عیراق و هەتا ئێرانیش دەنگی چاکی دایەوەو پشتگیریی مەعنەوییان لێکرد[٢٤].

لەئێران، مەهاباد کوانووی چالاکیی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد بوو، کە بە لاوازبوونی دەستەڵاتی رژێم و هەڵوێستی دنەدەرانەی ئوردووی سۆڤیەت کە ئازربایجانی داگیرکردبوو، گەشایەوەو وزەیەکی بە بەردا هاتەوە. ١٩٤٦ کوردی مەهاباد بەچاولێکەریی ئازربایجانی هاوسێیان، بانگی دامەزراندنی کۆمارێکی سەربەخۆیان هەڵدا. لەلایەن کوردی عیراقیشەوە پشتیوانییان لێکرا، بارزانیی بە یەکدوو هەزار جەنگاوەری چەکداری خێڵەکەیەوە، گەیشتە کنیان.

کۆمارەکە ساڵێکی تەواو نەژیا، ئوردووی سۆر لەئێران کشایەوە، کۆماری کورد لەتوانایدا نەبوو بێ پشتگیریی هێزێکی گەورە بەربەرەکانێی ئەرتەشی ئێران بکات. مەلا مستەفاو پیاوەکانی کشانەوە بۆ عیراق، ئەوانی دی تەسلیم بوون. پێشەوا قازی

محەممەدو صەدری برایو سەیفی قازی ئامۆزای بە مەرگ سزادرانو بەداردا کران. پارتی دیموکراتی کوردستان دارماو لەبەرئێك هەڵوەشایەوە، تەنها دەستەیەکی کەم بەدزییەوە درێژەیان بە خەبات دا. بارزانی بۆی نەلوا لەژوورووی عیراق جێپێی خۆی بکاتەوە، لەسنووری تورکیاو ئێرانەوە پێدزکەی کردو خۆی گەیاندە سۆڤیەت[٢٥]. خۆیو پێنجچەد پیاوی هاوڕێی یازدە ساڵیان لەوێ بەسەربرد. نێوی ئەو و قازی محەممەد، وەك تریفەیەکی هیوای نەهاتووەدی کورد، بەدرەوشاوەیی مانەوە.

لەساڵەکانی لەوەدوایدا، پێدەچێت بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد وەك هێزێکی کۆمەڵایەتی، جێگەی بۆ بزووتنەوەیەکی سیاسی ئاڵوودەی هەستی چینایەتی چۆڵکردبێت. لەتورکیا هەست بەگەرمەی چالاکییەکی سیاسی دەکرا، سیستێمی نوێی فرەپارتی گەلەك دەستەی منەکردووی بۆ جموجۆڵ هاندا. پشکێکی ئەو نائارامییە سیاسیو کۆمەڵایەتییە، ئێرانو عیراقیشی گرتەوە. لەسەرەتای پەنجاکاندا لەهەردوو وڵات وەرزێرە کوردەکان لەدەرەبەگەکانیان یاخیبوون. تا دەهات، تاڵی داوی ئاوێتە بوونی سیاسی کورد لەبۆتەی هەریەك لەو وڵاتانەدا رۆشنتر دەینواند. ململانێکە کەمتر توخنی لایەنی ئیتنی دەکەوت، زێتر سیمای ململانێی چینایەتی لێدەنیشت. لەشێستەکاندا هەستی نەتەوایەتی کورد هەمدیسان بوژایەوە، سەرەتا لەکوردستانی عیراقداو پاشان لەکوتەکانی ئێرانو تورکیاشدا.

### ١ ـ ٨ ـ ١. کوردستانی عیراق لە ١٩٥٨ەوە ١٩٧٨

لە ١٤ی یولی ١٩٥٨دا، سوپا بە سەرکردایەتی عەبدولکەریم قاسم کودەتایەکی کردو رژێمی پاشایەتیو کابینەی سەربەخۆرئاوای سەرەك وەزیران نوری سەعیدی رووخاند (کە بەرێکەوت کورد بوو). پارتە نهێنیەکانی وەك پارتی کۆمۆنیستی عیراقو پارتی دیموکراتی کوردستان ( کە لقی عیراقی پارتەکەی قازی محەممەد بوو) بەئاشکرا کەوتنە چالاکی. داوا لەبارزانی کرا لەیەکێتی سۆڤیەت بگەرێتەوە. چەند ساڵێك لەوەبەر، سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان کە زۆربەیان رۆشنبیری

شاریی نێوچەی سۆران بوون، روویان لەبارزانی نا، ببێتە سەرۆکی ڕێزلێنراویان. بارزانی رازیی بوو، بەلاّم هەرزوو دەرکەوت کە ئەو خۆی بەتاقە سەرۆکی راستەقینەو دەمراستی گشت کورد دەزانی. بەوە هەر لەسەرەتاوە کێشەکێش‌و ململانێ لەڕیزی پارتدا رەگیان داکوتاو چەند ساڵێك دواتر چووزەرەیان دەرکرد. بارزانی سەرکردەیەکی جەنگاوەری خاوەن ئەزمونی نێوچەی کرمانجایەتی بوو، نێوچەیەك کە هێشتا داب‌و نەریتی هۆزایەتی باو زاڵەو زۆر بایەخی پێدەدرێت.

بارزانی گوردێرێکی گەورەی ئەو پیاوانەی پارتەکە بوو، کە شارییەکی تا رادەیەك خوێندەوار بوون‌و خۆیان بە پیتۆڵ‌و سۆسیالیست دەزانی‌و وەك ئاکارێکی بەدی دواکەوتوویی لەپەیوەندیی خێڵایەتییان دەڕوانی‌و چاك فێرە گەمەی سیاسی بووبوون، بەلاّم جەماوەرێکی رەدووکەوتووی ئەوتۆیان نەبوو.

قاسم بەربەرەکانێی نێوان پارتەکەو بارزانی قۆزتەوە، پێویستی بە پشتگیریی کورد بوو، بەلاّم نەیدەخواست هێزو گوڕ پەیداکەن. هەوڵیدا دەستەلاّتی سیاسی خۆی لەسەر دینگەی سێکوچکەی بەرەیەکی لەقی نەتەوە پەرستە عارەبەکان‌و کۆمۆنیستەکان‌و کورد هەڵچنێت.

لەبەر ئەوەی مەرام‌و ئامانج‌و بەرژەوەندی ئەم سێ دەستەیە جوداوازو دژبەیەك بوون، کێشەو گرفت هەر لەسەرەتاوە سەریهەڵدا. دەستووره کاتییەکەی ۲۷ یولی ۱۹۵۸، بنەمای ئەو دژایەتیانەیە، کە تا ئەوڕۆش لەهەناوی کۆماری عیراقدا گەرایان خستووە. لەلایەك باسی یەکێتی‌و هاوشانیی کوردو عارەبان دەکات، کە گوایە مافی نەتەوایەتی هەردوکلایان بەپێی دەستوور دەستەبەر کراوە (بەندی سێهەم)، لە لایەکی دی ولاّتی عیراق بەپارچەیەکی دانەبڕاو لەنیشتمانی عارەب دادەنێت (بەندی دووهەم)[٢٦]. بەواتایەکی دی، گشت عیراقییەکان چوونیەکن، بەلاّم عارەبان لەکورد مەزنترن. کوردە نەتەوە پەرستەکان بەردەوام ئەو دژایەتیەیان وەیاد دەهێنایەوە، ئەوە بوو لەو ساڵانەی دواییدا، میسرییەکان، یا هەر برایەکی دیکەی نەتەوەی عارەب خواستبای، گشت مافێکی هاونیشتمانێتی عیراقی دەدرایە، بەلاّم ئەو کوردە عیراقیانەی لەتۆرەمەی ئێرانی کەوتوونەوە، غەوارەی رەزاتاڵ بوون‌و تووڕ دەدرانە

دەرەوە. رژێمی بەعس کە لە ١٩٦٨ەوە دەستەڵاتدارە، ئەو دەستوورە کاتییە ئاوها لێکدەداتەوەو کاری پێدەکات.

ئەمە لەسەردەمی قاسمدا پێشبینی نەدەکرا. قاسم کوردی دەلاواندەوەو پێدەچوو بەنیازبێت مافی نەتەوایەتی بەڵێن پێدراویان دەستەبەر بکات (هەڵبەت زێتر مافی کولتوری).

ئیدی کێشەو گرفت گشت کونجێکی عیراقی گرتەوە: ئەو وەرزێرانەی لەلایەن کادێرەکانی پارتی کۆمۆنیستەوە رێکخرابوون، دژی دەرەبەگەکان راپەڕینو فرەیان لێراوەدوونان. بێئاکام هەوڵی چەند کودەتایەك درا. باڵە دژەکانی لەشکر کەوتنە وێزەی یەکدی. رەگەزە جوداوازەکانی کەرکوك تێکبەربوون. ١٩٥٩ بارزانی دەگەڵ گەلەك لەهۆزە نەیارە دێرینەکانی دەوروبەری بارزاندا تووشی شەڕهات. پێوەندییە دۆستانە چاکەکەشی دەگەڵ قاسمدا شێوا، چونکە قاسم ئەمبەرو ئەوبەری زۆری دەکردو زوو زوو دۆستانی دەگۆڕی تا دەستەڵاتی لەدەستنەدات، ئەوجا رووی بە عارەبە ناسیۆنالیستە راستڕەوەکان دا. بەدگومانی لەیەکدی بەرادەیەك تەشەنەیکرد، کە لەسێپتەمبەری ١٩٦١دا یەکەم شەڕو پێکدادانی کوردو لەشکری عیراقی لێکەوتەوە. قاسم بڕیاری تۆڵەو سزای توندی دا، ئیدی بواری بەرپێگرتنی شەڕی ئاشکرای کوردو رژێمی بەغدا نەما. شەڕی کورد، هۆکارێکی روخاندنی قاسم بوو لە فێبریوەری ١٩٦٣دا[٢٧]. زنجیرەیەك لەو رووداو و پێشهاتانە چەند جارێك دووبارەبوونەوە. رژێمی نوێی عیراق سەرەتا سیاسەتێکی هێوری بەرامبەر کورد گرتەبەر، پاشان تووشی شەڕهاتنو بە کودەتایەك دەستەڵات فلێپبۆوە. چ عەبدولسلام عارف (لەفێبریوەری ١٩٦٣)دا و چ ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر (لە یولی ١٩٦٨)دا، سەرەتای دەستەڵاتیان بە رووی چاك نیشانداندو وادەو بەڵێن بەکورد، دەستپێکرد، بەڵام کەمێك پاشتر فرۆکەو لەشکریان تێبەردان، چونکە نەدەیانتوانیو نەبەنیازیشبوون داخوازییەکانی کورد جێبەجێ بکەن. وێڕای چەند ئاگربەستێك، جەنگ تا ١٩٧٠ درێژەی کێشا.

چەند جارێك گفتوگۆکرا، تا لە ١٩٧٠دا رێکەوتننامەیەك مۆرکراو گشت لایەك پێیزانیبوون، کوردەکان ئۆتۆنۆمییەکی نێوچەییان پێدراو بڕیاربوو بەپێی رێژەیان

لەدەستەڵاتدارێتیشدا بەشداربکرێن[٢٨]. ناشێت واتێبگەین کە جەنگی دژە کورد، گشت کوردی عیراقی هاندا چالاکانە دژی رژێم بوەستنەوە، چونکە نەک تەنها ژمارەیەکی زۆر کەنارگیربوون، بەڵکە گەلەکیش تا کۆتایی، دژی بارزانیو پارتی جەنگان. ئەو هۆزانەی پێش شەڕ بەگژ بارزانیدا چوون، درێژەیان بە دژایەتی دا، دەگەڵ رژێمدا یەککەوتنو پێکرا شاڵاویان دەبرد. لەزۆر جێگەی دی کوردستان، رژێم گەلەک سەرەکهۆزی دیکەی دیتەوە کە ئامادەی بەرەنگاربوونەوەی نیشتمانپەروەرانی کورد بوون، ئیدی ئەمە یا لە دوژمنایەتی کۆنەوە بوو، یاخود لەهەلپەرستییەوە. لەپاڵ ئەوەشدا کێشمەکێشو ململانێی نێوان بارزانیو سەرکردایەتی پارتی لەهەناوی بزووتنەوەکەدا، هەربەردەوام بوو. هەر دوکلا مەڵبەندی دەستەڵاتی گرنگی خۆیان هەبوو، کە زێتر تخووبی زاراوەکانی کرمانجیو سۆرانی دەگرتەوە. هێندەی هەردوولا لە مەودای سنووری دەستەڵاتی خۆیاندا مانەوە، هیچ کێشەیەکی ئەوتۆ نەهاتە گۆڕێ، بەلام پاشان هەرلایەک خۆی هێند بەهێز هاتە پێشچاو، کەبتوانێت لایەنەکەی دی ببەزێنێت.

١٩٦٤، کاتێک کۆمیتەی نێوەندیی پارت لەسەرداوای سەرکردایەتی پارتەکە کۆبووەوەو بەتوندی بڕیاری شەڕ راگرتنەکەی بارزانیو رژێمی تاوانبارکرد، ئیدی رکەبەرایەتیەکە بەچڵەپۆپەی گەیشت.

رێبەری سەرەکیی بەرەی دژە بارزانی، برایم ئەحمەدو جەلال تاڵەبانی زاوای بوون، کە جڵەوی بیرۆی سیاسییان وەدەستەوە بوو. کاردانەوەی بارزانی ئەوەبوو کە ئەو کۆنفرانسی پارتەکەی بەهیچ گرتو خۆی کۆنگرەیەکی سازکردو بیرۆیەکی سیاسی نوێی تەواو گوێرایەڵی داسەپاند. هێزە دڵبەندەکانیشی پەلاماری بارەگای مەکتەبی سیاسییانداو ئەندامانیان بەدیوی ئێراندا هەڵبڕین[٢٩].

ئەم رووداوە لەدووسەرەوە گرنگە:

١ - بارزانی خواستی خۆیی بەسەر پارتەکەدا سەپاندو دەستەڵاتی بۆ خۆی بڕداو کادێری فرەی دیتەوە، کە ئارەزوومەندانە ملکەچی فەرمانی بوون. هەروەها

سەنەندی کە دەتوانێت هەتا لەنێوچەی سۆرانی مەڵبەندی خۆشیاندا، زەبری سوپایی گورجوبڕ لەبیرۆی سیاسی بوەشێنێت.

٣. لەپاڵ ئەوەشدا ئەمە بووە بوارێك بۆ یەکەم پەیوەندیی بزووتنەوەی کوردی عێراق و رژێمی ئێران. ئێران سەرەتا داڵدەی تاڵەبانی و پیاوەکانی داو بڕێکیش کۆمەکی پێکردن، بەڵام پێدەچێت کەمێك دواتر یەکەم ژەمی چەکی قورسی بە بارزانییش دابێت. ساڵ وەرگەڕایەوە تاڵەبانی و رەدووکەوتووانی، بە تێکەوتنی ئێران گەڕانەوە عێراق و دەگەڵ بارزانیدا پێکهاتنەوە، لەبەشی خوارووی کوردستان (مەڵبەندی زاراوی سۆران) گیرسانەوەو درێژەیان بەدژایەتی بارزانی دا. لە ١٩٦٦ بەدواوە، شان بەشانی هێزەکانی رژێم، بەگژ بارزانیدا دەچوون بارزانی، تاڵەبانی بە بەکرێگیراوێتی رژێم تاوانبار دەکردو نێو سووکی خۆفرۆشانی کورد، جاشی لێنا.

هەڵبەت روون نییە ئەو تاوان وەپاڵدانانەی ئەودەم، تا چەند رەوابوون، هێند هەیە تاڵەبانی لەبارێکی سەخت و دژواردا بوو، دەبایە هێجگار هۆشیارانە هەنگاوی نابا. لەخوارووی کوردستاندا پشتگیرو پشتیوانی فرەی پەیدا کرد، وەلێ بارزانیش تا دەهات، جێپێی لەوێ قایمتر دەبوو. بەو پێیە تاڵەبانی بە دوژمن گەمارۆدرابوو: لەباکوورەوە بارزانی و پیاوەکانی، لەخۆرئاواو باشوورەوە بەسوپاو گەلەجاشی کورد. پاش کودەتاکەی ئەلبەکر لەیولی ١٩٦٨دا، تاڵەبانی هەڵپەی گفتوگۆی بوو دەگەڵ سەرۆکی نوێدا، کە گوایە دەیخواست چارەیەك بۆ کێشەی کورد بدۆزێتەوە. پێدەچێت تاڵەبانی بەهیوای مشەو دەستکەوتێکی سیاسی گرنگ بووبێت، بۆیە هێزەکانی خۆی تێکەڵ بە گەلە لەشکری رژێم کرد، کە لێبڕابوو دوا هەوڵ بۆ تێکشکاندنی بارزانی بدات. هەڵبەت ئەم هەنگاوە هیچ شۆرەت و رۆمەتێکی بۆ مسۆگەر نەکرد. ئەلبەکر هەستیکرد کە چارەسەری کێشەکە بێ بارزانی ناکرێت. رێککەوتننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ تەنها ئاشتی و ئۆتۆنۆمی بۆ کورد وەدینەهێنا، بەڵکە جێپێ و دەستەڵاتی بارزانییشی لەکوردستانی عیراقدا هێجگار توندو تۆڵکرد.

تاڵەبانی و گشت خێڵە نەیارەکانی بارزانی، تەنها یەك رێگەیان لەبەردەمدا ئاواڵە بوو، لایەنی کەم پێکهاتنێکی سەرزارەکی و کاتی دەگەڵ بارزانیدا. رێکەوتننامەی

یـازدەی ئـازار چوارسـاڵ مۆڵـەتی بـوو، دەبایـە لـەو چوارسـاڵەدا بەنـدەکانی جێبەجێکرێن، هەندەکیان هەرزوو جێبەجێکران: پێنج نوێنەری کورد کرانە وەزیـر لەکابینەکـەی بەغـدادا، یاسـای چارەسـەرکردنی زەویـوزار پیـادەکرا (وەك بۆیـان باسکردم، بەپلـەی یەکـەم ملکی ئـەو دەرەبەگانـەی گرتـەوە، کـە وابەستەی رژێمـی بەغـدا بـوون)، پێداویـستییەکانی تەندروسـتیو لەشـساغی گەیەندرانـە دوورتـرین کـونجی کوردسـتانو لـەبواری پـەروەردەو فێرکردنـدا هـەنگاوی چـاك هـەڵنرا. زۆر قوتابخانەی نوێ کرانەوە، وانەکان کرانە کوردی، کۆڕی زانیاریی کورد دامەزرێندرا.

بەنـدە بایەخـدارەکانی دیکـە، وەکـی دامەزرانـدنی دەزگاکـانی ئۆتۆنـۆمی لەکوردستاندا، زۆر بە هێواشی هەنگاوی بۆ هەڵدەگیرا. رژێم قەت ملی بۆ دیـارکردنی سنووری نێوچـەی ئۆتۆنـۆمی نـەدا: کـورد داوای مەڵبەنـدە پڕنەوتـەکانی کـەرکوكو خانەقینی دەکرد، کە ئەودەم زۆربەی دانیشتوانیان کوردبوون، دیارە رژێـم بـە گشت تواناپـەوە بەربـەرەکانێی ئـەو داوایـەی دەکـردو نەیدەویـست دەسـتبەرداری پڕخێـرو بێرترین نێوچەکان ببێت.

لەبری وی، رژێم دەستیدایە بە عارەبکردنی نێوچەکە، دانیشتوانی کوردی بە زۆر رادەگوێزاو عارەبی لەشوێن دادەکردن. دەشێت پاشخانی ئەم هەنگاوە لەپێشهاتەکانی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا بدۆزینەوە. لەلایەك عیراق لەسیاسەتی فراوانخوازانەی ئێران دەپرینگییەوەو لەلایەکی دی ترسی بەرەنگاربوونەوەی خۆرئاوای لێنیشتبوو. کاتێـك ١٩٧١ دوا هێزی سوپایی ئینگلیز لەکەنداو کشایەوە، ئێـران هەوڵیـدا ئـەو هێزلەنگینـە راگرێت، دورگەکانی گەرووی هـورمزی داگیرکـرد تـا بتوانێـت سەرپەرشـتی دەروازەی کەنـداو بکـات. پەیوەنـدی نێـوان ئێـرانو عـیراق، لـەو دەمـەوە کـە شـا نیوەئاشـکرا کۆمەکی سوپایی بە کوردەکانی عیراق دەکـرد، ئـاڵۆزبوو بـوو، ئیـدی هێجگـاری شێوا. هـەر لەهـەمان سـاڵی ١٩٧١دا عـیراق دەسـتی گـرت بەسـەر دەزگـا نەوتییـەکانی (ئینگلتەرەو هۆڵەنداو فەرەنساو ئەمریکا)دا و کردنییە خۆووڵاتی، وڵاتـانی خۆرئـاوا بە قرتاندنی گشت پەیوەندییەکی ئابووریی وەرامیاندایەوە.

دوورنییه عیراق لەوە نەترسابێت گەر کەرکوك لەژێر رکێفی دەزگای دەوڵەت دەرچێت و بەکورد بپرێت، نەوتەکە ناراستەوخۆ بە خۆرئاوا بگات، بۆیە دەستوبردی لەبە عارەبکردنی نێوچەکەدا کرد. ئەم پێشهاتانە عیراقیان زێتر دەخزانده ئامێزی سۆڤیەتەوەو لە ١٩٧٢دا پەیماننامەیەکی دۆستانەیان مۆرکرد. هەر هەمان ساڵ، بارزانی بەدزییەوە لەگەڵ زلهێزەکەی دی رێککەوت و بناوانی پێوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ بنیاتنا. هەڵبەت کلپەسەندنەوەی گڕی شەڕ لەکوردستانی عیراقدا، لەخزمەت بەرژەوەندییەکانی شا دابوو، خۆی پشتیوانیی CIA مسۆگەرکردبوو، بارزانییش لەتاران کیسنجەری دیت.

بارزانی و پیاوەکانی هێند بە کۆمەکی فراوانی ئەمریکا پشئەستووربوو بوون، کە کەمتر بە تەنگ ئەوەوە بێن لەگەڵ رژێمی بەغدادا مامەڵەیەکی راستەقینە بکەن و چارەسەرێکی گونجاو پەیدا کەن، چونکە دەبایە ملیان بۆ زۆرشت دابایە. بۆ ئەوەش، دەیانتوانی گەلەك لەپەیمانشکێنییەکانی رژێم بکەنە بڕو بیانوو، وەکی دەرپەڕاندنی کوردێکی زۆرو هەوڵەپووتەکانی کوشتنی بارزانی. لەئۆکتۆبەری ١٩٧٣دا، لەگەرمەی شەڕی ئیسرائیل و عارەباندا، بارزانی پێشنیازی بۆ پووڵپێدەرانی کرد، کە ئەویش تێهەڵچێت و هەڵمەت بەرێتە سەر رژێمی عیراق، بەڵام رێگەیان نەدا(*). لەمارتی

---

(*) زۆرم مەبەست بوو سۆراخێکی ئەم مەسەلەیە بکەم و بزانم داخۆ وابووەو بارزانی هێند کورتبین بووە کە ئارەزووەمەندانە خۆ بخاتە زریانەوە، یاخود ئەمە درۆو هەڵبەستی دوژمنان و ناحەزانێتی. مەخابن بەپرسیارو سۆراخکردن هیچم بۆ روون نەبوومەوە. هەتا برێك لەنێزیکانی ئەودەمی بارزانی، نکۆڵییان لەوەش دەکرد کە پێشهاتی لەو بابەتە هەربووبێت. بەڵام ئەو نامیلکەیەی بەشی رێکخستنی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان لەئایاری ١٩٨٥دا، لەژێر سەردێری: "موقابەلەی سەرۆکی پارتیمان هەڤاڵی تێکۆشەر کاك مەسعود بارزانی لەگەڵ نوێنەرانی دەزگاکانی راگەیاندن و رۆژنامەگەری کۆماری ئیسلامیی ئێران لە ١٩٨٥/٥/١٨دا" بڵاویکرکردۆتەوە، بەڕوونی دەریدەخات کە ئەو بانگەشەیە هەروا گۆترەو هەوانتە نییەو بنچکێکی هەیە، بڕوانە کاك مەسعود لەو بۆنەیەدا چمان بۆ دەگێڕێتەوەو چدەڵێت:

"شایانی باسە لەساڵی ١٩٧٣دا، کاتێ شەڕی عارەب و ئیسرائیل دەستپێکرد، ئەمریکا زۆر هەوڵیدا لەو هەلە سوود وەربگرێت و ئێمە ناچار بکات کە دژی سوپای عیراق رابوەستین و ناوچەکانی

١٩٧٤دا رژێمی بەغدا یاسایەکی ئۆتۆنۆمی یەك لایەنەی راگەیاند، کە گرنگترین نێوچەکانی کوردستانی دابڕیبوو، بە تایبەت کەرکوك‌و خانەقین. بارزانی یاساکەی دایە دواوە، دیاربوو خۆی بۆ ململانێیەکی چەکدارانەی نوێ ئامادەکردبوو.

لەهەمان مانگدا شەڕێکی قورسی بێئامان دەستپێکرد. ئەمجارەیان کوردەکان خاوەنی هەندەك چەکی قورس بوون، شارەزایانی بێگانە مەشقیان پێدەکردن. چیدی شەڕی چەتەگەری نەمابوو، بوو بووە شەڕێکی بەرەیی بەرفراوان بۆ پاراستنی نێوچە ئازادکراوەکان (ئەو نێوچانەی لەژێر رکێفی بارزانیدا بوون). لەئاکامی شەڕدا، سەدان هەزار لادێیی هەڵقەندران‌و ئاوارە بوون، زۆربەیان لەئۆردوگاکانی پەنابەرانی ئێراندا گیرسانەوە. ژمارەیەکی زۆر لەکوردەکانی دانیشتووی بەغداو نێوچەکانی ژێردەستی رژێم، دایانە پاڵ شۆڕش‌و بوونە پێشمەرگە، یاخود بوونە کاربەدەستی ئەو حکومەتە پرزەلێبڕاوەی کوردەکان بۆ بەربەرەکانێی دەستەڵاتی بەغدا قوتیان کردبووەوە . لەسێپتەمبەری ١٩٧٤ەوە تۆپە قورسەکانی ئێران بۆ بەهێزکردنی بەرەکانی کورد، پەڕینەوە دیوی کوردستانی عیراق، هاوکات راکێتە فڕۆکە شکێنە نوێیە نیشانپێکەکانی، بواری فڕۆکەکانی عیراقیان نەدەدا لەبنکەی سەرکردایەتی کورد نێزیککەونەوەو دەستی لێبوەشێنن. ژیانی ئابووریی لەنێوچە ئازادکراوەکاندا بەهۆی شەڕەوە خراپ شێوابوو. وەرزێران لەترسی فڕۆکە نەدەوێران لەکێڵگەکانیاندا کاربکەن. کوردان تەواو تەواو بووبوونە وابەستەی ئێران‌و ئەویش لغاوێکی کورتی لەزارنابوون.

هەرچی هەیە، چەك‌و تەقەمەنی، ئازووقە، جلوبەرگ، گشت لەگشتی لەئێرانەوە دەهاتن، وەلێ هێندەنا، کە بەشی پاشەکەوت بکات.

---

کوردستان بگرین. بەلام لەو رۆژەدا شەخسی بارزانی‌و سەرکردایەتی بەهەلیانزانی ئیسپاتی بکەن کە بڕیاری خۆمان لەدەستی خۆماندا بوو، ئێمە هیچ کات دژی جەماوەری عارەب نیین، بەڵکو ئێمە برای یەکترین.....تاد". ل٦

هەڵبەت لەم دوو بانگەشە دژبەیەکە، تەنها یەکێکیان راستە، بەلام گەلۆ داخۆ راستەکەیان کامەیان بێت؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟

بەدزییەوە چەند ژمەیك گفتوگۆ لەنێوان ئێران‌و عیراقدا کرابوون، تا ٦ی مارتی ١٩٧٥. لە کۆنفرانسەکەی ئۆپێکی جەزائیردا، بەرێککەوتنێك لەنێوان شاو سەدام حسێنی بالآدەسترین پیاوی عیراقدا، کۆتایی هات. هەرچەندە بەرازیبوونی هەردوکلا مۆرکرا، بەلآم بەسەرکەوتنێکی ئێران حسێبکرا. لەبەرامبەر دەستبەرهەلْداگردندا لەکورد، شا دەستکەوتی چەوری پێبڕا، بەتایبەت لەشەتاوی عارەب‌و زۆر جێگەی پڕ گۆبەندی دیکەدا. رۆژی دوایی هێزەکانی ئێران‌و چەکە قورسەکان لە کوردستان کێشرانەوەو لە ٨ی مارتدا لەشکری عیراق هێرشێکی توندی دەستپێکرد. کوردەکان توانییان هێرشەکە راگرن. وەلێ تا دەهات، تروسکەی هیوای خۆڕاگری‌و بەرپەرچدانەوە کزتردەبوو. پاش پێکگەیشتنێکی بارزانی‌و شا، بارزانی رایگەیاند کە چیدی نایەوێت بجەنگێت. لەچەند رۆژێکی کەمدا، بزووتنەوەکەی کورد دارماو شۆڕشەکە هەرەسی هێنا. دانیشتوانی زۆربەی نێوچەکان بۆ ئێرانێك هەلْهاتن، کە سەرکردایەتیشیان پەنای بۆ بردبوو. لەسەرەتای ئاوریلدا بەمەزندە ٢٥٠ هەزار پەنابەرێکی کورد لەئێران بوون. رژێمی عیراق لێخۆشبوونی بۆ گشت بەشداارانی شۆڕشی کورد دەرکرد، پێشمەرگەیەکی زۆر تەسلیم بوونەوە، لەمانگەکانی پاشتردا نێزیکەی ١٥٠ هەزار پەنابەر لەئێران گەڕانەوە. ئەوانەی لەئێران مانەوە، بەسەرتاپای ولآتەکەدا پەرت‌و بلآوکرانەوەو بەنیازی تواندنەوەی هەمیشەییان بوون. واپێدەچوو ئیدی لەعیراق چارەی کێشەی کورد کرابێت[٣٠].

رژێمی بەغدا لەلایەکەوە خەریکی چەسپاندنی یاسای ئۆتۆنۆمی بوو، لەلایەکی دییەوە خەریکی کەینو بەین‌و تەگبیری بەرگرتن‌و بەربەستکردنی راپەرینێکی دیکەی کورد بوو. لەسەر سیاسەتی بەعارەبکردنی خۆی بەردەوام بوو. هەر لەنێوڕاستی ١٩٧٥دا، کورد، راگوێزانی بەکۆمەلّی بەرەو باشووری عیراقی لەقاودا. ١٩٧٦ رژێم دەستیدایە وێرانکردنی ئەو گوندە کوردنشینانەی دەکەونە بەرایی ١٠ تا ٢٠ کیلۆمەتری سەرسنووری ئێران‌و تورکیاوەو راگواستنی خەلّکەکەی بۆ ئۆردوگای زۆرەملێ‌و گوندی شوێنە ستراتیژییەکان (ئەو ستراتیژە نوێیە، سالّی ١٩٧٧، لە "سەنگەرێك یا دوو سەنگەر"ەکەی سەدام حسێندا روون‌و ئاشکرا راگەیەندراوە)[٣١].

جوتكـاران خۆبـەخۆ راپـەڕین، لاوی خوێنگـەرمی شـاریی تێهەڵـچووی سیاسـەت، دایانـــەپاڵیان‌و ڕێکیانخـــستن. لـــەماوەی چـــەند مانگێکـــدا شـــەڕی چـــەتەگەرییان دەستپێکردەوە، ئەگەرچی لەمەودایەکی هێجگار بەرتەسکیشدا بوو.

هەر هێندەی قاوداکەوت پێشمەرگە پەیدا بوونەوەو داوپانەتە شاخ، ئیدی زۆر لەو لادێیانەی گوندەکانیان خاپورکرابوو، گەلەك شاریی نارەزا لەرەفتاری رژێـم، گەیانـدە کنیان.

خەباتی چەكدارانەی نوێی کوردستانی عیراق، تەنها کاردانەوەیەك نەبوو لەحانـد رەفتـاری درندانـەی رژێمی بەغـدادا بەرامبـەر بـە كـورد، بەڵكە هەڵپـەو پەلـەقاژێ‌و ململانێش بوو لەسەر گرتنەوەی جێگەی بارزانی. ئـەوەی بـۆی لوابـا سـەرەتا شۆڕش دەستـپێکاتەوەو سـەرکەوتووانە رێکیخاتـەوە، ئـەوە باشـترین شانـسی دەبـوو. بـارزانی خۆی نەخۆشییەکی سەختی کوشندەی گرتبوو، پەرپیدەی ئـەمریکا بـوو بـوو. جـەلال تالـەبانی، کـە لەسـەروەختی دواهـەمین شـەڕدا، نوێنـەری بـارزانی بـوو لەسـوریاو گوێڕایـەڵی فـەرمانی بـوو، چـاوەڕێی دەرفـەتی دەکـرد. کـوڕانی بـارزانی، ئیـدریس‌و مەسعود، کە ساڵانی دوایی بزووتنەوەکەیان رێبەریی دەکرد، حـسێبی خۆیـان لەسـەر دڵـسۆزیی‌و پـشتیوانیی زۆربـەی کرمانجایـەتی هەڵدەچـنی. هـەمانکات سـامی ئەورەحمان‌و مەحمود عوسمانی کۆنەباوەڕپێکراوانی بارزانییش، هەڵوەدای ئارمـانجی تایبـەتی خۆیـان بـوون. تالـەبانی رێکخراوێکـی بـەنێوی (یـەکێتی نیـشتمانی کوردسـتان)ەوە دروسـتکردو پەیوەنـدیی بەیەکـەم مـەفرەزەکانی شۆڕشـەکەی کوردستانی خوارووەوە کردو پاشان خـۆی جڵـەوی رێبـەریی گرتـە دەست سـاڵی ۱۹۷۷ بنکەی سـەرکردایەتی یـەکێتی نیـشتمانی لەدیمەشقەوە گوێزرایـەوە بـۆ کوردسـتانی عـیراق. جووتـە کوڕەکـەی بـارزانیش بەدوویـدا: هـەر لەئێرانـەوە دەستیانکردەوە بـە دامەزراندنەوەی پارتەکەیان، نێویاننا (پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان ـ سـەرکردایەتی کاتی). سامی ئەورەحمان بەچەند سەد پیاوێکەوە جموجۆڵی پێشمەرگانەی لەنێوچە سنوورییەکانی تورکیاو عیراقدا دەستپێکردەوە. لەئاوریلی ۱۹۷۸دا شەڕو پێکدادانێکی توند لەنێو هەردووك رێکخراوەکەدا روویـدا پیاوەکـانی تالـەبانی شـالاویان بردەسـەر

بارەگای سامی، بەلام بە. کوشتارێکی زۆرەوە خراپ شکێندران. هەردوکلا، تەواو لاوازبوون، شیرازەیان تێکچوو. سالانی پاشتر سامی دەگەل جووتە بارزانی برادا تێکیداو بۆخۆی پارتێکی دیکەی دروستکرد. محمود عوسمانی گوردێریان هەرزوو جودابووەوەو رێکخراوێکی سەربەخۆی دروستکرد، ١٩٧٩ دەگەل بالێکی داپچڕاو لەیەکێتی نیشتمانی کوردستاندا یەککەوتو پێکرا حیزبی سۆسیالیستی کوردستانیان دامەزراند. ئالەو ئانو ساتانەدا شۆرشی گەلانی ئێران شایەنی باری سیاسی نێودەولەتانی قلپکردەوە، کوردیش پرپشکێکی بەرکەوت.

### ١ ـ ٨ ـ ٢ ـ کوردستانی تورکیا، لە ١٩٦٠ەوە بۆ ١٩٨٠

هەستی نەتەوایەتی کورد کە لە سالەکانی بیستو سیدا، تەواو سەرکوێرو سەرکوتکرابوو، لەشێستەکاندا هێدی هێدی بووژایەوەو تینی تێکەوتەوە. بێشك سەرکەوتنەکانی بارزانی لەعیراقدا هاندەرێکی چاك بوون، وەلێ گەشەکردنی سیاسیو کۆمەلایەتیو ئابووریی تورکیا خۆیشی، بارێکی ئاوەهای خولقاند، کە هەستی نەتەوایەتی کورد سەرپێکەوێتەوە. گەلەك لەو کوردانەی لەگوندەکانی کوردستانەوە بۆ بازێرەمەزنەکانی خۆرئاوای تورکیا رەویاندەکرد، هەستیان بەو جوداوازییە کولتووریو گەشەکردنە ئابوورییە فراوانەی خۆرهەلاتو خۆرئاوای تورکیا دەکرد. جگە لەوە، تادەهات لاوانی کورد زێتر دەرفەتی خوێندنیان بۆ دەرەخساو تێکەل بە سیاسەتبازی دەبوون.

سالی ١٩٦١ دەستوورێکی نوێ بۆ تورکیا دانرا، کە ئازادییەکی سیاسی تا ئەودەم نەدیتراوی هێنایە گۆرێ پارتێکی سۆسیالیست بەنێوی "پارتی کارکەرانی تورك"ەوە دروستکرا. یەکێك لەو کێشانەی کە ئەم پارتە خۆی بۆ تەرخاندەکرد، گرفتی پەرەنەستاندنی خۆرهەلاتی تورکیا بوو، کە سیاسەتی دژەکوردی لەوەبەر بەهۆکاری دەزاندرا. بەپێی تێخوێندنەوەی تیۆرییە مارکسیزمە کلاسییەکان، مافی دیاریکردنی چارەنووسی میللەتان کرایە بەرنامە. پارتەکە لایەنگری فرەی لەنێو رۆشنبیرانی کورددا پەیدا کردو بووە بنەما بزووتنەوەی پاشەرۆژی کوردی تورکیا.

کوانویەکی دی "پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا" بوو کە بەنهێنی تێدەکۆشا. ئەم پارتە ساڵی ١٩٦٥ لەلایەن دەستەیەك رۆشنبیری سەربە توێژاڵە ئۆرۆستۆکراتیە تەقلیدییەکەوە دروستکراو لەژێر تین‌و تاوی بارزانییدا بوو. هەردوك پارتەکە لەکۆتایی شێستەکاندا سەرگەرمی دامەزراندنی کۆمەڵەی کولتووریی‌و رێکخستنی کۆڕو کۆبوونەوەی جەماوەریی بوون لەشارەکانی کوردستاندا. پاش کودەتا سوپاییەکەی ١٩٧١ گەلەکیان گیران‌و ئەوانەی مانەوە ناچاری چالاکیی نهێنی بوون. بڕێکیان بۆ کوردستانی عیراق هەڵهاتن‌و خواستیان شەڕی چەتەگەریی دژی تورکیا دەستپێبکەن. دیارە بارزانی بواری سەرەڕۆییەکی نەدەدا، کە جێپێی خۆی بنکەل بکات. جووتە سەرکردە گوردێرەکەی هەردووباڵی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا، بەکارەساتێکی لێڵ‌و نادیار تێداچوون[٣٢]، کە پاشان تۆوێکی زۆری بەدگومانیی چاند.

پاش وەرچەرخانەوەی تورکیا بەرەو دیموکراسێتی‌و سیستێمی پارلەمانی لە ١٩٧٣دا، رێکخراوە کوردییەکان بەزوویی تەشەنەیانکردو روویان لەرادیکالێتی کرد. هەر زووتر، بەر لە ١٩٧٠ داوا گرنگەکانی کورد بۆ گەشەپێدانی ئابووریی ویلایەتە کوردییەکان‌و دانپێدانانی مافە کولتورییە سەرەتاییەکانی (وەکی خوێندن‌و نووسینی کوردی) کرابوونە ئامانج. لەحەفتاکاندا رێکخراوە کوردییەکان پێشبڕکێییان بوو لەسەر ئەوەی داخۆ کامەیان داخوازیی توندڕەوانەتر دەکاتە دروشمی‌و بەگشتی ملیان بەرەوجوداوازی دەنا. ئەم ئارەزووە بەوە شێلگیرانەتربوو، کە چەپی تورك "یەکێك لە دۆستە نێزیکەکانی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد" یا لەکێشەی کورد دەسڵەمییەوەو خۆی تێنەدەگەیاند، یاخود خۆی دەکردە دەمڕاست‌و ردێن سپیی. سەردەمی لاوازیی دەستەڵاتی نێوەندیی لەساڵانی ١٩٧٥ەوە تا ١٩٧٨، بە لیبەراڵترین قۆناغی مێژووی تورکیا دەژمێردرێت، دەرفەتی چالاکیی‌و جموجوڵێکی بەرچاوی لەبواری رێکخستن‌و پڕوپاگەندەدای بۆ رێکخراوە کوردییەکان رەخساند. هەتا لەگچکەترین شارۆچکەکانیشدا لقی چەندین رێکخراوی کوردی دامەزران، کۆڕو کۆبوونەوەی سیاسی رێکدەخراو دەمەتەقێ دەکرا. بەڵام جوداوازیی ئیدیۆلۆژیی‌و

بەرنەهەرشتێك دوژمنایەتیو رکەبەرایەتی تاقەکەسی، هۆکاری چەندین دووبەرەکیو کەرتو پەرتبوون بوونو رێکخراوەکانیان داوەشاند، تا کۆتایی حەفتاکان نێزیکەی ١٠ رێکخراوی جوداواز توقتبونەوە.

کە ١٩٧٦، ١٩٧٧ شۆڕشی نوێی کوردستانی عیراق هەلگیرسایەوە، بڕێك رێکخراوی کوردستانی تورکیا کەوتنە هاریکاریی رێکخراوە هاوبیرەکانیانو کۆمەکی لۆجیستیکی چاکیان پێکردن، هەندێکیشیان تەنها خۆیان بە کوردستانی تورکیاوە خەریکدەکرد. چەندێکیان توانییان هەندەك مەلبەند بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوەو ئەمە جار جارە دەبووە هۆی شەڕو پێکدادان دەگەڵ رێکخراوە تورکیو کوردییە گوردێرەکانیاندا. رێکخراوەێکیان کە نێوی (پارتی کرێکارانی کورد PKK)ی لەخۆنا، بانگی جەنگی "دژە کۆلۆنیالیزم"ی هەڵداو زەبری شۆڕشگێڕانەی لە "تورکە کۆلۆنیالیستەکان"و کوردە "بەکرێگیراو"و "خیانەتکارەکان " وەشاندن. "خیانەتکاران" سەرۆکهۆزو سیاسەتبازو ئەندامانی رێکخراوە گوردێرەکان بوون. زەبرێکی هێند توندو دڵڕەقانەیان لەوسەرەکهۆزەکان وەشاند، کە مەگەر لەوەبەر جار جارە لەسەرەکهۆزەکان خۆیان وەشابێتەوەو شۆرەتیان پێپەیدا کردبێت، بەوە دەستەڵاتی PKK لە هەندەك مەلبەندو نێوچەدا زاڵبوو.

توندڕەویی سیاسی، نەك تەنها خۆرهەلات، بەڵکە سەرتاسەری تورکیای گرتەوەو زەبرو زۆر باڵیکێشا. لەدێسەمبەری ١٩٧٨دا یاسای جەنگ سەپاو دەستدرایە سەرکوتکردنو سزادانی توندی چەپیو کوردە ناسیۆنالیستە چاکەکان. ئەمە بەزۆری ئەو رێکخراوو داو و دەزگەیانەی گرتەوە کە ئاشکرا کاریاندەکرد، وەکی جڤاتی کرێکارانو دەزگە کولتورییەکان. سەرەرای یاسای جەنگو سەرکوتکردنیش، خەباتی نهێنی هەربەردەوام بوو. رێکخراوەکان لەسەرتاسەری کوردستانی تورکیادا سەرگەرمی پروپاگەندەی سیاسی خۆیان بوون. گەر کەسێکی (وەکی من)، لەکۆتایی حەفتاکاندا رێگەی کەوتبا گوندەکانی کوردستان، پاڵپشتو پشتیوانی پتەوی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی لەوێ دەدیت، هەرچەندە لەبڕێك هەرێمو نێوچەدا شەڕەزرتانێی رێکخراوە گوردێرەکان هێوریو ئارامییان شڵەقاندبوو.

له ١٢ى سێبتەمبەرى ١٩٨٠دا، سوپا دەستەڵاتی گرتە دەستو وڵاتی پاکژکردەوە. ڕەشبگیریو شاڵاوی سوپایی، شیرازەی ڕیکخراوە کوردییەکانیان هەڵتەکاند. بەوپەڕی تواناوە هەوڵدەدرا چ لەڕێگەی "سەرکوتکردنی جوداخوازانو' تواندنەوەو چ لەڕێگەی بوژاندنەوەی باری ئابوورییەوە (هەڵبەت بێ سەرکەوتنێکی ئەوتۆ)"، بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد سەرکپو خامۆشکرێت[٣٢].

## ١ـ ٨ـ ٣ـ کوردستانی ئێرانو شۆڕشی ئێران

پاش کۆماری مەهاباد ئیدی لەکوردستانی ئێراندا زۆر دەگمەنو لەبوارێکی هێجگار تەنگدا بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد دەبزوا. پاشماوەکانی پارتی دیموکرات جار جارە بەدزییەوە چالاکییەکیان دەنواند هاریکارییەکی بێئەندازەی حیزبی تودەیان دەکرد. کودەتاکەی ١٩٥٣، کە شای گێڕاوە سەر خوانی دەستەڵات، ڕەشبگیریو پەرەوازەکردنی هێزە مەترسیدارە هەڕەشەکەرەکانی بەدەمەوە بوو. حیزبی تودە دارزێندرا، سەرکردەکانی پارتی دیموکرات یا گیران، یاخود پەڕیدەی هەندەران بوون. پێدەچێت ژمارەیەکی هێجگار کەمی کادێرەکانی لەکوردستاندا مابنەوە. بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی عیراق کارێکی زۆری کردە سەر کوردی ئێران. وەك دەردەکەوێت، چالاکییە نوێکانی پارتی دیموکرات لە ١٩٦٢ بەدواوە، بریتی بووە لەکۆکردنەوەی پیتاكو خواردنو جلوبەرگو پشتگیریی لۆجیستیکی بۆ پێشمەرگەکانی بارزانی.

لەنێوڕاستی شێستەکاندا، لەنێوئەندامە چالاکەکانی پارتی دیموکراتدا "کە زۆربەیان لەکوردستانی عیراق بوون"، دوو ڕێباز سەریانهەڵدا. ڕێبازێکیان دەیخواست وەکی ڕێکخراوێکی پشتگیریکەر لەبزوتنەوەکەی بارزانی بمێنێتەوە، یەکێکی دیکەیان کە لەئەندامە لاو و ڕادیکالەکان پێکهاتبوو، لەپێوەندییە توندو تۆڵەکەی بارزانی بە ئێرانەوە دردۆنگو لەزاڵبوونی دەستەڵاتی بەسەر پارتەکەیاندا ناڕازیبوون. بارزانییان بەوە تاوانباردەکرد، کە بۆ مەبەستو ئارمزووی خۆی، بەهۆی وابەستەیی بە شاوە، ڕێگەی خەباتیان لێدەبەستێتەوە. لەو باوەڕەوە کە گوایە باری کوردستانی

ئێـران بـۆ شـۆڕش و راپـەڕین هـەموارەو لـەژێر تـاوی تیۆرییـە ئـەودەم جـەماوەر هەژێنــەکانی جیفـارادا، برێــك لـەرادیکالترین ئەندامــەکانی گەڕانــەوە کوردسـتانی ئێـران و سالآنی (١٩٧٦ / ١٩٦٨) هەوڵیانـدا زەمینـە بـۆ شـەڕی چەتەگەریی خۆشکەن. لەڕاسـتیدا هـیچ سـەرکەوتنێکیان وەدەسـتهێناو لــەهیچ جێیــەك جــووتێران پـشتگیرییەکی ئـەوتۆیان لێنــەکردن، لـەماوەی سـاڵێکدا سـاواك و ژانـدارم توانییـان ریشەکێـشیانکەن. قــاو وابــوو گوایــە پیاوەکــانی بــارزانی لەدەســتگیرکردنی ئــەو شۆڕشگێڕانەدا بەشداربوون. ئـەو تاوانـە نەقـەت ئیسپاتکراو نـە هەڵتـەکێنرا، وەلـێ بووە پاشخانی گەشەکردنی رچەیەکی دژەبارزانی لەنێو کوردەکانی ئێراندا و هۆکاری چەندین پێکداهەڵپژانی لەوەدوا.

ئیدی لە ١٠ ساڵەکەی لەوەپاشیدا، هیچ جۆرە جموجۆڵ و چالاکییەکی رێکخراوەیی لەکوردستانی ئێراندا نەما. ساواك و ژاندارم نێوچەکەیان تەواو تـەواو لـەژێر رکێفدا بـوو. بـەپێی یاسای "نـان و شـەق" رەفتاریانـدەکردو بـە سیاسـەتی "گونجانـدن یـان تۆقانــدن"، بــەریان بەڕاپــەڕین و بەربەرەکانــێ دەگـرت. تـا ١٩٧٨، لەسـاڵی شۆڕشـدا پەشــم وقینی پەنگــەوەخواردوو لەکوردســتان و ئوســتانە شــیعەکاندا بەراپــەڕین و خۆپیشاندانی جەماوەریی تەقییەوە. لەهەندەك شوێنی کوردسـتان، هـەر لـە ١٩٧٧ەوە بزووتنەوەی گچکەو لێـرەو لـەوێی وەرزێـران دژی ئاغـاو دەرەبەگـەکان سـەریانهەڵدا، دنـەدەری ئـەو جموجۆڵانـە رێکخراوێکی نهێنـی بـوو کـە پاشـان بـە کۆمەڵـە ناسـرا. زۆربـــەی خۆپیـــشاندان و رێپێوانـــەکانی ١٩٧٨ لەلایـــەن کۆمیتـــە لـــەناکاو و تـــازە دامەزراوەکانەوە رێکدەخران، کە زەقتریـن و گـرنگترین داواکارییـەکانیان، ئـازادکردنی بەندەسیاسییەکان و گۆڕینی سیستێمی سیاسی بوون.

هێـشتا هـیچ پـارت و رێکخراوێـك لەگۆڕێـدا نـەبوو تـا جڵـەوی ئـەو جموجـۆڵ و چـالاکییانە بگرێتـە دەسـت و رێکیانخـات. سـەرکردایەتی پـارتی دیمـوکرات لـەنیوەی دووهـەمی سـاڵی ١٩٧٨دا لەپەڕیـدەیی هەنـدەران گەڕایـەوە ئێـران، بۆیـە بـۆی نـەلوا دەمودەست بزووتنەوە سیاسییە خۆسـەرییەکان بخاتـە ژێـر رکێفـی خۆیـەوە. لەگـەڵ ئەوەشدا، بزووتنەوەکە گەشگەش سیمای بزووتنەوەیەکی نیشتمانپەروەرانەی کوردی

لێنیشت. عیززەدین حوسەینی، ئیمام جومعەی مەهاباد، کە تا ئەو دەمە کەسایەتییەکی تاراددیەك نەناسراو بوو، وەکی سەرکردەیەکی هێژاو درەوشاوە کەوتە پێشچاوان. چ لەلایەن ئیماندارانەوەو چ لەلایەن چەپییە رادیکالەکانیشەوە پەسەندکرا. هەڵبەت چ پارتی دیموکراتو چ کۆمەڵە لەمەهابادو سنەی جەرگەی مەڵبەندی چالاکییانەوە، لە هەڵپەی دروستکردنی رێکخراوەکانیاندا بوون، تا بتوانن لەدەرفەتی گونجاو و لەباردا حوسەینیو ئەوسەرکردە هەڵکەوتووانەی لەبۆتەی شۆڕشدا خولڤاند، کەناریانخەن.

هەر کە رژێمی شۆڕشگێڕ دامەزرا، لەفێبریوەری ١٩٧٩دا گفتوگۆو وتووێژی نوێنەرانی کوردو رژێمی شۆڕشگێڕی تازە کوورە دەستپێکرد. متمانەو لێکتێگەیشتن هێجگار کەم بوو، چونکە لەهەردوکلادا چەندین باڵو چەقی دەستەڵاتی ناحەزو دژبەیەك پەیدابوو بوون. لەمانگەکانی یەکەمدا چەندین جار لەکوردستان تەقەو پێکداهەڵبڕژان لەنێوان کوردە نیشتمانپەروەرەکانو لایەنگرانی رژێمی ئیسلامیدا روویداو هەرلایەك ئەوی دی بە دەستدرێژیکەر دادەنا، لەو دەمانەدا کوردەکان لەسەر گرنگترین داواکارییان یەککەوتن: ئۆتۆنۆمی بۆ سەرتاسەری نێوچە کوردنشینەکان. لەلایەکەوە کوردەکان ترسی ئەوەیان هەبوو، کە دەستەڵاتدارە ئیسلامییەکان هێندەیان پێرەوانەبینو ئەو روونیشاندانە ناچاری بێت، لەلاکەی دییەوە دەستەڵاتدارە ئیسلامییەکان لەدڵسۆزی کورد بۆ شۆڕشی ئسلامی بەدگومان بوون: ئەوەبوو کوردەکان لەسەر داخوازیی پارتی دیموکراتو کۆمەڵە، بەشداریی ئەو گەلپرسییەیان نەکرد، کە بۆ دامەزراندنی کۆمارێکی ئیسلامی سازکراو یەکپارچە دوورەپەرێز وەستان. پرۆگرامی پارتی دیموکرات ئەوپەڕی دنیایی بوو، پرۆگرامی کۆمەڵەش دژە ئاینی. جگەلەوانەش، پارتی دیموکرات سەردەمێکی دوورو درێژ پێوەندییەکی دۆستانەی پتەوی لەگەڵ رژێمی بەغدا (ئەهریمەنی گچکە) دا هەبوو. لەئۆگۆستی ١٩٧٩دا، پزیشکی پێشهاتێکی چکۆڵەی یەکێك لەشارە سەرسنوورییەکان، کلێەی گری یەکەم شەڕی دژەکوردی هەڵایسان. لەشکر شارە کوردەکانی گرت، صەدان کەس لەوشەڕانەدا کوژران، پاشان گەلەکی دی ئیعدامکران. هەزاران هەڵۆدەای کێوان

بـوون. پـاش چـەند مانگێـك ئاگربـەس كـراو گفتوگـۆ دەسـتپێكرد. هەرچـەندە هەڵبژاردنەكەی پارلەمان لەمارتی ۱۹۸۰دا تەنها هەندەك شوێنی كوردستانی گرتـەوە، لەگـەڵ ئەوشـدا پـشتگیرییەكی بـەربلاوی پـارتی دیمـوكراتی سـەلماند. لەئاوریلـدا هێرشێكی نوێ دەستپێكرایەوەو هەمدیسان ئاگربەسێكی لـەرزۆكی بـەدوواهات. لـە ۱۹۸۰/۹/۲۳دا عـێراق شـالاوێكی كوتـوپڕی بـردە سـەر ئێـرانو جـەنگێك هەڵگیرسا، كـە وارو وێخـی هـەردوولای هەڵتەكانـد، كـوردی هـەردوكلاش كەوتنـە نێـوان مـشتەو دەزگاكەوە[٣٤].

## ١ـ ٨ـ ٤ـ حاڵو بارەكە لە ١٩٨٠ بەدواوە

پێشهاتە نوێكان بۆ كورد هێجگار نالەباربوون. رژێمەكانی ئێـرانو عـێراقو توركیـا گەلـە لەشـكری خۆیـان لەنیـشتمانپەروەرانی كـورد بـەردا. سـەركوتكردنو تۆقانـدن باڵێكیشاو كەسی هەڵنەدەبوارد، هیچ حسێبێك بـۆ مـافی مـرۆڤ نـەدەكرا. دوو بـەرەی گـرنگ لەجـەنگی ئێـرانو عیراقـدا دەكەوتنـە كوردسـتانەوە، لەهەردووبـەری سـنوور گەلـەك گونـد خـاپووركران. هـەتا جـەنگیش شـەڕی دژە كـوردی هـەردوو رژێمـی پێرانەگیرا. هەردوولاش ـ سـەركوتووانە ـ هەوڵیانـدەدا كوردی لایەنەكـەی دی بكەنـە هاوسـەنگەری خۆیـان. ئـۆردووی تـورك پەڕییـەوە كوردسـتانی عـێراقو بـۆ شـالاوی دیكەش خۆی مەلاسدا. سەرباری ئەوەش پارتە سیاسییەكانی كورد تەنها رووبەڕووی حوكومەتـەكانی خۆیـان نەوەسـتانەوە، بەڵكـە سـەنگەری دوژمنایەتیـشیان لەیەكـدی گرتو جار جارەش تێكبەردەبوون. كوردستانی هەشتاكان وێنەیەكی ئاڵۆزو شێواو و پاشەرۆژ نادیارە. لەوەش شلێوتر ئەوەیە، كە گەلەك رێكخراوی نۆپۆزیسیۆنی دیكە، بارگەو بنەی لەكێوەكانی كوردستاندا خستووە.

پـارتی كۆمۆنیـستی عـیراق، بـە گەلـەك ئەنـدامی كوردیـەوە، پـاش تۆرانـە هێجگارییەكـەی ١٩٧٨ی لەسـەدام حـسێن، بنكـەی سـەركردایەتی بـردە كوردسـتان. موجاهیدینی خەڵق، لە ١٩٨٠وە بارەگای لەوێ هەیە. گەلەك رێكخراوی نۆپۆزیسیۆنی

گچکەی دیکەش، کە دەگەڵ ڕێکخراوە کوردییەکاندا بەرەی هاوبەشیان پێکهێناوە، ئەم هەموو تێکەو لێکانە پێناچێت بەرقەراربن‌و پاشەڕۆژێکی روونیان هەبێت.

لەکوردستانی عیراق دوو ڕێکخراوی گرنگ هەن: یەکێتی نیشتمانییەکەی تاڵەبانی‌و پارتە هەمدیسان دامەزرێندراوەکەی جووتە برا بارزانییەکە. پارتە گچکە سۆسیالیستەکەی کوردستان‌و پارتە کۆمۆنیستە عیراقییە لێومشاوە سیاسییەکە، سەرەتا دەگەڵ یەکێتی نیشتمانییداو پاشان دەگەڵ پارتدا بەرەیەکیان پێکهێنا، کە تۆوی بەدگومانییەکی زۆری لەنێوان ئەوان‌و یەکێتی نیشتمانییدا وەشاندو پاشانیش چەندین شەڕی خوێناوی لەنێواندا هەڵگیرساندن.

پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق تا رادەیەکی زۆر وابەستەی ئێرانە، زۆربەی هەرەزۆری پێشمەرگەکانی، ئەو کوردە عیراقیانەن، کە لەئێران پەنابەربوون. بارزانییەکان پێوەندییەکی دۆستانەی دێرینیان دەگەڵ خێڵەکانی باکووری کوردستانی ئێراندا هەیە، دەنا لای کوردەکانی دیکەی ئێران زۆر دزێو و ناپەسەندن. ١٩٧٩ و ١٩٨١ برێك کێشەو گرفتی گچکە لەنێویاندا روویدا، وەلێ ١٩٨١ پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق ئاشکرا پەلاماری پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێرانی داو بۆ دەرپەڕاندنیان لەبنکەکانی باکووری ئێرانیان، پشتگیری لەشکری ئێرانیان کرد. ئەو پێشهاتە پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران‌و یەکێتی نیشتمانی لێکنزیکخستنەوە، چ پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران‌و چ کۆمەڵە، لەڕووی دارایی‌و لۆجیستیکییەوە وابەستەی عیراقن، لەگەڵ ئەوەشدا پێدەچێت چکێك سەربەخۆیی خۆیان پاراستبێت، هەرچەندە هاریکاری ئاشکرا دەگەڵ یەکێتی نیشتمانییدا نەدەشیا، بەڵام وادیارە ١٩٨٤ پارتی دیموکرات رۆڵی نێوبژیکەری لەنێوان یەکێتی‌و رژێمی بەغدادا دیت‌و گفتوگۆ سازکرا. (وەلێ نەگەیشتنە هیچ ئاکامێك). هەڵبەت مەڵبەندو بنکەی سەرەکیی پارتی دیموکرات دەوروبەری مەهابادە، بەڵام پێدەچێت بەرەو خوارتریش جەماوەری چاکیان هەبێت.

کۆمەڵە گەورەترین گوردێری پارتی دیموکرات بوو، بنکەی جەماوەری دەوروبەری سنە بوو، پاشان دەگەڵ ڕێکخراوێکی گچکەی نا کورددا یەکیانگرت‌و پێکرا پارتی

کۆمۆنیستی ئێرانیان پێکهێنا. پێناچێت هیچ ڕێکخراوێکی کورد توانیبێتی لەنێو تیعە کوردەکانی باشووری کوردستانی ئێراندا، کە زۆربەیان پشتگیری ڕژێمی ئیسلامی ئێران دەکەن، جێپێی خۆی کردبێتەوە. هەر لەسەرەتاوە کۆمەڵەو پارتی دیموکرات کەوتنە دوژمنایەتی یەکدی: کۆمەڵە پێیوایە پارتی دیموکرات ڕێکخراوی فیۆدال‌و بۆرژوایانە، پارتی دیموکراتیش کۆمەڵە بە سەرکێش‌و توندڕەوو زڕەچەپ نێودەبات. لەراستیدا لەڕووی ڕەچەڵەکی ئەندامانیانەوە هیچ جوداوازییەکی ئەوتۆیان نییە. هێندە هەیە کۆمەڵە ئەندامی لاو و تاڕادەیەك ڕووناکبیری زۆرە، کە شانازی بە هەڵوێستی سەرکەشانەی خۆیانەوە دەکەن، بەڵام پارتی دیموکرات زۆر بەتەنگ ئەوەوەیە کە دڵنەوایی کەسایەتییە نەریتییەناسراوەکانی کوردستان بکات[٣٥].

پاش کودەتاکەی ١٩٨٠ی تورکیا، ئەندامە چوست‌و چالاکەکانی ڕێکخراوە جۆربەجۆرەکانی کورد، یا بۆ کوردستانی ئێران هەڵهاتن، یاخود بۆ کوردستانی عیراق. پەیوەندییان بە کوردستانی تورکیاوە بەدەگمەن‌و هەڵکەوت بوو، پێدەچوو ئۆردووی تورك توانیبێتی ڕیشەی زۆربەی پارت‌و ڕێکخراوەکان بدۆزێتەوەو زەبری کوشندەی لێدابن. ئیدی هیچ هەوڵێکی ڕاستەقینەی ئەوتۆی لەکوردستانی تورکیادا بۆ چالاکی‌و جموجۆڵی سیاسی‌و کەوتنەوە گەڕ نەدرا، جگە لەتاقە حاڵەتێك نەبێت: لە ١٩٨٤ەوە پارتی کرێکارانی کوردستان PKK، لەبنکەکانی باکووری عیراقەوە (بەتایبەت لەو نێوچانەوە کە لەژێر ڕکێفی بارزانیان دان) پێشمەرگەی چەکدار دەنێرێتەوە تورکیا. ئەو پێشمەرگانە پەلاماری تیپەکانی ئۆردووی تورك‌و خۆفرۆشانی کورد دەدەن. بەڵام پێناچێت لەلایەن دانیشتووانی نێوچەکەوە پشتگیریەکی ئەوتۆیان لێبکرێت "ڕەنگە زێتر لەترسی تاڵاوی تۆڵەی تورك بێت".

پێدەچێت PKK زەبرو زۆر بە تەنها ئامراز بزانێت بۆ سەپاندنی خۆو دەستخستنی کایەی ڕێبەرایەتی لەنێو ڕێکخراوە کوردییەکانی تورکیادا. بۆیە بێ پێشچاوگرتنی سەرکەوتنێکی ئەوتۆ، درێژە بە خەباتی چەکدارانە لەکوردستانداو بەربەرەکانێی ڕێکخراوە گوردێرەکانی لەکوردستانی عیراق‌و دەرەوەدا دەدات[٣٦].

لایــەنگرە چوســتو چــالاکەکانی پــارتو ڕێکخــراوە کوردییــەکان، هەمیــشە کەمینەیەکی کەم بوون. ڕژێمی عـیراق گشت کـات لەتوانایـدا بـووە هێنـدەو زێتریـش کورد بۆدژایەتی بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورد خرکاتەوە، هەتا لـەئێرانو تورکیـاش لــەو دوا دواییانــەدا دەوڵــەت توانیویــە کــوردێکی زۆر بــۆ بەرەنگاربوونــەوەی بزووتنــەوەی نیــشتمانی کــورد پەیـدا بکـات. ئـەز لـەو گەشـتە دوورو درێژانــەی کوردستانمدا، لەبەر ڕۆشنایی هەزاران وتوویـژو دەمەتەقێمـدا، بـۆم ئاشـکرا بـووە کـە هەسـتی نەتەوایـەتی لـەنێو کوردانـدا هێجگـار بـەربلاوە، هـەتا لـەنێو ئەوانـشدا کـە لەخــەباتو تێکۆشـان دوورەپــەرێزن. لەگــەڵ ئەوەشــدا هەســتو ســۆزی یــەکێتیو یـەکبوون هێنـدە ڕەنگ داکوتـاوو سـەقامگیر نییـە، کـە بتوانێـت جوداوازییـەکانی دی کەلاخات. کۆمەڵەو پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران، پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراقو یەکێتی نیشتمانیی، PKK و گەلـەك ڕێکخـراوی دیکەی کوردسـتانی تورکیـا، (تا رادەیەك) نوێنەرایەتی چەندین چینو توێـژی جۆراو جۆری کۆمەڵگە دەکەنو زۆر جوداوازیی سیاسیو ئیدیۆلۆژییان لەنێواندایە.

مێشەو گرفتی نێوانیان، ئاوێنەی باڵانمای ئەو پێبەنـدییو دژایەتییـە بنجییانـەن، کە ئەم کتێبە خۆی پێوەخەریکدەکات، تا مەودایەك دەگەڕێنەوە بۆ ئەو دەورو ڕۆڵە سەدان ساڵ دێرینەی کوردستان وەك کەوشەنی سنووری چـەندین دەوڵـەتی دوژمنـی یەکـدی. لـەو بابەتانـەدا کـە مێـژووی کـوردی تێداهەڵدەشـێلین، چـەندین نموونـەی جووتو هاوتەریبی باری ئەوڕۆ دەبینینەوە.

بـەهۆی فراوانـی خـاکیو هەمـە چەشـنەیی سروشـتی ژینگـەیو بـەربلاویی جموجـۆڵو چـالاکییە ئابوورییـەکانیو کاریگـەریّتی پێـشهاتە مێژوویـە نێوچـەییە جوداوازەکانـەوە، لەکوردسـتاندا ژمارەیـەکی فرەچەشـن ڕێکخـراوی کۆمەڵایـەتیو سیاسی تەرزیان فرێداوە.

توێژینـەوە ئێتنۆلۆژییـە بەردەسـتەکانی لـەو ڕێکخراوانـە کۆڵیونـەوە[1]، بـەپێی ڕێبازو جۆری لێکۆڵینـەوەیان دەگۆڕدرێن. هـەم حـەزو ئـارەزووی لێکۆڵەرەوەو هـەم تەگـەرەو بەرهەڵـستەکان ڕەنگپێدەدەنـەوەو لێکۆڵینەوەکـە دەترنجێننـە کـونجی بابەتێکی سیاسی هەژاوەوە. ئۆبـاڵی ئـەو دژایـەتیو ناسـازییانەی لـەو لێکۆڵینەوانـەدا دەدیترێـن، تـەنها گـەردنی ئیتنۆلۆژەکـان ناگرێتـەوە، چکێکیـشی دەکەوێتـە ئەسـتۆی هەلکەوتی کۆمەلگەکە خۆی. جگەلەوە ئـەو لێکۆڵینەوانـە پـەلیان بـۆ گـشت لایـەنێك نەهاویشتووەو سەراپایی نیین.

لەراستیدا ناتوانرێت هیچ یـەك لـەو ڕێکخراوانـە بـە "تایبـەت بـەکورد" دابنـرێن. گـەر سـەرپێی تێـبڕوانین "ڕێکخـراوی کۆمەڵایـەتی کـورد"ی ڕەسـەن بەدیناکـەین. جوداوازییەکان هێجگار قەبەو زەقن، لەگەڵ ئەوەشدا دەشێت هێنـدێك یاسای گشتی لەو جوداوازییە تایبەتانە هەلگۆزینو ئەز وەکی بنەمای گەلەك شێوەی ڕاستەقینەی ڕێکخـراوە کۆمەڵایەتیـەکان مامەڵـەیان لەگـەڵ دەکـەم. بـۆ هەربابـەتێکی باسـکراو نموونەیەکی شیاو دەهێنینەوە.

لەسـەرەتادا، لەبابـەتی یاسـا گـشتییەکاندا، شـێرازەی یاسـایەکی گـشتییم دەستیـشانکرد: ئـەویش ئـەو وەچـانە بـوون، کـە لەبـەرەبابێك کەوتوونـەوەو ژنو ژنخوازییـان هـەر لەنێوخۆیاندایـە. گـشت کـوردان خێڵـەکی نـیین، لـە گەلـەك جـی ئەوانەی سەر بە هیچ خێڵێك نیین، زۆربـەی دانیـشتووان پێکدەهێنن. شـایانی باسـە کە جوداوازیی نێوان کوردی خێڵەکیو کوردی ناخێڵەکی لەلایـەن کوردان خۆیانـەوە دەستنیـشانکراوەو پڕاوپـڕی ئـەو پێوەرانەیـە، کـە کۆمەڵناسـەکان دیارییـان کـردووە. (لـەبوارێکی دیکـەدا باسـی کـوردی ناخێڵـەکیو پێوەنـدی بـە خێڵەکانـەوە دەکـەین). ناخێڵەکییـەکان بەنێزیکە لەگشت سـەردەمێکدا، (لایـەنی کـەم تـا ئـەم سـەروەختە)،

لەڕووی سیاسیو ئابوورییەوە پەیوەستەو پێبەندی کوردە خێڵەکییەکان بوون. یانی دیاردەی فیۆدالیزم بەسەر شیرازەی خێڵدا زاڵە.

## ٢ـ ١ـ هۆزو دابەشبوونی

خێڵە کوردەکان یەکەیەکی کۆمەڵایەتی سیاسینو بەگشتی بە مەڵبەندێکەوە بەستراونەتەوەو لەو ڕووەوە یەکەیەکی ئابووریش پێکدەهێننو لەسەر بنەمای ڕەچەڵەكو خزمایەتییەکی ڕاستەقینە یاخود هەڵبەستراو هەڵچوونو شیرازەیەکی نێوخۆیی دیارکراویان هەیە. خێڵ لەچەند کەرتێکی لەخێڵ گچکەتر پێکدێتو ئەوانیش لەچەند یەکەیەکی گچکەتری وەك تیرەو تایەفە..... هتد، پێکدێن.

بەتێڕوانینی درەختی ڕەچەڵەك لەژێردا بۆ سەردا، ڕۆڵو پلەی خزمایەتی ئاشکرا دەبێت. لەژێری ژێرەوە خێزان دێت، چەند خێزانێك کە سەرۆکەکانیان لەبەرەبابێك کەوتوونەوە، خۆیان بەنێزیكو کەسی یەکدیو لەخێزانەکانی دی جوداواز دەزانن، لەلایەن کۆمەڵناسانەوە بەبنەماڵە نێودەبرێن. هەڵبەن بنەماڵەکان لەڕووی قووڵیی بنەچەیانەوە جوداوازن، ئەمە بەوەوە پەیوەستە داخۆ دەتوانن چەند پشتی هاوبەشیان دەستنیشانکەن. کوردەکان تۆرەمەی خۆیان وەکی ئامۆزاو پوورزاو خاڵۆزا بترازێت، ئیدی لە پلەو جۆری خزمایەتییەکە قووڵنابنەوە. لەنێو بنەماڵەدا پێوەندییە سیاسییەکە لەخزمایەتیە ڕاستەقینەکە لەپێشترە. ئەو جوداوازییەی کۆمەڵناسان لە نێوان تایەفە (Clan)و بنەماڵە (Lineage)دا دەیکەن، بۆ کورد زۆر شیاونییە. من هەر کات باسی تایەفە دەکەم، مەبەستم بەشێکە لە هۆز، کە نێوێکی پێکڕاییو سیاسەتێکی سەربەخۆو یەکگرتوویان هەیە. ئەو بنەماڵەیەش کە من مەبەستمە، لەتایەفە گچکەترەو لەڕووی پێکهاتیشەوە لەخوارترەو گشتیان لەڕەچەڵەکێك کەوتوونەوە.

زۆر خانەوادە هەن، بە هەر هۆیەکەوە بێت، خەڵکێکی زۆریان پێوەنیشتۆتەوەو گشتیان خۆیان بە بەشی یەك بنەماڵە دەزاننو لەکاتی پێویستدا پێکڕایی ڕەفتار دەکەن. پاش یەکدوو وەچە، ئیدی زارو زیچیان بوونەتە بەشێکی تەواو و بە

دەگمـەن بـیر لەبنەچـە بێگانەکـەیان دەکرێتـەوە. هەنـدە تایەفەیـەك، یـاخود بنەماڵەیـەك (هـەتا هـۆزێکیش) لەبنەچەدا لـەخێزانێکی دەستەڵاتدار کەوتوونـەوە، لەئاکامی سەرکەوتنێکی سوپایی یاخود سیاسیدا، لایەنگرێکی فرەی تاکە تاکە یـاخود بنەماڵـەی لێخڕبۆتـەوە. پـاش چـەند وەچـەیەك چـۆنێتی کەوتنـەوەی بنەچـەکە لەبیرچـۆتەوەو سەرگورشـتەیەك بـۆ پێکهـاتی ئێـستای تایەفەکـە داتاشـراوەو وا پێـشاندراوە کـە گوایـە گـشتیان لەبـەرەبابێك کەوتوونـەوە. Rondot باسـی بەسەرهاتێکی لەوبابەتە دەکات و نموونەی دوو تایەفەکەی ئەتمانکان (Etmankan) و مـەحمودکان دێنێتـەوە، کـە پێکـڕا هـۆزی ئۆمـەریانیان لـەکێوەکانی تۆرعابـدین پێکهێنـاوە[٢]. هێنـدێك لـەپیرەکانیان هێـشتا لەیادیانـە کـە هـەردوك سـەرەکهۆز مـەحمودو ئـەتمان هـەتا بۆرەخزمایەتیـشیان لەنێوانـدا نـەبووەو رەعیەتـەکانیان بـەنێوی ئەوانـەوە نێـونراون. پـاش شـەڕێك، کـوڕە گـچکەڵەکەی ئـەتمان دەداتـەپاڵ مەحمودکان، دواتـر (بـەهۆی عەگیـدی و مێرخاسییەوە) دەیکەنـە سـەرۆکی خۆیـان، بـەو شێوەیە هەردوك تایەفـە سـەرۆکیان لەتایەفـەی ئـەتمانکان دەبێـت. پاشـان دوو تایەفەکـە ئاشـتدەبنەوەو دەسـت لەشـەڕی یەکـدی هەڵـدەگرن، کەچـی زۆرکـەس پێیوابووە گوایە مەحمودو ئەتمان برابوون و بابەڵبابی تایەفەکەبوون.

بـۆ ڕوونکردنـەوەی شـیرازەی هـۆزو ئاسـانکردنی تێگەیـشتنی، خـشتەی ژمـارە (١) پێشچاودەخەم. ئەم درەختە لەدوو گۆشەنیگاوە تێیدەڕواندرێت، شاقوولی، وەچەیەك لـەدووی یەکـەکانی بنەماڵەکە پێـشاندەدات و تاقـە سێگۆشـەی ڕیـزی سـەری سـەرەوە باپیرەگەورەی بنەماڵەکەیە. (هەر سێگۆشەیەکی دیکەش گوزارە لە کەسێکی زینـدوو یاخود مردوو دەکات). وەکی دیکەش شەفتولی، پلەکانی شیرازەی هۆزێك پیشاندەدات، کە هەر ریزێکی گوزارە لەپلەیەکی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکە دەکات، وەکی هـۆز (I)، تیرە (II)، تایەفە (III)، بنەماڵە (IV)، خێزان (V)[٣]. لـەم حاڵەتەیانـدا سێگۆشـەکان گوزارە لەتاکە کەس ناکەن، بەڵکە لە یەکەیەکی کۆمەڵایەتی[٤].

### ٢ـ ١ـ ١ـ خێزان

دیارترین یەکەی پێکهاتی کۆمەڵگە، خێزانە. زۆربەی چالاکییە ئابوورییەکانی (رەوەند و وەرزێران) لەسەر ئەم ئاستە هەڵدەسووڕێن. بەشێوەیەکی گشتی خێزان گرۆکێکە لەمێردو و ژنو منداڵە (شوونەکردوو رەبەن)ەکان پێکدێت. جار هەیە باپیرەو داپیرەو پوور، یاخود مامو خاڵیشی دەگەڵدا دەژین. گەر پیاوەکە لەژنێك زێتری هەبێت، (کە دیاردەیەکی دەستڕۆیشتوویی بووەو ئێستا باوی نەماوە)، هەر ژنەو ژووری خۆی جودایە، بەڵام پێکەوە چێشت لێدەنێنو پێکڕا دەچنە بێری و...هتد. هەڵبەت ژنانی پیاوی چەند ژنەی رەوەندەکان دەبێت زێتر تێکترنجێن، چونکە دەوارەکان لەتاقە ژوورێکی بەینکراو بۆ پیاوانو ژنان پێکدێن، بەو پێیە ژنەکان زۆر کەمتر دەرفەتی تەنهاییان هەیە.

جاریش هەیە کوڕی ژندار، یەکەم ساڵی پاش ژنهێنانی لەماڵە باوانی جودانابێتەوەو هەر لەگەڵیاندا دەژیت. ئاکامەکەی بارێکی دووفاقەیە. بەشێوەیەکی گشتی کوڕی تازە ژن بۆ هێنراو هێندە بەشی بە خێزانەکەوە نییە وەك ژنی دووهەمو منداڵەکانی. لەهەندە حاڵەتێکدا کوڕە دەتوانێت نیمچە سەربەخۆییەکی هەبێت، بۆ نموونە چەند سەرمەڕێك بۆ خۆی بکڕێتو ژنەکەی بیاندۆشێت، بێئەوەی شیرەکە تێکەڵ شیری ماڵەباوان بکرێت. بەڵام زۆربەی کات ئەم جودابوونەوەیە نایەتەدیو ئەرکو فەرمانی نێوماڵ تێکڕا بەگشت ژنەکان جێبەجێ دەکرێت.

خێزانی گەورەی لەوبابەتە لای کوردان تاڕادەیەك کەمە. رەنگە زۆرو کەمیی لەنێوچەیەکەوە بۆ نێوچەیەکی دی جوداوازبێت. Barth لەچوار گوندی خوارووی کوردستاندا شیرازەی خێزانی سەرنجداوەو گەیشتۆتە ئەو ئاکامەی کە تەنها نێزیکەی ١٠٪ خێزانی (ماڵەباوان) خێزانی گەورە پێکدەهێنن. منیش لەتاقە هەرێمێك توانیم لێکۆڵینەوەیەکی لەو بابەتە بکەم (لەچوار گوندی نێوچەی باڵەکایەتی باکووری خۆرهەڵاتی عیراق)، من لەوەش کەمتر خێزانی گەورەم دیت[٥].

هەنـدە حاڵـەتێکی تایبـەت هـەن، خێزانـی گـەورە دەکاتـە داب و نـەریت، نـەك ریزپـەڕی. خێزانـە خـاوەن ملکـە دەوڵەمەنـدەکانی پێدەشـتەکان، چـاویان لەوەیـە سەرتاسەر ملکەکانیانیان بەدەستەوە بمێنێتـەوەو دەسـتووری میراتیـی لـەت و کوتیـان نـەکان: لـەوێ میراتیـی بـە نێرینـە دەبڕێت و ملکـی لەباوانـەوە بـەجێماو دەکەوێتـە دەسـتی بەتەمـەنترین و بەدەسـتەڵاترین پیـاوی بنەماڵەکـە، چـۆن خـۆی بەچـاکی بزانێت، ئاوها داهاتی بەسەر خزم و خوێشانیدا دابەشدەکات، (یانی ئیدی هەموو چاو لەدەستی ئـەون). تـا لـەو حاڵەتـە دەگمەنانـەدا دنـەدەرێك نییـە کرۆکـی خێزانەکـە هەڵتەکێنێت[٦].

ئەو حاڵەتـە بیژۆیانـەی لێدەرچێت، کرۆکـی خانـەوادەی کورد لەچەند کەسێکی خزمـی نێزیکـی یەکـدی پێکـدێت. چ لای ملکدارەگـچکەکان و چ لای ئـەو وەرزێرانـەی کوتەزەوییەکیان بە ئێجارگرتووە، مافی رەعەمـەلهێنانی زەوییەکە زێتر بـۆ دەزگـەی خێزانە وەك لەگەورەی خێزان. کوڕە پێگەیشتووەکانیان زەویەکە بە ملکی هاوبەشی خۆیـان و ئامۆزاکانیـان دەزانـن، لەحاڵـەتی پێویسـتدا، گشت نێرینـەکانی خانەوادەکە بڕیار دەربارەی ملەکان دەدەن.

## ٢ـ ١ـ ٢ـ یەکپارچەیی

ملکایەتی و ئەندامەتی هۆزێك، تیرەیەك، بنەماڵەیەکی تایبەت، هەرچـەندە بڕێك ئـاڵۆزن، بـەڵام تونـد پێکـەوە بەنـدن. داب و نـەریتی تیرەگـەری، یاسـاکانی ئیـسلام، رەفتارە فیۆدالیستەکانی عوسمانی و ئێرانی، ئارەزوو و هەوەسـی مولکایـەتی تایبـەت، گـشتیان پێکـرا بـارێکی سەرشـێوێنەریان سـازاندووە، کـە لەبەنـدی سـێهەمدا لێیاندەکۆڵینەوە.

بـەپێی داب، هـەر هۆزێـك بەنێوچـەیەکەوە پەیوەنـدەو هـەر نێوچـەیەش بەهۆزێکەوە. نێوچەکە بەنێوی هۆزە لێژیاوەکەیەوە نێودسنرێت، بۆ نموونە عەلیکان نێوی نێوچەو هۆزێکە لەباکووری خۆرهەڵاتی سوریا[٧].

نێوی برێك نێوچە، هۆزانێك دەهێننەوە یاد، كە لەمێژە لەنێوچوون، یاخود بۆ شوێنێكی دی رەویانكردووە. هەرچەندە زەویوزارو كێڵگەكان گشتیان بوونەتە موڵكی تایبەتو دەكڕڕێنو دەفرۆشرێن، لەگەڵ ئەوەشدا ناشێت هەر كەس ویستی بەئارەزووی خۆی نێویكیان لێبنێت. تا رادەیەك هێشتا زەوی هەر موڵكی هۆزەو تەنها لەنێوان ئەندامانی هۆزدا ئاڵمو ساتمی پێدەكرێتو ئەندامێكی هۆزەكە بۆ كڕینی لەدانیشتوویەكی بێگانەی هەمان گوند لەپێشترە. لەباكووری كوردستان هێشتا ئەم دابو نەریتە بەچاكی پەیڕەوی دەكرێت. (هەڵبەت جگە لەو نێوچانەی كە سەربە هیچ هۆزێك نیین، یاخود ئەو شوێنانەی تیرەگەریی تێدا هەڵتەكێنراوە).

"لەفێبریوەری ١٩٧٦دا لەگوندی كانێكێی پێدەشتەكانی باتمان، كە موڵكی هۆزی رەشكۆتانە، بووە شەڕەتفەنگ. یەكێك زەویەكەی خۆیی بە غەوارەیەك فرۆشتبوو (یاخود ناچاری ئەوە كرابوو)، بەیەكێك لەهۆزی بە دەستەڵاتی بەكرانی بفرۆشێت (كە لە كێوەكانی ساسون دەژینو زەوییان كەمە). كاتێك كابرای كڕیار دەیەوێت دەگەڵ چەند خزمێكیدا بگوێزێتەوە گوندەكە، خەڵكی ئاوایی (یاخود كوێخای گوند) رێی لێدەگرن، ئیدی هۆزی بەكران لە كێوەكانەوە دادەبەزنو گوندەكە دەدەنە بەر دەستڕێژ. پاش شەوو رۆژێك تەقە ئەوجا ژەندرمەو لەشكر هەڵمەت دەبەنو شەڕەكە دەكوژرێننەوەو سەرئەنجام هۆزی رەشخۆتان موڵكی خۆیی چنگدەكەوێتەوە"[٨].

لەوەڕگە موڵكی هەمووانە، گشت ئەندامێكی هۆز مافی تەواوی ئەوەی هەیە ئاژەڵەكانی لە لەوەڕگەكانی هۆزدا بلەوەڕێنێت، كەس مافی پاوانكردنی نییە. هۆزی تەییان (تەنها هۆزێك كەمن لەنێویاندا بووم)و لەنێوان جزیرەو فاندا كۆچو رەو دەكەن، هەر هەشت تیرەكەی لەوەڕگەی خۆیان هەیە، هەمیشە لەخەمی ئەوەدان ئاژەڵی تیرەیەك نەچێتە لەوەڕگەی تیرەیەكی دییەوە. بەو شێوەیە لەپێشەوە مەڵبەندی تیرەدێت، ئەوجا مەڵبەندی فراوانتری هۆز. دەشێت تیرە كوتكرێت یاخود یەكگرێتو لەوەڕگەیان سەرلەنوێ دابەشكرێتەوە، بەلام كەوشەنی مەڵبەندی هۆز زوو لەرێگەی شەڕو داگیركردنەوە دەگۆڕدراو ئەورۆش لەرێگەی دەستەڵاتی دەوڵەتەوە. مەڵبەندی لەتیرە گچەكەتر لای تەییان نەبوو. هەر تیرەیەك لە

لەوەرگـەی گەرمەسێرو سەردەسێریدا هۆبەیـەکی (٢٥ تـا ٥٠ خێـوەتی) هەڵـدەدات. هۆزێکی گەورەی کۆچەری وەکی جاف لـەخوارووی کوردستـاندا (کە ئـەورۆ زۆربـەی هەرە زۆریان نیشتەجێ بوون)، هۆبەیان گچکەترەو هێنـدە گوێ بـەوەنادەن بـەپێی بنەماڵە هۆبەکانیان جوداکەنەوە. راستە ئەندامانی هەر هۆبەیەو سەر بە تیرەیـەکن، بەڵام مەرج نییە هەر کەس خێوەتی لەپاڵ نێزیکترین خزمیدا هەڵدات[٩]. ئەمە لای هۆزی نیوەکۆچەری مەنگوڕو مامەشیش هەروایە (کە نێزیکی قـەڵادزێ، لـەباکووری عیراق دەژیـن)، هـەوارەکانیان لەچـەند هۆبەیـەك پێکدێن، بـەڵام لەشوێنی هەڵدانی خێوەتەکانیانـدا هەستم بـە پـەیڕەوکردنی هـیچ جـۆرە یاسـایەکی سـەپاو نـەکرد. پێیـانگوتم گوایـە رستی خێوەتیـان هـەر ساڵە بـە جۆرێکە. لێرەش هـەر تیرەیـەك لەوەرگەی خۆی جودایەو بەدڵی خۆیان جێ هۆبەیەك هەڵدەبژێرن.

"لەنێوچەشاخاوییەکانی باشووری گۆلی ڤان، حاڵو بار جۆرێکی دییە. کاتی خۆی بەشـی زۆری دانیـشتووانی ئـەو نێوچـەیە ئەرمـەنیو کلـدانیو نەسـتۆری بـوون. زۆربەیان لەدەمـەدەمی جـەنگی یەکـەمی جیهـانیو گێـژاوەکانی نێوچەکەدا کـوژران، راگوێزران، هەڵهاتن گوندەکانیان درەنگانێك لەلایەن هەنـدەك دەستەو تـاقمو هـۆزی کوردەوە ئاوەدانکرانەوە.

لەبـەر ئـەوەی ئـەم تـازە هاتووانـە نـەیانتوانیوە هـیچ دابو یاسـایەك بسەپێنن، دەسـتورو یاسـای ئەوڕۆکـەی تورکیـا باڵیکێـشاوەو زاڵـە. بـەپێی دابەشـکردنە ئیدارییـەکان، زەوی مـولکی گونـدەو لادێیـەکان خۆیـان، (یـاخود کوێخـای دێ)، مـافی موڵکایەتی دیاریدەکەن. بەو جۆرە هەر گوندێك لەوەرگـەی خـۆی هەیـەو شـێلگیرانە لەناخونەکی گوندەکانی هاوسێ دەیپارێزێت، با ئەو هاوسێیانە لەبنەماڵەی خۆشیان بن".

رەوەندەکان لەسەرەڕێی کۆچو رەویانـدا بـە زەویـوزارو مەڵبەنـدی هـۆزانی دیکـەدا رادەبوورن. دەبێت بەگشتیان باجێك بـە خـاوەن ملکـی ئـەو مەڵبەندانـە بـدەن. سـەر عـێڵ ئـەو پووڵـە لـەپیاوانی عێڵەکـەی خڕدەکاتـەوەو دەیداتـە کوێخـای دێ، یـاخود سـەرەکهۆزی ئـەو مەڵبەنـدە. ئـەویش دەیخاتـە تەنکـەی باخەڵییـەوەو بەشـی کەسـی

لێنادات. کەم هەڵدەکەوێت رەوەندەکان بە مەڵبەندێکی ئاریدا تێپەڕن و کێشەو هەڵلا روونەدات.

زۆربەی کات لەسەر کەمو زۆریی باجەکە دەبێتە بگرەو بەردەو هەردوکلا بەئاژەڵ دزین، یەکدی تاوانبار دەکەن. هەمیشە لەسەر ئەوە لۆمەی رەوەندەکان دەکەن، کە گوایە بە کاوەخۆ دەبزوێن و مێگەلەکانیان قرتەیان لەگیای گوند بڕی و هەتا شینایی و بەروبوومی گوندیشیان نەهێشت. گەر زوو کێشەکە چارەسەر نەکەن، دەبێتە شەڕەتفەنگ و هێند ناخایەنێت کۆمەك لەخێڵی پشت و پەناوە دەگاتە فریای هەردوکلا. پاش دووسێ رۆژێك شەڕ، ئەوجا پیاوێکی بەوەج دەکەوێتە بەینەوە (وەکی پێشەوایەکی ئاینی، سەرەکهۆزێکی بێلایەن، فەرماندەیەکی ژەندرمە)، بە ئاگربڕێکی لەق و لۆق رازییاندەکەن، کە زۆرجار لەکۆچ و رەوی داهاتوودا کلپەدەستێنێتەوە.

ئەو نێوچانەی رەوەندەکان پیایاندارادەبوورن، وەکی ملکی سەر لەبەری بنەماڵە نیشتەجێکان یاخود ملکی گوندەکان حسێبدەکرێن، بۆیە گشتیان پێکراپی بەرهەڵستیی دەستدرێژیی رەوەندەکان دەکەن. هەرچەندە سەرداری بنەماڵەکە یاخود کوێخای گوند ـ تارادەیەك ـ مشووری گیرفانی خۆی دەخوات: ئەوەتا ئەو باجی راگوزارییەی لەرەوەندەکانی دەستێنێت بۆ کیسەی خۆیەتی. بڕێك سەرەکهۆز لەرێگەی پەیوەندیی دۆستانەو توندو تۆڵیانەوە دەگەڵ ژەندرمەو دادگادا، مافی "چاری ناچاری" یان بۆخۆیان بڕیوە، بەوپێیە لەو نێوچانەشدا کە لەڕاستیدا ملکی هۆزە نیشتەجێکان نیین، (یاخود مولکی هۆزێکی سزادراوەو مافی باجسەندنی لێزەوتکراوە)، ئەمان باجی راگوزاریی لەرەوەندەکان دەستێنن. ئەمەش دەروویەکی دیکەی بۆ دەستگرتن بەسەر ملك و زەویوزاردا. پێشهاتێکی لەوبابەتە بۆ بەشێك لە لەوەڕگە سەردەسێرەکانی بڕێك لەتیرەکانی تەیان سازا: گیرافییەکان[١٠]، کە بنەماڵەیەکی مولکداری دەستەلاتدارن و (پەیوەندیی سیاسی توندو تۆڵیان لەگەڵ رژێمدا هەیە) و دەستیان بەسەر ئەو وەرزێرانەی دەوروبەری شاتاقی ویلایەتی ڤاندا دەڕوات، کەسەر بەهیچ خێڵێك نیین، ئەو لەوەڕگانەیان خستۆتە ژێر رکێفی

خۆیانــەوەو کرێیــەکی چــاك لەتەییانــەکان دەســەندن[11]. بــەلام لــەپاڵ ئەوەشــدا تەییانەکان تا ئێستاش مافی بێ چەندو چوونیان هەیەو گیرافییەکان ناتوانن لێیـان زەوتکـەن. بـۆ نموونـە گیرافییـەکان بۆیـان نییـە رێـی ئـەو لەوەرگانـە لەتەییانـەکان ببەستنەوەو بەهۆزێکی دیکەی بەکرێبـدەنو بهێڵن لـەوێ مێگەلـەکانیان بلـەوەرێنن. ئەمــە یاســای تیرەگەرییــە، گیرافییــەکان نــەدەتوانن رێگــە لەکــەس ببەســتنەوە، نەدەشتوانن بەخاترانە جێگەی هەڵبژاردە بە کەس بدەن.

هـەروەها لـقو پەلـە گـچکەترەکانی هۆزەنیـشتەجێو نیوەکۆچـەرەکانیش مـافی ملکدارێتی نێوچەی دیاری خۆیـان هەیـە. زۆربـەی کـات هـەر تیرەیـەك لەهۆزەکـە، نێوچەی تایبەتی خۆی هەیە، دەشێت ئەویش پێبەپێی پلە داکشاوەکانی دیکەی تیرە، کوتکوتکرێــت، هەڵبــەت لەمــەدا بێــژووش هەیــە. Rondot (١٩٣٧، ل ٢٢) بــۆ ماندەگێڕێتــەوە کـە هـەردوو تیرەکـەی هـۆزی ئۆمـەریان بەسـەر گـشت مەڵبەنـدو نێوچەی هۆزەکەدا بلاوبوونەتەوەو هەردەم پێکەوە دەژیـن. لقی مامەشـی عیراقـیش هەروایە، وەك دیتم، لەگشت گونـدێك نوێنـەری هـەر پێـنج تیرەکە هـەبوون (تێکرا پێنـج شەش گوندێکن).

### ٢ـ ١ـ ٢ـ گوند

گونـد دیارترینو لەپێشترین مەڵبەندە، (لەبنەماڵە کۆچەرو هۆبـەکان بگەڕێتـەوە) تاقە یەکەی بەڕاستی یەککەوتەیە. کێڵگەکان مولکی تایبـەتن، بـەلام وەك باسمـانکرد گشت کرپارێك مافی کرینی نییە[12]. لەوەرگەکانی دەوروبەری گوند مولکی هەموانن. هەریـەك لەگونـدە نیوەکۆچـەرەکانی خـوار گـۆلی ڤـان، لەوەرگەیـەکی هاوینـەی خـۆی هەیە.

هێندەی مـن بـۆم دەرکـەوتبێت، لەگونـدە نیوەکۆچـەرەکاندا، تـەنها لەسـەر ئاستی گوند خـۆی، نـەك لەسـەر ئاسـتی هـۆز، یـاخود تـیرە، یـاخود لەگونـد بـەرەو خـوارتر، سالانە بریاری کاتی کۆچو رەو و دەمی گەڕانەوە دەدرێت.

دەوڵـەتیش زێـتر لەمـەودای گونـددا پەیوەنـدیی بـە هاووڵاتییـە نیـشتەجێکانی خۆیـەوە دەکـات ـ ئەگـەر بـواری پەیوەندییـەکی راستـەوخۆ هـەبێت ـ هەنـدەك لـەو باجانەی (نەك هەمووی)، کە لەکۆندا وەك باجێکی گشتیی سەپاون، لەسـەر تـەواوی گوند دانـراون، کە زێدیشکراون، بۆ نموونە وەکی بـاجی خزمـەتگوزاریی‌و بەروبوومـە سـر وشـتییەکان، زێدەکـەی لەتـەواوی خـەڵکی ئـاوایی سـەندراوە. داب‌و نەریتـە ئاینییـەکانی وەکـی نوێـژی هـەینی‌و نوێژەبارانـەش، لەسـەر ئاسـتی گونـد جێبەجێدەکرێن‌و گیانی ئالیکاری گوند پتەوتر دەکەن[١٣].

هەندەکجار پێکهاتی گوند نموونەیەکی رچەی ئەو وەچانەیە، کە لەخشتەی ژمارە (١)دا پێشاندران، کـە پلەیـەك خـوار تـیرە دەکەونـەوە. زۆر گونـدی گچکە بـریتین لـە تاقە بنەماڵەیەك، کە تۆرەمەیان هێند قووڵ نییە. هەر حەوت تیرەکەی مـەنگوڕانی عیراق بەسەر ٢ تا ١٠ گوندێکدا پەرش‌و بڵاوبوونەتـەوە، هەڵبـەت زۆربـەی گونـدەکان بێگانەی لەهۆزەکەبەردەری سەر بە تیرەو بنەماڵەی دیکەشی تێپەڕیوە. زۆربەی ئـەو بێگانانە، لـەئاکامی شـەڕو دوژمنایەتیـدا گونـدەکانی خۆیـان جێهێـشتووەو پەڕیـدەی نێو مـەنگوڕان بـوون. بەنێوچـەی باڵەکایـەتیش (بـاکووری خۆرهـەڵاتی عـیراق) هەر ئاوهایـە. تیرەگـچکەکەی سـەکر، کـە خەڵکەکـەی زۆربـوون، پـەلێکی لێبۆتـەوەو لەشوێنێکی هەورازتری دۆڵەکەدا گوندێکی نوێیان بنیاتناوە، پاش کـەرتبوونێکی دی بەدۆڵەکەدا هەڵکشاون‌و باڵاتر سێهەم گوندیان ئاوەدانکردۆتەوە. دانیشتووانی یەکەم گونـد لەچـەند تۆرەمەیـەکی جـوداواز کەوتبوونـەوە. بـەدەم هـاواری پیـاوێکی نوورانییـەوە هـاتبوون‌و لـەوێ نیـشتەجێبووبوون‌و کردبوویانـە جێنزرگـە لەپەرتبوونی یەکەم گونددا، پەیوەندیی خزمایەتی تاڕادەیەك دەوری بینـی، پیاوێك جوادابـووەوەو تاقـەماڵێکی لەشـوێنێکی نـوێ دروسـتکرد، خێـرا نێـزیکترین خزمـی‌و باشـترین دۆسـتی دووی کـەوتن، پاشـانیش خـەڵکێکی دی، کـە بـەهۆی شـەڕو ئـاژاوەو کێشەو هەڵلاوە ناچاربوون گوندەکەیان جێبهێڵن.

کەواتە گوندەکانی ئێستا تاڕادەیەك تۆرەمەیان تێکەڵترە لەتۆرەمەی یەکەم گونـد لەو گوندانەدا کە بەشێکی خەڵکەکەی سەر بەهۆزێکن‌و بەشـەکەی دی سـەر بـە هیچ

هۆزێك نیین، وەكی لای دزەییەكان، یاخود لای هەمەوەندەكان، ئەوانەی سەربەهۆزن لەبەری یەكدوو بنەماڵەن، كە ریشەیان هێند قووڵ نییە، بەڵام ئەوانی دی هیچ داوێكی پەیوەندیی بەهۆزیانەوە نابەستێتەوە. ئەو جۆرە گوندانە پلەكانی دابەشكردنی هۆزیان بەسەردا ناچەسپێت. لای ئۆمەریان و مامەشەكانی عیراقیش حاڵەتێكی لەو بابەتەمان دیت، كە تیرەكان بەسەر سەرلەبەری مەڵبەندی هۆزەكەدا بڵاوبوونەتەوەو لەگشت گوندێكدا خەڵكی سەربەتیرەیەك، یاخود سەربە هەموو تیرەكان، پێكەوەدەژین.

### ٢ـ ١ـ ٤ـ هەڵس و كەوتی دەستەگەرییانەی لەئاستی گوند بەرەو خوار

لەئاستی گوند بەرەو خوارتر، ئیدی دەستەو تاقمی یەكگرتووی دیكە دەگمەنە. ئۆمەریان گوندیان بەسەرچەند تیپێكی گچكەتردا دابەشكردووە، كە بافكیان پێدەڵێن (لە وشەی باف "باوك"ەوە). ئەمانە ئەو بنەماڵە زۆرانەن، كە چ خزمایەتیەك لەنێوانیاندا نییە، هەر بافكێك بۆ خۆی سەر بەیەكێك لەتیرەكانی مەحمودكان یا ئەتمانكانەو بەشێكی سەربەخۆو جودای لەزەویوزاری گوند هەیە[١٤]. دەنا وەكی دی هەڵس و كەوتی دەستەگەریانە كەمە، بافكەكان تەنها لەكاتی شەڕو هەڵڵا دەگەڵ دەستەیەكی دیدا، پێكڕایی رەفتاردەكەن. پێكهاتێكی دیكەی لەوبابەتەم لای گۆیان و ئولودەرەكان دیت: چەند بافكێك بوون كە نێزیكایەتییەكی ئەوتۆیان نەبوو، یانی هەربنەماڵەیەو ئەندامانی خۆی، ئەمەم بەوەدا هەستپێكرد، كە دوو بافك دوژمنایەتی و خوێن كەوتبووە نێوانیانەوە.

هەر بەو پێیە، هۆزو تیرەو بنەماڵەكانیش بەدەگمەن لەئاستی گوند بالاتر، پێكڕایی رەفتاردەكەن، مەگەر لەكاتی شەڕوشۆڕدا. ئەمەش لەگەڵ هەڵسەنگاندنەكانی خودی ئەندامانی هۆزدا جووت دەوەستێتەوە. كە دەربارەی دەورو رۆڵی دەستەوتاقمەكانی كۆمەڵ لەسەر ئاستی رێكخراوە جوداكانی پرسیاریان لێدەكەیت، كە لەهۆكاری یەككەوتن و هۆی رەفتاری پێكڕاییان و لەئەرك و فەرمانی

ــەرکردەکانی ئـەو دەسـتـەو تاقمانـە دەپرسـیت، وەرامـەکان بەگـشتیی بـریتین لـە:
دەمەقاڵێو دوژمنایەتیو شەڕی نێوان هۆزەکان.

## ٢ـ ١ـ ٤ـ کەوشەنی هۆز

سنوورەکانی هۆزو تیرە تاڕادەیەك نادیارن. بنەماڵە کرۆکێکی پتەوی هەیە، لەپاڵ ئەوەدا هەندەك، یاخود زۆر کەسو بنەماڵەی ئازاد هەن، کە جار هەیە بەپێی دابو نەریتی هۆز رەفتاردەکەنو جار هەیە لەو دابو دەستووره تـەوەللا دەبـن. هـەر کـات حاڵو باری هۆزێك شکۆفە بکات، خێرا سەرچڵو دەستەی لەهۆزی دیکە دابڕاوی لێخڕدەبێتـەوەو چاوەچـاوی ئـەوەن لەسـایەو پەنایـدا کـەمێك ئـارامیو چـکێك دەسـتکەوتیان پێبڕێت. یەکەم ئـەوروپایی کـە هەسـتی بـەم دیاردەیـە کـرد، Richی نوێنەری کۆمپانیای خۆرهەلاتی هیندستانی بەریتانیایی بوو لەبەغدا. ساڵی ١٨٢٠ میرێکی کورد داوەتی خواروی کوردستانی دەکات، لەوێ هەنـدەك سەرنجی هێجگار گرنگ تۆمار دەکات. من گەلەکجار پەنا دەبەمەوە بەر ئەو کتێبەو چەند کۆپلەیەکی لێرادەگوێزم. Rich گەلەك لەسەرداره نێودارەکانی هـۆزی مـەزنی جـافی ناسـیوەو دەگێڕێتـەوە کـە گوایـە لـەکوێ ٦٠٠٠ خێوەتەکـەی جـاف، تـەنها ٦٠٠ دانـەیان جـافی رەسـەن بـوون، سـەرپاکی ئـەوانی دی جافەڕەشکەبوون*، یـانی یـاخود سـەر بـەهۆزە کۆچەرەکانی دی بوونو تێکەڵی ئەمان بوون، یاخود سەر بە هۆزە نیشتەجێکانی سەرسـنووربوونو سـەر لـەنوێ بوونەتـەوە کۆچـەر. (دیـارە سنووری پـڕ پەشـێوی ئەودەمەی نێوان دەوڵەتی عوسمانیو ئێرانی مەبەستە).

هەندەجارێك Rich ئەو تیرە پەڕایدانە هەر بەجاف نێودەبـاتو هێنـدێ جاریش بەنێوی هۆزەڕەسەنەکەی خۆیان[١٥]. ساڵی ١٩٢١، واتـە سـەدەیەك دواتـر، پـاش ئـەوەی پشکێك لەبەشە جافەکەی عـیراق نیـشتەجێبوون، کۆچـەرەکانی ٥٤٠٠ رەشمـاڵ بـوون.

---

* بۆ خۆم گەلکجار لەهەڵەبجەییانم بیستووە کە تانووتیان لەیەکێك داوە بەوەی گوایە جافی رەسەن نەبووەو خۆی بە جاف لەقەڵەم داوە، بە تێزپێکردنەوە جافەڕەشکە یان پێگوتووە، بە واتای جافی ساختە، بۆیە منیش لێرەدا بۆ ئەو مەبەستە بەکارم هێناوەتەوە

پێدەچێت زۆربەی جافەرەشکەی سەربەتیرەکانی دی، بووبنە جافی رەسەن. Edmonds کە بە شێوەیەکی گشتیی زۆر هۆشیارانە هۆزەکان لێك جوودادەکاتەوە، هەرچەندە نێوی هەندەك هۆزو تیرەی تێکەڵ نەبوو بە جاف دەهێنێت، بەڵام هیچ باسی ئەو هۆزانە ناکات، کە دەبێت بنەچەی بەشێك لەو جافەرەسەنانەبن[16]. ئەو دەمە، واتە ساڵی ١٩٢١، جاف قەوارەیەکی قووچ هەڵچووی هەبوو، کە بنەماڵەیەکی پاشازادەی خانەدان لەسەری سەرەوەو چەند تیرەیەکی رەمەکیی لەخواریەوە بوون، پێدەچێت ئەمە لەسەروەختی Rich یشدا هەر ئاوها بووبێت[17].

لەساڵەکانی شێستی نۆزدەهەمدا F. Millingen لە قۆتوور، کە نێوچەیەکی دیکەی سەر سنووره لەباکووری کوردستان، قوماندارێتی ئۆردوویەکی تورکی دەکرد، ئەویش هەست بە دیاردەیەکی لەو بابەتە دەکات: "هۆزەکانی کوردستان لەدوو بەش پێکدێن، پشکێکی هەمیشەیی‌و پشکێکی بەردەوام گۆڕراو. پشکە هەمیشەییەکە ئەو خانەوادانەن، کە پەیوەندییەکی توندو تۆڵیان بە مەزنانی هۆزەوە هەیە، پشکە گۆڕراوەکە لە دەستەیەك سەرچڵو یاخیبووی سەرکێش پێکهاتووەن، کە هەڵێك دەگەڵ ئەم هۆزو چەلێك رەگەڵ هۆزێکی دیکەن"[18]. داخۆ لەو سەردەمەدا ئەم دیاردەیە تا چ رادەیەك گشتی بووە، مەسەلەیەکە، یەکالاکردنەوەی ئەستەمە، چونکە سەرنجەکانی ئەو زادەی ناسیاری‌و پەیوەندییەکی دۆستانەیەتی دەگەڵ تاقە هۆزێکدا، ئەویش هۆزی میلانە، لەسەروەختێکدا کە ئەو هۆزە لەوپەڕی شکۆمەندی‌و سەرکەوتنەوە لەپڕێکدا بەرەو چاڵی نەهامەتی داخزا. پاشا تورکەکەی ڤان، بەرەیەکی لەگەڵ هۆزە چاوچڵێسەکانی هاوسێی میلاندا پێکهێناو زەبرێکی کوشندەیان لێوەشاندو لەخاکی خۆیان دەرپەڕاندن. ژمارەیان هێجگار لەکەمیی دا: "ئەو دەمەی لەژێر فەرماندەیی هۆمەر دا لەشکۆمەندی‌و شکۆفەدا بوو، تێکرا ١٦٠٠ تاووڵیان هەڵدەدا، پاش دووساڵی پڕ کولەمەرگی، هەر ئەو هۆزە ٥٠٠ تاووڵی مایەوە. گشت ئەوانی دی نەهامەتی راپێچیکردن‌و رایدان"[19].

نموونەیەکی دیکەی ئەو حەشیمەت لەکەمی‌و زۆریدانە، هۆزی ملانە، بە مەزنایەتی ئیبراهیم پاشا. ساڵی ١٨٦٠ ملان هۆزێکی رەتێنراوی فەوتێنراو بوو، هێشتا

ـەرانەی بە هۆزی بەهێزی شەممەری عارەب دەداو تێکرا ٦٠٠ دەواری مابووەوە. ـەود چکێکی هێجگارکەمی سەرجەم ژمارەی سی ساڵێك لەوەبەری بوو، ئەودەمی کە ـێوچەکەیان سەرحەدێك بوو لەنێوان لەشکری یاخیبووی میسرو ئۆردووی عوسمانیداو ئەمان لەژێر رکێفی هیچ لایەکدا نەبوون. ئەوەبوو ساڵێ ١٨٦٣ ئیبراهیم پاشا بووە مەزنی هۆزەکەو کەوتە شەڕو بەربەرەکانێی هۆزە عارەکانو هەتا هۆزی شەممەریشی شاکاندو بەسەریانداز اڵبوو. ئیدی حەشیمەتی هۆزەکە سەیر زیادیکرد، هەر هۆزی گچکەڵەبوو خۆی بە ملان لەقەڵەم دەدا[٢٠].

ئەم سێ نموونەیە تاقە نموونە نیین، وەلێ زەقترینو دیارترین نموونەیەکن کە من پەییمپێبردوون. پێدەچێت هەروا رێکەوت نەبێت، کە هەرسێ نموونەکە زادەی نێوچەیەکی سەرسنوورین، نێوچەیەك کە نائارامی تێیدا زاڵەو سیاسەتبازان دەرفەتی چاکیان هەیە بۆ سەر کەشیو سەرپێچیو کۆکردنەوەی لایەنگران. رچەی ناراستەوخۆی وەها دیاردەیەکی کۆن ڕووداو لەو راستییەدا دەبینینەوە، کە جارهەیە چەند تیرەیەکی هاونێو لەیەك نێوچەدا سەر بەچەند هۆزێکی جوداوازن. دەشێت (بەڵام مەرج نییە وابێت) ئەو تیرانە لەبنەچەیەك کەوتبنەوەو لەسەردەمێکدا هەندەك لەئەندامانی دابیانە پاڵ ئەم سەرۆکهۆزو هەندێکی دیکەیان دابیانەتەپاڵ سەرۆکهۆزە دژەکەی[٢١]. گەر بەراوردێکی تۆماری ناوی ئەو هۆزانە بکەین، کە لەنێوچەیەكو لەچەند سەردەمێکی جوداوازدا ژیاون، بۆماندەردەکەوێت کە هەندە هۆزێك زۆر تەمەن درێژ بوونو هەندێکی دیکەیان زوو تێداچوونو بەردەوام هۆزی نوێ پەیدا بوون[٢٢]. ئەمە بۆماندەردەخات کە ئەو دیاردەیە شتێکی سەیر نییە: هۆزەکان نافەوتێن، بەڵکە هەڵدەوەشێنەوە. لایەنگرانی هۆزێك لەسەرکردەیەکی نوێ خڕدەبنەوەو نێوێکی نوێ لەخۆدەنێن، یاخود لەلایەن هۆزێکی بەهێزی نێوچەیەکی دیبەوە داگیرو ژێردەستەدەکرێنو قەوارەی رەسەنی خۆیان لەدەستدەدەن.

یەکێتی هۆز (یاخود کەوشەنی) بەدەگمەن بەرپێچی دەکرێت. لای هەندەك هۆزی کۆچەر زێتر لەکاتی کۆچو رەو و گەڕانەوەدا هەستیپێدەکرێت. کۆچکردنی تێکرایی هۆز نەماوەو زۆری هۆزەکان نیشتەجێبوونو برەکەی دیش لەشێوەی دەستەو تاقمی

گچکەو تارادەیەك دابڕاو لەیەکدیدا، ڕەودەکەن. تەنها لەحاڵەتی ڕووبەڕووبوونـەوەو شاڵاوی هۆزێکی دیـدا. یـاخود هێزێکی دەرەکـی (وەکـی دەزگاکـانی دەوڵـەت، یـاخود سـوپا، یامـسیۆناره ئەوروپاییـەکان)دا، هـۆزە نیوەکۆچـەرەکان یـاخود هـەتا هـۆزە نیشتەجێکانیش یەکڕیزانە ڕادەوەستن. ئەو دەمە ئاشکرادەبێت کام بنەماڵانە یاخود تاکەکەسـانی کەنارکەوتـە، سـەربەون. ڕووبەڕووبوونـەوەی سـەرومڕی لـەو بابەتـە چیدی باوی نەماوەو کاتی بەسەرچووە.

دەتوانین هەمان شت دەربارەی تیرو بنەماڵەش بڵێین. ئـەوانیش تـەنها لەحاڵـەتی کێشەو هەڵلا لەگەڵ دەستەی کۆمەڵایـەتی لەبابـەتی خۆیانـدا، یەکڕیزدەوەستنەوە. هـەر لـەو دەمانەشـدا مـەزنانیان وەك سـەرکردە دەنـوێنن. شـیرازەی کۆمەڵایـەتی زەمینەی کێشەو هەڵلا نییە، بەڵکە کێشەو هەڵلا ماکی دیارکردنی پلـەکانی شـیرازەی کۆمەڵگەیەو تەنها لەو حاڵەتەدا توێژەکانی عەییان دەبن.

کێشەو هەڵلاکانی هۆز گشتیان لەیـەك سەرچاوەوە سـەرهەڵناگرن. ئـەو یـەکێتیو بەرهەڵستکاریانەی لەنێو توێژەکانی هۆزدا پەیدا دەبن، لـەکاتی کێـشەو هـەڵلای وەك دوژمنایـەتیو خوێنـدا ڕوونـتر دیاریـدەدەنو لـەئاکارو هەستەهاوبەشـەکەی هـۆزدا بـەڕوونی ڕەنگدەدەنـەوەو دەورێکـی گـرنگ دەبیـنن. پێوانـەی پێبەنـدیی ئەنـدامانی هۆزەکوردەکان بەم تیرە یاخود بەو بنەماڵەوە، خوێنو دوژمنایەتییە.

بـەر لـەوەی زێـتر بـەم بابەتـەدا ڕۆبـچم، بـە پێویـستی دەزانم کـەمێك زاراوە کوردییەکانی هۆزو پشکە داکشاوترەکانی بتوێژمـەوەو بـزانین داخـۆ بـۆ تێگەیـشتنی مەبەستەکان هیچ دەستگیرۆییەکمان دەکەن.

### ٢ـ ٢ـ زاروە کوردییەکان

زاراوە گـشتییەکانی وەکـی (Stamm)، (Klan)، (Lincage) کـە کۆمەڵناسـان بەکاریانـدەهێنن، وەکـی ئـەو کورتەکە قۆڵبەسـتو بـەرۆك بـەرەو پـشتانەن، کە بـە تۆپزی لەبەر شێتانیان دەکەن، دەگەڵ واقیعـی کۆمەڵگەی کوردەواریـدا نـەگونجاون. ڕەنگە توێژینەوەیەکی ئەو زاراوەنـەی کـوردان خۆیـان لـەم بـوارەدا بەکاریانـدەهێنن،

دەستگیرۆییەکمان بکەن. هەر لەیەکەم تێڕوانینی سەرچاوە ئێتۆگرافییە کۆنەکانەوە، هەست بە شلۆیی‌و سەرلێشێوان دەکەن، نەك تەنها بەو هۆیەوە کە زاراوەگان لەهەندەك جێ دوو واتا دەبەخشن، بەڵکە بەو هۆیەشەوە کە لەهەر جێیەکی کوردستان‌و بە جۆرێك بەکاریاندەهێنن. چکێکیان لێرەو بڕێکیان لەوێ زێتر بەکاردەهێنرێن. جگە لەوە زۆربەیان وشەی لە عارەبی‌و تورکی‌و فارسی خوازراون‌و هەندەکیان هێشتا بەشێك لەواتا رەسەنەکەی خۆیان لەدەستنەداوە. ئەو تێکەڵوپێکەڵییە لە خوارەوە ڕووندەکەینەوە:

Leach دەبینێت لەباڵەکایەتی زاراوەکانی عەشیرەت‌و تایەفەو تیرە بەکاردەهێنن، ئەویش بۆ ئەمەسەرو بەرامبەر وشەکانی Stamm و Klan و Lineage ی لە ئینگلتەرەوە هێنراو بەکاریاندەهێنێت، هەرچەندە ئەوەشی لاڕوونە، کە تایەفەو تیرە گەلەکجار لەجێی یەکدی بەکاردەهێنرێن. دەڵێت عەشیرەت دەستەیەکی سیاسییەو تایەفەو تیرە دەستەو تاقمی خزمی یەکدین. هەر عەشیرەتە لەتایەفەیەك یا زێتر پێکدێت، تایەفەش لەچەند تیرەیەك (٢٣).

Barth کە لێکۆڵینەوەی مەیدانیی لەبارەی جاف‌و هەمەوەندەوە کردووە، پێیوایە بەرامبەرییەکەی Leach نەشیاو و نەگونجاوە. کە لەیەکێك دەپرسێت سەر بە کامە تیرەیت، دەڵێت: جاف، کە نێوی تەواوی هۆزەکەیە. لەڕاستیدا تیرە گوزارە لەگەورەترین دەستەی ڕیزی خوارەوەی هۆز دەکات، عەشیرەتیش گوایە سەرکۆی گشت تیرەکانە. Barth پێیوایە کە تیرە بەرامبەر Hauptlineage "لینێژی سەرەکی" دێت، هەرچەندە گشت Hauptlineage یێك تیرەی پێناگوترێت (ئەمە خۆی لەخۆیدا وا دەردەخات، کە جاف تیرە زێتر بە یەکەیەکی سیاسی تێدەگات وەك لەتاقمێك خزم).

کەواتە Lineage بەرامبەر هۆز دادەنرێت‌و هۆزیش بەنێوی بابەڵبابی هەموویانەوە نێودەنرێت. بەو پێیە هۆزی برایم ئەو هۆزەیە کە لەوەچەی برایم کەوتۆتەوە. Barth پێیوایە کە زاراوەی تایەفەی عارەبی، ڕێك بەرامبەر وشەی هۆزی کوردی دەوەستێتەوە[٢٤].

Rudolph لەگوتارەکەی ١٩٦٧یدا، شیکردنەوەیەکی تێرو تەسەلی ئەو زاراوانەمان بۆ پوختەدەکاتو پێماندەڵێت چۆن لەنێوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستانی ئێراندا بەکاردەبرێن، دەڵێت تیرەو تایەفە بۆ یەك مەبەست بەکاردەهێنرێن (کە من تەواو لەگەڵیدا نیم)، لەپاڵ ئەوەشدا پێیوایە تیرە شێوازێکی رووتە بۆ مەبەستی بەشبەشکردن، بەڵام تایەفە واتای لاوەکی دیکەشی هەیە[٣٥]. بەلای منەوە ئەم بۆچوونە گرنگە. تیرە، کە لەبنچینەدا وشەیەکی فارسییەو دەشێت لەبواری دیکەدا واتای "کوتبوون" ببەخشێت. لەفارسیدا دەڵێن: "دو تیرە شدن" (بوونە دووکوتەوە). پێموایە روونە، دەستەیەك کە لە کۆمەڵێکی گەورەتر جودابووبێتەوە، تیرەی پێبگوترێت. رەنگە "شك" واتایەکی پڕ بەپێستی بێت. تیرە بەرامبەر هیچ یەکێك لە زاراوەکانی ئێمە "Stamm"، "Klan"، "Lineage" ناوەستێتەوە، بەڵام دەشێت بەپێی جێگەو رێگە بۆ هەرسێکیان بەکاربهێندرێت. (دەشێت جاف بە تیرە دابنرێت، گەر بزاندرێت لەمەڵبەندەکەیاندا دەستەو تاقمی دیکەش هەن[٣٦]. بەڵام لەڕاستیدا بیر بەلای دەستەو تاقمی دیکەدا ناچێت، تەنها جاف لەپێشچاوانە، بۆیە عەشیرەت گونجاوترە).

وشەی تایەفە (کە لە "طائفة"ی عارەبییەوە وەرگیراوەو کۆکەی "طوائف"ە)، واتای خزمایەتییەکی درۆ یا راستەقینەی لەهەناودایەو لێکچوونێکی زۆری دەگەڵ وشەی "Bruderschaft" (برای دینی تەریقەتو ئاینزا)ی لای خۆماندا هەیە. لەتەواوی خۆرهەڵاتی نێوەنددا تایەفە هەم بەرامبەر "بنەماڵەی گەورە"و "Lineage" بەکاردەهێنرێت، هەم بۆ ئەو تاقمانەش کە هیچ خزمایەتییەکیان لەنێواندا نییە، وەکی ئاینزاو تەریقەتەکان. (بۆیە Barth هەقێتی کە هۆزی لەجێگەی دادەنێت). بەتایبەت لەئێران ئەم ووشەیە زۆرباوە، لەهەر دەروێشێك بپرسیت سەر بە چ تایەفەیەکە، نێوی هۆزو تیرەکەی ناهێنێت، بەڵکە نێوی تەریقەتەکەی دەڵێت ئەو تەریقەتەی کە ئامێزی "برایەتی" بۆ کردۆتەوەو لەخزمایەتییە دنیاییەکە هەمیشەییترە.

ئـەهلی هەقـەكانی داڵـەهوو[٢٧]، ئـەو ئاینزایـەی هێجگـار لەموسـڵمانە سـوننیو شیعەكانی هاوسێی جوداوازە، خۆیان نێودەنێن تایەفە. تووتشامی هەوارگەی رێبـەرە ئاینییەكـەش هەنـدەكجار بـە پایتەختـی تایەفـە نێودەبـەن. ئـەهلی هـەق بـەوە لەهاوسێ موسڵمانەكانیان جودادەكرێنەوە، كە سمێڵیان بەردەدەنـەودو هەڵیناپاچن. منـیش ئەودەمـە سمـێڵم تـا رادەیـەك درێـژبوو، لەیەكـەم سـەردانمدا گەلـەكجار دەیانپرسی: "ئەرێ تۆش لەتایەفەی خۆمانیت؟".

بۆیـە كاتێـك Rudolph قامـك بـۆ لایـەك درێـژ دەكـاتو لەیـەكێك لـە ئـەهلی هەقـەكانی كـورد دەپرسـێت: چ تایەفەیـەك ئـا لـەوێ دەژیـن؟ وەرامـی دەدەنـەوە: "تایەفەی سوننی"[٢٨].

كەواتـە هـیچ سـەیر نییـە كـە وشـەی تایەفـە تـەنها بەرامبـەر وشـەی Lineage بەكارناهێنـدرێت، بەڵكـە بـەربڵاووترکراوەو بـەواتای Klan و Stamm یـش بـەكاردەبرێت. رەزم ئـارا لـەتێڕوانینی خێڵەكانی خۆرئـاوای ئێرانـدا، هـۆز بـە تایفـە نێودەبات[٢٩]، (هەتا هۆزێكی مەزنی وەكی گۆرانیش)، لەویش خوارتر تیرەیە، مـن بـۆ خۆم وشـەی تایەفـەم دەگمـەن بـەو واتایـە بیستووە، چونكە وشەیەكی ئەبستراكتە، كۆكەی "طوائف"، یاخود "طوائف فلان منطقە"یە.

عەشـیرەت (كـە عارەبییەكـەی "عـشیرە"و كۆكـەی "عـشائر"ە) لەگشت شـوێنێكی كوردسـتان بـاوەو بـۆ دەستنیـشانكردنی گـشت لەگـشتی خێڵەكـە بـەكاردەبرێت. بـە كۆمەڵـە هـۆزێكی یەككـەوتووش هـەر عەشـیرەت دەڵـێن[٣٠]. كەواتـە ئـەم زاراوەیـەش كەوشەنی نییەو وەك پێویـست جێـی خـۆی نەكردۆتـەوە. جگـە لـەوە لەسەرتاسـەری كوردستاندا بەپێچەوانەی "نـا خێڵەكی"یـەوە، گوزارە لـە "خێڵەكی" یـان دەكـات. Sandreczki كـە سـاڵی ١٨٥٠ چـۆتە نێوچـەی هـەركی (نێوچـەیەكە هێنـد لەسێكوچكەكەی سنووری توركیاو ئێرانو عیراقـەوە دوورنییـە)، باسـی سیـستێمێكی دووتوێیمان بۆ دەكات: جـوتێرە نـا خێڵەكییـەكان كـە (گـۆران)یـان پێـدەڵێن[٣١] و ژێـر فەرماندەی توێژێكی سەربازیی یا تاقمە خانەدانەكانن، كە سوپا یاخود ئاسیرەتا یـان پێـدەڵێن. Sandreczki ئەمـەی دوایـیـان بـە ئاسـوری تێگـەیـیوە، هەرچـەندە

واپێدەچێت لەعەشیرەتەوە وەرگیرابێت[٣٢]. Rudolph یش مەودای واتای ئەو زاراوەیەی هەستپێکردووە، تایبەت کۆکەی "ماعشایر" (ئێمەی عەشایەر) گوزارە لە توێژێکی کۆمەلایەتی دەکات، کە سەرگەورەی کەسانێکی ناخێڵەکی وەکی وەرزێرانن[٣٣]. Hay کە دوو ساڵ لەکوردستانی عیراق جێگری ئەفسەری سیاسی بووە، پێیوایە ئەوەی دەڵێت: "من سەر بە فلانە عەشیرەتم" وەکی ئەوە وایە کە کۆن لاتینییەکان بە لافو گەزافەوە دەیانگوت "ئێمە رۆمانین"[٣٤].

برێکجار لەئێران وشەی عێل وەك هاوواتایەکی عەشیرەت بەکاردەهێنرێت، بەلام پێناچێت عێل ئەو واتایە ببەخشێت[٣٥]. بەپێی ئەو ئاگادارییەی من هەمە، تەنها هۆزێك کە بەعێل نێوببرێت، هۆزە مەزنە یەکگرتووەکانی زەعفەرانلو و شاجلون لەخۆراسان. مەزنەکانی ئەم هۆزانە سەدان ساڵە نێوی رەسمیی ئیلخانییان دراوەتێ. ئەمە بە نیسبەت هۆزە یەککەوتە مەزنەکانی بەختیاریو قاشقییشەوە هەروایە. نێوی عێل بۆ هۆزەکانی خۆراسان داهێنراوی دەوڵەتە.

پێدەچێت عێلەکانی دیکەش لەدەستەوتاقمی تێکەڵەی هەمەچەشن پێکهاتبنو دەوڵەت یەکیخستبن[٣٦]. من وایبۆدەچم کە زاراوەی عێل زاراوەیەکی حوکمڕانی بووبێتو پاشان واتاکەی فراوانتربووبێت. لەباکووری کوردستان زاراوەکانی تیرە و تایەفە بەکارناهێنرێن.

تەیانو هۆزەکانی دیکەی نێوەندی کوردستان، لقەکانیان بە قەبیلە نێودەبەن (کە بەعارەبی "قبیلة" و کۆکەی "قبائل"ە). قەبیلە دەستەیەکی کۆمەلایەتی پلەیەك خوارتر لەهۆزەو لێرە بۆ هۆبەش بەکاردەبرێت. هۆزی میران (کە لەبنچینەدا کۆچەربوونو لەهەمان نێوچەدا ژیاون، بەلام ئێستەکە مەڵبەندەکەیان کەوتۆتە باکووری خۆرهەلاتی سوریاوە)، وشەی فەخر بۆ هەمان مەبەست بەکاردەهێنن (کە عارەبییەکەی "فخذ"ە)، ئەمان بەفەخر خوارتریش هەر فەخر دەڵێن.

لەو دووحاڵەتەی پێشوودا روونکردنەوەی واتای ئەو زاراوانە ئەستەم بوو، زۆر کەسیان پاش پرسیارو دەمەتەقێیەکی زۆریش، سەریان لەمەسەلەکە دەرنەدەکرد،

چونکە ئەو زاراوانە زۆر بەدەگمەن بەکاردەهێنن، تەنها نێوی هۆزەکە دەهێنن و تەواو.

بەڵام گشتیان لەوەدا یەک بوون کە زاراوەی باڤك (یاخود بابك) کە ئارییەکانی ئەو نێوچەیە بەکاریدەهێنن، بۆ ئەو جۆرە تیرانە ناشێت. باڤك دانیشتووی گوندێکن و قەت نەمدەیتووە لەوە تێپەڕیانکردبێت و لەچەند گوندێکدا ژیابن. تیرە لەوە گەورەترە، کە زاراوەی باڤکی بۆبشێت.

ماڵ تاڕادەیەك لەواتای باڤکەوە نێزیکە، ئەمە بنەماڵەیەکی پوختەو هیچ بێگانەی تێکەڵ نییەو تەنها ئەو بنەماڵانە مەبەستە، کە لە تۆرەمەیەکی نێودارو دەستەڵاتدار کەوتوونەوە. بەو پێیە بە ئاغازادە گوردێرەکانی شیرناخ ناگوترێت باڤك، بەڵکە بە ماڵا تەتمر ئاغاو ماڵا سلێمان ئاغا نێودەبرێن.

**٢ـ ٢ـ ١ـ کەمە سەرنجێك بۆ کۆتایی ئەم بەشە:**

١ـ وەك ئاشکرایە زۆربەی زاراوەکان، خوازراوی زمانی بێگانەن، تەنها نێوی دەستەو تاقمە گچکەکانی وەکی "هۆز"و "باڤك"و "ماڵ" بنەچەیان کوردییە. (لەبواری هەڵشێلانی زاراوەکانی سەرکردەشدا رووبەڕووی ئەم دیاردەیە دەبینەوە).

تاقە هۆکارێکی شیاو بۆ ئەم دیاردەیە، هەرچەندە دەبێت زۆر هۆشیارانە دەریبڕین، رەنگە ئەوەبێت کە هۆزو باڤك ئەو دەستانەن، کە جموجوڵی سیاسییان زێتر لەسەر ئاستی مەڵبەندێك خۆدەنوێنێتە بەڵام تایەفەو عەشیرەت مەودایەکی بەرینتریان هەیەو کاتی بەرەنگاربوونەوەو مملانێ لەگەڵ دەستەو تاقمی وەك خۆیاندا (هەتا دەگەڵ عەشیرەتی ناکوردیشدا)، یاخود لەگەڵ حکومەتەکاندا، دیاریدەدەن. ئەمانە ئەو دەستەو تاقمە کۆمەڵایەتییانەن، کە دەوڵەتەکان بەردەوام پێیانەوە خەریکبوون، کە سەرکردەکانیان زۆربەی جار بە پلەو پایە لەشکری و فەرمانڕەواییەکان تامەتامە دراون و هەڵپەرێندراون.

نابێت شیمانەی ئەوەش فەرامۆش بکەین، کە دوورنییە ئەوەی من وەك واتایەکی لاوەکی بۆ عەشیرەتم لێکدایەوە، لەڕاستیدا بنجی نەبێت و زاراوەکە لەبنەچەدا بۆ

ئەندامــە جــەنگاوەرەکانی هۆزێــك بەکارنــەهێنرابێت‌و پاشــان بــۆ ئــەو تیپانــەی جەنگاوەرەکانی تێدا یەککەوتوون، یاخود لەلایەن دەوڵەتەوە یەکخراون.

٢. Leach عەشیرەت بەدەستەیەکی سیاسی نێودەبات‌و تایەفەو تیرە بە دەستەو تــاقمی خزمــی یەکــدی. (Rudolph یــش بەکــەمێك ســـڵەمینەوەوە جێپێــی هەڵدەگرێت). رەنگە ئەم جوداکردنەوەیەی لەوەوەبێت، کە عەشیرەت بەو زەقییە واتــای دەســتەو تــاقمی خزمــی یەکــدی نــادات. بــەڵام پێدەچــێت ئــەوەی بەسەردارابوردبێت کە تاقمەکانی خوارتری رۆڵی سیاسی مەزنتر دەبینن لەخودی عەشــیرەتەکەو بــە بەڵگــە ســەلمێندراوە، کــە زۆر تایەفــەو تــیرە لەرەچــەڵەکێك نەکەوتوونەوە. هەر عەشیرەتێك تۆکمە بووبێت (واتە مێژوویەکی دوورو درێژی هەبێت) ئیدی لقەکانی وەك تایەفە دەنوێنن، چونکە زێتر پەرتبوون‌و کەرتبوون لەسەر ئاستی قەوارەی خزمایەتی دەسازێت. بەڵام ئەو عەشیرەتانەی کە هێندە نییە پەیدابوون یاخود لەو دواییی دواییانەدا بێگانەی زۆریان تێوروکاوە، روون دیارە کە لقەکانی لەرەچەڵەکی فرەچەشن کەوتوونەوە، هەتا ئەو لقانەش کە خزمایەتییەکی قووڵ لە نێوان ئەندامانیدا نییە، وەکی باڤك.

دوو فەرمانبەری سەرنجدەری دیکە، Hay و Rondot باری سەرنجێکی دی تەواو جوداواز دەردەبڕن:

"هۆز کۆمەڵێك، یاخود چەند کۆمەڵێکی یەککەوتەیە، کە بۆ پاراستنی ئەندامانی لەدەستدرێژیی دەرەکی‌و بۆ پارێزگاریی داب‌و نەریتی میللی پێکهاتووە. برێك هۆز هەن هەتا سەرکردەیەکی دانپێدانراویشیان نییە، هەندە هۆزێکیش هەن، کە چەند سەرۆکێکیان هەیە....... هۆزە گەورەکان بەسەر چەند لقێکدا دابەشدەکرێن"[٣٧].

Hay سەرکردایەتی بەگرنگترین دەزگەی هۆز دادەنێت (هەڵبەت بۆ فەرمانبەرێك هەر دەبێت وابێت).

Rondot یش زایەڵەیەکی دەنگی Hay ە، بەلای ئەوەوە هۆز:

"جیهـانێکی گـچکەیەو لەهـەناوی خـۆی دەڕوانێـت، ئـامرازێکی بەرگرییـە، دەزگەیـەکی نـەریتیو پارێزکـارە، کۆمەڵێکـە خـۆی لەهاوچەشـنەکانی بـە مـەزنتر دەزانێت".

لەسـەری دەڕواتو دەڵێـت: "سـەرەکهۆز تـەنها بـەکردارو ڕەفتـارو مێرخاسـیو کەڵـەمێری، جڵەودەگرێتـە دەسـت، بـەرگری لـەهۆزو سـەرکردایەتیکردنی جـەنگ، یەکێکـە لـەگرنگترین ئەرکـەکانی"[٣٨]. ئـەم دوو نووسـەرە دەورو ڕۆڵـی خزمایـەتی دەبـوێرن، بـەوە وێنەیـەکی شـێواوی هـۆزی دەنەخـشێننو بایـەخی سیاسـی زەقتر دەنوێنێت.

٣. هیچ یەك لەو زاراوە لێکنێزیکانە پڕاو پڕ بۆ هیچ یەکێك لەپلەو پەلەکانی هۆز نـاگونجێن. زاراوەکـانی نەخـشەی ژمـارە یـەك زادەی بـیری کۆمەڵناسـانن و لەخـەیاڵی کـورددا جێگـەیان نییـە. تایەفـە هـەم واتـای خزمایـەتی راسـتەقینەو هـەم واتـای خزمایـەتی داهێنـراویش دەگەیـەنێت. تـیرەو فـەخر شـێوازی دابەشـکردنیان تێدایـە، زێتر گوزارە لەحاڵەتی پەیوەندییەك دەکەن وەك لەوەی زاراوەیـەکی رەهابن: تایەفـە واتـای هۆزێـك، یەکەیـەك، پێکبەندییـەك دەگەیـەنێت، وەلـێ دوانەکـەی دی واتـای "بەشێك لەیەکەیەك، پێکبەندییەك دەگەیەنن. گەر نەخشەی ژمارە یەك بۆ هۆزێك بگونجێـت، ئـەوا دەشـێت ئەنـدامی هۆزێـك جارێـك A بـە تایەفـە. لێکبداتـەوەو B بەیەکێك لەتیرەکانی، ڕەنگە جارێکی دی A بە تیرە نێوبەرێتو B بە تایەفە کەواتە بە پێی زاراوە کوردییەکان بێت، خزمایـەتی (کـە مـەرج نییـە لەتۆرەمەیـەك بێـت)و چەند پلەو هەڵقەیـەك، بنـەماو خەسـڵەتی دەزگـەی هۆزن. بـەو پێیـە پلـەکانی ئـەو دەزگەیە ـ کە لە مۆدێلەکەی ئێمەدا بە روونی دەستنیـشانکران ـ گـرنـگ نـیین، بەڵکـە ژمارەی پەلـە پێکداهەڵقـژاوەکانی یـاخود پێکـەوە گونجاوەکـانی هـۆز لەهەریـەك لـەو پلانـەدا گرنگن".

## ٢ـ ٢ـ خوێن و دوژمنایەتی و کێشەی دی

قورئانیش شەریعەتەکەی تەورات دووبارە دەکاتەوە: "گیان لەبری گیان، چاو لەبری چاو، کەپوو لەبری کەپوو، گوێ لەبری گوێ، ددان لەبری ددان و تۆڵەی گشت زامێك دەسەندرێتەوە". لەسوورەتێکی دیدا دەفەرموێت: "هۆ گەلۆ، ئەی خاوەنئیمانەکان، فەرمانتانپێدەکرێت تۆڵەی کوژراو بستێننەوە، ئازاد لەبری ئازاد، کۆیلە لەبری کۆیلە، ژن لەبری ژن"[٣٩].

کوردەکان دەبێژن تا ماوەیەکیش لەمەوبەر لەهەڵسوکەوتیاندا گەلەك لەو فەرمووەدەیەی قورئانیان تێپەڕاندبوو، هێجگار دڵڕەقانەتر رەفتاریان دەکرد، هەر وەك عارەبەکانی سەردەمی پێش ئیسلام.

"گەر یەکێکمان لەلایەن کەسێکی سەر بە هۆزێکی دییەوە لێکوژرابا، نێزیکترین خزمانی دەچوونە سەر ئەو هۆزەو هەر زەلامێکیان تووشهاتبا، دەمودەست دەیانکوشتەوە. هەندەجارێك تەنها بە کوشتنی تاقە نەفەرێك دانەدەسەکنان، بەڵکە چوار پێنجێکیان لەتۆڵەیدا دەکوشتەوە. دیارە ئەوانیش بۆ تۆڵەئەستاندن دەهاتنەوە سەر مان و چەند کەسێکیان لێدەکوشتینەوە. ئیدی ئەم بزمە سالآنێکی زۆر درێژەی دەکێشاو تا رێکدەکەوتینەوە پەنجا، سەد پیاومان لەیەکدی دەکوشت".

ئەمە گوتەی کابرایەکی خەڵکی مۆدکییە. لەگەلەك نێوچەی دیکەی باکووری کوردستان بەسەر هاتی لەوبابەتەیان بۆ گێڕاومەوە. زۆربەی هەرە زۆری هۆزەکان جار جارە تووشی گیچەڵی لەوبابەتە هاتوون و چەندین ساڵ سەرگەرمی دوژمنایەتی و تۆڵەئەستاندن بوون. گەر بشێت لێکۆڵینەوەکانی Barth بکەینە پێوەر، پێدەچێت مەسەلەی دوژمنایەتی و تۆڵە ئەستاندن لەباشووری کوردستاندا بەو رادەیە نەبێت و کەمتر بێت[٤٠]. وەلێ لەباکوری لەکوردستاندا هێشتا پەتایەکی بێئامانە، هەرەچەندە چیدی بەو بەرفراوانییەی جاران نەماوە.

دوور نییە ئەو ژمارانەی بۆمنیان باسکردوون، زێدەڕەوییان تێدا نەبووبێت، چونکە بەسەرهاتەکان بەناتەواوی لەبیرەوەریدا دەدرەوشێنەوەو لەگەڵ حەسرەت و هەوی او ئاواتی بریا ئاوهانەبانایە پێکەڵپێکن.

سەیر لەوەدایە نە لەقورئانو نە لەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکاندا، هیچ باسی ئەوە ناکرێت کە تۆڵە راستەوخۆ لەپیاوکوژە تاوانکارەکە خۆی بستێندرێتەوە. لەدابی خێڵەکیدا ئۆباڵی پیاوکوشتن گەردنی هەمووان دەگرێتەوە، نەك تاکە کەس. جوداوازی نێوان دابو نەریتی خێڵەکیو یاسای قورئان لەوەدایە، کە خێڵ لەبری چاوێك چەند چاوێك دەکۆڵێتو هەتا تۆڵەی دەستێنێتەوە (کە قورئان قەدەغەی دەکات). لەو نێوچانەدا کە دەوڵەت دەستەڵاتی تەواوی تێدا نییە، یاخود بەرتیلو قاچو قووچ پەکی ئەو دەستەڵاتە دەخات، وەکی کێوەکانی باشووری خۆرهەڵاتی تورکیا، هێشتا تۆڵەو دوژمنایەتی هەر بەردەوامن.

لەگوندی نولودەرە، کە پێشان زێدی ئاسوورییان بوو، پاش پەرەوازەبوونی ئەوان لەیەکەم جەنگی جیهانیدا، کوردەکانی هۆزی گۆیان ئاوەدانیان کردەوە، چەند بافێکێکی لێن، کە پێدەچێت هیچ خزماتییەکیان لەگەڵ یەکدیدا نەبێتو Lineage لەرووی هێزیشەوە نابەرامبەرنو لەچەند گەڕەکێکی گەورەی جودا لەیەکدیدا دەژین. ساڵێك بەر لەوەی من بچمە ئەوێ، کوڕی بافکێکی گچکەی کەم هێز، کیژی کابرایەکی بەدەستەڵاتی بافکێکی گەورەتری هەلگرتبوو. هەڵبەت هەلگرتنو رەدووکەوتنو هەڵهاتنی دوو دڵخواز، پێشهاتێکی ترسناکەو خوێنساردیو کەڵەمێریو عەگیدیی گەرەکە. بەهەرحاڵ، پاشان شوێنی جووتە دڵخواز پێزانراو بووە شەڕەتفەنگ. کوڕە خۆی، یاخود یەکێك لەیارمەتیدەرانی، خزمێکی کچەیان زامدارکرد. هەرچەندە کوڕەو کچە ئیدی گەیشتبوونە خۆرئاوای تورکیاو لەوێ نیشتەجێبووبوون، کەچی هێشتا تۆڵەو خوێنرێژی نەبڕابووەوە. دوو پیاوی سەر بە بافکی کوڕە، کوژران. دیارە دوو کەسی نێزیکی نا، بەڵکە دوو کەسی کارامەی بێتاوانی بافکەکە. پاشان هەردوو بافکەکە ئاشتبوونەوە، یاخود تەنها شەڕیان راگرت، چونکە کەمهێزەکەیان لایرۆونبوو چارەی ئەوی دی پێناکرێت، بۆیە گرتنو سزادانی پیاوکوژەکانی بۆ دەوڵەت هێشتەوە، (لەڕاستیدا فەرمانبەرێکی دەوڵەت رێکیخستنەوە). بەلام بارو دۆخەکە هەر گرژو ئاڵۆز بوو، چونکە پیاوکوژەکان زلحۆدەسوورانەوە.

هێنــدەی کرابــا لایــەنگرانی هــەردوك باڤــك لــەدیتنی یەکــدی خۆیــان دەبــواردو دوورەپــەرێز لەیەکــدی دەوەســتان. کەســیان نەدەچــوونە ئــەو چــایخانەیەی پیــاوانی لایەنەکەی دی رووییانتێدەکرد، (لەئولودەرە دوو چایخانەی لێیە). جار جارە لەنێوان هــەردوو گەڕەکەکــەدا دەبــووەوە شــەڕەتفەنگ. پــاش ئــەوەی مــن ئــەوێم جێهێــشت، هەمدیسان گڕی شەڕو دوژمنایەتی هەڵایسایەوەو لایەنی کەم دووکەسی دیکەی تێدا کوژران.

تا مەودای جوداوازییە چینایەتییەکە لەنێوان پیاوکوژو کوژراوەکەدا فروانتربێت، دەستگەیشتنە تاوانکارە راستەقینەکەو تۆڵەنەستاندنەوە لێی ئەستەمتردەبێت. گەر سەرەکهۆزێك لەلایەن بۆرمپیاوێکی خۆڵامی خۆیەوە، کەسەر بەهیچ هۆزێ نـەبێت، بکوژرێت، کەسوکاری سەرەکهۆزەکەش سووربن لەسەر کوشتنەوەی خوڵامەکە، بەوە پلەی سـەرەکهۆزەکە دادەلەنگێننـە ئاستی خوڵامێك. وەلـێ خێڵایـەتی ئـەوەی پـێ قەبووڵ ناکرێت کە خوڵامێك خۆ بە خۆ ئاغای خۆی کوشتبێت، دیارە هـەر دەبێت بەفیتی سەرەکهۆزێکی دی بەو تاوانـە هەڵستابێت بۆیـە گومـان لەسـەرەکهۆزێکی دی پەیـدا دەکرێـتو ئـەو دەکرێتـە جێنیـشانەی تـیری تۆڵـە. هەڵبـەت ئەمـە تـەنها گریمانەیـەکی پەتییـە، دەنـا مـن بـۆ خـۆم نـە لەسەرچـاوە نوسـراوەکانداو نـە لـە لێکۆڵینەوە مەیدانییەکانی خۆمدا، تووشی پێشهاتی لەو بابەتـە نـەهاتووم، نەمدیت ســەرەکهۆزێك بەدەســتی بۆرمپیــاوێکی رووتەڵــەی خــۆی کوژرابێــت. هەڵبــەت دەستکێـشانە گیـانی ئاغایـان هێجگـار بـەو دانـسقەییە نییـە، بـەڵام زێـتر ئەوانـەی بـەکارێکی ئاوهـا هەڵدەسـتن، یـا خزمـی خۆیین، یـا کەسێکی هاوشـانی خۆی. دیـارە دەبێـت هەنـدەك پێـشهاتی ململانێـی چـینایەتی ئالـەم دوادواییانـەدا، لـەم حـسێبە هەڵبوێرین[٤١].

حاڵەتی پێچەوانەی ئەوە، وەکی ئەوەی بۆرمپیاوێك لەلایەن ئاغاوە بکوژرێت، وەك رووداوێکی ئاسـایی رۆژانـە نـەبووە، زۆر دەگمـەنیش نـەبووە. فەلـە کوردەکـانو ئـەو وەرزێرانــەی سـەر بـە هـیچ هۆزێـك نـەبوون، لەبەرامبـەر دەسـتەڵاتی خێڵەکانـدا هەمیــشە دادۆشــراو و خــوڵامو خزمــەتکاری ئاغــاو ســەرەکهۆزان بــوون، هــیچ

جوداوازییەکی ئەوتۆیان دەگەڵ کۆیلەکانی سەدەی نێوڕاستی ئەورووپادا نەبووە. ئاغاکانیان وەك بەشێك لەملکی خۆیان، وەکی گاوگۆتاڵیان تێیانڕوانیون. چۆن کوشتنی بەرانێکی ئاغا تۆڵەی سەندراوەتەوە، هەر ئاوهاش کوشتنی خولامێکی فەلەی، بێ تۆڵە نەهێڵدراوەتەوە.

Taylor کە لە ساڵەکانی شێستی سەدەی نۆزدەهەمدا لەدیاربەکر کونسولی بەریتانیا بووە، بۆماندەگێڕێتەوە کە لەو دەمەدا وەرزێرە فەلەکانی مەڵبەندی بۆتان، پێکڕا دەگەڵ ئەو زەوییەی کاریان تێدا کردووە، کڕراون و فرۆشراون، پێیانگوتوون زێڕکڕیی، (ئەوانەی بەزێڕ دەکڕدرێن). سەروبەر ملکی کابرای کوردە بوون. Taylor بەداخ و حەسرەتەوە بۆماندەگێڕێتەوە چۆن لەتۆڵەی زێڕکڕییەکدا کە بەدەستی (یاخود بەفیتی) سەرەکهۆزێك کوژراوە، دوو زێڕکڕیی خولامی کوژراونەوە، "هەرچەندە هیچ پەیوەندییەکیان بەکوشتنی خولامە هاودەردەکەیانەوە نەبووە"[٤٢].

پێدەچێت Taylor نەیزانیبێت کابرای کوردە هێندە لەفەرموودەکەی قورئان لایداوە: "خولام لەبری خولام"، کە لەبریتی تاقە زێڕکڕییەك جووتێکی کوشتۆتەوە. کوشتنی خولامێکی ئاغا هیچ جوداوازیی دەگەڵ کوشتنی قاترێکیدا، یاخود دزینی شەکێکیدا نەبووە. کەس چاوەڕوانی ئەوە ناکات ئاژەڵێك، یاخود خولامێك تۆڵەی خۆی بەدەستی خۆی بکاتەوە، ئەوە کاری ئاغایە. جگەلەوە، فەلەکان بۆیان نەبووە چەك هەڵگرن، ئیدی چۆن و بەچی تۆڵە بستێننەوە. یاسای خێڵەکی تەنها بۆ ئەندامانی خێڵە، دەستوپێوەند ناگرێتەوە. Taylor ئەو بەسەرهاتە تایبەتە پڕ مەرگەساتەمان بۆیە بۆ دەگێڕێتەوە، چونکە قوربانییەکان فەلەی (کلدانیی) بوون، دەنا خولامی بێ پشت و پەنای کورد، حاڵیان باشتر نەبووە. تا ئێستاش ئاغا تۆڵەئەستێنێ خولامە. ئەمە لەوەی سەربەست بژین. بۆ کابرایەکی رووتە، خولامێتی ئاغایەکی دەستەڵاتدار باشترین بەربەست و قەڵغانە لەحاند دەستدرێژی و شاڵاوی تەڕیدە و ملهوڕاندا.

گەر پیاو کوژو کوژراو سەر بەهەمان هۆز، یا هەمان تیرە، یاخود هەمان بنەماڵەبن، مەودای ئامانجی تۆڵەئەستاندنەکە بەرتەسکتر دەبێتەوە.

لەبەر رۆشنایی خشتەی ژمارە (١)دا دەتوانرێت ئەمە باشتر روونکرێتەوە، گەر لەهەر سێگۆشەیەك وەك تایەفەو بنەماڵەیەك بڕوانین. گریمان پیاوێکی بنەماڵەی ژمارە (٢) لەلایەن کابرایەکی بنەماڵەی ژمارە (١٤)ەوە دەکوژرێت، ئیدی تەواوی کەسانی بنەماڵەی C دەبنە جێنیشانەی تیری تۆڵە، تەواوی کەسانی بنەماڵەی A دەبنە تۆڵەستێن. (لەڕاستیدا بە کردەوە تەنها خزمە زۆر نێزیکەکانی کوژراوەکە منەی تۆڵەئەستاندن دەکەن، یانی خانەوادەی a). گەر پیاوکوژەکە سەر بە تایەفەی ٧ بێت، ئەودەم هەردوك بنەماڵەکانی ä و B گرفتاری داوی دوژمنایەتی دەبن، (بنەماڵەی h دوورەپەرێز دەوەستێت). بەلام گەر پیاوکوژەکە سەر بە بنەماڵەی ٤ بێت، ئەوا تەنها کەسانی سەر بە بنەماڵەی b دەبنە جێنیشانەی تۆڵەو تۆڵەئەستێنانیش تەنها لەبنەماڵەی a دەبن. ئابەو جۆرە دوژمنایەتی کۆمەڵەکان کوتکوت دەکات و رووبەڕووی یەکدییان دەکاتەوە. پلەی خزمایەتی پیاوکوژەکەو کوژراوەکە رادەو ئاستی رووبەڕووبوونەوەکە دیاریدەکات.

ئیدی لەپارچەکانی کوردستاندا باوی وەی بەسەرچووە هەر قوڕبەسەرێکی سەر بە هۆزە دوژمنەکە بەردەستکەوت، بکوژرێتەوە. تەنها پیاوکوژەکە خۆی، یاخود کەسێکی هەرەنێزیکی وەکی برای یاخود کوڕی دەکوژرێتەوە. وەلێ دوژمنایەتییەکە هەر بە زرپی دەمێنێتەوە، کەس و کاری هەردوکلا خۆ لەیەکدی دەبوێرن. سیمای خێلایەتی بە دوژمنایەتییەکەوە کاتی رێککەوتن زەقتر خۆدەنوێنێت، ئەو کاتەی بەژ بەکەس و کاری کوژراو دەدرێت و بەوە دەست لەتۆڵە هەڵدەگرن. قورئان فەرمانی ئەو جۆرە رێککەوتنە دەدات: "گەر براکەی رازیبێت بەشتێك لێخۆشبێت، دەبێت خوێنباییەکی چاکی پێبدرێت"[٤٣]. دەبێت ئەو بەژە بنەماڵەی پیاوکوژەکە هەڵیسوورێنێت، لەدەستنیشانکردنی ئەندازەکەیدا بەریڤان تەنها پلەو پایەی پیاوکوژو کوژراوەکە پێشچاوناگرێت، بەڵکە گەورەیی و دەوڵەمەندیی بنەماڵەی پیاوکوژەکەش. پشکی ئەو بەژەی دەکەوێتە سەر هەریەکێك لەبنەماڵەکە، بەپێی

دەستکەوتو پلەی ئابووریی هەریەکێکیان دەگۆڕرێت. بەڵام دەبێت هەر ئەندامێك لایەنی کەم، هێندەی پێهەڵدەسووڕێت باربوو بدات. دیارە بەژ بەسەر گشت ئەندامانی بنەماڵەی کوژراوەکەدا دابەشناکرێت. گەر بابی کوژراوەکە مابێت، ئەوا ئەو خوێنباییەکە وەردەگرێت، دەنا برای یا ئەو خزمەی وەریدەگرێت، کە ئەرکی چاودێریکردنی کەسوکاری کوژراوەکەی لەئەستۆدایە.

## ٢- ٣- ١- بەلاداخستنی دوژمنایەتی لەڕێگەی نێوبژییەوە

چارەسەری ئاشتییانەی کێشەو ئاشووبێك هەروا ئاسان نییەو لەپڕێك ناکرێت، دەبێت کەسێکی بەوەج و دەستەڵاتدار بکەوێتە نێوانەوە. لایەنە هەڕەشەلێکراوەکە کەسێك دەدۆزێتەوە کە لای تۆڵەئەستێنەران ڕێزو ڕۆمەتێکی بێت. زۆرجار ئەو کەسە سەرەکهۆزێك یا مەزنی گەورەماڵێکە. گەر ئەو کەسە خۆی سەربە بنەماڵەی پیاوکوژەکە بێت، ئیدی ئەویش لەدوژمنایەتییەوە گلاوەو ناتوانێت ببێتە بەریڤان. تا پلەی کۆمەڵایەتی دوو دەستە دوژمنەکە بالاتر بێت، دۆزینەوەی بەریڤانێکی گونجاوو شیاو، دژوارترو ئەستەمتر دەبێت[٤٤]. چاوساغێکی نێوچەی مۆدکانی نێزیکی بەتلیس بۆیگێڕامەوە، کە گوایە دوژمنایەتی نێوان خزمان زێتر لەڕێگەی ڕێکەوتنو بەژەوە چارەسەردەکرێت، وەلێ دوژمنایەتی نێوان هۆزە جوداوازەکان قەت لەو ڕێگەیەوە چارناکرێت: "تەنها ڕێگە، خوێن لەبری خوێنە". گەر لایەکیان کەسایەتییەکی ناسراوو بەشۆرەت پەیدا نەکات تا ڕێکیانخاتەوە، ئەوا دوژمنایەتییەکە هەتا هەتایە بەردەوام دەبێت. جار هەیە سەرەکهۆزانی هاوسێ هەوڵدەدەن تیرەو هۆزە گەورە دوژمنەکان ڕێکخەنەوە، هەرچەندە گەورە پیاوانی هەردوولا بەهاسانی ملنادەن، چونکە سەرەکهۆزی نێوبژیکەر، بەوە نێوو شۆرەتێکی درەوشاوەی پێدەبڕێتو مەزنتر دەبێت. پەندێکی باکووری کوردستان هەیە دەبێژێت[٤٥]: "سەرزەعفن، لێ سەرێ کو سەر پێ ببهیسنە کێمە" (سەر گەورە زۆرن، وەلێ ئەو سەرگەورانەی گوێ بۆ سەرگەورەیەکی دی رادەهێڵن، کەمن).

دوو هۆکاری روونی جووتبەندی یەکدی، قۆرتی سەر ریگەی ئەوەن کە ریکخراوە سیاسییە کوردستانییەکان بتوانن نیلەنیلی گری دوژمنایەتی هۆزەکان خامۆشکەن: یەکیکیان پلەوپایەی بلندو دەستەلاتی فراوانی سەرکردە ئاینییەکانی وەکی شیخە. شایانی باسە کە سەرکردایەتی یەکەمین راپەرینی نیشتمانیی کورد، بەدەست شیخانەوە بووە. هۆکاریکی دیکەیان ئەوەیە کە گوایە زۆربەی سەرەکهۆزە مەزنەکانی کورد لەرەچەلەکیکی دیکە کەوتوونەوە . یاخود خۆیان بانگاشەی ئەوە دەکەن . بریکیشیان خەلکی کونجیکی دیکەی کوردستانن. بەلام دیاردەی زەقو زالی زۆر لەسەرەکهۆزانو خانەوادە خانەدانەکان ئەوەیە کە گوایە لەبنەمالەیەکی بەشۆرەتی عارەبان کەوتوونەوە، ئیدی یەکیك لەو عارەبانەی کە لەمیژووی ئیسلامدا دەوریکی گەشیان دیتووە، وەکی یەکیك لەهاوەلو یاوەرەکانی پەیامبەر، یاخود یەکیك لەپالەوانانی جەنگی داگیرکەرانەی عارەبان، یاخود دامەزرینەری یەکیك لەمیرنشینە مەزنەکان. بەوە جگە لەدەستخستنی پلەو پایەی ئاینی، کە درەختی خانەوادەیەکی لەو بابەتە پییدەبەخشیت، واشدەردەخات کە گوایە خزمایەتی دەگەل ئەندامانی دیکەی هۆزەکەیدا نییەو نابیتە پشکیك لەو دوژمنایەتییەی بنەمالەکانی دی تیوەی گلاون. بەوە مافی ئەوەشی دەکەویت کە ببیتە بەریڤان. نابەو رۆلی نیوبژیکردنە، زۆربەی سەرەکهۆزان دەستەلاتیان برەو پیدەدەن.

شیخان زۆریان پشکیك نیین لەخانە جوداوازەکانی پیکهاتی هۆز. ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی زۆریان بتوانن رۆلیکی سیاسی درەوشاوە لەکۆمەلگەی خیلایەتیدا بۆ خۆیان بپچرن. لەراستیدا زۆری شیخەکان هیچ خزمایەتییەکیان دەگەل هۆزەکانی دەوروبەریاندا نییە. دامەزرینەرانی زۆر لەو تەکیَ شیخنشینانە، وەکی ریبەریکی ئاینی لەجییەکی دییەوە رەویانکردووەو هاتوون لەشوینی ئیستایان نیشتەجیبوون.

ئەمە خۆی لەخۆیدا برِوا و بانگەشەی بیلایەنیو لەسەرنەکردنەوەی هیچ یەکیك لەهۆزەزەکانیان پتەوتر دەکاتو نابنە بەشیك لەو ململانییە. شیخان وا پیشاندەدەنو سوورن لەسەر ئەوەی کە گوایە دوورن لە چنینەوەی دەستکەوتو سوودی دنیاییو خۆیان بۆ خزمەتی ئیزدانو پاراستنی ئاینو بەرژەوەندیی

ئیمانـداران تەرخاندەکـەن، بـا گەلـەکجار رۆژگـار پێـچەوانەی کەشـی دەرخـستبێت. بانگەشەی ئەوە دەکەن کە گوایە لەڕێگەی جەزبەو زیکرو تەهلیلەوە، زێتر لەڕێبەرو پێـشەوا ئاینییـەکانی دی، ئێـزدانو بەنـدەی لێـك نزیکدەکەنـەوە. ئـەو پلـەو پایـە مەزنەی لەدەرەوەی قەوارەی هۆز بـۆ خۆیـان پـچڕیوە، وایلێکـردوون ببنـە باشـترینو لەبارترین پەناگـە بـۆ تێکـەوتنو نێوبـژیکردنو بڕاندنـەوەی دوژمنایـەتیو گێرمـەو کێـشەی نێـوان هۆزەکـان. چارەسـەرکردنی زۆرتـرین کێـشەو گرفتـی نێـوان هـۆزە جوداکان لەسەردەستی شێخاندا کراون. ئابەو دەورو رۆڵە ئاشتیخوازانەیە، شۆرەتی خۆیان برەو پێداوەو دەستەڵاتی سیاسی خۆیان پەرەپێئەستاندووە.

لەنێوان ساڵانی ١٨٢٠و ١٨٦٠ دا، ژمارەی شێخەکانی کوردستـان بەشێوەیەکی سـەیر زێـدیکردو پلـەو پایـەی سیاسیـشیان پەرەیـسەند. وەکـی لەبەنـدی چـوارهەمدا روونیدەکەینەوە، ئەو پەرەئەستاندنە ئاکامێکی لەنێوچوونی دواهەمین فەرمانڕەوا نیوەسەربەخۆکانی کوردو پیادەکردنی چارەسـەرییە ئیدارییـەکانو سـەقامگیرکردنی دەستەڵاتی نێوەندیی ئیمپراتۆریتی عوسمانی بوو. تا سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمیش هێـشتا فـەرمانڕەواکانی کـورد یاساو دادگـەی خۆیـان هـەبوو، دەسـتەڵاتو هێزێکـی تـەواوی دانپێـدانراوی ئـەوتۆیان هـەبوو، کـە بتـوانن چـارەی کێـشەو گرفـت بەسـەر هۆزەکـانی قەڵەمڕەویانـدا بـسەپێنن. پـاش لەنێوچـوونی ئـەوان، کۆمەڵگەکـە چـاولەدووی جـۆرە کەسـایەتییەك بـوو، کـە متمانـەی سـەپاندنو ئاشـتی هێـوریی پێبکرێتو دان بەدەسەڵاتیدا بنرێت، پێدەچێت شێخان بـۆ ئـەو مەبەسـتە لەگشت کەسان گونجاوترو لەبارترو شیاوتر بووبن.

لـەنیوەی یەکـەمی ئـەم سـەدەیەوە، رژێمـە نێوەندیـەکان هەوڵیانـداوە مەڵبەنـدە کوردییـەکان بخەنـە ژێـر رکێفـی راسـتەوخۆی خۆیانـەوە، تۆڵـەیان یاسـاغ کـردووەو لەبریتی یاسای عەشایەر، یاسای مەدەنیو سزاو دادگایان سەپاندووە، (یاخود باشـترە بڵێین هـەوڵی سـەپاندنیان داوە)، تـا لـەو رێگەیـەوە دەسـتەڵاتی سـەرکهۆزانو شـێخان کەچو بنبڕکەن. توندڕەوترین هەوڵ لەو بوارەدا لەکۆمارەکەی تورکیادا درا، لـەئاکامی شۆڕشو راپەڕینەکانی بیـستو سییەکاندا، گەلـەك گـەورە پیـاوی تەقلیـدی کوژران،

یاخود دەربەدەرکران. هەتا ئەو زەبرو زۆرانەش بێ ئاکام بوونو ئامانجیان نەپێکا. چونکە متمانە بە فەرمانبەرانو کاربەدەستانی دەوڵەت نەدەکرا، نەیانتوانی جێگەی گەورە پیاوە تەقلیدییەکان بگرنەوە. جار جارە لێرەو لەوێ توانیویانە چارەی کێشەیەکی خێڵەکی بسەپێنن، بەلاّم قەت نەیانتوانیوە لەڕێگەی گفتوگۆو لێکتێگەیشتنەوە چارەی هیچ کێشەیەك بکەن.

گەلەکجار کاربەدەستانی دەوڵەت بەوە تاوانبار کراون، لەبریتی ڕێکخستنەوەو ئاشتکردنەوە، ئەم هۆزیان دژی ئەوی دی دنەداوە. لەگەلەك نێوچە سەرەکهۆزی نوێ پەیدا بوونو دەستەلاّتیان وەدەست گرتووەو کاربەدەستانی دەوڵەت ئالیکارییان کردوونو دەستکەوتیان چنیوەتەوە. لەهەرجێیەك هێزو دەستەلاّتی ئاغاو شێخان بە هێجگاریی بنبڕ کرابێت، لەوێ کۆمەڵگەکە کێشەو گێچەڵی لەجاران زێتری بۆ سازاوە.

دارگوند گوندێکی نێوچەی مۆدکییەو دەکەوێتە باکووری خۆرئاوای بەتلیسەوە، ساڵی ١٩٣٥ هۆزە گچکەکانی ئەو مەڵبەندە پێیانوابوو گوایە شۆڕشو ڕاپەڕینێکی سەراپایی کورد دژی دەستەلاّتی تورکان لەئانو ساتدایەو ها کە تەقییەوە. مۆدکی کە پێتەختی مەڵبەندەکەو چەقی فەرمانڕەوایی بوو، گەمارۆیاندا، بەلاّم بەر لەوەی داگیریکەن، ئۆردووی تورکی گەیشتێ. ژەندرمەی تورك هێجگار توندو تیژ تۆڵەیان لەخەڵکەکە سەندەوەو خراپ سزایاندان. زۆربەی ئاغاو شێخان بەدارداکران، پشکی هەرە زۆری گوندنشینەکان، پاش دەستلێوەشاندنێکی خوێناوی، بۆ تراقین دوورخرانەوە. ماڵو گوندیان وێرانو خاپوورکران، هەتا دارگوێزەکانیشیان لەبنو بێخدا بڕینەوە، تا ئەوانەی هەڵهاتوون، دالّدەیان نەمێنێتو دەرفەتی گەڕانەوەیان لێبتەندرێت. ئەو گوندانەی مانەوە، خرانە ژێر چاوەدێریو جەورەوەو بۆ هەر دوان سیانێکیانو بنکەیەکی ژەندرمە دانرا. یەکێك لە چاوساغەکانم بە تەوسەوە دەیگوت: "ئا بەو شێوەیە گشت لەگشتمان کراینە ژیاریو بووینە تورکی ڕەسەن".

خەڵکی دارگوند سەر بە هۆزی کیبورانن، کە لە دوو تایەفەکەی مەمۆو سلۆ پێکهاتوون. هەتا ئەوڕۆکەش سەرەکهۆزێك، گەورەپیاوێك، کوێخایەك مەزنێکیان نییەو بێسەریی مانەوە، هەتا دەوڵەمەندێکیشیان تێدا هەڵنەکەوتووە، گشت

لەگشتیان وەرزێرن. پێشان لەگوندێکی هاوسێ شێخێکی لێبوو، پاش راپەڕینەکە کوژرا. ئێستەکە کوڕێکی لەوێ دەژێت، بەویش دەڵێن شێخۆ، جار جارە نوشتەو چاوەزار دەنووسێت‌و منداڵان لەچاوی پیس دەپارێزێت، بەڵام خۆی هیچ شکۆیەکی ئەوتۆی نییە، لەو سەرو بەرەدا بۆتە ئیمانی گوندەکە و لەلایەن دەوڵەتەوە مووچەیەکی بۆ بڕراوەتەوە، دیارە ئەمە لەچاو پایەی شێخایەتیدا، دالەنگینی پلەی کۆمەڵایەتییە. بڕێك کێشەی گچکەی وەکی کێشەی زەوی‌و موڵکایەتی لەلایەن ژەندرمەوە چارەسەر دەکرێن، بەڵام، ئەوان ئەو شکۆو سەروەرییەیان نییەو متمانەیان پێناکرێت‌و ناتوانن چارەی کێشەی گەورەو گرنگ بکەن‌و خەڵکی رێکبخەنەوە. لەوەوە جۆرە دالەنگین‌و بۆشاییەك لەهێزو دەستەڵاتدا کەوتۆتەوە. دیارە شیرازەی کۆمەڵایەتی‌و ئیدیۆلۆژی پابەندو پەیوەستی هۆزە، وەلێ تاقە سەرچاوەی دەستەڵات کە یاسا دەسەپێنێت، سەر بە شیرازەیەکی کۆمەڵایەتی دیکەیەو لەسەر بنەمای ئیدیۆلۆژییەکی دی هەڵچووەو بەو رەوتە هەڵسوکەوت دەکات. ئەمە بۆتە ماکی ئەوەی کە کێشەکان هەتا هەتایە بەردەوام بن، یاخود لەباشترین حاڵەتدا هێجگار خاو و لەسەرەخۆ خامۆش ببن‌و لەبیربچنەوە.

ساڵی ۱۹۷۳، کابرایەکی مەمۆیی، یەکێکی سلۆیی کوشت، پێدەچوو زێتر رێکەوت دەوری لەو بەدبەختییەدا دیتبێت. لەترسی تۆڵەسەندنەوە، تاوانکارەکەو براکانی دەمودەست هەڵهاتن بۆ کونجێکی خۆرئاوای تورکیاو لەوێ خۆیان حەشاردا. خزمانی دی هەر لەگوند مانەوە، دڵنیابوون تۆڵە لەوان ناستێندرێتەوە. بەڵام سلۆییەکان خۆیان بە زوڵم لێکراو دەزانی‌و بەوە گرژی‌و ئاڵۆزییەك لەنێوان هەردوو بنەماڵەکەدا سازاو خاوبوونەوەی نەبوو، چونکە تاوانکاریش هەر دوورە دەست بوو. (ماوەیەکی کورت گیراو لەلێخۆشبوونە گشتییەکەی ۱۹۷٤دا بەرهەڵدا کرا، بەزیت‌و وریایی خۆی، نەیهێشتبوو کەس پێبزانێت لەکوێ دەژێت).

هیچ گەورە پیاوێکی خاوەنشکۆی ئەوتۆی نەبوو، کە بتوانێت دوو بنەماڵەکە رازی بکات تا رێککەونەوەو دوورەپەرێز لەیەکدی دەوەستان. ئێوارە دادەهات بە دەگمەن لەماڵ وەدەردەکەوتن. هەتا شایی‌و زەماوەندیشیان چۆڵ‌و هۆڵ‌و بێگەڕی رەشبەڵەك‌و

ناڵەی نەیو زرمەی دەهۆڵو زیـرە زیـری زورنـابوو. تـەنها جێیـەك كە هەردوو كلا رووپانتێـدەكرد، قوتابخانەكـەی نـاوایی بـوو، دەچـوونە كـن ئـەو مامۆسـتایانەی هـەر لەوێ دەژیان (مامۆستاكان گشتیان غەوارە بوون)، منـیش مێـوانی ئـەوان بـووم. هـەر تاقە سلۆییەك رووپكردبا ئەوێ، هەرچی مەمۆیی لێبان، دەستەبەجـێ هەڵدەسـتانو دەڕۆیـشتن، پێـچەوانەكەشی هـەروابوو، هـەتا چاییەكەشـیان فڕنـەدەكردو هـەروا جێیاندەهێشت.

پێدەچێت ئەو گرژیو ئاڵۆزییە زۆر بخایەنێتو درەنگ خاوبێتەوەو بەسەربچێت. رەنگە وەچـەكانی داهاتوویـان بتـوانن ئـەو دوژمنایەتییـە گۆڕكـەنو گـەردنی یەكـدی ئازادكەن. چونكە ئەوان لەڕێگەی وانەكانی قوتابخانەوە شارەزای پێومرێكی دی دەبن، جـودا لـەدابو نـەریتی خێڵایـەتی. لـە حەفتاكانـدا، ئـەو پێـومرە خـۆی تـەنها بـە ئیدیۆلۆژیی رەسمیی كەمالیستەوە نەبەستبووەوە، بەڵكە ئـەو ئاڵقەیـەی پساندبوو، ئاڵتەرنەتیڤی ئیسلامو سۆسیالیزمیشی ئاوێتـەبوو بـوو. وەلـێ لـەو پـەڕی كراوەیـیو دڵفراوانیـشیاندا، هێـشتا هـەر هەسـتێكی نـاقۆلا زاڵ بـوو، كـە نـا لـەم پێـشهاتەوە دەچریسكێتەوە:

رۆژێـك پێـنج لاوی "پێـشكەوتنخوازیان" دوانـی سـلۆییو سـیانی مـەمۆیی - بڕیاریانـدا پێكـڕا بـچنە راوەماسـی. (راوەماسـی بـە دینامێـت دەكـەن، هەرچـەندە یاساغیشە، بەڵام ئـەومیان لەگشت شێوازێكی دی لا شیرینترە، بۆمبایـەك هەڵدەدەنـە گۆمێكی پڕ لە ماسییەوە). سەرەتا وایبۆدەچووم كە ئەو لاوانە تا رادەیەك متمانەیان بەیەكدی هەیەو پێدەچێت كەمتر بایەخ بەكێشەی نێوان تایەفەكانیان بـدەن. بـەڵام سـەرنجمدا، كـە چـوون نێـو گونـد بـۆ دینامێـت كـڕین، مـەمۆیی كـەنارێكی چۆمەكی گـرتو سـلۆیی كەنارەكـەی دی، لەهـەر لایەشـیان تـەنها تاقـە یـەكێكیان چـووە دوكانەكـەوە. ئـەوجا پێكـەوە بـۆ شـوێنی دیـاریكراو بەڕێكـەوتن. لـێ لـەوێش لێـك جودابوونەوەو هەر لایەك بۆخۆی بە جودا بۆمبای خۆی هەڵدەدا.

هێشتا لەوێ گەورەپیاوێكی نوێی ئەوتۆیی هەڵنەكەوتۆتەوە، كە بتوانێت پێبەپێی دابو نەریتە دێرینەكە، رێزو سـەروەری خـۆی بـسەلمێنێتو دەسـتەڵات پـەیدا بكـات،

رەنگە هۆکەی ئەوەبێت کە ژەندرمە نێوچەکەی تەواو تەواو لەژێر رکێفیدایەو ئەوە مــەودای پەیــدابوونی ســەرەکهۆزێکی هەلکــەوتووی تــەنیبێت. هەرچــەندە کــەس بەدەستەلاتی نوێی دەولەتو داو دەزگاکانی رازیی نییەو بەوە بارێك کەوتۆتەوە، کە کێشەکان نەبە شێوازی نەریتیو نە بە شێوازی نوێ، ناتوانرێت چارەبکرێن.

لەهەنــدەك جێگــەی دیکــەی کوردســتانی تورکیــا، تایبــەت لەشــوێنە چــەپەرەکانی باشــووری خۆرهــەلات، بــارودۆخێکی دی لەئارادایــەو بۆتــە هــۆی ســەرهەلدانو پەیـدابوونی دەسـتەیەکی نـوێ لەسـەرەکهۆزی گـچکەلەو هەنـدەك لەدەستڕۆیـشتووە دەلالەکان، کە زۆربەیان ئەو پلەوپایەیان لەرێگەی پەیوەنـدییو ئالیکارییـەوە دەگـەل ئـۆردووی تـورکو دەزگاکـانی دەولەتـدا، پێـبڕاوە. ژمارەیــەکی هێجگارکــەم لەوانــە توانیویانە سەروەرییو شکۆی خۆیان بسەلمێننو متمانەیـەکی ئاوهـا پەیـدا کـەن، کە ئـاگری شـەڕو هـەرایان پێبکوژێتـەوە. پێدەچێت ململانێـی نێـوان ئـەو سـەرەکهۆزە هەلپەرستە بە هەلپانەو سەرەکهۆزە سەرکزکراوەکان، کێشەو گرفتـی نێـوان هۆزەکـان پتر پەرەپێبدات، نەك کەمی بکاتەوە.

لەحەفتاکاندا، کە ئیدیۆلۆژی لەهەرەتی مۆدەو باویدابوو، بابـەتی شـیرینی بـاسو دەمەتــەقێی لاوە خوێنگەرمــە رۆشــنبیرەکانی گونــدو شارۆچــکەکانی کوردســتان، هەلتەکانــدنی بــیری گەنــدەلی تیرەگــەریو کۆتاییهێنــان بــە شــەڕو دوژمنایــەتی خێلایەتی بوو، چونکە هەستی نەتەوایەتی سیسو خامۆش دەکات، چارشێو بەسەر جوداوازیی چینایەتیدا دەداتو یەکێتی یەکریزیی موسلمانان کزو کەنەفت دەکات. سەر بـە هـەر ئیدیۆلۆژییـەك بـان، شـەڕی تیرەگـەرییان بـەماکی بەدییـەکانو نێرکـی ئیدیۆلۆژییــەکی دوژمــن دەزانــی. دیــارە ئــەوە گەلــەك ئاســانترو کاریگــەرتر بــوو کــە هەســتی خێلایــەتیو شــەڕی تیرەگــەری وەك بنەمایــەکی مەعنــەوی ریــشەکێشو بنکەلکــەن، وەك لــەوەی چــاوەڕوانو تەماشاچــی بــن ئــەو دەمــەی هــۆزی خۆیــان تێوەدەگلێت. ئا ئەو تاقمە رووناکبیرانەی کە شەڕی تیرەگـەرییان بـە ئیدیۆلۆژییـەکی دژ دادەنا، توانییان رەفتارو ئایدیای خۆیـان یەکخـەن. هەرچـەندە تـەنها تاقـەجارێك

بیستم کە لاوان هۆشیارانە نەریتی کۆن پێشێل کەنو ببنە دۆستو هەفاڵی کەسانێك، کە دەبایە بە چاوی دوژمن لەیەکدییان روانیبا:

کەمال کە کرێکارێکی لاوی دیاربەکریو ئەندامێکی چالاکی رێکخراوێکی سیاسی کورد بوو، ئەم بەسەرهاتەی خۆی بۆ گێرامەوە: خێزانەکەی بەر لەچەند ساڵێك بەهۆی دوژمنایەتییەوەو لەترسی تۆڵەسەندنەوە، ناچار بوو گوندەکەی خۆی لەنێزیکی ئاگری جێبهێڵێت. هیچ یەکێك لەوەچە بەتەمەنەکانی نەیانوێراوە چیدی تاقەجارێك روو لەگوندەکەیان بکەنەوە. بەڵام کەمال بۆیگێرامەوە کە ئەو بە هۆی جموجۆڵی سیاسییەوە بەردەوام سەردانی گوندەکەی کردووە. بەو هۆیەوە کە زۆربەی لاوانی خوێندەوارو سۆسیالیستو کوردی نەتەوە پەرست بوون، قەت لەوێ هەستی بە مەترسی نەکردووە. راستە دوور نییە زۆر سادەو سافیلکانە لەسۆسیالیزم گەیشتبن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بڕوایان پێیبووەو هۆشیارانە لەو پێناوەدا دژی دابو نەریتی تیرەگەرێتی وەچەکانی بەر لەخۆیان وەستاونەوە. کەمال پێیوابوو کە لاوانی تیرەکەی دوژمنی بۆیە هێند بەتەنگ دۆستایەتییەوە بوون، تا بە شانازییەوە بیسەلمێنن کە نوێخوازو پێشکەوتنخوازن.

## ٢ـ ٣ـ ٢ـ ژنو ژنخوازیو کێشەی خێڵایەتی

رەنگە یەکێك لەو هۆکارانەی کە لە کێشەی خێڵایەتیو تیرەگەرێتی کوردستاندا، پتر لەزۆر کۆمەڵگەی خێڵەکی دی، دەورێکی نەرێتی دیتبێتو ماکی درێژخایاندنی ئاشووبو هەرا بووبێت، مەسەلەی Endogamie بێت، واتە ژنو ژنخوازی لەنێویەکدیو لەسەر ئاستێکی ئەوپەڕی بەرتەسکی پلەو خانە جوداکانی هۆزدا. ژنو ژنخوازی لەنێوان ئامۆزاو بنئامۆزادا زۆر باوو لەپێشە. ئامۆزای کچە دەتوانێت بەربەرەکانێی گشت خوازبێنیکەرێك بکاتو دژی بوەستێتەوە.

گەر بابی بخوازێت کچە بە بێگانەیەك بدات، دەبێت جارێ پرس بە ئامۆزاکانی بکاتو ئەوان رازی بن، بەوە ئەوان دەستبەرداری مافی لەپێشێتی خۆیان دەبن. بۆ خۆم قەت نموونەی لەوبابەتەم نەدیت، بەڵام لەزۆر گۆشەی کوردستان باسی ئەو

دابەم بیست. گەر کچە، ئامۆزایەکی خوازبێنی بکات، ئەستەمە بابی نەیدات، گەر نەڵێم هەر شێوای رەتکردنەوە نییە.

لەگشت جێیەکی کوردستان، ئەو شیربابییەی لەئامۆزا دەستێندرێت، گەلەك کەمتر لەوەی لەبێگانەیەك داوا دەکرێت، دیارە بەچاوپۆشی لەچاوگەو هۆو ئامانجی ئەو دابەی رێگە بە مارەکردنی ئامۆزا دەدات.

ئاشکرایە ئەم جۆرە ژنو ژنخوازییە دابەشبوونو خانەخانەکردنێکی هێجگار تێکەڵو پێکەڵ لەدرەختی بنەماڵەکەدا دەسازێنێت، (بڕوانە خشتەی ژمارە ٢). لەکاتێکدا ژنو ژنخوازی لەنێوان دوو بنەماڵەی ئامۆزای یەکدیدا، تێکەڵیو خزمایەتی دووتایفەکە پتەوتر دەکات (تایبەت گەر ئامۆزازا، یاخود بنئامۆزازابن)، ئەوا شووکردنی کچێك بەئامۆزای خۆی، تەنها خانەیەك لەپلەکانی تایەفەکە پتەوتر دەکات. وەك لەخشتەی ژمارە ٢دا دەبینین، خانە داکشاوەکانی دووبنەماڵەکە، تاكو تەنها مانەوەو تێکەڵی لەنێوانیاندا رووینەداوە، بەوە خزمایەتییەکی ئەوتۆ نەخوڵقاوە کە بتوانێت کێشەی لەپرسازاویان دامرکێنێتەوە. هەڵبەت پیادەکردنی ئەم جۆرە یاسایەی لێرەدا دەستنیشانمانکرد، لەژیانی رۆژانەدا خاوتر دەنوێنێت، گشت ژنو مێردەکان ئامۆزای یەکدی نیین، هەرچەندە ژمارەی ژنو مێردانێك کە بەپێی نموونەکانی ئەم خشتەیە سازاون، هەتا لەنێو کوردە شارنشینەکانیشدا، سەرسامیانکردم. مەخابن من لەهیچ جێیەك بۆم نەلوا ئەژمارێکی رێکوپێکی ئەو جۆرە ژنو ژنخوازییانە بکەم. تاقە سەرچاوەیەك کە پێبزانم، ئەو سەر ژمێرەیە کە Barth لەباشووری کوردستان لەشێوەی پرۆفەیەکی گچکەدا دەستیخستووەو بەو پێیە بێت، لەنێوخێڵەکییەکانی کورددا ٤٠٪و لەنێو ناخێڵەکییەکاندا ١٠٪ی ژنو مێردەکان، ئامۆزاو بنئامۆزان[٤٧]. من تەواو تەواو دڵنیام کە لە باکووری کوردستان، رێژەکە برێك لەوە باڵاترە.

گەر کچە بە ئامۆزایەکی نەبرا، ئەوجا ئامۆزازا یاخود بنئامۆزازا دێتو ئەوان لەخزمێکی دی لەپێشترن، خزمێکی دوورت لەبێگانەیەك لەپێشترە. لەڕاستیدا فشاری

کۆمەڵایەتی زێتر بەلای ژنو ژنخوازیی نێو گوندێك خۆی، لەژنو ژنخوازیی نێو تایەفەیەك لەپێشترە (چونکە جوداوازییەکی ئەوتۆ لەنێوان خەڵکەکەیدا نییە).

لەباکووری کوردستان نەریتێکی سەیرم دیت، کە مافی کوڕانی گوندێك بەسەر کچانی گوندەوە ئاشکرا دەکات. گەر کچە شوو بەبێگانەیەك بکات، (یانی بە کوڕی گوندێکی دی)، گوڕگەلی دی ناهێڵن کچە بگوێزنەوە تا بابی زاوا شتێك پووڵیان نەداتێ. لەڕۆژی زەماوەندی لەوبابەتەدا، دەمدیت کوڕو کاڵی دێ، گشت ڕێگەکانیان دەبەستو کەژاوەی بووکیان رادەگرت، هەتا کەسوکاری زاوا سەرانەیەکیان نەدابا، ڕێگە ڕۆیشتنیان نەدەدان.

## ٢ـ ٢ـ ٣ـ بڕێك جۆر کێشەی دی

لەبەر دوو هۆ دوژمنایەتیم پێش کێشەکانی دیکەی خێڵ خست: کوردەکان خۆیان گەلەکجار بۆ دەرخستنی گرنگیی ئەندامێتی تایەفە، دوژمنایەتی وەك نموونە دەهێننەوە، (لەمەوە ئەوە دەدرەوشێتەوە، کە دوژمنایەتی پشکێکە لەو پێناسەی خۆیان بۆ شیرازەی کۆمەڵایەتی هۆزیان داناوە). هەروەها ئەو بەرپرسیارێتییە گەلەییەی لەکۆکردنەوەی بەژدا ئاشکرا دەبێت، لەگشت شتێك ڕۆشنتر پرینسیپی گەلەدژایەتیو دوژمنایەتی ڕووندەکاتەوە. گەلەك کێشەی دی هەن، تاڕادەیەك هەمان ڕێچکە دەگرنەبەر، بەڵام ڕۆشنایی کەمتر دەخەنە سەر خانەخانەکردنە کۆمەڵایەتییەکە. زۆرجار ئەو کێشانە لەنێوان دەستەو تاقمانێکدا سەرهەڵدەدەن، کە لەحاڵو باری ئاساییدا، سنووری نێوانیان زەقتر دەنوێنێت، بۆ نموونە دزینی مەڕومالاتی گوندێك لەلایەن ڕەوەندەکانی هۆبەیەکی دیاریکراوەوە. لەو حاڵەتانەشدا تۆڵەکردنەوە هەر گەلەییە (دیارە زۆر بە زێدیشەوە)، کە دوورنییە تۆڵەی دیکەی لێنەکەوێتەوە.

زۆر کێشەی خێڵەکی دی هەن، خولقاوی دەستی سەرەکهۆزەکانن، زێتر پاشخانی دژایەتیو ڕکەبەریو ململانێی نێوان ئەوان خۆیانە بەدارو دەستەکانیانەوە، وەك لەوەی گێرمەو کێشەی خانەو کوتەجوداوازەکانی هۆزبێت. ئەم دیاردەیەی دواییان

دەگمەنترە، هەرچەندە هەرچی کێشە هەیە، بە دوژمنایەتی بشکێتەوە، هەر کێشەیەکی ئالۆزیش درێژەی کێشا، خوێنی تێدا دەڕژێت.

**٢ـ ٤ـ دەستەو تاقمی لەهۆز هەراوتر**

دەتوانین بێژین پرینسیپی دوولانەی دژایەتیو هاوپەیمانێتی، بەرادەیەك لەهەناوی هۆزدا رەگی داکوتاوەو تەرزی فرێداوە، کە پەلوپۆی بۆ ئاستە هەراوترەکانیش هاویشتووە: وەك قەوارەی هۆزە یەکگرتووەکان، یاخود قەوارەی میرنشینەکان (ئەو دەستەلاتدارییە کوردیانەی لەلایەن میرێك، بەگێکەوە فەرمانڕەوایی دەکرانو تا گیانەڵلای سەدەی نۆزدەهەمیش هەر بەردەوامبوون). هەتا جاروبار (بەپێچەوانەی نەتەوەکانی دیکەی وەکی تورکو فارسو عارەبو ئەرمەنەوە)، تانوپۆی تەواوی نەتەوەی کوردی تەنیوەتەوە[٤٨]. هەرچەندە هێندەی پەیوەندیی بە تێکڕای نەتەوەی کوردەوە هەبێت، پڕ قۆرترە، (دیارە دەبێت زاراوەی نەتەوەی کورد، لەسەرەتای سەدەی بیستەم بەدواوە، بە کەمەلێك سڵمینەوەوە بەکاربهێنین). سەرجەمی بزووتنەوە ئازادیخوازەکانی کورد، تەنها لەلایەن دەوڵەتانی تورکو فارسو ئینگلۆ ـ عارەبەوە بەربەرەکانی نەکراوە، بەڵکە لەلایەن کوردێکی هێجگار زۆریشەوە.

ئەوەبوو لەدواهەمین جەنگی ١٩٧٤ / ١٩٧٥ی کوردو عیراقدا کە تا نەوەدەمە کورد بەشداری چالاکانەو راستەوخۆی لەو بابەتەی بەخۆوە نەدیتبوو، (زێتر لە ٥٠ هەزار چەکدارو ژمارەیەکی هێجگار زۆر لایەنگیر)، سوپای عیراق بە تەنها خۆی بەرەنگاریی بزووتنەوەکەی نەدەکردو دژی نەدەجەنگا، بەڵکە دەیان هەزار چەکداری بەکرێگیراوی کوردیشی لەتەکدابوو.

ئەو دژایەتییە هۆکاری زۆر بوو، گرنگترینیان ئەوەبوو کە سەرکەوتنی بزووتنەوەکە، هێزو دەستەلاتێکی ئەوتۆی بۆ سەرکردایەتیو کەسایەتییە تەقلیدییەکانی تەوەریو دەوروبەری مسۆگەر دەکرد، کە بەزیانی نەیارە نەریتییەکانیان بشکێتەوە. سا بۆیە ئەوانیش دەیاندایە پاڵ دوژمن. دیارە نسکۆو

تێکشکانی بزووتنەوەکە، مانای پەرەنەستاندنی هێزو دەستەڵاتی ئەوانە، هەڵبەت تا ئەو مەودایەی کە هەستی نەتەوایەتی بەسەر هەستی خێڵایەتییاندا زاڵنەبێت‌و پرزەی لێنەبڕێت‌و جێی پێلێژنەکات.

لەسەر ئاستی قەوارەی نەتەوەکە، پرنسیپی دوولانەی هاوپەیمانێتی‌و دژایەتی، مەگەر بۆ خۆهەڵنان‌و پڕوپاگەندە، دەنا قەت وەکی پێویست رەوتی نەکردووەو نەهاتۆتەدی.

میرە کوردەکان، هەندەکجار شکۆو سەروەرییەکی هێجگار زۆریان هەبووەو گشت لایەك ملکەچی فەرمانیان بوون. بەڵام وەکی لەبەندی سێهەمدا روونیدەکەینەوە، یەکێتی‌و یەکڕیزی ئەو میرنشینانە، گەلەکجار کەوتوونە گێژاوو تالووکەوەو لەکاتی بەرەنگاربوونەوەو تێکگیران دەگەڵ میرنشینە کوردەکانی دیدا، یاخود دەگەڵ دەستەڵاتی نێوەندیدا، درزو شەبەقیان تێکەوتووەو دارماون. ئا ئەمە مشتێکە لەخەروارێك:

ساڵی ١٨٣٢ میری کۆر (محەمەد پاشای میری رەواندز) پەلاماری میرنشینی بادینانی هاوسێیداو داگیر کردو رەسوڵی برایی کردە حوکمڕانی ئامێدی پێتەختی. هۆزەکانی بادینان بەرگرییەکی ئەوتۆیان نەکردو بۆ بەرپەرچدانەوەی داگیرکەران‌و پاراستنی میرنشینەکەیان پێکڕایی نەکەوتنەخۆ. سمایل پاشای میری بادینان، بێهوودە هانای بۆ میری بۆتان‌و هەکاری‌و والی عوسمانی لەموسڵ برد، تا کۆمەکی پێبکەن‌و پێتەختەکەی بۆ بستێننەوە. هەوڵ‌و کۆششی دەگەڵ هۆزەکەی خۆشیدا بۆ راپەڕین‌و خەبات‌و دەرپەڕاندنی هێزی داگیرکەر، بێ ئاکام بوو. ئەم رووداو پێشهاتانە کۆتاییان بە تەمەنی میرنشینەکە هێنا، چیدی یەککەوتن‌و یەکگرتنەوەی نەسازا. هەندەك سەرەکهۆزی گچکەی بادینان، هەڵگەڕانەوەو دایانەپاڵ رەسوڵ بەگ، دەستەیەکی دی سەنگەریان گواستەوە کن والی عوسمانی، بڕێکی دیش بوونە ئاغای خۆیان‌و تەنها پێبەندی ئارەزووی خۆیان بوون[٤٩]. کەواتە پرنسیپی دوولانەی هاوپەیمانێتی‌و دژایەتی‌و ئالەم حاڵەتەدا نەهاتەدی‌و کاریگەرنەبوو.

## ٢ـ ٤ـ ١ـ ململانێی نێوخۆو چاوگە دەرەکییەکانی هێزو دەستەلات

یەکرِیز وەستانەوە بەرامبەر بێگانە، لەسەر ئاستی هۆز، گریمانەیەکی پەتییە. وا چاوەڕوان دەکرێت تەواوی هۆز لەکاتی بەرەنگاربوونەوەی هێزێکی دەرەکییدا، یەکرِیز بوەستێتەوە (بەتایبەت لەبەرامبەر هۆزەکانی دیدا)، بەلاّم لەڕاستیدا گەلەکجار ئاکام جۆرێکی دیکەیە. لەکاتی تێکگیربوونی دوو هۆزدا، دەشێت لقی هۆزێکیان بداتە پاڵ هۆزە نەیارەکە. رەنگە هۆکاری ئەوە دوژمنایەتییەکی نێوخۆ بێت، کە بە گردەبڕی سەنگەرەکان جودا دەکاتەوە، یاخود زۆرجار تەنها زویربوونی سەرداری ئەولقە لەسەرەکهۆزەکە، ئەو یاساگشتیە قڵپدەکاتەوە. بەتایبەت هەر ئا لەم سەدەیەدا، تا ئەو دەمەی هێشتا دەوڵەتەکانی نێوچەکە، سنوورێکیان بۆ دەستەلاّتی سەرەکهۆزەکان دانەنابوو، شەڕەزرتانێیەکی بەردەوام بوو لەسەر سەرۆکایەتی هۆز. هەر نێودارێک هەڵدەستا، هەوڵی دەدا بەرلەوانی دی، دەستەلاّتی کۆمەلاّیەتی - سیاسی بۆ خۆی بربدات. ئەو سەرەکهۆزە دڵبژۆکانە، لەبریتی پەندی "هۆزی گوردێر دژی هۆزەکەمە"، لەبیرو هزری ئەوەدابوون "هەڵبەت بەتەنێ تیرەو هۆزو سەرکردە مەزنەکان، لەوەتەی هەن، خەریکی ئەم بازییە نەبوون، بەڵکە وڵاتە بەهێزەکانیش دەستیان تێکەڵکردووە. بڕدانی دەستەلاّت لەلایەن دەوڵەتەوەو توانستی فەرمانڕەوایی کردنو دەستتێوەردان، بەشێوازێك کە ململانێی خێلاّیەتییە نێوچەییەکان بە سوودی خۆی بشکێنێتەوە، نموونەی هەمیشە پاتەکراوەی مێژووی کوردن".

لەدەووروبەری ساڵی ١٦٠٠دا، دوژمنایەتییەك دووبەرەکیی خستە نێو بنەماڵەی سەرۆکەکانی هۆزی نێوداری موکرییەوە (کە ئەورۆ لە باشووری گۆلی ورمێ نیشتەجێن). ئەو سەروەختە، باکووری خۆرهەلاّتی کوردستان نێوچەیەك بوو، لەنێوان ئیمپراتۆرێتی عوسمانیو ئیمپراتۆرێتی سەفەویدا کێشەو هەڵلاّی لەسەربوو. لەساڵی ١٦٠٢وە، شاعەبباس دەستیکردە هێرشبردن بۆ سەر ئازربایجانو ئەرمینیاو کوردستان، تا لە ٢٤ی ئۆگۆستی ١٦٠٥دا، پاش شەڕێکی خوێناوی، سەرکەوتنی بەدەستهێناو عوسمانییەکانی بەزاند، کە لەپاڵ زۆر هۆکاری دیدا،

منەتباری تیپێکی جەنگاوەری هۆزی موکری بوو. هەمانکات، دەستەیەکی گوردێر هەر لەهۆزی موکری خۆی، شانبەشانی ئۆردووی عوسمانی دەجەنگا. ئەم بەسەرهاتە لەڕێگەی راپۆرتێکی Malcolm ەوە زانراوە (هەڵبەت ئەویش لەسیلەی تێروانینی فارسەکانەوە دەیگێڕێتەوە). دیارە خۆشترواپە زۆر درێژەی پێنەدەین و لەکورتی بیبڕینەوە:

"کاتێك شا عەبباس لەتەك بالآدەسترین ئەفسەرەکانی و هەندەك لەمەزنترین دیلەکانیدا دانیشتبوو، خەریکی خواردنەوە بوون، دیتی وا هەرزەکارێك، کابرایەکی چەتەوڵی سەرباز ئاسای تازە بەدیلگرتووەو داویەتیەپێش. پاشا خواستی بزانێن، ئەوە کێیە. دیلە گوتی:" لەخانەدانانی کوردی موکریم". بەڕێکەوت پاشا ئەفسەرێکی بەردەستی لابوو، کە نێوی رۆستەم بەگ بوو، ئەویش لەخانەدانانی موکری بوو، پاشا دەیزانی دەگەڵ خانەوادەی دیلەکەدا دوژمنایەتییان هەیە، گوتی: "ئا ئەو دیلە بدەنە دەست رۆستەم بەگ". بەلآم ئەو سەرەکهۆزە رازی نەبوو دیلە وەرگرێت. گوتی: "بەهیوام پاشام بمبەخشێت، لەراستیدا لەدڵەوە حەز دەکەم خوێنی هەڵقوڕێنم، بەلآم سوێندم خواردووە، قەت کەم فرسەت نەبم و کەساسی و زەلیلی دوژمنی دەستبەستراوم نەقۆزمەوە". واپێدەچوو ئەو جوامێری و مێرخاسییەی کە لەگوتەی ئەو ئەفسەرە کوردە دەچریسکایەوە، پاشای خستبێتە گۆمی بیرکردنەوە. بەشێواوییەکەوە میرغەزەبی بانگکرد، تا لەسەری دیلە بدات. هەر کابرای تەژەی کورد ئەو فەرمانەی بیست، خۆی راپسکاندو کۆت و پێوەندی دەستی پساندو لەخەنجەرەکەی نەوی و هەڵمەتی بۆ پاشا برد. بووە شەرەمست و لەو هەڵپە هەڵپ و پەلەپەلییەدا کە پاسەوانان بۆ قوتارکردنی پاشایان کردیان، چرا کوژایەوە، ئیدی کەسیان نەیاندەوێرا دەستبکەنەوە، لەترسی ئەوەی نەبا لەبریتی کابرا، زرمە لەپاشا هەڵسێنن. چەلێکی چاك بە تۆقیوی و واق وڕماوی مانەوە، تا لەپڕێکدا دەنگی پاشایان هێوری کردنەوە، دووجاران قیژاندی: "مەچەکم گرتووە، مەچەکم گرتووە". دیسان هێمنی باڵیکێشایەوەو چرا هەڵگیرسایەوە. ئەوجا سەدان شمشێر لەو دیلە دلاوەرە کلۆڵە کەوتنە کارو ئەنجن ئەنجنیانکرد. پاشاش پاش ئەوەی

خەنجەرەکەی لەدەست سەند، کەڕایەوە نێو کۆڕەکەی‌و دەستیکردەوە هەڵقوڕاندنی پێکە مەیی خەست‌و تا کاژێری دوازدەی شەوێ، خەریکی وەرگرتن‌و ژماردنی کەللەسەری دوژمنانی بوو[٥٠].

ئەمە نەیەکەمین جارو دواهەمین جاربووە، کە کورد بۆ بەرژەوەندیی دوژمنانی، دژی کورد بجەنگێت، هەتا دژی ئەندامانی تیرەکەی خۆشی، جەنگێك هۆکارەکەی هەرچی بووبێت، ئاکامەکەی هەمیشە بەزیانی کورد شکاوەتەوەو کورد دۆڕاوی یەکەم بووە. هەنووکە لە گۆشەنیگای کەسێکی بێگانەوە، ئا ئەو سیاسەتە خۆکوژییە، هێجگار ناپەسەندو نابەجێ‌و دوور لەگشت هەستونەستێك دێتە پێشچاوان، وەلێ گەر لەئاقاری بەشدارانی ئەو دەمەی کوردەوە تێبڕوانرێت، دەبێت پێشهاتەکان جۆرێکی دیکەیان نواندبێت. لە سەروەختی ئەو دوژمنایەتییەی نێو هۆزی موکریدا، لەشکری فارس‌و ئۆردووی عوسمانی، گرنگترین جووتە زلهێزی دژەیەکی نێوچەکە بوون. دەبایە ئەو دووتیرە دوژمنەی هۆزی موکری، بەرامبەرێنی ئەو جووتە هێزەیان، بۆ دەستکەوتی سیاسی خۆیان قۆزتباوە. پێدەچێت خۆبەستنەوە بە لەشکری ئەو لایەنەوە کە بەهێزتر نواندوویە، ستراتیژێکی پڕهیوابووبێت، چونکە واچاوەڕواندەکرێت ئەوە لایەنی سەرکەوتوو بێت‌و دان بەسەرکردایەتی ئەو هێزەدا بنێت کە هاوکاریی دەکات‌و بۆتەفروتووناکردنی، یاخود لاوازکردنی گوردێرەکەشی پشتگیریی بکات. هەرکات تیرەیەکیان دەیدایە پاڵ ئۆردوویەکیان، تەنها چارەی تیرەکەی دی نەوەبوو بداتە پاڵ ئۆردووەکەی دی‌و بەو پەڕی تواناوە لەتەکیدا بجەنگێت، چونکە پاشەڕۆژی سیاسی، بەسەرکەوتن، یاخود ژێرکەوتنی ئەو هێزەوە وابەستەبوو. ئەوەی بۆ هەردوو ئیمپراتۆرێتەکە شەڕی مان‌و نەمان بوو، بۆ جووتە تیرەی هۆزی موکری، تەنها درێژەپێدانی دوژمنایەتییەکی بێجێ بوو.

### ٢ـ ٤ـ ٢ـ دوو پەلكەیی سەرتاسەری كۆمەڵگە

ئـەوەی راسـتیبێت لـەپاڵ بنـەمای ئیـدیۆلۆژیو پرنـسیپی دوولانـەی دژایـەتیو هاوپەیمانێتیو (ئالیكاریو یەككەوتنی هۆز بەرامبەر بێگانە)دا جارجارەش شوێنپێی دووپەلكەیی، تەواو تانو پۆی كۆمەڵگە قاشدەكات.

لەمیرنـشینی هەكاریـدا، هۆزەكـان بەسـەر دوو دەسـتەی "راسـت"و "چـەپ"دا دابەشـكرابوون. كرۆكـی هەریـەكێك لـەو دوو دەسـتەیە، لەیەككـەوتنی تیرەكـانی خۆرئـاوا دەگـەڵ هـۆزی ئەرتووشیداو تیرەكانی خۆرهـەلات دەگـەڵ هـۆزی پنیانـشدا، پێكهاتبوو، هەنـدەك خێڵی گچكەڵە. كە لەمەڵبەنـدی ئـەو دوو یەكێتییـەدا، یـاخود لەكەنارياندا دەژیان، لەسەر لایەنێك لەودوانە حسێبدەكران. ئەوە بەنیسبەت تایەفە گـچكەكانی هـەردوو بـاژێڕی میرنـشینەكەوە هـەر ئاوهـابوو. كەواتـە نـەك تـەنها میرنشینەكە، بەڵكە یەكەیەكەی نێوچەو هەتا باژێڕەكانیشی، بـوو بوونـە "راسـت"و "چەپ". هەڵبەت میر بۆخۆی نـەبوو بـووە پشكێك لـەو دوو كوتـە، دەسـتەلاتی بـەو گەمەیە بەڕێوەدەچوو، ئەملای دژی ئەولا هاندەدا.

هـەتا ئێـستاش، ١٣٠ سـاڵ پـاش وەلاخـستنی دواهـەمین مـیری هـەكاری، ئـەو دووپەلكەییـە هـەر هەسـتپێدەكرێت، بەتایبـەت لەدەمـەدەمی هەڵبژاردنـەكانی پارلەمانی توركیادا، كە ویلایەتی هەكاری تەنها بـە تاقـە نوێنـەرێك بەشداریی تێـدا دەكات. پنیانشو ئەرتووشی یەكی نوێنەرێك دەستنیشاندەكەن، كە هەریەكەیان سەر بەیەكێك لەو دوو پارتـەن، كـە بەربـەرەكانێی یەكدی دەكـەن (مـەرج نییـە ئـەو دوو پارتە هەمووجار هەر هەمان پارت بن). لەتوركیا پارتی فـرە هـەن، بـەڵام لەهـەكاری تەنها دوو پارتی هەڵبژاردەی ئەو دوو یەكێتییە رەواجیان هەیە. بـەهۆی ئـەو هـەلو دەرفەتـە والاو بەرفراوانـەوە كـە كـاتی هەڵبـژاردن دەرەخـسێت، ئـەو قۆنـاغـە بـە گەرمەی ئەمبەرو ئەوبەرو ئەمسەرو ئەوسەری ژیـانی سیاسی نێوچـەكە دادەنرێـت. لـەناكاو شـایەنی سیاسـی تاكەتاكـەی سیاسـەتمەدارانی نێوچـەكە، هەڵبـەزو دابـەزو دالەنگانو هەلگڕانی زۆر بەخۆوە دەبینن. گەلەك كێـشەی كـزو خـامۆش، لـەپڕ كڵپـە دەسـەندنەوە. ئـەو سـەرەكخێڵە گـچكانەی كێـشەو گرفتیـان دەگـەڵ سـەرەكهۆزەكەی

خۆیـان، یـاخود دەگـەڵ یـەکێك لەسـەرەکخێڵەکانی هـۆزە یەککەوتووەکـەدا هەیـە. بەزۆری دەدەنەپاڵ پارتـە بەرامبەرەکـەی ئـەوهۆزەی سـەر بـە هـیچ یـەکێك لـەو دوو یەکێتییـە نـەبێتو لەنێوخۆشـدا تیراوێـی دوژمنایـەتی دوو کـوتی کردبێـت (کـە گەلەکجار روودەدات)، هەردوو کوتە دوژمنەکە چاوەڕواندەکەن، تـا لایـەکیان دەداتـە پاڵ پارتێك، دەمودەست لایەنەکەی دیش دەداتەپاڵ پارتەکەی دی. بەو پێیـە، گشت ئـەو کێشەو دژایـەتیو بەربەرەکانێیانـەی کـە لـەکاتی ئاسـاییدا چ پەیوەندییـەکیان دەگەڵ یەکدیدا نییەو جودا لەیەکدی هاتوونەکایەوە، لەسەروەختی هەڵبژاردنەکانـدا دەبنـە کێـشەیەکی دووپەلکەکـەری کۆمەڵایـەتیو چ لێکـچوونێکیان دەگـەڵ مـۆدێلی بەشبەشکردنە ئاساییەکەی کۆمەڵگەدا نامێنێت. شیرازەی ئەو دووپلکەییـە بـەردەوام لـەوەوە دەبریـسکێتەوە، کـە قـەت لـەدوو بـەرە زێـتر نییـە، هەردووبەرەکـەش لـەدوو یەکێتییـە خێڵەکییەکـە دەئـاڵێن. جگـە لـەوە ژمـارەی لایـەنگیرانو ئەنـدامانی هـیچ لایـەکیان هەمیـشەیی نـینو تاسـەر قـەوارەیان مـسۆگەرناکەن، چـونکە دانـەپاڵیان لەوابەستەییەوە نەکەوتۆتەوە. دەشێت رێبـەرێك بەچاوبڕینە دەسـتکەوتێك، یـاخود بـەهۆی کێـشەیەکی خێزانییـەوە، لەپڕێکـدا سـەنگەر بگوێزێتـەوەو بداتـە پـاڵ لایەنەکەی دی، دۆستو لایەنگرانی رەگەڵی دەکەون، هەنـدەك دوژمـنو گوردێریـشی بەرەی ئەوبەری بۆچۆڵدەکەنو دەدەنە پاڵ لایەنەکەی دی.

لەبۆنەیـەکی دیـدا Rondot (١٩٧٣، ل ٢٥ ـ ٢٦) بـە نموونەیـەك دووپەلکەییـەکی روونـترمـان پێـشاندەدات، کـە راسـتەو راسـت هۆزێـكو دەوربەرەکـەی کردۆتـە دووکوتـەوەو دوو تایەفـەی هـەمان هـۆزی بـەجۆرێك لەیەکـدی راستکردۆتەوە، کـە لەنێو هۆزە دوژمنەکانیشدا وێنەیان کەمە:

نموونەکە هەمیدسان هۆزی ئۆمەریانو بەشبوونە نـا ئاساییەکەیەتی بەسـەر دوو تایەفەی مەحمودکانو ئەتمانکاندا، کە لەمەڵبەندی هۆزەکەدا لەپاڵ یەکدیدا دەژیـن. چاوساغێك بۆ Rondot دەگێڕێتەوە، کە گوایە نەك تەنها ئۆمەریان، بەڵکە هەرچی هۆزی هاوسێش هەیـە، بەسـەر ئـەو دوو تایەفەیـەدا بەشبوون، هەتا گشت لەگشتی

هۆزە دوورەکانیش یا مەحمودکانین، یاخود ئەتمانکانی. بەو پێیە کابرای چاوساغ، کوتبوونی هۆزەکەیی بەسەر گشت کوردستاندا سووە.

زایەڵەی ئەو دووپەلکەییە، لەداستانێکی بەنێوبانگو بەرەواجدا دەبیستین، کە دەربارەی بنەچەی هۆزەکانی کوردە. گوایە سەرەتا تەنها دوو هۆزی زلانو ملان هەبوون، کە لەرووی کولتورییەوە لێك جوداوازبوون، ئیدی سەرپاکی هۆزەکان لەو جووتە کەوتوونەوە. هەتا ئێستاش گەلەك هۆز رەچەڵەکی خۆیان دەگێرنەوە سەر یەکێك لەو دوانەو هەر بەو پێیەش رەچەڵەکی هۆزە هاوسێکانیان دەستنیشانو رستدەکەن[٥١].

ئەو نموونانە ئەوە پێشاندەدەن کە هێمای دیاردەی خانە خانەکردنێکی دوولانەی کۆمەڵگە لەئارادایە، هەرچەندە تەواو روونو ئاشکرا نییەو لەچاوبەشبەشکردنەکانی دیکەدا پلەدوو دەنوێنێت. شایانی باسە هەمان چاوساغ بۆ Rondot ی گێرابووەوە، چۆن بافکێکی مەحمودکانیی گوندەکەی، خەریکبووە بداتە پاڵ ئەتمانکان، چونکە بافکە مەحمودکانییەکەی دیکەی هەمان گوند، هەوڵی پتەوکردنی جێپێی سەرکردەکەیانی نەداوە[٥٢]. کەواتە ئالێرەشدا لایەنگریی هیچ یەکێك لەو دوولایەنە، تاسەر نییە، ئا لەوەدا هە دوولایان چوونیەکن.

بەلام بۆچ ئاوها دوو ‌‌لکەن؟ بۆ سێپەلکە یا زێترنیین؟ ئەو جۆرە مۆدێلەی Barth (١٩٥٩) دەربارەی یەککەوتنی پاتانەکان پێشچاومانیدەخات، رەنگە بۆ روونکردنەوەی ئەو مەبەستە دەستگیرۆییەکمان بکاتو تێمانبگەیەنێت بۆ چ سەرەکخێڵە گچکەکانی هەکاری دووبەرەیان پێکهێنا. وەلێ رەنگە روونکردنەوەی لەو بابەتە بۆ ئۆمەریان نەشێت. پرسیارەکەی کردمان تەنها گریمانەیەکی پەتی نییە، بەبڕوای من هەر تێڕوانینی دوولانە، یەکێك لەو هۆکارانە بوو، کە ئەو بزووتنەوەی بارزانی رێبەریی دەکرد، بەو چارەنووسە گەیشت. هەرچی دەوروبەرە (هەر لەهۆزو پارتە سیاسییەکانو باڵەکانی نێوخودی بزووتنەوەکەوە، تا رژێمی عیراقو دەوڵەتانی هاوسێو زلهێزەکان)، گشت لەگشتیان لەکونجی خانەخانەکردنێکی دوولانەی سادەو ساکار دەخزێندران (دوژمنی دوژمنەکەم لایەنی کەم لەم دەمەدا ، باشترین دۆستمە).

ئیدی هەرگیزاو هەرگیز ستراتیژێکی پشتبەستوو بەتیۆرییە شۆڕشگێڕەکان، یاخود تیۆرە بزووتنەوە نیشتمانییە ئازادیخوازەکان، لەئارادا نەبوو، تەنها مل وە تاکتیکەوە دەنراو هەوڵدەدرا پشکەکانی ئەودەوروبەرە جێگۆڕکێ پێبکرێت و لەملاوە بۆ ئەولا رافرێندرێن.

## ٢ـ ٤ـ ٣ـ ململانێی سەرۆکهۆزەکان و دارمانی یەکێتی هۆز

لەتەك بۆچوونەکانی پێشووماندا، کە دەشێت یەکێتی و یەکرێزی هۆزێك، لەکاتێکی دیاریکراودا، بە هۆی ململانێ و شەڕەزرتانێی سەرکردەکانییەوەو خۆبەستنەوەیان بە هاوپەیمانانی دەرەوەی هۆزەوە، هەڵتەکێت، دەتوانین لەمەڕ سیاسەتی کورد، دوو بۆچوونی دیکەی بخەینە سەر:

A . ئا ئەو دیاردەیە رێی ئەوەی بۆ دەوڵەت خۆشکردووە، تارادەیەك بەئاسانی بتوانێت لەکوردستاندا کەسایەتی رووکەش قوتکاتەوە. سەرەکهۆزی گونجاو و لەبار دژی دوژمن و گوردێرە نەریتییەکانی دەنەدراوەو پشتگیری کراوە. لایەنگیریی و دڵسۆزیی و پێبەندیی بەنیشان و پلەوپایەو جلکی سەرومری و مووچەو بەرات و خەڵات و سوارەو ژەندرمەی بە یاسا داتاشراو کڕراوە، کە برێکجار بوونەتە سوپای تایبەتی سەرەکهۆز. لغاوکردن و ژێرکێفخستنی ئەو سەرۆکهۆزانە هێجگار ئەستەم بووە، چونکە هەریەکەیان کۆمەڵێك دوژمن و گوردێری خۆی هەبووەو گەلەکجار ناچاری راپەڕین و یاخیبوون کراون. بەتایبەت فەرمانڕەوایانی ئینگلیز لەعیراقدا، توانیویانە گەوجانە زۆر هۆز دژی یەکدی هانبدەن[٥٣]. چونکە هێجگار لەتواناو دەستەڵاتی خۆیان رازی و دڵنیابوون، بەپێبەندی و دانەپاڵی پراگماتیکانەی هەندەك سەرەکهۆز دەستخەڕۆ بوون و بەخۆشەویستی و دڵسۆزی بۆ ئینگلتەرەی تێگەیشتوون. تا هەلگەڕانەوەو یاخیبوونی ئەو سەرەکهۆزە بەنێو دڵسۆز و وابەستانە رایچەڵکاندوون و بەهۆشی هێناونەوە. دیارترین نموونە شێخ مەحمود بوو، شێخی تەنها تینووی دەستەڵات نا، بەڵکە سەرکردەیەکی لەدڵ و دەروون و باوەڕەوە

نیشتمانپەروەر، سەرکردەیەك كە ئینگلیز قەت نەیبەخشی، چونكە لەبریتی ئەوە ولاتەكەی تەسلیمی ئەوان بكاتو خۆشی خەریكی دەستكەوت چنینەوەبێت، هەولێدەدا ئەوان بۆ دامەزراندنی كوردستانێكی ئازاد هەلسووڕێنێت.

B ــ لەهەر جێیەك خانەوادە خانەدانو دەستەلاتدارەكان لەگەمەكەدا بەشداربووبن، لەپال كێشەو بەربەرەكانێی نێوخۆیاندا، بڕێك هۆكاری دیكەش سەرباربوون بۆ هەندەك لەئەندامانیان، تا بدەنەپال هێزی دەرەكی ئەوتۆ، كە وەكی دژو دوژمنی خانەوادەكە ناسراون. پەندە نێودارەكەی كە دەبێژێت: "گشت هێلكەكان لەسەبەتەیەك مەنێ"، لەو خۆرهەلاتە هێجگار بەبرەوە. رەنگە ئەوپەندە لەلایەن خانەوادە خانەدانەكانی ئێرانەوە، لەسەردەمی فرەپارتەییەكاندا، بە باشترین شێوە پەیرەوكرابێت. ئەو خانەوادانە زۆر بە پەرۆشی ئەوەوەبوون، لەهەر پارتێكدا، لایەنی كەم، بەیەكێك لەئەندامانی خێزانەكە بەشداریی بكەن. هەتا جارجارە لەرێكخراوە نهێنیەكانیشدا نوێنەریان هەبووە. بەوپێیە هیچ باكێكیان لەزریانو ئالوگۆڕنی سیاسی نەبووە، هەمیشە كەسێكیان لەپەنا دەستەلاتدارە سیاسیەكانی رۆژدا هەبووە. ئەم دیاردەیە لەكوردستانیشدا هەستپێدەكرێت، بەلام زێتر لەمەودای باژێڕەكاندا، نەك لەریزی خێلەكاندا. ئەوەبوو لەسەردەمی پاشایەتی عیراقدا زۆربەی خانەوادە خانەدانەكانی خوارووی كوردستان، نوێنەریان هەم لەریزی دەستەلاتدارانی دەولەتو هەم لەریزی هێزە بەرهەلستكارە نهێنییەكانیشدا هەبوو. كە رژێمی پاشایەتی رووخاو پارتی كۆمۆنیست ئاشكرا دەستی بەچالاكی كرد، دەركەوت هەندەك لەوخانەدانانە، نوێنەریان لەوێش هەبوو، كە دیارە خێری چاكی بۆدانەوە، تایبەت ئەودەمەی پارتەكە كەوت هێرشبردنە سەر دەرەبەگان، نوێنەرە دەستڕۆیشتووەكانیان، زۆر سەركەوتووانە خانەوادەكانی خۆیان لەو هێرشانە پاراستو وەریانچەرخاندەوەو گشت گۆتاوڕۆكەیان بۆ دەرەبەگە نەیارەكانیان نایەوە.

### ٢ـ ٥ـ سەرکردایەتی و کێشەو هەڵلا

سـەرکردایەتی و کێـشەو هـەڵلا، دوو تـوولّی تـێکلاو، دوو دیـاردەی ئاوێتـەو پێکەڵپێکی یەکدین. دەشێت کێشەو گرفتـەکان بـە تێکـەوتنی کەسایەتییەکی بـەوەج چارەسـەربکرێن، بەچارەسـەرکردنی هـەر کێـشەیەکی ئـاڵۆزیش شـکۆو سـەروەریی سـەرکردە، هـەراوترو سـەقامگیرترو پتـەوتردەبێت. لەسـەرێکی دییـەوە، کێـشە خێڵایەتییـە ماڵوێرانکـەرەکانیش، ئاکـامێکی ململانـێ‌و شەڕەدەسـتەڵاتی سـەرکردە دژیەکەکانن. یەکێك لەئەرکە سەرەکییەکانی سەرەکهۆز، رێبەریکردنی هۆزە لـەکاتی کێشەو شـەڕ دەگەڵ هـۆزو تایەفـەکانی دیـدا. لـەکاتی هێمنـی‌و ئاسایـشدا، سەرەکهۆز هیچ ئەرکێکی ئەوتۆی نییەو یەکرێزی هۆزیش تەنها بۆ نێوە. گەلەکجار سەرەکهۆزە چـەمووش‌و چاوچنۆکەکان خۆیـان کێـشە دەسازێنن، تـا لـەو رێگەیـەوە دەسـتەڵاتی خۆیـان‌و یـەکرێزی هـۆز بـسەپێنن‌و کەوشـەنی هـەردووکیان فـراوانتر بکـەن. چ زێـدەڕەوی نییـە گـەر بڵـێین، ئـەرکی پێویـست بـۆ سـەقامگیرکردن‌و پتـەوکردن‌و فراوانکردنی کەسایەتی خۆ، لەوەدا دەبینێت: یەکـەم ـ رێگەنـەدات کۆمـەکی دەرەکی بەکەس بگات، دووهـەم ـ دەسـتپێکەری شـەڕبێت، سێهەم ـ شـەڕ بـەکولکی ئـەوانی دیکەوە بکات[٥٤].

ئەو دەوڵەتانـەی لەبـەرایی ئـەم سـەدەیەوە، کوردسـتانیان بـە تـەواوی خـستە ژێـر رکێفی خۆیانەوە، مافی تەواوی زەبرو زۆرو سەرکوتکردن بەخۆ رەوادەبینن. کاتێـك دەسـتەڵاتیان تـەواو سـەپا، ئیـدی کاریـان بەخۆشـکردنی ئـاگری کێـشەو هـەڵلا نـەما. لەسەر ئاستی هۆزیش، سەرەکخێڵە چەتوونە چڵێسەکان، هەستیانکرد تەنها رێگە بـۆ دابینکردنی دەستەڵات، دلگڕاگرتنی فەرمانبەرانی دەوڵەتەو "سوود تەنها لەوەدایە". پێدەچـێت ئـەو سـەرەکخێڵانە، بەپێـچەوانەی جارانـەوە، بـۆ مـسۆگەرکردنی پلەوپایەیان، زێتر پشتیان بە کۆمەکی دەرەکی بەستبێت.

ئـەو غـەوارە دەسترۆیـشتووانەی سـوودو دەسـتکەوتێکیان لێهەڵـدەوەری، (وەکـی ئەفـسەرە سیاسـییە ئینگلیزەکـانی سـەردەمی ئینتیـداب‌و سـەروەختی لکانـدنی کوردستان بەعیراقەوە)، بـۆ راگرتنـی شایەنە سیاسییە نێوچەیی‌و مەڵبەندییـەکان،

تووشی ژمارەیەکی زۆر سەرەکهۆزی گەورەو گچکە هاتبوون، ئەوانیش ئەرکی هەرە لەپێشیان دنەدانیان بوو دژی نەیارەکانیان. گەلەکجار ئەو حاڵە بۆ کابرایەکی ساویلکەو سەرراستی بێگانە، زۆر لەوە ئاڵۆزترو ماکیافیلیانەتر بوو، کەپەیی پێبباتو سەریلێدەرکات[00].

ئامرازە نەریتییەکانی بردانی دەستکەوتو دەستەڵاتی سیاسی، خۆیان لەخۆیاندا تەمەن کورتیلەنو زوو دەشەمزن، بۆیە پشکی زۆری پاشەڕۆکەی ئەم بەندە، لەحاڵو باری بەسەرچوو و فەوتاو دەدوێتو زێتر پشت بەدەمەتەقێو سەرچاوەی نوسراو دەبەستێت. لەپشکی دووهەمیاندا، بەپشتیوانیی دوو نموونەی تێرو تەسەل، سیمای برێك گۆڕانکاریی لەئامرازو ئاکاری سەرکردایەتیدا پێشچاودەخەین.

### ٢ـ ٥ـ ١ـ کێ دەبێتە سەرۆك؟

چونکە یاسایەکی گشتی بۆ دەستنیشانکردنی سەرەك هۆز نییە، واباوە چەند کەسێك خۆ بۆ سەرۆکایەتی پاڵاوتە دەکەن. لەبەر ئەوەی لەنێو وەچەیەکی تایەفەدا، گشت تاکەکانی لەیەك ئاستدان، هاوتایی بەسەر شیرازەیدا زاڵە. با بڕوانینە خشتەی ژمارە(١)، گەر هەر سێگۆشەیەك گوزارە لەتاکە کەسێك بکات، ئەوا سەرلەبەری خشتەکە، تایەفەیەك پێکدەهێنێت. هیچ پێوەرێکی ئەوتۆیی لەبەردەستاندا نییە، تا لە (ریزی ژمارە V)دا. کە وەچەی ئێستاکەیە، کەسێکمان بۆ سەرۆکایەتی پاشە رۆژ بۆ دیاریبکات. وەك دەبینین، هەریەکە بۆی هەیە هەمان مافی هەبێت. گەر یاسایەکی دیکەی روونو ئاشکرا بۆ دەستنیشانکردنی سەرۆك لەئارادا نەبوو، ئەوا دەشێت کێبەرکێ لەسەر پلەی سەرۆکایەتی دەستپێبکاتو سەرکەوتن بۆ گونجاوترینیانە.

ئەمە گرفتی گشت کۆمەلگەیەکی خێڵەکییە. زۆربەیان پەنا بۆ چارەی Primogenityr (نۆبەرە یاخود پێشەنگ) دەبەن، بەو پێیە پلەو کایەی گشت ئەندامانی وەچەیەك دیاریدەکرێت. گریمان خشتەی ژمارە (١) لەچەپەوە بۆ راست، سەرەی لەدایکبوونی هەر وەچەیەکیان دیاریدەکات، یانی ریزی (V) کە وەچەی

ئێستایە، گەورەیی تەمەنیانو پلەو کایەیان لەچەپەوە بۆ راست دیاریکراوە (کە لە ١ەوە تا ١٦ یە). لەو کۆمەڵگانەدا کە پایەی کۆمەلایەتی لەسەر بنەمای بەتەمەنترین هەڵچووە، زێتر بەلای دەرپێتێکەلێدا دادەشکێنو درزی نێوان چینەکانی زەقدەچێتەوە. تایەفەی لەو بابەتە بە تاقمی قووچ konische Klan نێودەبرێن.

هەرچەندە قەت تاقمی قووچ لەکوردستاندا نەبووە، بەلام وەکی دی نۆبەردەو پێشەنگو بەتەمەنتر هەر باوبووەو سووکەدانێکی پێدانراوەو کەم تا کورتێك لەسەر ئاستی بنەماڵە، بەخەروارێك بیژۆکییەوە، پەیڕەوکراوە.

کە سەرگەورەی بنەماڵە دەمرێت، کوڕە گەورەی جێگەی دەگرێتەوە، مەگەر برایەکی یاخود رەبەنی هێشتا لەسەر ماڵ مابێت. لەو حاڵەتەشدا چاوەڕواندەکرێت کە مامە، پاش پێگەیشتنی برازاکەی، جێگەی بۆ چۆڵکاتو کەنارکەوێت.

لەتایەفەو تیرەدا، هەرچەندە یاسایەکی چەسپاوی بەرۆگریی نییە، بەلام جڵەوی سەرکردایەتی هەر لەدەستی هەمان خانەوادەدا دەمێنێتەوە. زۆرتیرە، کوڕە گەورە بە باشترین بەرۆگر دەزانن (ئەم یاسایەش لادانی زۆرە). لای هەندێك تیرەو تایەفەی دی، ردێنسپییەکانی، گونجاوترین بەرۆگر دەبێت "پیاو"ێکی نەستێلە بێت: خورت، جوامێر، دادوەر، دلاوا، ستراتیژزانێکی چاكو دادیارێکی کارامەبێت. بۆ ئەم سەردەمەش گرنگە بزانێت چۆن دەگەڵ فەرمانبەرانی دەوڵەتدا هەڵسوکەوت دەکات، (تا لەوەیشوومی باجی زۆر بەدووربنو بتوانێت کۆمەکیش بۆ دەستوپێوەندەکانی مسۆگەر بکاتو لەبەلای خزمەتی سەربازی قوتاریانکات).

لەڕاستیدا زۆرجار بۆ بردانی ئەو پایەیە، پەنا بۆ زەبرو زۆرو فرتو فێڵو تەڵەکە دەبرێت. ئەو خانەوادەیەی جڵەوی سەرکردایەتی لەدەستی خانەوادەیەکی دی بۆ خۆی هەڵدەپچڕووکێنێت، کە لەنێو هۆزە گەورەکاندا زۆرجار روودەدات، دیارە لەهێزدارییەوەیە. نموونەی لەو بابەتە هۆزی مەزنی هەڤێرکانە کە لەسەدەی رابوردوودا لەلایەن سێ گەورە ماڵی جوداوازەوە رێبەرییکراوە. (پاشان هەر لەم بەندەدا باسی کەسایەتی حاجۆی دواهەمین رێبەری دەکەین).

حاڵو بارەکە لای برێك هۆزی مەزنی دی وەکی هەرکیو جاف، جۆرێکی دیپە[٥٦].
لای ئەمان کەمو زۆر، سەرکردایەتییەکی سەقامگرتوو لەئارادایە. بەهۆی جوداوازیی ڕەچەڵەکییانەوە، هەر تایەفەیەكو مەزنی خۆی هەیە، وەلێ سەرکردەی هەمووان لەبنەماڵەیەکی پاشازادەیە، کە بە بەگزادە نێودەبرێت. بەگزادەکان دەستەڵاتی خۆیان بەجۆرە هۆردوویەکی جەنگاوەر ڕەونەق پێدەدەن، کە لە چیتەرین شەڕکەرانی هۆزو بێگانان پێکدێت. دەبێت سەرۆکی تیرە مەزنەکان گشتیان بەگزادە بن (کە تاقمێکی تایبەت پێکدەهێنن و نەژن لەڕەشەخڵکەکە دەخوازن و نە کچیشیان دەدەنێ). مەزنایەتی تانها لەنێو لقە جوداکانی هەمان بنەماڵەی بەگزادەدا دەستاو دەست دەکات[٥٧].

ئاڵۆزتر لەوە، سیستێمی سیاسی میرنشینەکان بووە، کە گەلەك خەسڵەتی دەوڵەتیان تێدابووە. ئەمانیش بەردەوام خەریکی شەڕەزرتانێی دەستەڵات بوون، وەلێ لەبەر ئەوەی کەم خانەوادەیان نێوو شۆرەتێکی پڕ ڕەونەقی ئەوتۆیان هەبووە، کە بەشی ئەوە بکات ببنە سەرگەورەی هەمووان، تێکبەربوونەکە زێتر لەنێو ریزی لقەکانی هەمان خانەوادەی فەرمانڕەوادا گیریخواردووە.

## ٢ـ ٦ـ سەرکردایەتی: ناودێری و ئەرك

وەك پێشتر ڕوونمانکردەوە، ئەستەمو دژوارە بتوانین بڕیاربدەین کامە دەستەبە هۆزو کامە بە هۆزی یەککەوتە (کۆنفوێدراسیۆن)و کامە بە تایەفەو تیرە نێوببەین. جگە لەوە، زاراوە کوردییەکانیش تەواو دەگەڵ مۆدێلی شێرازە داڕێژراوەکەی ئێمەدا ڕێك نایەنەوە.

هەر بەو پێیە زاراوە کوردییەکان جوداوازی لەنێوان سەرکردەی هۆزو تیرەو تایەفەدا ناکەنو گشتیان بە ئاغا نێودەبەن. دیارە کەمەك بێزۆیی لەو ڕووەوە هەیە، بۆ نموونە سەرگەورەی تایەفەیەك کە ڕەچەڵەکێکی هێند قووڵی نییە، وەکی باڤێکی نۆمەریان، ئاغای پێناگوترێت، بەڵکە بەمەزن یا ماقووڵ نێودەبرێت (کە لە مەعقوولی عارەبییەوە وەرگیراوە).

لای نۆمـەریان کوێخـای دێ، مـەزنی گـەورەترین باڤگـە. (گۆیانـەکان بـەو مەزنـە ئاغـاش دەڵێن). هـەر تایەفەیـەك چـەند ردێنـسپییەکی خـۆی هەیـە، کـە راوێـژکاری ئاغـانو لـەکاتی پێویستیـشدا بـەرۆگری هەڵدەبـژێرن، لـەوەبترازێت چ دەسـتەڵاتێکی دیکـەی راسـتەقینەیان نییـە. وادیـارە ئاغـا ئـەو سـەرکردەیەیە، کـە فـەرمانڕەوایی رەعییەتەکەی دەکات[58]، هەرچەنـدە خزمە نێزیکەکانیشی هەر بە ئاغا نێودەبرێن.

لەباشوورو خۆرهەڵاتی کوردستان سەرۆکی هۆزو تیرە رەئیسیان پێدەڵێن (کـە لـە عارەبییەوە وەرگیراوەو کۆکەی روئەسایە). خانو بەگ کە بـە سـەرەکهۆزە مەزنـەکان دەگـوترێن، لەبنەچـەدا نـاودێری فیۆدالانـەنو زێـتر وەپـاڵ نێـوی راسـتەقینەیان دەخرێت، بۆ نموونە عەلیخان، رەسووبەگ.

ئەورۆ ئـەو ناودێرانـەو ئـەرکی فیۆدالانـەیان لەگەرکەوتوون. بـۆ خـۆم نەمـدیتو نەمبیست هیچ سەرەکهۆزێك بە خان یاخود بە بـەگ نێوببرێـت، ئەگـەر شایانی ئـەو نـاودێرەش بووبێـت. زۆرجـار بـەو فەرمانبـەرە کـوردە شارییانە بـەگ گـوتراوە، کـە خاوەنمڵـك بـوون، بـەڵام دوور لـەملکی خۆیـان ژیـاون. یـەکێك لـە چاوسـاغە هەرەلەپێشەکانم جـوداوازی ئـەو ناودێرانـەی لەدیاربـەکری دەوروبـەری بیستەکاندا، ئاوها بۆ باسکردم:

"ئاغا سەرۆکی هۆزە، دەگەڵ هۆزەکەیدا لەکێوان دەژێت، بـەڵام بـەگ شارنـشینەو دەشـێت لەتۆرەمـەی سـەرەکهۆزێك کەوتبێتـەوە، هەرچـەندە مـەرجیش نییـە. بـەگ خوێنـدەوارە، ئاغـا بێـسەوادە. بـەگ ژیارییـەو خـەریکی سیاسـەتە، ئاغـا شـەڕکەرە. بەگەکان گەلـەکجار زەوییـەکی زۆریـان لەدەشتاییەکاندا هەیـە کـە لەلایـەن وەرزێـرە ناخێڵەکییەکانەوە رەعەمەل دەهێندرێن، ئاغـا لـەو کێوانـە خـاوەنی زەوی هۆزەکـەی نییە، بەڵکە هەرکەس خاوەنی کوتە زەویەکی خۆیەتی"[59].

لەکن هۆزە نیوەکۆچەرەکانو نیشتەنییەکان، کە بە بڕوای مـن ئـەم خەسڵەتانەیان زێـتر پێوەدیـارە، گونـد دیـارترینو زەقتریـن یەکـەی کۆمەڵایەتییـەو پێدەچـێت دەستەڵاتی کوێخا بەسەر ژیانی سیاسیو ئابووری خەڵکەکەیدا زاڵبێـت، (سـەرەکهۆزو گەورەی تایەفـەکانیش مـەزنی گونـدی خۆیـانن). Leach جـوداوازی لـەنێوان ئاغـای

گونـــدو ئاغـــای تایەفـــەو ئاغـــای عەشـــیرەتدا دەكـــاتو واپێدەچـــێت تـــەنها لەدەستنیشانكردنی ئەركو كایەی ئاغای گوندا مەبەستی پێكابێت. دەربارەی ئاغای گوندی باڵەك، دوو سەرنجی داوە:

A- گوندەكە ملكی ئەوە، (ئەمە مانای وایە كە):

ــ دەتوانێـت هەركەسـێكی دڵـی دەیخوازێـت، لەگونـدی بـەدەرنێت، (هەرچـەندە Leach گومان لەو مەسـەلەیە دەكات، چونكە ئاغـا دەگـەڵ زۆربـەی رەعییەتەكەیـدا خزمە).

ـ دەبێت لادێیەكان پشكێك لەداهاتو بەروبوومی خۆیانی پێبدەن.

B- بەرپرســیارە لــەراگرتنو هەڵــسوڕاندنی ئــەركی دیوەخــان. لەڕوانگــەی سەركردایەتی تەقلیدییەوە، لەگشتیان گرنگترە. دیوەخان تەنها نێوو نێوبـانگی ئاغـا پێشان نادات، بەڵكە پلەوپایەشی دەردەخات. بۆیە ناچارم بەر لەوەی بگەڕێمەوە سەر شیتەڵكارییەكانی Leach، شتێك دەربارەی ئەم بنكەیە بڵێم:

## ٢ـ ٧ـ مێوا نخانە ـ دیوان ـ دیوا نخانە

سەرنجێكی پێویـست: هەرچـەندە دیوەخـانو ژووری مێـوان هێـشتا هـەرماون، لـێ زۆربـەیان بـاقو بریقـی دێرینـەیان لەدەسـتداوەو لادێییـەكانیش وەكـی جـارانی بـەر لەدەپازدە ساڵێك، هێند بەتەنگ خزمەتییەوە نایەن.

(پشكی زۆری زانیارییەكانی ئەم بەشە، پشتی بە گفتوگۆ بەستووە).

هەر رێبوارێك رێـی بكەوێتـە هـەر گونـدێك، دەتوانێـت بـەكامی دڵ تـامی پەنـدی (مێواندۆسـتیی كـورد) بـچێژێت. زۆربــەی ئاغاكــان ژوورێــك یــاخود خانوویــەكی تایبەتییان هەیە، كە رێبواران تێیدا دەحەوێنەوەو دەمەتەقێی تێدا دەكەنو چایان بۆ دەمدەكرێتو خۆراكی چاكیان لەپێش دادەنرێتو شەویش پێخەفێكیان بۆ ئامادە دەكرێت. هەر رێبوارێكیش بخوازێت چەند رۆژێك بمێنێتەوە، كەس دەست ناهێنێتـە رێگەیو ئاغاش پێیدەڵێت: "ماڵ مـاڵی خۆتـەو هێنـدەی دڵت دەخوازێت، بمێنـەوە"،

هەرچەندە بواری زۆریش هەیە بۆ تێگەیاندنی میوانێك، كە زێدە لەپێویست ماوەتەوە. بەو پێیەی ئاغا نوێنەری رەعییەتەكەیەتی، پێشوازیكردنی لەبێگانان، رۆمەت پەیدا كردنە بۆ گوندەكەی، تایەفەكەی، یاخود هۆزەكەی. دەستودڵ والایی ئاغا، مەرجی یەكەمی دەستەڵات پەیدا كردنێتیو رژدیو چرووكی، شەرمەزارییەو بەدەگمەن دەستەڵات پەیدا دەكات (مەگەر لەرێگەی زەبرو زۆرەوە). ئەو تەخشوپەخشەی لەدیوەخاندا دەكرێت، دەبێتە مایەی شۆرەتو رووسوورییی[٦٠].

ئەم بازیی مێواندۆستیە چەندە دەخایەنێتو هەتاكەی بردەكات، مەسەلەیەكە پەیوەندی بە پلەو پایەی میوانەكەو خانە خوێكەوە هەیە. هەر ئاغای گوندێك خۆی لەئاغای تایەفەی خاوەنی گوندەكە، دڵاواتر دەردەخات، دەبێتە گوردێرێكی راستەقینەی ئاغای تایەفەو رەنگە نەك تەنها لەسەر ئاستی گوندەكەی خۆی، بەڵكە لەو مەودایەش بەرینتر پشتیوانی لێبكرێت.

مێوانراگرتن سوودی دیكەشی هەیە: رێبواران پەیامهێنەرو هەواڵدەری رووداوی نوێن، با ئامرازی هەواڵراگەیاندنی نوێی وەكی رادوێش لەئارادا بێت، هێشتا هەواڵهێنەرانی دەمی بەرەواجو بایەخدارن[٦١]. بە تایبەت ئاغاكان كەشەیدای كایەیەكی سیاسی گرنگن، پێویستیان بەو شێوازە هەواڵدارییەی رێبواران هەیە. برێكجار ئاغاكان خۆیان شۆفار بەرێدەخەن تا هەواڵی دیوەخانی ئاغایانی دیكەیان بۆ كۆوەكەن.

جگە لەوە مێوانخانە كە هەندەكجار بە مێڤانخانە، وەكی دی دیوان یاخود دیوانخانە، برەجارێكیش بەهۆدەیێ گوند نێودەبرێت، وەك نێوە كوردییەكەی دەیدركێنێت، چەردەیەك ئەركی دیكەی هەیە: لەگەرمەی شكۆفەی ئەم دەزگەیەدا، دەمەو ئێواران گشت پیاوانی ئاوایی لێكۆدەبوونەوەو باسی پێشهاتو بەسەرهاتی رۆژیان دەكرد. كێشەو گرفتو دەمەقاڵەی ئەو رۆژەیان بۆ ئاغا دەگێرایەوە، دەربارەی مەسەلە پێوەندیدارەكان بە گوندو (تایەفە یاخود هۆز)ەوە بریاریاندەدا، لاوان بە دابو نەریتو شێوازی هەڵسوكەوت ئاشنادەكران. هەر ئێرەش جێگەی جەژنو ئاهەنگگێران بوو[٦٢].

دەبێت ئەوەش بڵێین، کە ئاغا لەو ڕێگەیەوە جڵەوی ژیان کۆمەڵایەتی ئاوایی دەگرتەدەست. ڕەشەخەڵکەکە بۆیان نەبوو مێوان ڕاگرن، بەڵکە دەبایە لەدیوەخان دایانکردبان، تا ئاغا بتوانێت جەمسەری گشت پێشهاتەکان لەژێر ڕکێفی خۆیدا بهێڵێتەوە.

چۆنیەتی ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی دیوان بەپێی سەردەم و کاتەکەو لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی گۆڕاوە. دیوانی ڕەوەندەکان پشکێکی جوداکراوەی پڕ سەرین و دۆشەك و فەرشە لەدەواری ئاغا. زۆرجار دیوانی لەو بابەتە هێجگار ڕازاوەو ناوازەن، وەکی ئەو وێنەیەی Montagne ساڵی ١٩٢٢ گرتوویەو دیوانی مەزنی هۆزی میلان پێشاندەدات. لەباڵەکایەتی هاوینان نێزیکی ماڵە ئاغا، کەپرێك دروست دەکراو فەرش و دۆشەکی تێدا ڕادەخراو پشتیی و سەرینی لێدادەنرا، زستانانیش مێوان لەماڵە ئاغا دادەمەزرێندران[٦٢].

ساڵی ١٩٧٥، ئەو دەمەی من لەو نێوچەیە بووم، وەك هەر جێیەکی دی کوردستان، دیوانی زۆربەی گوندەکان ژوورێکی سەربەخۆ بوو لەماڵی ئاغا. خۆشترین و دلگیرترین دیوەخانی کوردم لەباکووری خۆرهەلاتی جزیرە دیت. ئەو کوردانەی سەرەتای ئەم سەدەیە لەوێ نیشتەجێبوون، نیوسەدەی تەواو بەوپەڕی تێر و تەسەلی ژیان. هەر لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا دەستدرایە کشتوکاڵ و وەرزێری، ئاغاکان بە پیت و پرفەرترین ئەو زەویانەیان بۆخۆیان بردا (کە پێشان لەوەرگەی پێکرایی هۆزبوون)، پەلپی بەشێکیشیان لەداهات و بەروبوومی جوتێران گرت. ئا لەو دەستکەوت و داهاتانە، چکێکی چاکی بۆ پێداویستییەکانی دیوەخان تەرخاندەکرا. یەکەمین خانووی ڤیتی ئەو گوندە تازە ئاوەدانکراوانە، ماڵە ئاغایان و دیوانخانەکانیان بوون، دەنا لادێییەکانی دی، نیوە شوانکارەو نیوە جوتێر، هێشتا لەدەواردا دەیانگوزەراند. برێك لەو دیوەخانانە خۆشترین ستران و باڵۆرەیان پێدا هەڵدراوەو لەدووریەکی زۆر دوورەوە ناسراون. ڕەنگە ئەو جۆرە دیوەخانانە وێنەیەکی گشتی نەبن، بەڵام بێگومان نموونەیەکن، بۆیە باسێکی دیوان وەك نموونەو شێوازێکی زاڵ دەکەم.

دیوان هەمیشە لاکێشەییەو لای سەروو لای خوارووی هەیە. دەرگەکەی دەکەوێتە داوێنی خوارووەوە. بە چواردەوریدا دۆشەك و پشتی بۆ دانیشتن ریزکراون. مێوانی شکۆمەند، یاخود پیری رێزلێگیراوی گوند، سەرین و پشتیی لەدەورکەڵەکە دەکرێت تا جوان شاندادات و چاك بحەوێتەوە، بەلام گەر ئەمە بۆ لاوێك بکرێت، دەبێتە تیزپێکردن. دیارە جێگەی ئاغا هەمیشە لای سەری سەرەوەیەو پیرانی خاوەنشکۆ و مێوانی رێزلێگیراو لەنێزیکی دادەنیشن. تا لادێییەکە، یا مێوانەکە گەنجتر بێت، یاخود پلەو پایەی کەمتر بێت، جێگەی بەرەو خوارتر دەبێت. ئەو پیاوانەی پلەوپایەیان هێجگار نزمترە، هەر دانانیشن، بەلکە لەنێزیکی دەرگەکەوە هەڵدەتر وشکێن. هەر کات کەسێك وەژوورکەوت، گشت ئەوانەی پلەوپایەیان لەئاستی ئەودایە، یاخود داکشاوترە، لەبەری هەڵدەستن و چاوەڕواندەکەن تا جێگەیەکی گونجاو دەدۆزێتەوەو رۆدەنیشێت. ئەوجا یەك لەدووی یەك سلاو و بەخێرهاتنی لێدەکەن، ئەویش وەرامی یەکەیەکەیان دەداتەوە. بڕێکجار ئاغاش لەبەر مێوانی تازەهاتوو راستدەبێتەوە، تا رێزو قەدری خۆیی پێشانبدات، با مێوانەکە پلەوپایەی نزمتریش بێت، لەو حاڵەتەدا گشت ئەوانی دیکەش راستدەبنەوە(٦٤). هەر بەو پێیە، لەکاتی رۆیشتنی کەسێکیشدا، بۆ دوعاخوازیی لەبەر هەڵدەستن.

لەداوێنی خوارووی دیوەخاندا وەجاخێکی پڕ جزۆی قاوەی قەبەی لەوەرشاو یا مس دروستکراو، یاخود سەماوەرێکی چای هەمیشە دەمکراوی لێیە، نوکەرێکی ئاغا بەو ئەرکە هەڵدەستێت، کە قاوەچی پێدەڵێن.

ئاغای مەزن و نێودار هەن، کە چەندین خولام رادەگرن و ئەوانیش تەنها خەریکی خزمەتی دیوەخانن: یەکێکیان تووتنچییەو تووتن بۆ پێچاندنەوەی سیغار دەگێڕێت، یەکێکی دیکەیان خۆراك بۆ مێوانان دادەنێت، چراو لۆکس پڕدەکاتەوەو پێیاندەکات، جێگە بۆ مێوانەکان رادەخات. بەلام زۆربەی کات قاوەچی بەتەنێ خۆی بەو هەموو ئەرکانە هەڵدەستێت.

دیوان بەو شێوازەی تا ئەم دواییانەش بەڕێوەدەچوو، چێترین ئامرازی ژێررکێفخستنی ژیانی کۆمەلایەتی بوو. دەبایە ئێواران گشت لادێیەکان روو

لەویکەن. ئەوەی رۆژێك نەهاتبا، لێیدەپرسرایەوە بۆ چ نەهاتووە. هەر کەس چەند رۆژێك ئامادە نەبایە، ئاغا یاخود ردێنسپی، سەرکۆنەی دەکرد: تۆ چۆن پیاوێکیت؟ چ بەتەنگ ئەوەوە نابێت لێرە باسو خواس چییە؟ دیارە زێتر دڵت بە هەڵومڕییە بێبایەخەکانی ژنەکەت دەکرێتەوە؟ ئەرێ تۆ ژنیت یاخود پیاویت؟

ئەگەر زۆربەی پیاوان گفتوگۆو دەمەتەقێی پیاوانیان لەگوتەی ژنان لا پەسەندترو پڕتامو چێژتر نەباو گەلەکجار لەدیوەخان مەسەلەی گرنگ باسنەکرابا، ئەستەم بوو زۆرلێکردنی لەو بابەتە سەریگرتبا.

دیارە هەرچی رەفتارو هەڵسوکەوتی بەگەن نەکراوی هەرزەکاران هەیە، لەگشت لاوە دەدرێتە بەر تانەو تەشەرو هەتا بواری دەمکردنەوە بەرگری لەخۆکردنیشیان نادرێت.

بۆ خۆم ماوەیەك لەماڵە ئاغایەك دەژیام، ئاغا بەردەوام سەرزەنشتی ئەوەی دەکردم، کە گوایە زۆرجار نوێژەکانم لەکاتی خۆیاندا ناکەم. بەڕادەیەك پێمدا هەڵدەکاڵا، کە خۆم هێجگار لاوازو بێدەستەڵات دەهاتە پێشچاو، هەر وەکی سەردەمی ساڵانی یەکەمی قوتابخانەی سەرەتاییم، ئەودەمەی یەکێك لەمامۆستاکانم بەردەوام لەپێشچاوی هاوەڵەکانم دەیشکاندمەوە. هەڵبەت ئاغا تەنها ئەو دەمانە سەرزەنشتی دەکردم، کە خەڵکێکی زۆری لێبا، دەنا کە هەر خۆمان دەماینەوەو بە کراوەیی دەگەڵ یەکدی دەدواین، باسی ئەو مەسەلانەی هەر نەدەکرد، دیاربوو نەیدەویست تەنگەتاومکات.

بەتەمەنەکانی دانیشتووی دیوەخان، هەمیشە سەرمەشق بوون بۆ رەفتاری پیاوانە. کە ئەوان دەدوان، دەبایە خۆرتەکان بێجووڵە دانیشنو گوێڕاهێڵبن، تەنها دەیانتوانی بە چییە لەگەڵ یەکدی بدوێن، قەت بۆیان نەبوو دەنگ هەڵبڕن. دەبایە بەچوارمەشقی قیت دانیشن. پاڵیان نەدەداوە، چونکە ئەوە نیشانەی لاوازیی بوو، هەستێکی ناقۆڵای لای ئامادەبووان دەڕسکاند. ئا بەو شێوازە گشت شەوێك دادەنیشتن، گوێیان رادەهێڵا چۆن گەورەکان باسی کێشەو تەنگوچەڵەمەکانی رۆژیان دەکرد، چۆن نەخشەیان بۆ کاروفەرمانی مەزراو مووچەو داهاتی کشتوکاڵیان

دادەرشت، باسی شەڕو هەرایان دەکرد، هەتا گەر پێویستبا، پلانی چەتەیی‌و جەردەیی‌و راووڕووتیشیان دادەنا. برێکجار پێشهاتێکی گرنگ دەسازا، ئاغا راوێژی بە پیرە خاوەن تەجرەبەکان دەکرد، پاشانیش بۆخۆی بە تەنها بڕیاری دەدا، پیرەکان بەسەرهاتی سەردەمی کۆنیان دەگێڕایەوە، زێتر باسی مێرخاسیی‌و جوامێری سەرەکهۆزێکی مەزنیان دەکرد.

زۆر لەئاغاکان گۆرانیبێژی تایبەتی خۆیان هەبوو، سەدان گۆرانی‌و چیرۆک‌و بەیت‌و بالۆرەیان دەزانی. بەدەم چریکەی گۆرانیی ئەڤینداری‌و سترانی جەنگەوە، تەمبوریان لێدەدا.

سالانە چەند جارێك دەروێشی گەڕۆك دەهاتن، چەند رۆژێك دەمانەوە، دەگەڵ خرمژنی دەفدا، سروودی ئاینی سۆفیانەو عیرفانیان دەچڕی، کە زۆربەیان پێداهەڵدانی یەکێك لەشێخە نێودارە خاوەن کەراماتەکان بوون. بەوە رێگەیان بۆ پەروەردەیەکی ئیماندارانە خۆشدەکرد، کە جۆرێکی دی‌و جودا لەوانە وشك‌و وەڕستکەرەکانی ئیمامی گوند بوو، (ئەگەر هەر هەبا). جار جار لێرەو لەوێش جڵەو بەردەدراو تەوقی کەشی داب‌و نەریت دادەماڵدراو دەکرایە گاڵتەو گەپ‌و شادی، گەورەو بچووك دەیانکردە گۆرەوی بازی.

هەڵبەت بۆ خۆم تاقە دیوانخانەیەکی لەو بابەتەم نەدیت، کە تائێستا پارێزگاریی ئەو داب‌و نەریتەی کردبێت. ئەوەبوو لەساڵەکانی شێستدا، لەمەڕ دارۆچکانێك روویدا، دەنا ئەودەم هێشتا لاوەکان دیوەخانی لەوبابەتەی باسمکرد، لەیادیان مابوو. لەکوتە جزیرەکەی سەر بە سوریادا، دەوڵەت گشت لەگشتی چایخانەکانی مۆرکرد، واپێدەچوو ئەو چایخانانەی بە کوانووی بوژاندنەوەی هەستی نەتەوایەتی کورد زانیبێت. لێ ئاغاکان هەر لەماڵی خۆیان مێوانداریبیان لەخەڵکی دەکرد، هەرچەندە شێوازەکە تەواو جوداوازبوو لەجاران. دەتوانرێت لەمەڕ کوتە جزیرەکەی تورکیاش، هەمان شت بگوترێت. لێرە چایخانە زۆربوون، بەڵام زۆرترین کات چۆڵ‌و هۆڵ بوون. (دیارە مەبەستم ئەو هاوینەیە، کە خۆمی لێبووم. دەنا بۆیان گێڕامەوە زستانان

جمەیان دێت. گەر لادێییەکان سەرگەرمی کارو فەرمانێك نەبن، زۆربەی ئێواران لەوێ بەسەردەبەن).

هۆکاری هەرە بەتینی لەنێوچوونی ئەو دیوەخانانە، گۆڕانە لەناکاوەکەی پەیوەندییە ئابوورییەکەی نێوان ئاغاو رەعیەتەکەی بوو. بەگەڕخستنی مەکینە لەبواری کشتوکاڵدا، (کە لەپەنجاکانەوە دەستپێکردو لەشێستەکاندا تەواو تەنییەوە)، ئاغای لەتواناو هێزی بازووی لادێییەکان بێ منەت کرد. پەیوەندییەکی ئابووری نوێ سازا. زۆربەی وردە کرێگرتەکان زەوییەکانیان لێسەندرایەوەو خۆشیان بەدەرنران، وردە مالیکەکان، وەکی زۆربەی ئاغاکان، مەسرەفی زەوییەکانی خۆیان پێهەڵنەدەسووڕا، بوونە وابەستەی ئەو پووڵدارانەی مەکینەی نوێیان دەکڕی. زۆرجار خاوەنملکەکان دەیاندیت چۆن ئەو پووڵدارانە، بەروبوومی ملەکەکانیان بە زەبری پووڵو رێبازی سەرمایەدارانە بۆ خۆیان دادەڕووتاندو چکێکی کەمیان بەوان دەدا. زۆر لادێیی چەند رۆژێکی ساڵی لێدەرچێت، ئیدی بەردەوام بێکاربوون. ناچار تەواوی هاوینەکە وەك کرێکاری وەرزی، لەملاو لەولا مشووری کاریان دەخوارد.

بەو شێوەیە لەپڕێکدا شیرازە کۆمەڵایەتییەکەی لادێ شێواو داتەپا، دیوەخانیش لەگەڵیدا لەنێوچوو[٦٥].

ساڵی ١٩٥٠، دیاردەی دیوەخانێکی دی لەخوارووی کوردستاندا سەرنجی Barth ی راکێشابوو. دەبینێت نێودارترین ئاغاکان بۆ بازێڕەکان رەویانکردووە. لەوێش دەرگای دیوەخانیان هەر ئاواڵەبوو، بەلام دیوەخانی گوندەکان تێداچوون. لەگوندی خێڵەکییەکاندا برێك دیوەخانی گچکە مابوون، تەنها تاقمێکی کەم رووبانتێدەکرد. لەگوندی ناخێڵەکییەکانیشدا هەندەك پیاوی بەهەڵپەو هەڵمەت، لەماڵی خۆیاندا دیوەخانێکی گچکەڵەیان قوتکردبووەوە[٦٦].

ئەمە لەزۆر جێگەی کوردستانی تورکیاش تا سەرەتای ئەم سەدەیە هەر ئاوها بوو. هەرچەندە دیوەخانەکان زۆر ئاوەدان نەبوونو تەنها ژمارەیەکی کەم لەپیاوان روویان تێدەکرد. خاوەن دیوەخان، خانەدانی پێدەگوترا. مەرج نەبوو خانەدان

ئاغایەك بێت، بەڵام هەر خانەدانێك بیخواستبا، دەیتوانی تاقمێك خڕەوەكات. تاقمێكی هەمەچیزە لەدەستوپێوەند.

هەتا ئێستاش لەنێوەندی كوردستاندا، ئوتێلو مێوانخانەی راستەقینە كەمن. میوان لەماڵی ئاغا دادەبەزنو زۆربەی لادێییەكانو نێزدیكانی ئاغاش بەردەوام هەر روو لەوێ دەكەن.

## ٢- ٨- دیاردەیەكی ئابووری

### خاوەی ئاغا

بۆ مزەختی دیوەخان، ئاغا خاوە لەگشت لادێیەكان دەستێنێت. زۆربەی كات ئاغا لەداهاتی دانەوێڵە ١٠٪ باج وەردەگرێت، لەخاوەن مێگەلی گەورەش، چل یەكی (مەڕ یاخود بزن) دەستێنێت.

خاوە ئەوە ناگەیەنێت كە ئاغا خاوەن ملكەو لادێییەكانیش وەرزێری كرێگرتەی[*] وەك ئەم پێشهاتەی خوارەوە دەریدەخات. ملكانەو خاوەی دیوەخانی ئاغا، دوو شتی جیاوازن: لەگوندی سارێی سەر بە كوتە جزیرەكەی توركیا، ئاغای گوند خاوەنی ملكەكانی گوندیش بوو. لەسەروەختی بەگەڕخستنی یاسای چارەسەركردنی كشتوكاڵی ساڵانی پەنجاكاندا، چەند پارچەیەكی زەوییەكانی بەسەر وەرزێرەكاندا دابەشكران، بەجۆرێكی ئاوها كە زەوی ئاغاو وەرزێرەكان لێك هەڵدەبوێردران. كە پیرە ئاغا مرد، كوڕەكانی زەوییەكانیان لەنێوخۆدا بەش كرد. یەكێكیان بووە جێنشینی ئاغاو ئەوی دیكەشیان بووە دەرەبەگو پشكی زۆری زەوییەكانی پێبرا. وەرزێرە كرێگرتە گچكەكان دەبایە لەسێ بەش دووبەشی داهاتیان بە خاوەنملك

---

[*] وشەی كرێگرتەم پڕاو پڕ بەرامبەر وشەی ئیجاری موڵكی لەكوردیدا باو، بەكارهێناوە، هەرچەندە لام روونە كە كرێگرتە زێتر بۆ (كرێچی خانوو) بەكاردێت. لەزۆر شوێن كە زەوی بەملكانە دەدرێت، خانوویەكیشی لەگەڵە، كە زەوییەكە لەوەرزێرەكە سەندرایەوە، خانووەكەشی لێدەستێندرێتەوە، یانی وەرزێرەكە كرێگرتەی زەویو خانووە.

دابا. بەڵام گشت لەگشتیان، چ کرێگرتە گچکەکان و چ خاوەنملکە گچکەکان، دەبایە ١٠٪ پوختەی داهاتی شیناوەردیان، بۆ مزەختی دیوەخان، بە ئاغا دابا.

جوداوازی ئەو دوو جۆرە باجە هەمیشە ئاوها روون نییە. زۆربەی کات خاوەنملکەکان ١٠٪ داهات لەبریتی ملکانە لەوەرزێرەکان دەستێنن. ئەو دەرەبەگانەی دوور لەگوندەکانیان دەژین و لەگوند هیچ دیوەخانێکیان نییە، ئەو باجە بە مولکانە نێودەبەن. هەندەك دەرەبەگی دیکەش، (بۆ نموونە لەکوتە جزیرەکەی سەر بە سوریادا)، هەمان ئەندازە باج دەستێنن و ئەوانیش هەر ملکانەی نێودەنێن، (بەڵام مافی ئەوەش بەخۆدەدەن، جوتێر لەملکی بەکرێگیراویان بەدەرنێن)، لێ بۆ دیوەخان هیچ خاوەیەك ناستێنن.

هەڵبەتە گەلەکجارو لەزۆر جێ، پشکی ئاغا بری زەکاتی ئیسلام دەخرێت. لەسەرتاسەری کوردستانی عیراقدا، خاوەی ئاغا ئەو نێوەی لێدەنرێت[١٧]، هەرچەندە ئاغا چکێکی بە هەژاران و نەدارانێك نادات، کە شایانی راستەقینەی ئەو زەکاتەن. ئەمە دەریدەخات کە ئاغاکان یاخود بە نارەوا باجی ئیسلامیان بۆ خۆ بردووە، یاخود خواستوویانە لەرێگەی زاراوەیەکی ئیسلامەوە، دەمامکێکی ئاینی بە بەر ئەو باجە نارەوایەدا بکەن. هێندەی من پێبزانم، لای ئەو هۆزانەی خاوەی ئاغا زەکاتی نێولێدەنرێت، چیدی هیچ زەکات و سەرفترەیەك بە مەلای گوند نادەن، وەکی لەشوێنەکانی دیکەی کوردستاندا باوە.

برێك لەچاوساغەکانم بۆیانگێرامەوە کە گوایە ئاغاکان دەستیان بەسەر زەکاتی ئیسلامدا گرتووەو بۆ خۆیانی زەوتدەکەن. لەشیرناخ بیستم ئاغاکان بە چ زەبرو زۆرو درندایەتییەك پشکی خۆیان دادەقەپێنن و داواکارییان چەندە زۆرە: "هەتا "١٠٪ بەروبووی پیازیش دادەپاچن" و "زەکات و سەرفترەی مەلاش لرف لێدەدەن".

گەرەکمە ئەم مەسەلەیە بە نموونەیەکی لای هۆزی باڵەك روونکەمەوە: وەك Leach دەڵێت، هەڵسوورێنەرو راپەرێنەری دیوەخان، دەستەڵاتی سەپاوی ئاغایە. لەگێرانەوەکانییەوە ئەوە دەدرەوشێتەوە، کە ئەودەم لەباڵەکایەتی خاوەنملکی گچکە نەبوون، بەڵکە وەرزێرەکان وەك وردەکرێگرتە زەوییەکانی ئاغایان رەنێوهێناوە.

ئەگەر ئەمە راست بێت[٦٨]، ئەوا پێشهاتێکی ئاسایی نەبووەو مانای وایە بوونی خاوەنملکی گچکە لای هۆزە کێونشینەکان، دیاردەیەکی سەراپایی نییە. تەنها دەتوانرێت برێك لەوانەی سەر بە هۆز نیین، یاخود هەندەك دەستەو تاقمی نا کورد بە وورده کرێگرتە نێوبەرێن، کە تێکڕا خزاونەتە ژێر باڵی تایەفەی هۆزێکەوە، (باشتر بڵێین، خزاونەتە ژێر دەستەڵاتو چەپۆکی ئاغاوە). Leach هەقێتی گومان لەدیاردەیەکی دیکەی خاوەندارێتی ئاغا بکات، ئەویش مافی بەدەرنانی وەرزێرانە، کە بەڕاستی ئەستەمو سەختە، چونکە زۆربەی هەرە زۆری لادێییەکان، خزمو کەسی خۆیین[٦٩].

ئاغای گوند ملکەچو گوێڕایەڵی ئاغای تیرەیەو ئاغای تیرەش هەمان جۆرە بەرامبەر ئاغای هۆز. Leach دەگێڕێتەوە کە گوایە هەرسێکیان بانگاشەی خاوەندارێتی راستەقینەی گوندیان کردووە.

هەرچەندە بەپێی یاسای عێراق، بەشێکی چاکی زەوی ئەو نێوچەیە هێشتا هەر ملکی دەوڵەت بووەو هۆزەکان تەنها مافی رەنێوهێنانیان هەبووە. ئەو دەمە چاوەڕوانی تاپۆکردنیان دەکراو[٧٠]، Leach پێیوابوو کە ئاغای تیرەکان لەهەمووان لەپێشترن، هەرچەندە تەنها ئاغای گوند، مافی دەیەك سەندنی هەیە.

باو وابوو ئاغای تیرە بۆ ئەرکو فەرمانەکانی، دیاری شیاوی پێدەدرا، ئەرکی سەرەکیی ئەوەبوو "کە ببێتە دادوەری برێك وردە دوژمنایەتیو لەکاتی پێکداهەڵقژانو شەڕو هەرای گوندە هاوسێکاندا لەسەر مافی لەوەڕگەو نۆرە ئاوو ئەو کێشانە، رێکیانخاتەوە". دیارە هەردوکلا شەڕکەرەکەش خەڵاتیان دەکرد[٧١].

هەڵبەت هەر لەسەروەختی Leach خۆشیدا ئەو ئەرکو فەرمانانەی ئاغا باوی نەمابوو، نەوڕۆکەش لەبەشی هەرە زۆری کوردستاندا وادەی بەسەرچووە. بەڵام وەك رستکردنێکی ئەرکو فەرمانی دێرینەی ئاغا، نرخو بایەخی خۆی هەیە.

ئەرکو فەرمانی ئاغای هۆز کەمتر روونە. هەرچەندە هەمانکات ئاغای تیرەو گوندیشە، بەڵام کایەی قەت ئەو بایەخەی نەبووە، مەگەر کاتی جەنگی لێدەرچێت، کە بێ ئەمسەرو ئەوسەر دەبووە سەرکردەی تەواوی جەنگاوەرانیو بەو پێیەش

دەســتکەوتو ســوودی دەچــنییەوە[٢٧]. دەنــا لــەکاتی هێــوریو ئاشــتیدا، خــەڵاتو دیارییەکی ئەوتۆی لەئەندامە دوورەدەستەکانی هۆزەکەیەوە پێنەدەگەیشت.

پێدەچـێت لای زۆربـەی هۆزەکـان، ئـەو خـەڵاتو دیاریيانـە لـەوە رەنگ داکوتـاوو ئاساییتر بووبن، کە Leach بتوانێت پەییان پێببات.

گـشت سـاڵێك بەبۆنـەی هـەردوو جێژنەکـەی موسـڵمانانەوە (رەمـەزانو قوربـان)، ئاغاو ردێنـسپێکانی هـەر گونـدێك، بـە دەسـتو دیارییـەوە دەچوونە دیـداری ئاغـای هۆز. Hay دەگێرێتەوە کە ساڵانە لەهەر مێگەلێکی گەورە، سەرێك مەڕ سەندراوەو کراونەتـە بەشـێك لـەو دیارييانـە[٧٣]. هەنـدەك هـۆز تـا ئێـستاش پارێزگـاری ئـەو نەریتەیان کردووە، هەرچەندە زۆربەی دیارییەکان کەم نرختربوونو ئـەو بەهایـەی جارانیان نەماوە، زێتر بوونەتە کەلو پەلی قاچاخی وەکی شەکرو چا.

دامەزراندنو جێگیرکردنـی دەزگـەکانی دەوڵـەت لەنێوچـەی باڵـەك دا، بـووە هـۆی کۆبوونەوەی هێزو دەستەڵاتێکی فرەی ئابووریو سیاسی لەدەسـتی سـەرەکهۆزدا، (کـە گوێڕایـەڵترین پیـاوی ئینگلیزبـوو لەسەرتاسـەری نێوچـەکەدا). مووچـەیەکی بـۆ بڕرایەوەو دەوڵەت بووە پاڵپشتی بۆ سەقامگیرکردنی پلەو پایەو کەسایەتی. هەر ئەو سەردەمە بەسەرچوو، ئیدی دەستەڵاتی ئاغاش بەخێرایی شەمزا. ئاغا بۆخۆی ساڵی ١٩٧٥ نـەمابوو، کوڕەکـەی کـە بـەرۆگری بـوو، چ بڕشـێکی نـەبوو. چاوساغەکانم کـە لـەتیرەی سـەکر Sekir بـوون، دەیـانگوت لەمێـژە چـیدی ئاغایـەك لەهۆزەکـەدا هەڵنەکەوتووە.

Leach زۆر بـەجوانی شـێرازەی سیاسـی هـۆزی باڵـەکمان بـۆ دەستنیـشان دەکـات، تێکڕا لەسێ توێژدا کۆیاندەکاتەوە:

A ـ ئاغـای گونـد، دەسـتەڵاتی تـەنها لەکەوشـەنی مەڵبەندەکەیـدا بڕەدەکـاتو لـەو ئاستەدا شـەڕو هـەراو کێـشەکان چـارە دەکـات. زەوییـەکان بەدەمیـەك، یـاخود بـەکرێ دەداتە وەرزێرەکان "کە خزمی خۆیین".

B ـ ئاغای تیرە، لەشەڕو هەڵلاو کێشمە کێـشی نێـوان گونـدەکانـدا دەبێتـە دادوەرو بەو پێیە خەڵات دەکرێت.

C . ئاغـای هـۆز، لەسـەر ئاسـتی دەرەوە نوێنـەری هۆزەکەیـەتی، لـێ لـەژیانی ڕۆژانەی هۆزەکەیدا ئەرك‌و کایەیەکی ئەوتۆی نییە.

دوو سەرنجی دیکەی Leach خۆی، ئەم ڕستکردنە ساکارەی کەمێك شلۆێ دەکەن‌و برێك ئاکاری هێزو وزەی سەرکردایەتی دەشێوێنن:

١. ئاغایەکی هەمان تیرەی ئاغای هۆز خۆی (کە لێرەدا بەئاغای تیرە نێودەبرێت) دان بـە سـەرکردایەتی ئاغـای هـۆزدا نانێـت، هەرچـەندە ئاغـای هـۆز ئـەو بـە "وابەسـتە"ی خـۆی نێودەبـات، (بڕوانـە Leach، ١٩٤٠، ل ١٧). ئـەو ئاغایـە وا رادەگەیەنێت کە گوایە ئەو بەخۆی، نەك ئاغای هۆز، لەیەکەم جەنگی جیهانیدا سەرکردایەتی هۆزەکەی کردووەو بەری بە ئۆردووی هێرشهێنەری ڕووس گرتووە (هەمان سەرچاوە، ل ١٨). گشت کەس ئەم ئاغایەی لەسەرگەورەکەی بە جوامێرتر دەزانـی (هـەمان سەرچـاوە، ل ٢٨). هەرچـەندە ئـەم ئاغایـە لەگـچکەلەترین گونـدی نێوچەکەدا دەژیـا (گونـدێکی دووتاقـەماڵە)، لـێ نێـو و نێوبـانگێکی میواندۆسـتیی هێجگار درەوشاوەی هەبوو. کەواتە گەورەترین گوردێری ئاغای هۆز، ئاغای تیرەیەکی دیکـە نـەبوو، بەڵکـە ئاغـای هـەژارترین گونـد بـوو. بەوپێیـەی گـەر هـەر لەسـەر خانەخانـەکردنی شـیرازە کۆمەڵایەتییـەکانی (گونـدو تـیرەو هـۆز) سـووربین‌و بـەو پێوەرە سـەرکردایەتی بەشبەش بکـەین، ئـەوا سـووك‌و ئاسـان دیـاردە ڕاستەقینەکان تێکوپێك دەدەین.

٢ـ برێـك لـەئاغای گونـدەکانی باڵەکایـەتی، لەگونـدێك زێتریـان هەیـە. خۆیـان لەگونـدێك دەژیـن‌و کاربەدەسـتێك، یـاخود دەمڕاسـتێکیان لەسـەر گوندەکـەی دی داناوە، کە کوێخا یاخود سەرکاری پێدەگوترێت‌و کارەکانیان بۆ ڕادەپەڕێنێت.

## ٢ـ ٩ـ حاڵ‌و باری سەرکردایەتی چەند هۆزێکی جوداواز

پێکهاتی شیرازەی کۆمەڵایەتی هۆزی باڵەك لە زۆربەی هۆزەکـانی دی سـادەترە، بـا بـەو ڕوونـی‌و ڕێکوڕەوانییـەش نـەبێت، کـە Leach گەرەکییـە پێشـچاویخات. لـەم بەشەدا باسی چەند هۆزێکی دی دەکەین، کە شیرازەی کۆمەڵایەتییان ئاڵۆزترە.

## ٢ـ ٩ـ ١ـ مەنگوڕەکان

مەنگوڕ هۆزێکی نیوەکۆچەرە، زستانان لەگوندەکانی داوێنی چیاکانی ژووروی قەڵادزێدا دەیگوزەرێنن. لەنێوان گوندەکانی مەنگوڕاندا، بەتایبەت لەتەختانییەکاندا، گوندی دی هەن، کە خەڵکەکەی وەرزێرنو سەر بە هیچ هۆزێك نیین، بەڵام رەعییەتی مەنگوڕانن. گوندی مەنگوڕان ئاغایان نییە. بەڵام هەر تیرەیەك ئاغای خۆی هەیە، ئەوانیش ملکەچو گوێڕایەڵی فەرمانی ئاغای هۆزن. ئاغای هۆز دەستەیەك چەکداری گوێ لەمستی راگرتووەو دەستەڵاتێکی زۆری داونەتێو ئەوانیش خەریکی کۆکردنەوەی ملکانەو دادۆشینی لادێییەکانن. ئاغا لەهەر گوندێك کوێخایەك یاخود دەمڕاستێکی داناوەو کردوونییە بەرپرسیاری کۆکردنەوەی زەکاتو باجەکانی دی. پیاوەکانی ئاغا، کۆمەڵێك جەلۆی چەتوونی سەرچڵی تۆڕینو هەریەکە لەکونجێکەوە هاتوون. هەمیشە لەدەوروبەری ئاغانو هێند گوێڕایەڵین، کە ئامادەن بەفەرمانی ئەو، برای خۆشیان بکوژن. هەر گوندێك لەکۆکردنەوەی زەکاتدا پرکێشی سەرپێچی کردبا، پیاوەکانی ئاغا باشترین ئامرازی سەرنەوەرکردن بوون. جگە لەوە، ئاغا هەر لەو رێگەیەوە برێك دابی فیۆدالانەی دیکەی وەکی بێگاریی دەسەپاند: کە چ ئەندامانی هۆزەکەو چ ئەو رەعییەتانەی ئەندامی هۆزەکە نەبوون، دەبایە ساڵانە چەندین رۆژ لەزەویو ملکی پانو بەرینی ئاغادا بەخۆڕایی کاربکەن، گەنم دروێنە بکەن، گیاو شینایی بۆ ئالفی زستانە بدوورنەوەو بیگوێزنەوە، یاخود سواخکاریو قوڕەکاری بکەن. بێگار وەکی سەرشۆڕترین کار تێیدەڕواندرا، لایەنی کەم بە تێڕوانینی ئەوڕۆکە. لەساڵەکانی پەنجاوە کە راپەڕینو جموجۆڵی دژە دەرەبەگایەتی دەستیپێکرد، خەڵکەکە بەرپەڕی تواناوە هەوڵیاندەدا خۆ لەئەرکی گرانی ئاغا بدزنەوە، بەڵام پیاوە دەسندەخۆرەکانی ئاغا زوو زوو شاڵاویان دەبردو هێندەی پێویستبا، رەشو رووتیان بۆ بێگار راپێچدەکرد.

دەستەڵاتی ئاغا لەگشت کونجێکی مەڵبەندەکەی وەك یەك بڕی نەدەکرد، هەندەك لەئاغای تیرەکان، دەستەڵاتێکی سیاسیو ئابووری چاکیان بۆخۆیان بڕدابوو. ئاغای

چـنارەیی (ئــەو تیرەیــەی مــن ماوەیــەکی کــورت لەنێویانــدا بــووم) گوندێکیــشی لەتەختانییەکانــدا هــەبوو. ئــەو وەرزێرانــەی ســەر بــە هۆزەکــە نــەبوون، وردە کرێگرتەبوونو دەبایە نیوەی داهاتیان بە ئاغا دابا. گونـدەکانی دەوروبـەر، ئەوانـەی برێك لەدانیشتووانی ئەندامی هۆزەکەبوونو هەندێکیشیان بێگانـە، تـەنها زەکاتیـان دەدا. ئـەو دەیەکـە، جارێـك ئاغـای تـیرە دەیـسەندو جارێـك ئاغـای هـۆز، مەسـەلەکە پەیوەندی بە هاوکێشیی دەستەڵاتی هەردووکلایانەوە هەبوو.

وردە شەڕو ورەووری نێوگوندێك، ردێنسپییانی چارەیان دەکرد. پێشهاتی گـرنگتر دەچووە بەردەم عەلی ئاغای سەرەکهۆز. ئەویش داوای قەرەبووی لێدەکردنو چکێك پوولی لەهەردوکلا شەڕکەرەکە دەسەندو پاشانیش سزای تاوانکارەکەی دەداو شـتێکی جەریمـەدەکرد، هەڵبـەت بۆخـۆی نـەك بـۆ تاوانلێکراوەکـە[٧٤]. خـەڵکی بەدەگمـەن روویان دەکردە دادگای ئاسایی، لەو نێوەش شێخێکی بەوەجی لێنەبوو. بەو پێیـە عـەلی ئاغـا مـەزنترین دادیـاری قسەڕۆیـشتووی ئـەو مەڵبەنـدەبوو. هـۆزە گـچکەکەی مامەشـی هاوسێـشی، کـە لـەدێرەوە پەیوەسـتی مـەنگوڕە، کێـشەی گرنگـی خۆیـان دەهێنایە کن عەلی ئاغا، بەوە دانیان بەشکۆو سەروەرییدا دەهێنا.

دوو رووداوی گرنگــی ئــەو دەیــان ســاڵی رابــووردوو، بوونــە هــۆی شــێوانو گۆڕڕانکارییـەکی بنجـی لەهـەناوی چـەقی دەسـتەڵاتی مەنگوڕانـدا: پـاش کودەتاکـەی ساڵی ١٩٥٨ی قاسم، بزووتنەوەو راپەڕینێکی بـەرفراوان، بەدنـەدانو پـشتگیری لایەنـە رەسمییـەکان، دژی دەرەبەگـەکان دەسـتپێکرد، جوتێرەکـان یـاخیبوونو لەسـەرانەو کەرانـەی دەیـەكو ملکانـەو بێگـاری سەرپێـچییان کـرد. دەسـتەو تـاقمی گـچکەی چەکداری قوتابیـانو فەرمانبـەرە گـچکەکانو جـوتێرە چالاکەکان، بـە گوندەکانـدا دەسـووڕانەوەو هەڕەشـەیان لەدەرەبـەگان دەکـرد. زۆر لەشـێخە دەوڵەمەنـدەکانو ئاغاکـان بـۆ ئێـران هـەڵهاتن، عـەلی ئاغـاش یـەکێك بـوو لەوانـە. کـە زریانەکـە هێـور بووەوە، گەڕایەوەو هەوڵیدا سەرلەنوێ بێگاریی داسەپێنێت. ئەوەی بـۆ نەچووەسـەر، بـەڵام رەعییەتەکـەی هـەروەکی جـاران زەکاتیـان دەدایـە. پـاش هەڵایـسانی کڵپـەی شۆڕشـی کـورد لەسـێپتەمبەری ١٩٦١دا، وەکـی زۆر ئاغـای دیکـەی نێوچـەکە، تێکـەڵی

شەپۆلی نەتەوەپەروەرانی کوردبوو، لەو ڕێگەیەوە توانی دەستەڵاتو پلەو پایەی خۆی بنجبەستکاتەوە.

ئەوجا لە ١٩٦٦دا نەتڵو بەڵایەکی شەیدای دەستەڵاتی لێقوتبووەوە، حەسۆ میرخان کە یەکێك بوو لەپیاوە باوەڕپێکراوەکانی بارزانی، بووە فەرماندەی هێزی ئەو نێوچەیە. حەسۆ کوڕە جوتێرێکی بادینانی بوو، چاوی بەهیچ کەسایەتییەکی نێوداری دەوروبەریدا هەڵنەدەهات، ئیدی ئاغا با یا ئەندامی پارت. فەرمانیدا چیدی کەس زەکات بە عەلی ئاغا نەداتو زەکاتی گۆڕی بە "یارمەتی" بۆ بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد. ئەمیش دەستیدایە ناچارکردنی جوتێران کە جار جارە بۆ خۆی (بۆ بزووتنەوەکە) بێگاری بکەن. ئەولاتریش، لای خۆرئاوایەوە، عەلی شەعبان فەرماندە بوو، ئەویش بەهەمان جۆر ڕەفتاری دەکرد. دیارە ئەو هەڵوێستە ئاغاکانی لەهەردوکلا ڕاستکردەوەو بڕێکیان دایانە پاڵ ڕژێم (بێ لەعەلی ئاغا)، بەو هیوایەی بتوانن جێپێی خۆیان قایم بکەنەوە. پاشان ناچارکران. خۆیانو گوێ لەمسترین دەستوپێوەندیان، نێوچەکە چۆڵبکەن. حەسۆش پشکێك لەزەویەکانیانی بەسەر جوتێرە هەژارەکاندا بەخشییەوە. هەڵبەت حاڵو بارەکە بۆ مەنگوڕان گۆڕرانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهات: لەهەواری زستانەیان، یانی لەگوندەکانی داوێن چیاکانی ژوورووی قەڵادزێ، حەسۆ میرخان جێگەی عەلی ئاغای گرتەوە. کوێخاش نێوی بەمەسئوولی دێ گۆڕرا. دیارە مەسئوولی دێ لەلایەن حەسۆوە دادەنرا، نەك بەهەڵبژاردن، کە دەبا وابایە. لەئێلاخو هەوارو لەوەرگەی هاوینەشیاندا، دوور لەبارەگاکەی حەسۆ، عەلی ئاغا توانیبووی شکۆو کەسایەتی نەریتییانەی خۆی، وەك دادیاری گشتیو تاقە نوێنەری مەنگوڕان، لەمامەڵە دەگەڵ هۆزەکانی دیدا، داسەپێنێت.

ئەم ڕوونکردنەوەیە ئاشکرای دەکات، کە ئەو شیرازە سیاسییە ئاماڵ نانێوەندییەی باڵەك، کە دەستەڵات بەسەر ئاغای هۆزو تیرەو گوندا دابەشکراوەو (ئاغای گوند کایەیەکی زەقو دیاری هەیە)، بۆ گشت لایەك ناشێت. ئاغای هۆزی مەنگوڕ،

لەڕێگەی دەستەیەك چەكداری گوێڕایەڵییەوە، دەستەڵاتێكی نێوەندی بەهێزی لەسەر حسێبی سەركردە نێوچەییەكان، لەدەستی خۆیدا كۆكردۆتەوە.

ئەو تاقمە چەكدارە وابەستە گوێڕایەڵە، یاخود ئەو یاودرە تایبەتانە، دەزگەیەكی هێجگار سەیرو سەمەرەیە. ئاشكرا پێچەوانەی دابو نەریتی خزمایەتی كۆمەڵگەی خێڵەكییە، چونكە ئەو پیاوە ڕاگیراوانە ئامادەن لەكاتی لەكاتی پێویستدا، بەفەرمانی ئاغایان، دژی كەسوكاری خۆشیان بجەنگن، بۆیە ئەندامانی ئاسایی هۆزیش بە كەم ڕەوشت باسیان دەكەن. ئەمە ئەو هۆیەیە كە هەندەك نووسەر، هاتنەكایەی سیستەمێكی گوێڕایەلانە، بە "یەكەم هەنگاو هەنانی ڕاستەقینە لەدابی خێلایەتییەوە بەرەو دابی فیۆدالیزم" نێودەبەن[٧٦]. من دەمەتەقێ لەوبارەوە، داخۆ كۆمەلگەی كوردەواری چەندە "فیۆدالییە"، تاڕادەیەك بە بێئاكام دادەنێم. بەلام گەرەكمە سەرنج بۆ ئەو ڕاستییە ڕاكێشم، كە ئەو جۆرە وابەستەییو گوێڕایەڵییەی (بۆ هاتنەكایەی فیۆدالیزمی ئەورووپایی هێجگار گرنگو پڕ بایەخ بوو)، لای خێڵە جەرمانییەكان، لەئاكامی پەیوەندییان دەگەڵ ئیمپراتۆرێتی ڕۆمانیدا هاتەكایەوە[٧٧]. ئەمە پەنجە ڕاكێشانە بۆ ئەو گریمانانەی لەبەندی سێهەمدا زێتر خۆیان پێوە خەریكدەكەم.

### ٢ـ ٩ـ ٢ـ پشدەرییەكان

جۆرێكی دی لەرێكخراوە نێوەندییەكان، دەگەڵ توێژتوێژكردنێكی ڕوونو ئاشكرادا، لەكن پشدەرییەكان بەدیدەكرێت. وەك لای باڵەكایەتی دیتمان، لێرەش هەر گوندێك (یاخود چەند گوندێكی نێزیكی یەكدی) ئاغایەكیان هەیەو دەیەك دەستێنێت. (كوردەكان بە تەوسەوە بەو جۆرە ئاغایانە "گوند داقەپێن" دەڵێن). لەكن پشدەرییەكان ئاغای گوندو مسكێنەكانی هەر خزم نیین، بەڵكە گشت لەگشتیان لەهەمان تایەفەو بەرەبابیش كەوتوونەوە. تایەفەی میراودەلییەكان بەنێوی میر عەودالٚ ئاغای باپیرەیانەوە نێونراون، كە دەوروبەری ساڵانی ١٨٤٠ لەترۆپكی ڕەندیو خورتیدا بووە. لەساڵانی بیستی ئەم سەدەیەدا، شەش لقی ئەم

تایەفەیە نێودارو ناسراو بوون، بەڵام دوانیان لەسەر دەستخستنی جڵەوی ڕێبەرایەتی‌و سەرکردایەتی هۆزەکە، بێ پسانەوە لەشەڕو ململانێدا بوون.

بەرە بەرەکانێکە لەنێوان بابەکر ئاغاو عەباسی بنامۆزایدا بووە، (یەکەمیان ساڵی ١٩٥٩و دووهەمیان ساڵی ١٩٤٥ کۆچی دوایی کرد).

هەڵبەت بڕێك لەئەندامانی لقەکانی دیکەی تایەفەکەش، لەهەندەك مەڵبەند، کایەیەکی زۆریان لەسەقامگیرکردنی دەستەڵاتە نێوچەییەکەدا هەبووە. پێدەچێت زۆر گێرمەو کێشەو هەڵلا، لەلایەن ئاغای بەهێزتری، لقی مەزنتری خانەوادەی دەستەڵاتدارەوە، بۆ ئاغای گوند سازکرابێت، (مەرجیش نییە هەردوکلا سەر بە هەمان لقی ئاغایان بووین).

بەر لە ١٩١٨، لەڕێگەی پەلهاویشتن‌و بەربڵاوکردنی دەستەڵاتەوە، بەر بە بەربەرەکانێی نێوان لقەکانی تایەفەکە گیراو کەمێك خاوکرایەوە. میراودەلییەکان لەبنەڕەتدا تەنها هۆزی نورەدینییان لەژێر چەپۆکدابوو، لێ پاشان هێدی هێدی بازنەی دەستەڵاتیان فراوانکردو زۆر لەو گوندانەی هیچ مافێکی ڕەوایان بەسەریانەوە نەبوو، خستییاننە ژێر ڕێکفی خۆیانەوەو دەمڕاست‌و نوێنەرایان بەسەردا سەپاندن[٧٨].

پاش ئەوەی ئینگلیز لە ١٩١٨ / ١٩١٩دا، ژێرووی کوردستانی بەعیراقەوە جووتباقەکرد، ئەو پەلهاویشتن‌و بەربڵاوکردنی دەستەڵاتە ڕاگیرا. (تا لەساڵانی پەنجاکاندا سەر لەنوێ دەستیدرایەوە، بڕوانە سەرنجی ژمارە ٧٥). لەوەدوا، تادەهات، بەربەرەکانێی نێوان بابەکر ئاغاو عەباس ئاغا توندو تیژتر دەبوو. ئەفسەرە سیاسییە ئینگلیزەکان، کەسایەتی بابەکر یان زۆر بەدڵدا چوو بوو، کە بووبووە نموونەو سەرباشقەی سەرەکهۆزە کوردە ملکەچ‌و گوێڕایەڵەکان[٧٩]. عەباسیش بوو بووە نموونەو سەرمەشقی کەسانی یاخی‌و متمانەپێنەکراوو خیچاو. هەڵبەت دوژمنایەتییەکەی دەگەڵ بابەکر دا، کە ئینگلیزەکان دەستەڵاتێکی فرمیان دابوویەو لەگشت بوارێکدا بۆ بەرژەوەندیی خۆیان راوێژیان پێدەکرد، ناچاری ئەو هەڵوێستەی کردبوو. ئەوەبوو هەتا پاش گێڕانەوەی دەستەڵاتی ڕاستەوخۆی

نەفسەرە سیاسییەکانیش لەنێوچەکانی دیدا، ئەویش پاش سەروەختێکی پڕ ئاشووبو هەڵڵای فەرمانداریکردنی تییانیان، هێشتا هەر قەڵادزێو ناودەشت بەدەست بابەکر ئاغاوە هێڵرانەوە، (ئەو دەم بەرەسمیی پلەی قایمقامی قەڵادزەی درابوویەو لەبواری هۆزەکانی هەردووك دیوی سنوورو نێوچەکانی دیدا، راوێژکاری ئەفسەرە سیاسییەکان بوو)[٨٠]. بەو پێیە تەواوی هۆزەکە بوو بووە دووکوتی سەربە بابەکرو عەباسەوە، لەو روانگەیەشەوە بوو بوونە لایەنگر، یاخود دژە دەوڵەت.

دووربەرەکییەکە بەپێی پرنسیپە گشتییەکەی تایەفە رەوتی نەدەکرد، بەڵکە ململانێیەکی پەتی بوو لەنێوان دوو لقی خانەوادە دەستەڵاتدارەکەدا. لقەکانی دیکەی خانەوادەکە، لەبەر رۆشنایی حاڵو باری ئینگلیزدا هەڵوێستیان وەبەردەگرت، چەلێك بێلایەن دەبوونو هەلێك دەیاندایە پاڵ لایەکیان: هەر کات هەستیان بە پرهێزیی ئینگلیز کردبا، دەیاندایە پاڵ بابەکر، کە سووسەی لاوازییان کردبا، ئەودەم دەبوونە لایەنگری عەباس. هەرچی دژە ئینگلیز هەبوون، (بۆ نموونە چ شێخ مەحموود لەسەروەختی راپەرینەکانیداو چ شۆفارە جلخوارەکانی تورك، ئەوانەی سەرەتای بیستەکان کەوتبوونە پڕوپاگەندەیەکی بەربلاوی دژە ئینگلیز، بەو ئومێدەی خوارووی کوردستان ببەنەوەو بیدەنەدەم تورکیا نوێ)، دەیانتوانی پشت بە بەرەی عەباس ببەستن. بەوپێیەی پشدەرییەکان بەهێزترین هۆزی خوارووی کوردستان بوونو بابەکر هاوپەیمانێکی بە بەهێنەتی ئینگلیزبوو، پێدەچوو عەباس ئەو هەڵکەوتووەبێت، کە بتوانێت ریزی گشت دەستەو تاقمە دژە ئینگلیزەکان یەکخات. شایەنی هێزی ئەو دوو گوردێرە، هەرگیز هاوتا نەبوو، هەمیشە تای هێزی ئینگلیزو بابەکری پیاوی قورستر بوو، وەك لەوەبەریش هەر ئاوهابوو: ئەوەبوو ساڵی ١٩٠٠ بابەکر دەیتوانی یەك هەزار چەکدار خڕکاتەوە، عەباس تەنها پێنج سەد پیاوی پێ کۆدەکرایەوە[٨١].

لەقۆناغێکی پاشتردا، برێك کێشەو قۆرتی دی بۆ ئەم هۆزە، یاخود ئەم دووبەرە شەڕکەرە سازا: وەکی کێشەی نێوان ئاغاو وەرزێرانی سەر بە هۆزەکە لەلایەكو

ئاغاو مسكێنه بێگانەكانی لەلایەكی دی. دیاره ئەندامانی هۆزەكە، لەپلەو رادەی گوێڕایەڵی‌و ملكەچییاندا بەرامبەر خانەوادە فەرمانڕەواكە، جوداوازبوون.

لەپاڵ كاكڵەیەكی رەقی بەئەمەكدا (كە زێتر لەدێرینترین مسكێنە نورەدینییە ژێر چەپۆكخراوەكان پێكهاتبوو)، دەستەیەكی دیكە هەبوو، كە لەو دواییانەدا دەستەمۆكرابوون، بەتوندی دژی پێبەندكردن‌و سەرانەی بەزۆر لێسەندراویان راستبووبوونەوە. مامەشەكان كە توانیبوویان لەیەخسیركردنی تەواو خۆ رابپسكێنن (بڕوانە سەرنجی ژمارە ٧٥)، تا ئێستاكەش بەو پەڕی رق‌و كینەوە باسی ئاغاكانی پشدەر دەكەن. دیارە بەدبەختەكانی دیكەش هەر هەمان هەستیان هەیە. ساڵەكانی پەنجا، كە زەوییەكان تاپۆكران‌و پەیوەندیی ملكایەتی یەكەیەكەیان دیاریكران، گێرمەو كێشەیەكی یاسایی توندو تیژ لەنێوان ئاغاكان‌و رەشە خەڵكەكەدا خۆڵقا. لێرەش وەك لە كوتەكانی دیكەی كوردستاندا، كڵپەی چەندین راپەڕینی چكۆلەی وەرزێران هەڵایسا. وەرزێرە رووتەڵە بێ زەوییەكان، هێرشیان بردەسەر ماڵ‌و ملكی ئاغاكان‌و داگیریانكردن. پاش كودەتاكەی قاسم، بزووتنەوەی دژە دەرەبەگانەی مسكێنەكانی پشدەر، پشتیوانی چاكی بۆ رەخساو بردوی سەند. دوای چەند شەڕو پێكداهەڵقژانێك، زۆربەی ئاغاكان بۆ ئێران هەڵهاتن. كە گێرمەو كێشەو مەسەلەی ململانێی چینایەتی بە هۆی تێكچوونی نەتەوەپەروەرانی كوردو قاسمەوەو ئاڵۆسكانی بارەكەوە، پەردەی بەسەردا دامالڕا، ئەوجا گەڕانەوە. ماوەكی چاك بۆیان لوا سوود لەكەشی گەشەسەندنی هەستی نیشتمانپەروەریی كورد وەرگرن، توانییان خۆ تێكەڵی بزووتنەوەكە بكەن‌و لەو رێگەیەوە لەگرنگی‌و بایەخی مەسەلەی جوداوازییە چینایەتییەكە كەمبكەنەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێدی هێدی هێزو دەستەڵاتە نەریتییەكەی خۆیان لەدەستداو فەرماندەكانی پێشمەرگە جێگەیان گرتنەوە. تا لە ١٩٦٩دا بە هێجگاری خۆیان‌و دەستوپێوەندەكانیان دایانەپاڵ رژێم‌و چالاكانە دژی بزووتنەوەكە كەوتنە جەنگان. فەرماندەكانی پێشمەرگە دەستیان بەسەر ملك‌و ماڵیاندا گرت‌و پشكێكیان بەسەر جوتێرە رووتەڵە بێ زەوییەكاندا

دابەشـكرد. لـێ پـاش ڕێكەوتنەكـەی ئـازاری ١٩٧٠ گەڕانـەوەو ملْـكو مـاڵی خۆیـان وەرگرتەوە، (هێندە یاسای نوێی چارەسەركردنی زەوی ساڵی ١٩٧٠ ڕێگەی پێدەدا)[٨٢].

كەواتە شیرازەی كۆمەڵایەتی پشدەرییەكان لەباڵەكو مەنگوڕان روونترو ئاشكراتر توێتـوێ كـراوە: تایەفەیـەكی فـەرمانڕەوا لەسـەری سـەرەوەیە، كـە گـشت ئاغاكـانی مـیراوەلی دەگرێتـەوە. ژێرتـر مـسكێنەكانن، كـە لـەڕووی ڕەچـەڵەكەوە جـوداوازن، نورەدینییـەكانو برێـك تایەفـەو دەسـتەوتاقمی كەناركەوتـە، كـە ئارەزوومەندانـە یـاخود بـەزۆری زۆرداری ژێردەسـتخراون، لـەبرێك جێگـەش هەنـدەك وەرزێـری ناخێڵەكی كە بە توێژی كۆیلەكراون، لەژێری ژێرەوەن.

## ٢ـ ٩ـ ٣ـ هەمەوەندەكان

هەمەوەندەكان لەزۆر ڕووەوە وەكی پشدەرییەكانو هەتا شیرازەیەكی لەوان قووچ هەڵچووتریـشیان هەیـە[٨٣]. ئـەم هـۆزە كـە سـەروەختێك وەكـی جـەردەو تەڕیـدە ناسرابوو، نێوو نێوبانگی بەخراپی ڕۆیشتبوو، لەشكرێكی گوێڕایـەڵو پـڕ دیـسپلینی هەبوو، لەبنەچەدا لەئێرانەوە هوروژمیان بۆ سەر ئیمپراتۆرێتی عوسمانی هێنـاوەو مەڵبەنـدی ئەوڕۆكـەی خۆیـان داگیركـردووەو دانیـشتووە ڕەسـەنەكەی، كـە وەرزێـر بوونو سەر بەهیچ خێڵێك نەبوون، كۆیلەكراونو كردوویاننە مسكێنی خۆیان.

هۆزەكـە هـەروەكی هـۆزی جـاف لەلایـەن تایەفەیـەكی بـەگزادەوە سـەرەوكاریی دەكرێـت، تایەفـەكانی دیكـەش ئاغـای خۆیـان هەیـە. لەكۆنـدا دەبایـە هـەر گونـدێك جـەنگاوەری خـۆی هـەبا (دە تـا پـازدە نەفـەرێك) كـە ئاغـای گونـد سـەركردایەتی دەكردنو بۆ لەشكری هۆز ئامادەكرابوون.

ئـەم پەلـە گـچكانە پـشكێك بـوون لـەلقی گـەورەتر، ژێردەسـتەی ئاغـای بـاڵێكی فراوانتری هۆزبوون. دەستەی سەرقەتاری جـەردەییو ڕێگـریو ڕاو و ڕووت، لەلایـەن ئاغایەك، یاخود چەند ئاغایەكەوە، یاخود گەر ئەركەكە گرنگبـا، لەلایـەن سـەرداری تایەفـەی بەگزادانـەوە دەستنیـشان دەكـرا. ژێـر چەپۆكخـستنی مـسكێنو گونـدیان،

ئەرکی تاکە تاکەی ئاغاکان خۆیان بوو، کە دەستوپێوەندی هۆزەکەیان بۆ ئەو جۆرە شەڕو دەستوەشاندنانە بانگرادەهێشت.

گوندی یەخسیرکراو دەبووە باجدەری ئاغای نەخشەکێشی هێرشەکە. هەندەك لەپیاوەکانی (زێتر خزمێکیو دەستوپێوەندەکانی)، بەهێجگاری لەو گوندە نیشتەجێ دەبوونو باجو خەراجیان دەسەندو (بڕێکیان) بۆ ئاغا دەنارد. پاشتریش زۆرجار کابرای نوێنەرو سەرکاری ئاغا تەواوی ئەو باجەی بۆخۆی لرف لێدەدا.

کەواتە مسکێنەکان خاوەنی ئەو زەوییە نیین، کە رەنێوی دەهێنن، بەڵکە وردە کرێگرتەنو شوورەی تایەفەگەری لەلادێییە خێڵەکییەکانیان هەڵدەبوێرێت. هەرچەندە بە سەرزارەکی بەرۆگرانیان مافی کرێگرتەیی برێك پارچەیان دەکەوێت، بەڵام زۆرجار ئەو مافە پێشێلدەکرێت[٨٤].

هەڵبەت هەرچی مسکێن بوو، ئیدی مانای ئەوە نییە گوایە هەژارو نەدارە، نەخێر، جار هەیە ئەو ملکەی بەدەست کابرای مسکێنەوەیە هێند فراوانە، کە دەبێت وەرزێری بۆ بەکرێبگرێت (دیارە زێتر وەرزێری بێگانە). دەبێت ئەوەش بڵێین کە دادۆشینی جووتێرە خێڵەکییەکان لەلایەن هەمەوەندەکانەوە هیچ دەردیسەرییەکی ئەوتۆی زێتر نەبوو لەدادۆشینیان لەلایەن ئاغای تایەفەکەیانەوە: تێکڕا دەبایە ١٠ ـ ١٥٪ی دانەوێڵەو سێیەکی داهاتی زەوی بەراوی (وەك تەرەو سەوزەو تەماتەو .... ئەو جۆرە بەرووبوومانە) ملکانە بدەن. کەواتە لەگوندی مسکێنەکانی هەمەوەندیشدا کۆمەڵگەیەکی چەند توێژی دەدیترێت، کە پێکهاتیان ئا بەم چەشنەیە: ئاغا، هەمەوەندە خێڵەکییەکان، مسکێنی بێ ماف لەگۆڕینی جێگەی ژیاندا، کرێکارە کشتوکاڵییەکان.

هەتا دەستەڵاتی دەوڵەت تەواو سەقامگیر نەبوو بوو، پەیوەندی فیۆدالانەی نێوان هەمەوەندو مسکێنەکان، سوودو دەستکەوتی هەردوکلای تێدابوو. مسکێن تەنها دانەدۆشرا، بەڵکە لەشاڵاوو دەستدرێژی هۆزەکانی دیکەش دەپارێزرا. جگەلەوە، دەستکەوتو سوودی ئابووریشی دەچنییەوە، ئەویش لەڕێگەی ئاڵو وێڵەوە، لەبازارەکاندا کەلو پەلو تالانیی هەمەوەندیان ساخدەکردەوە. لێ پاش

برەوسەندنی دەستەڵاتی دەوڵەت، ئەو پەیوەندییە بووە دژایەتی. ئیدی هەمەوەند ناچاربوون دەست لەتاڵانو برۆ هەڵگرنو بۆ پەیداکردنی بژێویان، مل دەبەر جووتیری نێن، یاخود پەرە بەدادۆشین بدەنو مسکێنان لەجاران خراپترو زێتر داپڕوسکێنن. دیارە بەهۆی پلەی کۆمەڵایەتییە باڵاترەکەیانەوە، هەمەوەندەکان دەرفەتی پێوەندییەکی چێتریان دەگەڵ فەرمانبەرانی دەوڵەتدا بۆ رەخسابوو، دەیانتوانی ساناتر کاریان تێبکەنو لەسەر حسێبی مسکێنەکان، دەستکەوت بۆخۆیان بچننەوە. مسکێنەکان دەگێڕنەوە گوایە هەمەوەندەکان لەکاتی سەربازگرتندا، یارمەتی پۆلیسیان داوەو نێوی گشت ئەو مسکێنانەیان لا ئاشکراکردووە، کە کاتی سەربازییان هاتووە، لەبەرامبەر ئەوەدا خۆیان لەخزمەتی سەربازی بەخشراون[٨٥].

ساڵی ١٩٥٠، ئەو دەمەی Barth دەچێتە ئەو نێوچەیە، دەبینێت کە کێشمەکێشی نێوان مسکێنو هەمەوەندەکان لەچڵەپۆپەدایەو گشت پێشهاتەکانی دی شاردۆتەوە، ملکلانێ بووە لەسەر تاپۆی زەویو مافی ملکایەتی، کە تازە دەستیدراوەتێ. مەخابن من نەمتوانی زانیاریی تەواو دەربارەی بەشداریی ئەو مسکێنانە لەراپەڕینە وەرزێرییەکانی پاشتردا وەدەست بخەم.

### ٢ـ ٩ـ ٤ـ دزەییەکان

ژێر چەپۆکخستنی وەرزێرە ناخێڵەکییەکان تەنها لەرێگەی داگیرکردنەوە نەهاتۆدی، وەکی نموونەی پشدەرو هەمەوەند وا پێشاندەدەن. دزەییەکان نموونەیەکی پێچەوانەی ئەوانەن. دەستەڵاتی سیاسیو ئابووری بەدەست وەچەکانی ئەحمەد پاشا نێوێکی خەڵکی (دزە)وە بووە، کەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم لەهەولێر والی عوسمانی بووە.

هەر لەو رێگەیەوە بۆی لواوە زەویو زارێکی زۆر لەدەشتە پڕ فەڕو پیتەکەی هەولێر بۆخۆی بڕبڕێتو دانیشتووەکانی ژێرچنگۆڵە بنێت. بەڵام روون نییە داخۆ هەر ئەودەمانە خانەوادەکەی بۆتە مەزنی خێڵە نیوەکۆچەرەکانی ئەو مەڵبەندە، یاخود لەدێرتردەوە سەردارو سەروەری ئەو هۆزانەبوون. ئەوەی ئاشکرایە، ئەوەیە کە

ڕەچەڵەکی خانەوادەکە لەبنەچەی ئەو هۆزانە جوداوازە. هەرچەندە سەرچاوە تۆمارکراوەکان بەدەگمەن جوداوازی لەنێوان خێڵەکیو ناخێڵەکییەکاندا دەکەنو ناتوانن لەو ڕووەوە دەستگیرۆییەکی ئەوتۆمان بکەن.

بەپێی گوتەی Hay (١٩٢١، ل ٧٧)، ساڵی ١٩٢٠، ژمارەی خەڵکە ڕەمەکییەکە، نێزیکەی ٣٠ هەزار کەسێك بوونو خانەوادە دەستەڵاتدارەکە، چوار لقی نەتەویو گوردێری یەکدی هەبووە. خێڵەکییە نیوەکۆچەرەکان لەگوندەکانی زێواری دەشتاییەکەدا ژیاونو هاوینان ڕەویانکردووەو چوونەتە ئێلاخ[٨٦]. ئەو مسکێنانەی لەگوندەکانی دەشتاییەکەدا ژیانو ژێرچەپۆکەی یەکێك لەئاغاکانی خانەوادە دەستەڵاتدارەکە بوون، هەر ئەویش خاوەن ملکیان بووە.

گشت ئاغاکان پێکرا خاوەنی زێتر لەنیوەی دەشتی هەولێر بوون، ئەو ملکانەیان لەڕێگەی شەڕو تاڵانییەوە چنگ نەکەوتووە، (چونکە هۆزی دزەیی بەوەجنو ناچنە تاڵانیو شڕەخۆری ناکەن[٨٧])،

بەڵکە بەرژەوەندیی هاوبەشی خانەوادە دەستەڵاتدارەکەو فەرمانڕەوایی عوسمانی، ئەو دەرفەتەی بۆ ڕەخساندبوون. بەوپێیە دەیانتوانی بەرەسمی داوای پاشنێوی دەرەبەگانە بکەن. جگەلەوە "وەکی چەندین جار ڕوویدا"، دەزگەی دەوڵەت بۆ پاراستنی ملكوماڵیان، دەستگیرۆیی دەکردن.

Hay کە زۆر خۆی بە دزەییەکانەوە خەریککردووە، ئەحمەد ئاغا، کە یەکێك بووە لەدوو ئاغا هەرە گرنگەکان، "زێتر بە بازرگانێکی سەرکەوتووی دەستکەوت فرە دەزانێت، نەك سەرەکهۆز"، کە لەڕێگەی بەرتیلو قاچو قووچو زەوتکردنو زەبرو زۆرەوە، هەڵگڕاوە[٨٨]. ئەحمەد ئاغا هەر لەسەرەتاوە دژی ڕژێمی تازە دامەزراوی عێراق وەستایەوە. Hay پێیوایە ئەوەش بەوهۆیەوە بوو کە ئینگلیزەکان کەمتر بەرتیلو سیرمەخۆرییان دەکرد وەك لەعوسمانییەکان، یاخود زێتر ڕێتێدەچێت بەوهۆیەوە بووبێت کە ئینگلیزەکان بایەخی زێتریان بە ئیبراهیم ئاغای ناحەزی دەدا، چونکە ئەویان بە سەرەکهۆزێکی مەزنتر دەزانی.

دیاره ئەو سەروەختەش مسكێن هەر چارەی ئاغایان نەویستووە. ئەوەبوو لەكۆتایی ١٩١٨، ئینگلیزەكان لەبەشە داگیركراوەكەی كوردستاندا، گەلێرسییەكی بەرتەسكیان لەبارەی ئومێدو ئاواتی دوارۆژیانەوە كرد، بەتایبەت لەبارەی ئەوەوە داخۆ ژێرەووی كوردستان سەربەخۆبێت، یاخود بكرێتە بەشێك لەدەوڵەتە عارەبییەكەی عێراق. قاو وابوو گوایە رەشەخەڵكە لادێییەكەی دەشتاییەكانی موسڵو هەولێر، خەونو خولیایان ئەوەبوو: "لەدەستی توركان قوتاركرێن، ئەوجا لەدەست جەورو ستەمی دەرەبەگەكان، تاقە چینێك كە دامەزراندنی دەوڵەتێكی عارەبی عێراقی بە ئاوات دەخواست". دیارە ئا ئامە داخوازییەكی گرنگی پێكەلێپێكە لەسۆزی نەتەوایەتیو هەستی چینایەتی. Hay (١٩٢١ــ ل ٦٨) بەسەرهاتێك دەگێڕێتەوە، گوایە "دزەییەكان سەرپێچییان لەوە كردووە كە لەشەڕی دژی دەستەلاتدارێتیدا، پشتی ئاغایان بگرن"، بەلام روونی نەكردۆتەوە داخۆ ئەو دزەییە سەركەشە یاخییانە ئەندامانی هۆزەكە بوون، یاخود مسكێنەكان. لەسەردەمی پاشایەتیدا، ئاغاكانی دزەیی، لەرێگەی پێوەندیی توندو تۆڵیانەوە دەگەڵ حوكمڕانانی بەغدا دا، دەستەلاتی بێسنووری خۆیان تەواو بنجبەست كرد. برێكیان بوونە ئەندامی پارلەمانو هەتا چەند قلێكیشیان گەیشتنە پلەی وەزیری. ساڵی ١٩٥٣ راپەرینە مەزنەكەی جووتێران، سەرتاپای دەشتی هەولێری راتەكاند. رەنگە ئەوە گرنگترین راپەرینی مێژووی عێراقی نوێ بێت. دەرەبەگەكان (كە زۆربەیان لەشارەكان دەژیان)، ترسێكی وایان لێنیشت، كە بە پەلەپرووزێ نێوچەكەیان جێهێشتو پاشانیش بە كۆمەكی سوپا گێڕدرانەوە سەر جێگەو رێگەی خۆیان.

لەجەنگی نێوان كوردو عیراقدا، ژمارەیەكی كەم لەمسكێنەكان دایانەپاڵ نیشتمانپەروەرانی كورد. هەتا ئەو كاتەش كە چەند ئەندامێكی خانەوادە دەستەلاتدارەكە چوونە ریزی شۆڕشەوەو بوونە ئەندامی سەركردایەتی، ئەو هەڵوێستە گۆڕانی بەسەردا نەهات. (دیارە خانەوادە دەستەلاتدارەكە هێندە ژیرێتی هەبوو، هۆشی هێند بڕیدەكرد، كە لەهەر ئاگردانێكدا چەند شیشێك بۆ تەنگانە بەجێبهێڵێت). ئەودەمە باری گشتیی دەشتی هەولێر ئاوها بوو، لەكاتێكدا برێك

لـەجووتێره خێڵەکییـەکانو نیـوه کۆچـەرەکان بەفەرمانـدەیی، یـاخود بەدنـەدانی ئاغاکانیـان دەچـوونە پـاڵ شۆڕش، یـاخود دژی شـۆڕش دەجـەنگان، مـسکێنەکان (کـە قەت شەڕکەر نەبوون) دوورەپەرێز دەوەستان. لەپاڵ کەم توانایـیان لـەبواری شـەڕدا، هۆیەکی دیکەشیان هەبوو، ئەویش تێکەڵ نەبوون بوو.

ئـاواتی هەرەبـەرزیان ئـەوەبوو، ئـەو زەوییـەی بـەکرێیان گرتبـوو، ببێتـە ملکـی خۆیانو داهاتێکی زێتری لـێ بەرهەم بهێنن، ئارمانجێك کە لەداخوازیی نەتەوەییانە، یاخود مافی کولتووریو ئۆتۆنۆمی لە پێشتر بـوو. گـرنگ بـەلای ئەوانـەوە ئـەوە بـوو کە رژێمی بەغـدا، نـەك بـارزانی، چـارەی کێـشەی زەویوزاریـان بکات، ئـەویش لەبـەر هۆیەکی زۆر سادەو ساکار، چونکە لایان روونبوو کە بارزانی لەبارێکدا نییە بتوانێت دەشتە تەختەکەی هەولێر بپارێزێت.

## ٢ـ ١٠ـ هێزو دەستەلات وەك پرۆسێسێك
## کۆلۆنیالکردنی جزیرەی ژووروو

برێـك لـەو بـاوەڕەدان کـە فیـۆدالیزمی (ئـەوروپای خۆرئـاوا) بـە پـوختترین شـێوازییەوە، لەئـەوروپا خۆیـدا چـەکەرەی نـەکردو شـین نـەبوو، بەڵکـە لـەولاتانی خاچپەرستی کەنار دەریای نێوەڕاستدا، لەخۆرهـەلاتی ئیتالیا بـەولاوە، ئـەو شـێوازە بەرهەمهێنـەرو دەزگـە سیاسـییە، لەزەمینەیـەکی بۆشـدا چـێنراو گەشـەی کـردو هەڵچوو، بـێ ئـەوەی هـیچ یـەك لەشـێوازە زرپو زینـدووەکانی ئـەوێ، بتـوانن بـەری پێبگـرن[٩٠]. ئەمـە مانـای وایـە توێژینەوەیـەکی هـوردی مێـژووی ولاتـانی سـوارەی خاچپەرستان، رەنگـە ئاسـۆی تێـڕوانینو تێگەیـشتنمان لـەلۆژیکی فیـۆدالیزم (وەکـی ئەوەی لەئەوروپادا هەبووەو گەشەی کردووە)، فراوانتر بکات.

جزیـــرەی ژووروو، چ نێوچـــە کـــەم ئاوەدانییـــەکانیو چ نێوچـــە قـــاقڕو بـــێ ئاوەدانییەکانی، ئەو جێیەی لەسەردەمی نوێدا (لەبەرایی سەدەی بیستەمدا)، هۆزێك لەنێوەندی کوردستانەوە ڕوویانتێکردو لێینیـشتەجێبوون، وەکـی "تاقیگەیەکـە" بـۆ توێژینەوەی دەزگەی فیۆدالیزمی خێڵەکی کورد. هەرچـەندەدەبێت لەحانـد ئاگامی

ئـەو جـۆرە تویژینەوانـەی نێوچـەکەدا وریـا بـین، بـەڵام پێدەچـێت بتـوانین لـەو ڕێگەیەوە لەدینامیکی ژیانی سیاسی هۆزەکان باشتر تێبگەین.

بەشی داهاتوو تا مەودایەکی زۆر پشتی بەو گفتوگۆو دەمەتەقێیانە بەستووە، کە لەمایسی ١٩٧٦دا لەجزیرە کردوومن.

جزیرەی ژووروو، یانی (بەشی سەرووی تەختانییەکانی مسیۆپۆتامیاو ئەوپەڕی بـاکووری خۆرهـەڵاتی سـوریای ئـەورۆو پەڵـە دەشـتاییەکانی خـوار قەراجـەداغو کێوەکانی تۆرعابدین)، بەپیتو فەرترینو ڕێژەوترین نێوچەی جیهانە. لەسـەردەمە دێرینەکانـدا خـەڵکێکی هێجگـار زێـتر لـەوەی ئـەورۆ، بـژێوی خۆیـان لـەوێ وەدەستخستووە.

هێـرشو شـاڵاوی هـۆزە بـەدووەکانی باشـوورو کـوردە ڕەوەنـدەکانی بـاکوورو لای کێوەکانی شەنگار، مەزراو کێڵگەکانیان تێکوپێکداو بـێ فـەڕیان کـردن. زۆر نێوچـە بوونە چۆڵەوانیو گەلەك قوتەو قەڵاتی توورەکە ڕێژ، بوونە گـەواهی سـەردەمانێکی هێورتری دوورو درێژ. ئێرە بووە سامناکترینو پـڕ مەترسـیترین کـوتی ئـەو کاروانـە ڕێیەی، بەغداو موسڵو حەڵەبو ئەستەموڵی پێکەوە دەبەستەوە.

ڕێبوارانی ئەوسا باسی نائـارامیو نیگـەرانیو دڵەڕاوکی بەردەوامیان دەگێڕنـەوە، تـرسو دڵەلـەرزەی ئـەوەی بـەدووە جـەردەکان، یـاخود هـۆزە ئێزیدییـەکان، ڕووتیانکەنەوە[٩١].

لـەنیوەی دووهـەمی سـەدەی نۆزدەهەمـدا، والییـە چوسـتو جەربـەزەکانی موسـڵو دیاربکر، کۆتاییان بە شاڵاوی تاڵانکەرانـەی کوردە ئێزیدییـەکانی لای شـەنگار هێنـاو هێرشی بەدووەکانیشیان تا ڕادەیەك بەربەستکرد.

پاشان هێـدی هێـدی جزیـرەی ژووروو ئاوەدانکرایـەوەو بەشـێك لـەو خێڵە کوردە ڕەوەندانـەی لێنیـشتەجێ بـوون، کـە ئـەو نزمایییـە گەرمێنـەیان کردبـووە هـەواری زستانەیانو هەمیشە ڕوویانتێدەکردو تا درەنگانێکی کۆتایی سەدەی پێـشووش، هـەر مڵکانـەیان بـە بـەدووەکانی هـۆزی شـەممەر دەدا[٩٢]. بـەپیتی پـڕ خێـرو بێریـی خاکەکەی، هەندێك لەو تاقە ماڵانەو بڕێك لەچڵی هۆزەکانی، لەنێوچەکانی دییەوە

بەکێشکرد. داخستنی سنووری نێوان تورکیاو دەوڵەتی تازەدامەزراو و خاوەن لەلەی سوریا (لەدەوروبەری ساڵی ١٩٢٤دا) پەلەو دەستوبردی بە پرۆسێسی نیشتەجێبونەکە کرد. لەلایەك کۆچەرییەکان ڕێگەی کۆچو ڕەوی ساڵانەیان لێبەستراو نەیاندەتوانی چیدی بەکامی دڵ گەرمێنو کوێستانیان بکەن، بۆیە هەندەکیان لەداوێنی خوارووی سنوورەکەیدا نیشتەجێبوون. لەلایەکی دیکەشەوە جەزرەبەدانی کورد لەتورکیادا، گەلەکی ناچارکرد زێدی خۆیان بەهێجگار جێبهێڵنو بۆ سوریا هەڵبێن. ئەوەبوو "لەماوەی کەمتر لەپێنج ساڵێکدا، بازێرێكو ٢٨ گوندو ٤٨ کوێرەدێو ٢٩ تاقەماڵ (کە پاشان بوونە گوند)، تەنها لەپارێزگای قامیشلیدا هەڵتۆقین"[٩٢].

خانەوادەی مەزنانی خێڵی دووریکان، کە ئەو دەمە خێڵێکی کۆچەری سەر بە هۆزە یەککەوتەکانی هەڤێرکان بوو، یەکێك بوو لەیەکەمین نیشتەجێکانی ئەوێ. زۆربەی خەڵکە ڕەمەکییەکەی سەربەهۆزەکە، ژووروو‌تر، لەنێزیکی هەوارو لەوەرگەی هاوینەیان نیشتەجێبوون، وەلێ لەوێشەوە هێشتا هەر ساڵانە وەك نەریت، مەڕی خۆیان بە جێژنانە بۆ مەزنانی هۆز دەنارد. بڕێکیان بەتاقەماڵە لەجزیرە نیستەجێبوون. یەکەم دووریکانیی نیشتەجێ، عەباس بوو (بڕوانە خشتەی ژمارە ٢)، ڕەنگە ئەوە دەوروبەری ساڵی ١٨٥٠ بوو بێت. لەسەردەمی ئەودا بۆ یەکەمینجار تاپۆی زەویوزار دەستپێکرا. ملکێکی هێجگار زۆری لەسەر سێ کوڕە گەورەکەی تاپۆ کرد، (شاوەیس کە لەگشتیان مندالٚترە، ئەو دەمە هێشتا لەدایك نەبووبوو). پشکێکی زۆری ئەو مەڵبەندە هەر لەکۆنەوە پاوانو لەوەرگەی هۆزەکەی بوو.

دیارە عەباس کە نیشتەجێبوو، تەنها نەبوو، سەرەکهۆزی کورد قەت تەنها نابێت. بڕێك خزمی دووریو دەستوپێوەندی، شوانی مێگەلە گەورەو مەزنەکانی، وەرزێرە وابەستە ڕەچەڵەك جوداکانی، گشت لەگشتیان ڕەگەڵی کەوتن. پشکی هەرە زۆری ئەو وەرزێرانە، فەلەی یاقووبی (یاخود سریانی) نێوچەی کێوەکانی تۆرعابدین بوون.

روون نییە داخۆ ئەو یاقووبییانە، بەرلەوەی عەباس نیشتەجێبێت، لەوێ ژیاون یان نا. دوور نییە بڕێکیان پێشتر لەوێ نەژیابن، بەڵام وەها دیارە زۆربەیان ئەو کاتە

نێوچە جمکوتەکەی کێوەکانی تۆرعابدینیان جێهێشتبێت، کە عەباس بەهەمیشەیی نیشتەنی بوو و گفتی بەرگری‌و پاراستنی لەشالاوی هۆزەکانی دی پێدان، بەتایبەت لەدەستدرێژیی هۆزی شەممەر. جگە لەوە پێدەچێت هەندەك جووتێری ناخێڵەکیی کوردو برێکی سەر بەهۆزەکانی دی، بەهەرە هۆیەکەوە بووبێت، پێبەندی عەباس بووبن‌و لەتەکدا نیشتەنی بووبن. وا دیارە تا ئەو دەمەش هێشتا هیچ دووڕیکانییەك خۆی بەکشتوکاڵەوە خەریك نەکردبوو، چونکە زۆربەی رەوەندەکان، کارو فەرمانی وەرزێرییان بە سووکایەتی‌و نا شایستەی شکۆی خۆیان دەزانی[٩٤]. ئەو جووتێرە دووڕیکانییانەی من دیتمن، یا تازەکی هاتبوونە ئەو نێوچەیە، یاخود لەو دواییانەدا ملیان دەبەر وەرزێری نابوو.

کە عەباس مرد، محەمەدی کوڕە گەورەی جێیگرتەوەو بووە سەرۆکی هۆزەکە. ئەو دەمانە خانەوادەکە هەندەك داب‌و نەریتی هۆزە عارەبەکانی وەرگرتبوو. محەمەد لەنێو سەرەکهۆزە عارەبەکاندا، کە ئەو سەروەختە ململانێیان بوو لەسەر دەستەڵات‌و شکۆو شۆرەت، نێوونێوبانگێکی درەوشاوەی چاکی بۆخۆی پەیدا کردبوو، ئەویش لەرێگەی ئەو ئاهەنگ‌و داوەتە مەزن‌و گەورەو گرانانەیەوە، کە ئەو نێوچەیە هێشتا بە خۆیەوە نەدیتبوو. گشت پیاوە نێودارەکانی جزیرەی بانگرادەهێشت، لەتاقە رۆژێکدا سەدان مەڕی سەردەبڕی. نێوو شکۆ لای کوردو عارەبان، یا لەرێگەی مێرخاسی‌و عەگیدییەوە، یاخود لەرێگەی دەستودڵ واڵاییەوە پەیدا دەکرێت، محەمەد سوارچاکی ئەو مەیدانە بوو. هەتا ئەورۆش هێندە بەسە کە وەچەکانی تەنها نێوی بهێنن، ئیدی هەرچی سەرەکهۆزی عارەبانە ئەوپەڕی رێزیان لێدەنێن‌و لەخزمەتیان هەرگیز درێغی ناکەن.

محەمەد برێك سەودایی‌و ئارەزووی دیکەشی هەبوو. تێکڕا ٤٠ ژنی هێنابوو، بەڵام دیارە وەك موسڵمانێکی راستەقینە رەفتاری دەکردو لەدابی ئیسلام لاینەدەدا. قەت پێکڕا لە ٤ ژن زێتری نەدەبوو. پێش ئەوەی یەکێکی نوێ مارەبکات، کۆنەیەکی تەڵاق دەدا. محەمەد هەر زوو مرد، بەرلەوەی کوڕەکانی پێبگەن‌و بتوانن جێگەی بگرنەوە.

ئـەوجا سـلێمانی بـرای بـووە ئاغـا. ئـەمیان هێـورتر بـوو، تـەنها ١٤ ژنـی هێنـابوو (بەپێچەوانەی براکەیەوە، ١٠ سەری لەژنە تەڵاقدراوەکانی لەماڵەکەیدا گلدابووەوە).

لقەکانی دیکەی خانەوادەکەش لەزاو زێدا تارادەیەك چوستو چالاك بوون، پەیتا پەیتا پەرەیاندەسەند. هەڵبەت جگە لەسـەرگەڤار کەسـی دی دەسـتکەوتو داهـاتێکی سەربەخۆی ئەوتۆی نەبوو. جووتێرەکان ئازادبوون کامە پارچە زەوی هەڵدەبژێرنو رەنێـوی دەهێـنن، (زەوی زۆرو زەوەنـدیان لەبەردەسـتدابوو)، تاقـە مـەرج ئـەوەبوو دەیەکی داهاتیـان بـە ئاغـاو مـەزنی خانـەوادە دەسـتەڵاتدارەکە بـدەن. سـەرگەڤاریش دەسـتکەوتەکەی بەسـەر ئەنـدامانی خێزانەکـەدا دەبەخـشییەوەو هەریەکـە مووچـەیەکی بـۆ بڕڕابـووەوە، بـەو پێیـە گـشت خزمـانی، لـەڕووی ماددییـەوە، چـاو لەدەستو لارەملو وابەسـتەیەکی تـەواوی بـوون[٩٥]. هەڵبـەت هـەموویان لـەو حـاڵو بارە ڕازی نەبوون، برێك ئەنـدامی خێزانەکـە منـەو مـشەی دەروویـەکیان دەکـرد تـا دەسـتکەوتێکی لێهـەلگۆزی، دیـارە بـێ ئـەوەی پێویـست بـەوە بکـات نووکـە گاسـنێك لەزەوی بدەن.

لەگـەڵ زۆربـوونی ژمـارەی وەرزێرەکانـدا، تـا دەهـات کەوشـەنی دەسـتەڵاتی خانەوادەکەش لەو ئاقارەو گوندەکانیدا، بەربڵاوتر دەبوو. گوندی دوگیر کـە عـەباس یەکەمجار لێنیشتەجێبوو، ماڵی سەرگەڤاری لێبوو، بووبـووە پێتـەخت. ئەندامـەکانی دیکـەی خانەوادەکـە، وەك دەسـتەو تـاقمی گـچکە گـچکە، بەسـەر جێگـەکانی دیـدا بڵاوببووبوونەوەو سەرپەرشتیو چـاودێری جووتێرەکانیـان دەکـرد. نـە دەیانخواسـت ئەودەم دەگەڵ سلێمان خۆیداو نە پاشانیش دەگەڵ کوڕە بەرۆگرەکانیـدا تێکیبـدەنو شـەڕو دوژمنایـەتی سازکەن، بۆیـە ملکانـەیان بـۆ خۆیـان گلنەدەدایـەوە. لادێیـەکان دەیـەکی داهاتیـان بـە ڕدێنـسپی، یـاخود موختـاری دێ دەدا، کـە یـا لەلایـەن ئاغـاوە دادەنـرا، یـاخود لادێییـەکان خۆیـان هەڵیاندەبـژارد، ئـەویش خـشت دەیکـردە مـستی ئاغاوە.

پێدەچێت ژمارەیەك لەگوندەکان پەتیان پساندبێتو تەواو لەژێر رکێفدا نەمابن. ئەوەبوو ردێنـسپییانی دەیـەکیان دەسـەند، بـەڵام هیـچیان بـۆ ئاغـا نـەدەنارد، بەڵکـە

سەرپاكیان بۆ مزەختی دیوەخان گلدەدایەوە. ئەو گوندانە تەنها كاتی كێشەو هەڵلا دەگەڵ هزێكی دیدا، (یا پاشان دەگەڵ فەرەنسییەكاندا). كۆمەكیان بەخانەوادەی دووریكان دەكردو پوولیان پێدەدا.

ئەو ئەندامانەی خانەوادەكە كە لەگوندەكانی دی دەژیان، نەك لەدوگیر، وەك پێشتر گوتمان، دەیەكیان دەسەند، بەلام بۆ خۆیان هەڵنەدەگرت. كاتێك شەلال بووە سەرگەفار، هەندێكیان هەوڵیاندا بەجۆرێكی دی خۆیان لە وابەستەیی ئەو قوتار بكەن. ئەویش بە رێككەوتن دەگەڵ ئەو جووتێرە رەش و رووتانەدا كە گاو گاسنیان نەبوو، لەسەر ئەوەی كە ئەمان قاترو گاسن و بنەتۆویان بدەنێ، بەرامبەر بە نیوەی داهاتیان. مەخابن لە گێڕانەوەكانەوە، بۆم بوون نەبووەوە، داخۆ ئەو جووتێرانە سەرباقیی ئەوەش، هێشتا دەیەكیان بەسەركهۆز دەدا یان نا. ئەگەر ئاوهاش بووبێت، مانای وایە ئەو وەرزێرانە زێتر وابەستەی ئاغاكانیان بوون، كە ئامرازەكانی بەرهەمهێنانیان خستوونە بەردەستەوە، وەك لەسەرەكهۆزەكەیان، كە دیارە هیچ خۆشی لەو مامەڵە نوێیە نەهاتووە.

پاشان كێشەو گرفتی زۆر سازا، دیارە نە لەسەر ملكایەتی بوو، چونكە زەوی نرخ و بایەخێكی ئەوتۆی نەبوو، هەتا دڵ ئارەزووكات زۆربوو، نەلەسەر سەركردایەتی بوو، چونكە ئەو دەمە هێشتا كەس لەسەر پلەو پایە، ململانێی دەگەڵ سەرگەفاردا نەدەكرد.

تەنها هەڵپەی ئەندامانی خانەوادەكە بۆ ئەوەبوو، خۆ لەوابەستەیی سەرگەفار قوتاركەن. ئیدی هێدی هێدی گیانی ئالیكاریی نێوان ئاغاكان پووكایەوە. هۆو هۆكاری راستەقینەی، شێوازە نوێكەی بەرهەمهێنان بوو. كێشمە كێش و ململانێی نێو هەناوی خانەوادەكە، تارادەیەك بەربەرەكانێ بوو لەسەر ئەركێكی تا ئەودەم هێشتا كەم، ئەویش كاربوو. چینێكی نوێی وەرزێران هاتبووە كایەوە (یاخود بۆ یەكەمینجار هەستی پێكرا)[96]، زۆربە هەڵپەی ئەوەیان بوو خۆ بكەنە ئاغایان.

سەیر ئەوەیە كە "یاخیبوانی" خانەوادەكە، هەوڵی قلێكردنەوەو گۆڕینی حاڵ و بارە سیاسی و ئابوورییە سەقامگیربووەكەیان نەدەدا، (نەدەیانخواست دەیەك بۆ

خۆیـان هـەڵگرن‌و نـە هـەوڵی لـەفکردنی پایـەی سـلێمانیش وەك سـەرگەڤار، دەدرا)، بەڵکە پێکهاتنێکی تەواو نوێیان داهێنـا. بـەوە لـەبریتی وی هـەر خـۆ بـەدەم شـەپۆلی سیاسەتە دێرینەکەوە بدرێت، گۆڕانکارییەك لەبواری کۆمەڵایـەتی سیاسیدا هێنرایـە کایەوە.

پێشهاتێکی کۆتایی سالآنی بیست، پێشانیدەدات کـە تـا ئەودەمـەش پلـەی سیاسـی سـەرگەڤار دانپێـدانراو و رێـزلێگیراو بـووەو زەویـو زاری هۆزەکـەش وەك هەمیـشە لەژێر رکێفیدا بووە. پێشهاتەکە لە گوندەکەی عەڤدێ دا بوو. سەرپاکی دانیشتووانی ئـەو گونـدە فەلـەبوون، (فەلـەی یـاقووبی یـاخود سـریانی). بـە پێـچەوانەی زۆربـەی نێوچەکانی دیکەی کوردستانەوە، لەکن دووڕیکانییەکان‌و باڵەکانی دیکەی هەڤێرکان، کـەمتر زۆرو سـتەمی ئـابووری‌و سیاسـی لەفەلـەکان دەکـرا. هـەتا لـەزۆر رووەوە وەك ئەنــدامێکی هۆزەکــان تێیانــدەڕوانین. لەگــەڵ ئەوەشــدا پەیوەنــدی نێــوان فەلــەو موسڵمانەکان هەمیشە بـێ کەندو لەند نەبوو. بەتایبەت پاش ئەوەی فەرەنسییەکان فەرمانڕەواییەکیان لەسوریادا دامەزراند، زۆر کێشەو گرفت سازا.

فەلـەکان ئەودەمــە خۆیــان بــەپارێزراو دەزانــی‌و ئامادەنــەبوون چـیدی تــاڵاوی دادۆشین‌و سووکایەتی بە بێدەنگی هەڵلووشن.

هەندەك گونـدی قەڵـەمڕەوی دووڕیکـان، یەکپارچـە فەلـە بـوون. فەرەنـسەییەکان بــێ ئــەوەی هـیچ خـەرامانێك بـدەن، دەسـتیان بەسـەر گونـدێکی دووڕیکانـدا گـرت‌و دایانــــە دەســــت دانیــــشتووەکانی. شــــەلالی ئاغــــای هــــۆز، بــــۆ ئــــەوەی رێگــــە لەدەستبەسەرداگرتنی دیکـە ببەسـتێتەوە، فـەرمانی بەعەڤدێ کـرد، کـە لەگونـدێکی فەلـەی دیکـەی دەژیـا، دەمودەسـت گوندەکـەی بـە دانیـشتووانی بفرۆشـێت، عەڤـدێ دەستبەجێ فەرمانەکەی بەجێهێناو گوندەکەی فرۆشـت‌و گـشت لەگشتی پووڵەکـەی بـۆ شـەلال نـاردو خۆشـی گوندەکـەی جێهێـشت. وا پێدەچێت ئـەو دەمـە زەویـوزار کاڵایەك بووبێت ئاڵ‌و وێڵی پێوەکرابێت، بەڵام هێشتا نەبووبێتە موڵکی تایبەت[٩٧].

دیـارە چـیدی ملکـی تێکـڕای هۆزەکـە نـەمابوو، بەڵکە بووبـووە ملکـی خانـەوادە دەستەڵاتـدارەکەو ئاغای هۆز سەرەوکاریی دەکرد.

سیماو خەسڵەتەکانی سەرکردایەتی هۆز، لەو پەنجا ساڵەی رابووردوودا. گۆڕڕانێکی بەرچاوی بەسەرداهات. تا دووڕیکانییەکان رەوەندەبوون، ئاغا یەکە پیاو بوو لەریزی هاوشانەکانی خۆیدا، شکۆو سەروەریی لەسەر سێ بنکە هەڵچووبوو: لێهاتوویی‌و کارامەیی لەبواری شەڕو لەشکر رێکخستندا، دادوەری، ژیری‌و دانایی، لایەنی کەم ئەوڕۆکە ئاوها تێیدەڕوانرێت. ئەگەرچی ئاغا ساڵانە لەگشت گەورە پیاوانی هۆزەوە مەڕی بەدیاری بۆ دەهات، بەڵام دەرامەتی زۆر لەوان باشتر نەبوو. هەمووجار ئاغا یەکە دەوڵەمەندی هۆزەکەی نەبووە، چونکە ئاغای چاك دەبایە مەڕی چاکیشی سەبڕیبا. لەجزیرە ئەو کاتەی زەویوزارو کێڵەکان برەویان پەیداکرد، ئاژەڵداریی‌و وڵسات لەکەمییاندا، سەروەت‌و سامان بووە پاڵپشتێکی گرنگی پلەو پایەی ئاغا. بەداسەپاندنی فەرمانڕەوایی‌و دادگاکان لەلایەن فەرمەنسییەکانەوە، کە دەسەڵاتی سیاسی ئاغای هەڵپاچی، بەڵام جێگەی نەگرتەوە، ئەو گۆڕانکارییە زووترو خێراتر هاتەدی.

لێرەدا گرنگە بزانین داخۆ بەپێی کامە پێوەر بەرۆگر دیاری دەکرا. گەر تەمەن‌و زنجیرەی لەدایکبوون **پێوانە** بایە، (وەك یاسا کۆچەرێتییەکە دەخوازێت، بەڵام بەکردەوە **هەموو کات نایەتەدی**)، ئەوا دەبا عەباسی دووهەم جێگەی سلێمانی گرتباوە، چونکە بەتەمەنترینیان **بوو. کە پرسیم** بۆ چ شەلال بووە بەرۆگر، بەهیچ جۆر باسی پرنسیپی **تەمەن‌و زنجیرەی لەدایکبوونیان** نەکردو خۆیان لەقەرە نەدا. هۆکاری دیکەیان بۆ رستکردم، **بۆیان روونیانکردەوە** لەبەرچی عەباسیش شایان‌و شایستەی ئەوەبوو میراتگربێت: **گوایە وەك شێخمووسی** برای کەڵەمێرێکی نێودارو ناسراو بوو، لەشەلال قارەمانترو **جوامێرتربوو، بەڵام شەلال** برێك خەسڵەتی دیکەی هەبوو، بۆ نموونە دەستودڵ واڵاترو ژیرو **داناتر بوو. ئەمە** بەڵگەو بیانووی ئەو برایەیان بوو، کە پاش شەلال بووە ئاغا، لەتەك **ئەوانەشدا پێیوابوو** کە **گوایە شەلال** دەیواتی چۆن ژیرانە دەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتدا **هەڵسوکەوت** بکات. **ئەمەش بووبووە** یەکێك لەو خەسڵەتە هەرە گرنگانەی کە **سەرەکهۆزی کارامەو لێهاتوو دەبا** هەیبا.

هەڵبەت تەنها دەستودڵ والآیی نیشانەی ئەوە نییە کە گوایە ئەو کەسە خەسڵەتی سەرکردەیەکی کارامەو بەتوانای تێدایە، ئەوەش لەبەسەرهاتی جوامێری‌و عەگیدیی غالبەوە دەدرەوشێتەوە: "کچەکەیی دایە برازاکەی، بێ ئەوەی شیربایی لێبسێنێت". دیارە ئەمە باشترین ئامرازو شێوازە بۆ دڵنەوایی‌و هێورکردنەوەی ئەو دەستەو تاقمانەی مەترسی رقەبەرایەتی‌و ململانێیان لێدەکرێت[٩٨].

گۆڕرانکارییەکانی دی لەزاری محەمەدی دووهەم خۆیەوە دەبیستین، کە من ماوەیەك میوانی بووم. محەمەد لەماڵی شێخموسی مامیدا گەورەبووبوو، چونکە بابی ساڵی ١٩٢٢، کاتێك فەرەنسییەکان روو لەو کافارە دەکەن، لەجەنگی دژی فەرەنسییەکاندا دەکوژرێت. بەڵام هەرزوو دەگەڵ شێخموسی مامیدا نێوانیان تێکدەچێت، ئەویش لەسەر ئەوەی مامی برێك وەرزێر، بەپێی پێکهاتنەکەی پێشان باسمانکرد، رادەگرێت، محەمەدیش دەخوازێت پشکی لەو داهاتەدا هەبێت. پاشان مامی جێدەهێڵێت‌و دەچێتە دوگری پێتەختی هۆزەکە، کە شەلالی سەرەکهۆزی لێدادەنیشت. کاتێك محەمەد بەپێش چاوی شەلالەوە قاترێك‌و گاسنێك بە جووتێرێکی رووتە دەدات، ئیدی دەردیسەریی بۆ دەسازێت. ناچار دوگر جێدەهێڵێت‌و روو لەجێیەك دەکات‌و لێینیشتەجێدەبێت، کە ساتە رێیەك لەوێوە دوورە. لەوێش خزمانی لێهەڵدەپێچن‌و خەریکن قاویدەن. ئالەو کاتە سەخت‌و ئەستەمەدا، تەنها دەستگیرۆیی یەکەم خەزووری، (کە خاڵی بوو)، لەهەژاری‌و برسێتی دەیخەلەسێنێت. هەتا پیاوەکانی ئەو خاڵەی، خانوویەکیشی بۆ دروستدەکەن. زۆر ناخایانێت شێخموسی مامیشی لەنێزیکیەوە خانوویەك دروستدەکات، (هێجگار نێزیکی، تا ژیانێکی ناسوودە بەسەربەرێت!). بەو جۆرە محەمەد لەلایەن مامەکانییەوە، کە بەچاوی دوژمن تێیاندەڕوانی، گەمارۆ دەدرێت. ماوەیەکی کورت هێوری‌و ئارامی باڵدەکێشێت، ئەویش پاش ئەوەی عالیەی کچی سلێمان مارەدەکات، کە دەیکردە خوشکی شەلال. کەمێك دواتر، کێشەکان هەمدیسان سەرهەڵدەدەنەوە. محەمەد خۆرتێکی تووڕەی کەللەشەقی کینەوەری جیڕبوو، نرخی بۆ هیچ کەسایەتییەك دانەدەنا، هەرگیز کۆڵدانی نەدەزانی‌و ملی نەوی نەدەکرد. هەر بەو جۆرەش

سەرخۆبوونی بەدەستهێنا. پاشان هێدی هێدی دەورو بەریماڵەکەی تەنراو بووە گوندێکی تەواو. تەنها جووتێرە هەژارە رووتەڵەکان، کە ئەو ئامێرو وڵاخی بۆ دابین دەکردن، رووپانتێنەکرد، بەڵکە کۆمەڵێك وەرزێری ئاساییش بارگەو بنەیان لەوێ خست. ئەویش دەیەکی بۆ خۆی لێدەسەندن‌و چکێکی بە ئاغای دوگر نەدەدا. لەگوندەکانی دیکەش گۆڕانکارییەکی لەو بابەتە هاتبوودی، یاخود لەسەرهەڵداندا بوو. حاڵەکە بە رادەیەك گەیشت، کە پاشان غالب تەنها داهاتی دوگرو دوو گوندی دیکەی پێدەبرا.

لەساڵەکانی نێوان ١٩٥٢ و ١٩٥٤دا، سەر لەنوێ تاپۆ دەستپێکرایەوە ئەوەی تازە سەربەخۆ بووبوو، بەپێی یاسا دان بە مافیدا نراو چەسپا. گشت زەویوزاری دەوروبەری گوندەکەی محەمەد، لەسەر منداڵەکانی تاپۆکران. وەك ئاکامێکی دیاردەی میکانیزەکردن، (سەرەتای ساڵانی پەنجا، تراکتۆرو پاشانیش لەکۆتایی ساڵانی پەنجادا، کەمبارین)، پەیوەندیی دەگەڵ وەرزێرە کرێگرتەکانیدا، گۆڕرا.

لەڕاستیدا بۆ رنێوهێنانی کێڵگەکانی، چیدی پێویستی بە وەرزێرەکانی نەمابوو، چونکە دەیتوانی مەکینەیەك بە مەکینەچی شارەزاوە بەکرێ بگرێت‌و گشت ئەرکە پێویستەکانی پێراپەڕێنێت. لێ وەرزێرەکانی پیاوی خۆیبون‌و نەیدەتوانی هەروا سانا پاڵیان پێدەنێت‌و دەستبەرداریان بێت. بۆیە ئیدی نیوەی زەوییەکانی گرتە دەستی خۆیی‌و مەکینەی پێویستی بۆ بەکرێدەگرت‌و خۆی رنێوی دەهێنا، نیوەکەی دیکەشی تارادەیەك بە یەکسانی بەسەر وەرزێرەکاندا دابەشکردو ئەوانیش بۆ بەرهەمهێنانی بەشەکەی خۆیان، هەمان ئەو مەکینانەیان بەکرێدەگرت. محەمەد دەیەکی داهاتی لێدەسەندن. بەڵام ئەودەم بیری لەوەدەکردەوە چۆن بەپێی داب‌و نەریت خۆی لەدەست وەرزێرەکانی قوتارکات. گەر سەرپاکی مڵکەکانی بەسەر منداڵە زۆرەکانیدا دابەشکرێت، هەریەکە هێندەو کەمتریشی لەوە پێدەبرێت کە بەپێی یاسای چارەسەرکردنی کێشەی زەوی، لەشوێنی دی داوای زەوی بکەن.

ئەو گۆڕانکارییە لەبوارێکی دیکەشدا هەستپێدەکرا. دیوەخان، (کە خانوویەکی گەورەی سەربەخۆو جودا بوو لەماڵەکەی محەمەد خۆی)، داخرابوو. ئیدی

لادێییەکانیش زۆر بە دەکمەن روویان لەمالی دەکرد. تەنها ردێنسپییان (کە یەکەمین دانیشتووی گوندەکە)و یەکە گوێڕایەڵی بوون و لەگشت کێشەو پێشهاتێکدا پشتیان دەگرت، زوو زوو دەچوونە سەردانی.

خێراترو زووتر لەبەریەکرەوینەوەی ئەو نێوەندییەی لای دووریکانیان دیتمان، تا ئەندازەیەك لەگن گشت هۆزەکانی ئەو مەڵبەندە هەستپێدەکرا، کە سەرلەبەریان ماوەیەك سەرکردایەتییەکی نێوەندیی تۆکمەیان هەبوو. فەرمانداریو دەستەڵاتی دەوڵەت، پەرەئەستاندنی خێرای ژمارەی ئەندامانی خانەوادە دەستەڵاتدارەکە، دەستوبردیان بەو گەشەیە کردو هەڵتەکاندنەکەیان پێشترخست. ئاشکرایە هیچ لێکدی ترازانێکیش ناگێڕدرێتەوە دۆخی جارانی.

ساڵی ١٩٢٦ کەسایەتییەکی مەزن و ناسراو، کە لەرێگەی تێکگیرکردنی شێوازە "نەریتی" و "نوێ" کانەوە، دەستەڵاتێکی فرەی گرتبووە دەست، پەرپیدەی سوریا بوو، ئەویش حاجۆی دواهەمین سەرەکهۆزی مەزنی هەڤێرکان بوو. لێرەدا بە پێویستی دەزانین بەرکورتێکی مێژووی نوێی ئەو هۆزەو بە تایبەت کەسایەتی حاجۆ، وەك باقە نموونەیەك پێشچاوخەین.

## ٢ـ ١٠ـ ٢ـ کۆنفێدراسیۆنی هەڤێرکان و حاجۆ

هەڤێرکان کۆنفێدراسیۆنێکی فراوانە، (وەك دەڵێن) لەبیستو چوار هۆز پێکهاتووە. برێك لەو هۆزانە موسڵمان و ئەوانی دی ئێزیدین. هەندێکیش فەلەیان تێکەڵە، کە دەگەڵ هۆزەکەدا هاوپەیمانی مێژینەن. هەڤێرکان کاتی خۆی سەر بە میرنشینی بۆتان بوو. تا میرنشینەکە مابوو، ئاسایش باڵیکێشابوو، نە شەڕو ئاژاوە لە نێوان هۆزەکاندا هەبوو، نەشەڕو ئاژاوە لەنێو هۆزەکاندا هەبوو، لەریزەکانی تاقە هۆزێکدا، هەڤێرکانێکان پێکڕا تاقە سەرکردەیەکیان هەبوو، کە وابەستەو گوێڕایەڵی میری بۆتان بوو. کاتێك عوسمانییەکان ساڵی ١٨٤٧ میر یان بەزاندو ئاوارەیانکرد، میرنشینەکە دارماو شەڕەزرتانێی سەرکردەو سەرگەورە، گەلەك لەهۆزەکانی دارزاند.

یەکەمین مەزنانی هەفێرکان خانەوادەی مالا شێخێ بوو، کە لەنێوەکەی زێتر نەماوەو نەناسراوە.

هەرزوو مالا عەلی رەمۆ جێگەیان گرتەوە. عەلی رەمۆ مەزنی تیرەی عارەبیان بوو، کە بە کەڵەمێری، تیرە لەدووی تیرەی خستە ژێر رکێفی خۆیەوە. لێ وەچەکانی، هێدی هێدی شکۆو سەروەرییان لەدەست داو مەزنایەتیشییان بە خانەوادەی مالا عوسمان دۆڕاند، کە سەربە تیرەی عەلیکان بوون. (بڕوانە خشتەی ژمارە ٤).

عوسمان خۆی ماوەیەك بوو مردبوو، کە دەستەڵاتی خانەوادەکەی سنووری خێڵەکەی خۆی بەزاند، حەسەن یەکەم کەس بوو کە دەستەڵاتی خۆیی بەسەر برێك تیرەو تایەفەی هاوسێدا زالکرد. ماوەیەکی دوورو درێژ هەفێرکان بێ سەرکردەیەکی هاوبەش بوو. دەستەڵات لەنێوان مالا عەلی رەمۆو مالا عوسماندا کوتکرابوو. مالا عوسمان، هەتا ئەو دەمەش کە گشت کۆنفوێدراسیۆنەکەیان خستبووە ژێر چنگۆڵەی خۆیانەوە، قەت تەواو لەدەست هەستی پەستی خۆ بەکەمزانین نەخەلەسین. مالا عەلی رەمۆ تا ئەوڕۆکەش هەر شکۆدارو رێزلێگیراون. شایانی گوتنە، کە ئەندامانی مالا عوسمان زێتر بەدەورو خولی مالا عەلی رەمۆ دا دێن، نەك بە پێچەوانەوە[٩٩]. لەشەڕو هەرای نێوان دوو باڵەکەی مالا عوسماندا، برێکجار مالا عەلی رەمۆ دەبنە بەرەڤان.

کوڕەکەی حەسەن کە نێوی حاجۆ بوو، کەوشەنی دەستەڵاتی خۆی بەرینتر کرد، هەرچەندە هێشتا گشت هۆزەکانی هەفێرکانی نەگرتبووەوە. یەکێك لەستراتیژییەکانی، جەنگین بوو بەرامبەر هۆزی دەکشووریی هاوسێی، کە هۆزێکی بێگانەی نەتەوەیو یەکێك لەو هۆزە کەمانە بوو، کە کاتی خۆی نەیدایەپاڵ میرنشینی بۆتانو لایەنگیری نەکرد. ئەمە بووە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لەهەفێرکانییان بدەنەپاڵ حاجۆو لەسایەو پەنایدا یەککەون. وەلێ گێچەڵیشی دەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا بۆ سازاند، چونکە دەکشووری دابەستەو وابەستەی دەوڵەت بوو. ئیدی لەودەمەوە هەفێرکان نێوی بە هۆزێکی یاخی زڕاو هەوڵی تاوانبارکردنو تەمێکردنی دەدرا.

ساڵی ١٨٩٦ حاجۆی دووهەم بەفیتی جەمۆی سەرەکهۆزی دەکشووری بەکوشتچوو. جڵەوی سەرکردایەتی کەوتە دەست عەلیکێ بەتتێو چەلەبییەوە. ئەمەی دواییان سەر بە یەکێك لە لقە خەڵفەکانی خانەوادەکەبوو. پاش شەڕو پێکداهەڵقژانێکی بەردەوام لەنێوخۆدا، توانییان گشت تیرەو خێڵە جوداکانی هۆز بخەنە ژێر رکێفی خانەوادەکەوە. عەلیك کارامەو لێهاتووانە، وەك قارەمانێکی هەڵکەوتووی هۆزەکەی، زێتر لەبیست ساڵی رەبەق وەك پێشمەرگە دژی دەوڵەتی عوسمانی جەنگا. تۆڵەی ئامۆزاکەیی سەندەوەو بەدەستی جەمۆی کوشتەوە. دەگات. بۆ گەیشتن بە ئارمانجی، لەهیچ شتێك نەدەپرینگایەوە. شارەزایەکی چاکی هەڵمەتو هێرشبردن بوو. لەبواری لەشکرکێشیدا، تاکتیکزانێکی کارامە بوو. بە چەند پیاوێکی کەمەوە، لایەنگرانی چەلەبیی تەفرو تووناکرد، بەڵام خۆی لەرووبەڕووبوونەوەو ململانێی راستەوخۆ دەگەڵ چەلەبیدا، دەدزییەوە. سەرەتا کرۆکی لایەنگرانی چەلەبی نەکردە جێنیشانەی شاڵاوی خۆی، بەڵکە دەستی لەوانە وەشاند، کە نیوەو ناچڵو نابەدڵ دووی چەلەبی کەوتبوونو دەیزانی دوورخستنەوەیان ئاسانترە. بۆ نموونە بەهێزێکی تەواو کۆکەوە، پەلاماری یەکێك لەو گوندانەیدا، کە پشتی چەلەبییان دەگرت، بەڵام لەبنکەو بارەگا گرنگەکانی دەستەڵاتییەوە، هێجگار دوور بوو. حاجۆ تەنها کاتێك هێرشی دەبرد، کە تەواو دڵنیابا هێزی پیاوەکانی خۆی لەهێزی بەرگریکەرانی گوندەکە خەملێوترو زاڵترە. پێیوابوو پیاوی ژێر سەرەڕۆیی بێجێ ناکاتو خۆی ناخاتە تالووکەوە، ئەوەی بیەوێت بەرەو ترۆپك بڕوات، نابێت لەتربداتو تلۆربێتەوە. گەلەکجار بە خۆیو دەستەیەك لایەنگری پڕچەکییەوە، دەیدا بەسەر گوندێکداو گشت ماڵاتو ولساتی پێشدەدا. (کە ئەوانەم بیست نەمدەتوانی باوەڕبکەم، پێمراست نەبوو سەرەکهۆزێك ئا بەو شێوەو شێوازە بتوانێت هێزی خۆی بەسەر هۆزی خۆیدا زاڵکات).

جەمیلی کوڕی حاجۆ زۆری لەو کردەوەو هەڵسوکەوتانەی بابی بۆ گێڕامەوە، لێمپرسی: "مەبەستت ئەوەیە هەروا سووكو ئاسان مێگەلەکانیان دەدزی؟" جەمیل دەیزانی کابرایەکی ئەوروپایی ئەو چەشنە کارانە جۆرێکی دی لێکدەداتەوە، بۆیە

دەیگوت: راستە حاجۆ دەستی بەسەر ئەو مێگەلانەدا دەگرت، بەڵام ئەوە بە هیچ جۆر ناکاتە دزی، بەڵکە ئەوە تالانییەو تالانی چشتێکی دییە. دز شەوەکی دەخزێتە ماڵێکەوەو بە پەنهانی دەستدەداتە شتێك، بەڵام پیاوی پیاوانە ئاشکرا بەو کارە هەڵدەستێتو تەشقەڵە بە کەسێك دەکاتو پێشانیدەدات تاقە مەردی مەیدان خۆیەتی.

حاجۆ جەردەیەکی جەربەزەو بە هەڵمەت بوو، چەلەبیش هەموو گوندەکانی پێنەدەپارێزدرا، بۆیە زۆریان لەترسو بێچاریدا، دایانەپاڵ حاجۆ. لەزۆر گوندی دی، بەشێکی خەڵکەکە سەر بە حاجۆ بوونو بەشەکەی دی سەر بە چەلەبی. لەو جۆرە گوندانەدا زۆر شەو دەبووە تەقەو شەڕەتفەنگ لەنێوان هەردوکلادا. ئەوانە زێتر ئەو گوندانە بوون، کە هەر لەوەبەر بە هۆی لایەنگریی جوداوازیانەوە، دوو کوت بووبوون. کێشەو هەرای دێرینەیان، لەڕێگەی شەڕە دەستەڵاتی حاجۆو چەلەبییەوە زیندوو و دەمەزەرد دەکردەوەو دوژمنایەتییەکە وزەیەکی نوێتری تێدەزایەوە[١٠١].

ئیدی هێدی هێدی ژمارەی ئەوانەی حاجۆیان بە مەزنو سەرکردەی هەڤێرکان دەزانی، لەزۆربوونداوون. ساڵی ١٩٢٥ زۆربە پشتگیریی ئەوی دەکرد. بە پێچەوانەی ئەو دابە دێرینەی لای هۆزەکان باوەو پەیڕەویی لێدەکرێت، حاجۆ بۆ پتەوکردنو داسەپاندنی شکۆو مەزنایەتیو کەسایەتی، سەرەتا لەبنەماڵەکەی خۆیەوە تێهەڵنەچوو، ئەوجا پەلهاوێت بۆ پلەو ئەڵقە باڵاترەکان، بەڵکە سەرومڕ لەنێو گشت خێڵو تیرەکاندا بەتێکڕایی، چوستو چالاك بوو. بەردەوام لەگشت لاوە کوتی گچکە هەبوون دەیاندایەپاڵیو بڕێکی دیکەش چاویان لێدەکردنو بەدوویان دەکەوتن. هەوڵێدەدا ئەو دەستەوتاقمە گچکە دوورەدەستانەش کە دوژمنایەتییان لەنێواندا بوو، لایەکیان بەلای خۆیدا راکێشێت. زۆر زووتر لەوەی بتوانێت دەستەڵاتی خۆی بەسەر تەواوی کۆنفێدراسیۆنەکەدا بەسەپێنێت "کە قەت بۆی نەلوا"، کەوتە گێژاوو داوی سیاسەتێکی ئەستەمترەوە. لەهەوڵو تەقەلای ئەوەدا بوو بەرەیەکی یەکگرتووی نەتەوەیی کورد دابمەزرێنێت، دیارە بە رێبەرایەتیو سەرکردایەتی خۆی.

سالی ۱۹۲۵ کلپەی شۆڕشێکی نەتەوەیی کورد بە پێشەوایەتی شێخ سەعید هەڵایسا. بەپلەی یەکەم هۆزەکانی ژوورووی خۆرهەڵاتی دیاربەکر هەڵگیرسێنەری بوون. حکومەتی تورك هەوڵیدا دەهۆو تەڵەکەبازییە دێرینەکەی بخاتەوە گەڕو هۆزەکانی دی بەگژ شۆڕشگێڕەکاندا بکات. لەو هۆزانەی فەرمانیان پێکرا بەرەو دیاربەکر بەڕێکەونو بەشداری لەهەوڵی تێکشکاندنی یاخیبووەکاندا بکەن، هەڤێرکانەکان بوون، سالی ۱۹۲۱، سالو نیوێك پاش کوشتنی عەلیك، هۆزێکی سەرکوتکراو بوو، وا ئێستا دەبێتە هۆزێکی گوێڕایەڵ. بۆ ئەوەی تووشی بەربەرەکانێی بێجێی حوکومەت نەیەن، حاجۆ ناچارانە فەرمانی بەجێهێناو دەگەڵ پیاوەکانیدا بەرەو دیاربەکر جما. وەلێ هەوڵیاندا دوورەپەرێز بوەستنو دەگەڵ شۆڕشگێڕەکاندا رووبەڕوو نەبنەوە. کاتێك ئۆردووی تورك بنکەی سەرکردایەتی شۆڕشەکەی خاپوور کردو زەبری کوشندەی لێوەشاند، هەڤێرکانەکان بەر لەوەی بهێڵن پەڵەی خیانەت لەکوردیان پێوەبلکێت، خۆیان کێشایەوە.

هەڵبەت حاجۆ چارەی دیکەی هەبوو، دەیتوانی بداتە پاڵ شۆڕشگێڕەکان، (کە دوور نییە پێشتر ئاگاداری نیازیشیان نەبووبێت، هەتا پێدەچێت داوای بەشداریشی لێکرابێت). بەڵام دیارە شۆڕشێك، خەڵکێکی دی نەخشەیان کێشابێتو ڕێبەریی بکەن، ئاهو ئارەزووی ئەو دانامرکێنێتەوە، رەنگە لەباشترین حاڵەتدا ئەو کایەی دووهەمی پێبڕابا. پێموایە ئەمە هۆی ئەوەبوو کە پەنای بۆ چاوەڕوانی برد.

تا ساڵێك پاشتر هەلو دەرفەت بۆ خۆی هەڵکەوت، لەنێوەڕاستی مارتی ۱۹۲٦ دا، پیاوەکانی دایان بەسەر قشڵەی پۆلیسو هێزی سەرسنووردا، گشت کاربەدەستانی حکومەتیان دەرپەڕاند، هانای کۆمەكو پشتگیریان بۆ گشت هۆزەکانی دەوروبەر برد، هەتا بۆ ئەوانەی ئەو ئاقارانەش، کە ئیدی بە عێراقو سوریا نێودەبران.

راپەڕینەکە زۆر خراپ رێکخرابوو، هەتا ئەوڕۆکەش روون نییە هۆی ئەو هەڵەشەییە چیبوو. رەنگە بەو هۆیەوە بووبێت کە نێوچەکە کەوتبووە بەر گورزی کینەو تۆڵەی تورکەوە. دوورنییە نەخشەی هوردتریش لەئارادا نەبووبێت، بەڵام بەهۆی چەوتیو نالەبارییەوە کەڵکی خستنە گەڕی نەبووبێت، چونکە بەردەوام

لەکوتەکانی دیکەی کوردستانی نێوەنددا، لەیەك کاتدا چەندین راپەڕینو شۆڕشی گچکە، لەگڕو کڵپەدا بوون. جگە لەچەند هۆزێکی هاوسێی، کە پێشتریش هەر لایەنگری خۆی بوونو تاکە تاکەی جەنگاوەرانی هۆزەکانی دی، ئیدی بانگەوازی حاجۆ بۆ هەژاندنی هەستی نیشتمانپەروەریی کورد، بێ زایەڵە مایەوەو کەس بەهانایەوە نەچوو. یەکێك لەو جەنگاوەرانەی سەر بەهۆزێکی دی بوو و دەمودەست دایەپاڵی، مەهدی برای شێخ سەعید بوو، پاشانیش ناچار بوو بۆ عیراق هەڵبێت. دەنا زۆربەی سەرەکهۆزەکان سڵیان لەوەدەکردەوە هەڵوێستی خۆیان ئاشکراکەن. حاجۆ دە رۆژی رەبەق، تەواوی نێوچەکەی خستە ژێر رکێفی خۆیەوە، ئەوجا ئۆردووی تورك ناچاری پاشەکشەیانکردو بەدیوی سوریادا ئاوایانکرد. ئەو کاتە هێشتا دەستەڵاتی فەرەنسییەکان لەسەرووی خۆرهەڵاتی سوریادا، کەڵو کەچ بوو، بۆیە حاجۆو لایەنگرەکانی دەیانتوانی بێ دەردی سەرو تەگەرە، ئەمدیوو ئەودیوبکەنو لەهەردووسەرەوە، سنوور ببەزێنن. لەوێ هۆزی طی عارەب، داڵدەی حاجۆیدا. ماوەیەك بەیاخێتی مایەوەو دەگەڵ دەستەو تاقمی گچکەدا، بەشێوەی چەتەگەرییانە شاڵاویان دەبردو پەلاماری پاسەوانانی تورکیان دەدا، تا فەرەنسییەکان بەریان پێگرتو رێگەیان لێبەستەوە.

بەگشتی فەرەنسییەکان وەك سەرەکهۆزێکی مەزن لەحاجۆیان دەڕوانیو رێزیان لێدەگرت. بەڵام ئاغا کوردەکان کەمتر دڵیان پێدەکرایەوە، چونکە زۆر دەستەڵاتدارو لەدوژمنایەتیدا بێئامان بوو. توانای بەهرەی دیپلۆماسییانەی هەرزوو لای فەرەنسییەکان شیرینی کردو کرایە دەمڕاستی گشت هۆزە کوردەکان. جێپێبوونەوەو قسەڕۆیشتنی لای فەرەنسییەکان پەنای پێبردەوە بۆ شێوازو ئامرازە کۆنەکەی، تا دەستەو تاقمە نوێکان بخاتە ژێر دەستەڵاتو رکێفی خۆیەوە. ئەو وەك ئاغاکانی دی نیشتەجێ نەبوو و مل دەبەر وەرزێری نێت. ئەو قەت جووتێر نەبوو، بەڵکە جەنگاوەرو سیاسەتباز بوو. بەئالیکاریی فەرەنسییەکان باژێری تربێ سپی بۆ خۆی دروستکرد. کاتێك هەڵوەدای جزیرە بوو، خاوەنی هیچ نەبوو. ئەو زەوییەی تربێ سپی لەسەر بنیاتنا، ئاغاکانی دووریکان پێیان بەخشیبوو. گوندەکان هەرگیز

دەیەکیان نەدابوویە، هەر بە گەیشتنی، بڕێکیان ـ با بە نابەدڵییش بووبێت ـ کەوتنە ناردنی.موختارەکان پێیانوابوو، ژیرانەتر ئەوەیە بەردەوام شتێك بدەیت، نەك بەردەوام تووشی گێچەڵو شاڵاوی پیاوەکانی حاجۆ ببیتو رەنگە زیانێکی زێتریش ئاکامەکەی بێت. ئاغا تێکبەربووەکانی دووریکانی شەڕو کێشەی خۆیان بیرچووەوەو پشتیان نا بە پشتی یەکدییەوە، لەترسی ئەوەی نەبا حاجۆ بەزوویی ببێتە مەزنو سەرداری گشت ئاقارەکە، ئیدی ئەوان هیچیان بۆ نامێنێتەوە تا لەسەری بەشەڕبێن. حاجۆیان وەك هەمیشە بەرەفتار بەدییو دزی (یاخود تالانیی) لەڕادەبەدەر تاوانبار دەکرد. بەڵام پێدەچێت بەر لەهەرشتێك قسە رۆیشتنو رێزو شکۆی لای فەرەنسییەکان، ئۆقرەی لێبڕیبن. بۆ نموونە هەرکات فەرەنسییەکان کرێکاریان پێوستبا، حاجۆ یان رادەسپارد مشووریان بۆ بخوات. مزی کرێکارەکانیشیان بەو دەسپارد. بەو هۆیەوە خەڵکێکی رەمەکی زۆر، سەریان تێدەکرد. بۆ پتەوکردنی جێپێو زەمینەی سیاسی خۆی، لەتەك کرداره ئاساییەکانی وەکی (دوژمنایەتیو هێرشو شاڵاو و پەیوەندی چاك دەگەڵ دەوڵەتدا)، پەنای بۆ ئامرازێکی دیکەش دەبرد، تا مەودای دەستەڵاتی بەرینترکات، ئەویش ئەوەبوو وەك کوردێکی نیشتمانپەروەری راستەقینە رەفتاری دەکرد. یەکێك بوو لەئەندامە درەوشاوەو دیارەکانی خۆیبوون، کە نەخشەدانەری شۆڕشی ئاراراتی ۱۹۲۹/ ۱۹۳۰ بوو. کاتێك لەشکری تورکان هێرشی بردە سەر کوردە راپەڕیوەکانو تا مەودایەکی ترسناك لەنێوچەی ئاراراتدا چووە پێش، حاجۆ لەقوڵی خوارووی خۆرهەڵاتی تورکیاوە، کەوتە پەلامارو شاڵاوبردن، تا ئۆردووی تورك سەرقاڵو خەریککات. ئا بەو هۆیانەوە حاجۆ بووە بەهێزترینو دەستەڵاتدارترین سەرەکهۆزی کورد، لەنێوچەیەکی هێجگار بەرفراواندا. بەر لەوەی گۆڕانکارییە ئابووریو سیاسییەکان بتوانن پلەو پایەی رامالنو نێوی بسرنەوە، حاجۆ مرد، بەڵام لەبیرو یادگاری خەڵکەکەدا، وەك دواهەمین سەرەکهۆزی مەزنی نێوچەکە، بە نەمریی مایەوە.

پێکهاتی سیاسی هەفێرکان لەو ڕووەوە گرنگە، کەقەت تەواو سەقامگیر نەبوو، دەزگەیەکی سەرکردایەتی نێوەندیی نەبوو. دەستەڵات لەنێو خێڵو تیرەکانی خواری

خواردوه (یاخود لەنێو خانەوادەكانیاندا) ئەم دەستو ئەو دەستی دەكرد. لەئاكامدا هەردووك پاڵێوراوەكانی ئامادەی سەركردایەتی، سەر بەیەك خانەوادە بوون. گەر گۆڕرانكارییەكان هەربەو شێوازە بەردەوامبان، دوور نەبوو ماڵا عوسمان وەكی جاف نەبنە بنەماڵەیەكی بەگزادە. سەیر ئەوەیە پلەو پایەی ماڵا عەلی رەمۆ، لەگەڵ كەمیو بێ بڕشتیو بێ شكۆیەكی سیاسی كاریگەری نەوتۆدا، (دیارە جگە لەزاڵیی دەستەلاتیان بەسەر تیرە داكشاوترەكەی عارەبیانی خۆیاندا)، كەچی لەماڵا عوسمان زێتر رێزیان لێدەگیراو لەوان لەبەرچاوتر بوون.

## ٢ـ ١١ـ مسكێنە ناخێڵەكییەكانو پەیوەندییان دەگەڵ كوردە خێڵەكییەكاندا

لەبەشەكانی پێشووتردا نێوی بڕێك دەستەو تاقممان هێنا، چ كوردو چ رەگەزی دی، كە سەر بە هیچ خێڵێك نەبوون، بەلام پێبەندو وابەستەی تەونی سیستەمی فیۆدالانەی كوردە خێڵەكییەكان بوون. بەشێوەیەكی گشتیی كوردە ناخێڵەكییەكان، خاوەنی زەوی خۆیان نیین، بەڵكە وردەكرێگرتە، یاخود كرێكاری كشتوكاڵیی بێ زەوین. وەك لەزاراوەی ناخێڵەكییەوە دەدرەوشێتەوە، مانای وایە بەشێك نیین لەتەوەری شیرازە رێكخراوەكەی هیچ هۆزێكدا. دیارە بێجگە لەو بنەماڵانەی كە رەچەڵەكێكی كەمتر قووڵیان هەیەو كێشێكی سیاسی نەوتۆیان نییەو شیرازەی پێكهاتی كۆمەلایەتییان لەسەر بنەمای خزمایەتی هەڵنەچووەو هیچ سیمایەكی دەرپێتێكەڵیو ژنو ژنخوازییەكی بەرتەسك، كە تەنها لەسەر ئاستی ئەڵقەكانی بنەماڵەكە سازكرابێت، بەدەر ناكەوێت.

كاتێك ئەندامی هۆزەكان، جوداوازییەكانی نێوان كوردی خێڵەكیو ناخێڵەكی پەنجەژمێردەكەن، خۆ لەقەرەی ئەو ئاكارە نادەن. دیارە مەسەلەكە لەكن ئەوانو لەتێڕوانینی ئەوانەوە، دوو توێژییە: ئاغاو خزمەتكار، دەستەلاتدارو ژێردەستە هەن. خێڵەكییەكان لەشەڕكەرو جەنگاوەرن، بەلام كاری گرانیان پێناكرێت. ناخێڵەكییەكان لەشەڕدا بێكەڵكو تەپۆن، كەواتە ئاساییە گەر ئاغاكانیان

دایاندۆشـــن و بـــەری رەنجیـــان بخـــۆن. ناخێڵەکییـــەکان دەزگەیـــەکی چـــالاکی بەرهەمهێنەرن، چ جوداوازییەکی ئەوتۆیان دەگەڵ مێگەلەمەڕێکدا نییـە. لەڕاسـتیدا " مێگەلە مەڕ" یەکێك لەواتا سەرەکییەکانی رەعییەتە (عارەبییەکەی رعایا)یە، کـە تا ئێستاش چ لەکوردستان و چ لەنێوچەکانی دیکەی خۆرهەڵاتی نێوەندا بۆ نێونانی ئەو دەستەو تاقمانە بەکاردەبرێت. گەلەك لەو ئەوروپاییانەی لەسەدەی نۆزدەهەمدا چوونەتە کوردسـتان، باسـی ئـەو جوداوازییـەیان کـردووە، بـەڵام لەگێڕرانـەوەکانی ئەواندا، لێکهەڵبواردنەکە هێجگـار زەق و زۆپـتر دەنوێنێـت، وەك لـەوەی مـن بـۆ خـۆم دیتم. رەنگە زێدەڕەوی لەمەسەلەکەدا کرابێت، چونکە زۆربەی جار چاوساغەکانیان کەسانی سەر بە هۆزەکان بوون، کە بە هێزو توانای خۆیان خاپاون.

هەڵبەت ئەوە راستە کە گۆڕڕانکارییەکانی بواری باری کۆمەڵایەتی و ئـابووری ئـەم نیوسـەدەیەی رابـورد، جوداوازییـەکانی نێـوان ئـەو دوو توێـژەی سـڕیوەتەوە. سیمای ئەو دیاردەیە ئەوەبوو، کە خێڵەکییەکان شوانی کۆچەر، یاخود شـوانی نیوەکۆچـەر و جووتێر بـوون، لـەڕووی ئـابووری و سیاسـییەوە لارەمـل و ژێردەسـتەی خێڵەکییـەکان بوون. لـێ ئێستا زۆربەی خێڵەکییەکان نیشتەجێبوون و ملیان دەبەر وەرزێری نـاوە، ململانێـی چـینایەتی چ لـەکن ئـەوان و چ لـەکن ناخێڵەکییـەکان وەك یـەك هـەن و ئاشکران، بۆیە ئەوڕۆ چیدی جوداوازییەکە بەو زەقی و تۆقلەییەی جاران نەماوە.

مـن بـۆ دەمەتەقـێ لـەوبارەوە، زێـتر پـشت بـە هەواڵـە تۆمارکراوەکـانی سـەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم دەبەستم.

### ٢ـ ١١ـ ١ـ دادۆشینی وەرزێرەکان لەلایەن خێڵەکییەکانەوە

جـۆری پەیوەنـدیی نێـوان خێڵـەکی و ناخێڵەکییـەکان و رادەی دادۆشـین و شـێوازی داچکاندنیان، لەکاتێکـەوە بۆکـاتێکی دی و لەشـوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکی دی دەگۆڕێت. لەنێوچـەکانی پـەرڤاری و هـەکاری (لەکوردسـتانی تورکیـا)، دیـتم تـا ئـەوڕۆش گیادروونەوە بۆ ئالفی زستانەی مێگەلەکانی ئاغا، ئـەرکی وەرزێـرە ناخێڵەکییەکانـە، لـێ لـەوەزێتر ئـەرکی دیکـەیان بەسـەردا نادرێـت. لەنێوچـەکانی شـاتاق و نـۆردوز

(کــەمێك ژووررووی هــەکاری)، وەرزێــرە ناخێڵەکییــەکان زۆربــەی هــەرەزۆری دانیشتووانی مەڵبەندەکە پێکدەهێنن. کەسیان خـاوەنی زەوی خۆیـان نـیینو دەبێت پشکێکی زۆری داهاتیان بە ئاغای هۆزی گیراقی بدەن(١٠٢).

Barth دەگێڕێتـەوە کە هۆزی هەمەوەنـد (لەخوارووی کوردستـان)، (تـەنها) ١٠٪، یـاخود ٢٠٪ی دەغـڵو دانو سـێیەکی داهـاتی زەوییــە بــەراوەکانیان، لــەوەرزێرە ناخێڵەکییــەکان دەســتاند. هەڵبــەت لــەجووتێرە خێڵەکییــەکانیش هــەر هێنــدە دەســتێندراو لــەو رووەوە هــیچ جوداوازییــان نــەبوو. وەلــێ تاقــە جوداوازییــەك لەئارادابوو، چ لەگن هەمەوەندەکانو چ لـەگن دزەییـەکان، مـسکێنەکان بـەو زەویـەوە بەندبوون، کە کاریان تێدا دەکرد. ئەوانیش وەك زەوییەکان مڵکی ئاغـای هۆزبـوونو هەروا بە سانایی نەیاندەتوانی ئاغاکەیان جێبهێڵنو بچنە کن ئاغایەکی دی(١٠٢).

هــەتا ئــەورۆش، ســەرەڕای ئــەو هەنگاوانــەش کــە عــیراق بــۆ بەربەســتکردنی دەســتەڵاتی دەرەبەگــەکان هــەڵیناوە، ئاغاکــانی دزەیــی بــەر بــە گــشت بــزووتنو جموجۆڵێکی ئازادانەی مسکێنەکانیان دەگرن.

لەکۆنـدا وەرزێـرە ناخێڵەکییـەکان تێکڕا کۆیلـەی تـەواوبوون. Taylor لەسـاڵانی شێستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، دەبینێت وەرزێـرە فەلـەکانی مەڵبەنـدی بۆتـان کـە زێرکڕییان پێگوتوون، دەگەڵ ئەو زەوییەی کاریان تێداکردووە، کڕراونو فرۆشـراون. (Taylor، ١٩٨٥، ل ٥١). چلو پێنـج ساڵ دواتـر Rich ی هاونیـشتمانی Taylor (کە مـیرێکــی دەســتەڵاتداری بابــان داوەتــی دەکــات)، دەچــێتە نێوچــەی ســلێمانی، لەیاداشـتەکانیدا دەنووسێت: "کابرایـەکی خێڵەکی بـێ پـەردە پێـی لـەوە نـا، کـەوا هەستدەکەن گوایـە مـسکێنەکان تـەنها بـۆ خزمـەتکاریی ئـەوان خوڵقـاون، لەراسـتیدا باری ژیانی ئەو جووتێرە کوردانە، هێجگار دەردناکە.......".

(Rich، ١٩٣٦، ل ٨٩). Rich مـسکێنەکان دەگـەڵ قولەڕەشـە کۆیلـەکانی خۆرئـاوای هنـددا بـەراورد دەکـات، جوداوازییـەکی ئـەوتۆ بـەدیناکات. ئاغایـەکی دی بـۆ Rich دەگێڕێتـەوە: "هەرچـیم دەکـەوێت لێیاندەسـتێنم، زەکـات، یـاخود دەیـەکی داهـات،

ئـەوجا هێنـدەو زیـتریـشیان، بـە هـەر بـڕو بیـانوو و ڕێگەیـەك بـۆم دەسـتبدات، لێدمردەكێشم". (Rich ، ١٩٣٦، ل ٩٦).

### ٢ـ ١١ـ ٢ـ جوداوازیی رەگەزایەتی

برێك لەمسكێنە ناخێڵەكییەكان، بەرەگەز لەئاغاكانیان جوداوازن. بەتایبەت ئەوە بە نیسبەت ومرزێرە فەلەكانـەوە زۆر روونو ئاشكرایە، چونكە تێكڕا بـە زمـانێكی دی دەپەیڤنو كولتووریكی جوداوازیان هەیە. بەڵام خـۆ گشت فەلـەكان ژێردەسـتەی كورد نـەبوون، (یـاخود گـشتیان مـسكێنی كوردە خێڵەكییـەكان نـەبوون)، هەشبوون بۆخۆیـان لەمەڵبەنـدو نێوچـەی سـەربەخۆی خۆیانـدا دەژیـان، هـەتا لەكوردسـتانی نێوەنددا جووتێری كورد هەبوون، مسكێنی نەستۆرییەكان بوون.

لــێ زۆربـەی فەلـەكان لـەڕووی سیاسـییەوە، ژێردەسـتەی ئاغـا كوردەكـان بـوونو لـەرووی ئابووریـیـەوە دادەدۆشـران. بنەچـەو رەچـەڵەكی دەسـتەو تاقمـە فەلـەكانی كوردستانو پەیوەندییان بەكوردەوە، لەزۆر رووەوە روون نییەو هێشتا لەلێڵاییدایـە. ئـەو بـاوەڕە گـشتییەی گەشـتەوەرە ئەوروپاییـەكانی سـەدەی نۆزدەهـەم، كـە گوایـە فەلـەكان وەچـەی دانیـشتووانی راسـتەقینەی ئـەو مەڵبەنـدەنو كوردەكـان نـەوەی دانیـشتووە داگیركـەرە نوێكـەن، رەنگـە لەهەنـدەك رووەوە راسـتبێت، بـەڵام هـیچ پاساوێكی بۆ پەیوەندییە مێژووییە ئاڵۆزەكەی ئەو دووڕەگەزە، لێهەڵناكرێندرێت.

نموونەیەكی گونجاو بۆ ئەو گریمانەیە، "هەرچەندە رەنگە زێتر حاڵەتێكی تایبەت بێـت"، پەیوەندییـەكانی كـوردو ئەرمەنییـەكانی نیـشتەجێی نێوچـە گردۆڵكـەكانی ئەرمینیایە[١٠٤]:

لەبنەڕەتـدا ئـەو بەرزاییانـە بەنێزیكـە تـەنها ئەرمـەنی لێـدەژیان، كـە زۆربـەیان جـووتێر بـوون. پـاش شـەڕی چـاڵدیرانی ١٥١٤، كۆمـەڵێكی زۆر لـەكوردە رەوەنـدە ئاژەڵدارەكان نێردرانە ئەوێ، تا ببنە پاساوڵی سەر سنووری ئێران. لەنێوان جووتێرە ئەرمەنییـەكانو كوردە رەوەندەكانـدا، پەیوەندییـەكی دۆستانەی سـەیر پەیـدا بـوو. كەشو هـەوای ئـەو تـەپۆڵكانـە لەزسـتانانـدا هێجگـار سـاردە، (زۆر كـات ٢٥ پلـە لـەژێر

سفردومیه). دانیشتووه ئەرمەنییەکانی، جۆرە خانوویەکیان داهێنابوو، کە نیوەی. یاخود هەمووی ژێر زەمین بوو، دیارە ئەمە بۆ ئەو کەشە ساردەی ئەوێ، چاك دەگونجا. کوردەکان مەکۆی زستانەی لەوبابەتەیان نەبوو، "هەر لەخێوەتدا دەژیان" چونکە ئەرکیان پاسکردنی سنوور بوو، ڕێگەشیان نەدەدان بۆ نزمایییە گەرمەکانی خواروو و خوارووی خۆرئاوا داکشێن. ناچار لەزستاندا پەنایان بۆ لای ئەرمەنییەکان دەبردو لەماڵەکانیاندا دەژیانو هەر لەوێش پشتێریان بۆ ئاژەڵەکانیان دروستکردبوو و مێگەلەکانیان تێدا مۆڵدەدا. ئەرمەنییەکان بژێوی خۆیانو ئالفی ئاژەڵەکانیان بۆ دابیندەکردن. لەبری وی، کوردەکان بەروبوومی سروشتی (یانی بەروبوومی ئاژەڵەکانیان) دەدانێ، هەڵبەت هەر هێندەی سەوداگەرێکی زەبردار بە پێویستو ڕەوای بزانێت. لەسەدەی نۆزدەهەمدا، بەتینو تاوی جەنگی نێوان رووسو تورك، پێوەندییەکانی نێوان کوردو ئەرمەن شێواو تێکچوو، کوردەکان کەوتنە چەوساندنەوەی زێتری ئەرمەن. بە دامەزراندنی سوارەی چەکداری حەمیدی لەنێو کوردەکاندا، لەلایەن سوڵتان عەبدولحەمیدەوە، ئیدی یەکجارەکی دەستی کورد بۆ تالانو بڕۆو دزیو راو و رووتو هەتا کوشتنیش، بەرهەڵداکرا. زۆر ئەرمەن بۆ قەوقاز هەڵهاتن، زۆر زێتر لەوانەش لەڕەشکوژییە یەك لەدووی یەکدییەکاندا تێداچوون. کوردەکان دەستیان بەسەر مڵكو ماڵیاندا گرتو لەجێگەیان نیشتەجێبوون.

دیارە تەنها دەستڕۆیشتنو زاڵیی دەستەلاتی کورد بەسەر فەلەکاندا سیمای سەرەکی نییە، بەڵکە شەقڵی جۆرە سیستمێکی دوو توێییش لەزۆربەی کوتەکانی کوردستاندا، لەنێو کوردەکان خۆیاندا، دەدیترێت. وەرزێرە ژێردەستە ناخێڵەکییەکان چەندین جۆر نێویان هەیە. لەکوردستانی ژێروو، زاراوەی "مسکێن" زۆر باو و بەربلاوە، (بۆ نموونە لەکن هەمەوەندو دزەییو جاف)ەکان. زۆر کۆنتر "گۆران" باو بوو، وەك چۆن تا ئەوڕۆش لەبەشی زۆر نێوچەکانی کوردستانی ئێراندا هەر باوەو هێشتا هەر بەکاردەهێنرێت. لەکوردستانی ژووروو زێتر "کرمانج" یان پێدەگوترێت. لەتەك ئەوانەشدا، لەسەرتاسەری کوردستاندا، "رەعییەت"یش وەك

زاراوەیەکی هاو واتایان، رەواجی زۆرە. کە لەوشەی کۆی "رعایا"وە وەرگیراوەو ئەمە زێتر داهێنراوی فەرمانڕەوایانی عوسمانی بوو.

هەڵبەت گشت لەگشتی کوردە ناخێڵەکییەکان، ژێر دەستەی خێڵەکیو ئاغاکانیان نەبوون. لەنێوچە بەپیتو بەر بەرهەڵداکانی وەکی دەشتاییەکانی دیاربەکرو هەولێردا، لەو شوێنانەی کە دەوڵەت دەیتوانی دەستەلاتی تا ڕادەیەك ئاسانتر بسەپێنێت، لەتەك جووتێراندا، سوپاو فەرمانبەرانی دەوڵەتو بازرگانانی شارنشینیش خاوەن زەویو زارن.

لەبارەی رەچەڵەکی ئەو کوردە ناخێڵەکییانەوە، دوو گریمانە هەن:

١ـ ئەمانە ئەو کوردانەن، کە هەستی خێلایەتییان لەنێوچووە. رەنگە بابو باپیرانیان نیشتەجێبووبنو ملیان دەبەر جووتێری نابێت، ئیدی هێدی هێدی شیرازەی رێکخراوە خێڵەکییەکەیان پساوەو توانا جەنگاوەرییەکەی رەوەندە ئاژەڵدارەکانیان لەدەستداوەو پاشان لەلایەن هۆزێکی دییەوە ژێردەستخراون. دووریش نییە یەکەمجار ژێر دەستە نەکرابنو ئەوجا لەلایەن هۆزی سەرکەوتووەوە ناچاری وەرزێری نەکرابن. یاخود دەشێت لەبنچینەدا خۆیان سەر بەهەمان هۆزی سەردەستە بووبن، بەلام پاشان هەژاریو نەداری ناچاری ئەوەی کردبن نیشتەنی ببن[(١٠٥)].

٢ـ ئەمانە ئەوەی چەند رەگەزێکی دیکەی جوداواز لەکوردن، کە لەکورد دێرینترنو دانیشتووی رەسەنی ئەو نێوچەیەن. کولتوری ئەوڕۆی کورد بە گشت گونجاویو شیاوییەکییەوە، بەرهەمو ئاکامی تێنو تاو و تێکەڵیو ئاوێتەبوونی (لایەنی کەم) دوو کولتوری بنجیی جوداوازە.

هەرچەندە گریمانەی یەکەم پەسەندتر دەنوێنێت، بەلام دووهەمیان بەردەوام لەلایەن گەڕاڵو توێژەرەوەکانەوە دووبارەکراوەتەوەو پێشنیازکراوە، کە دواهەمینجار لەگوتارەکەی ساڵی (١٩٥٩)ی Rudolph دا بوو. من پێموایە بەلگەی تەواو بۆ ئەوە بەدەستەوەیە، کە برێك نموونە، هەندێك لەبیانووەکانی گریمانەی بۆ دەشێت، بۆ هەندێك حاڵەتیشبیانووەکانی گریمانەی دووهەم پەسەندترن. بەهەرحاڵ پێدەچێت

پێداچوونەوەو دارشتنەوەیەکی نوێ پێویست بێت. ئەگەرچی راستە بە بەڵگە سەلماوە لەهەندەك جێ وەرزێرە ناخێڵەکییەکان، لەرەگەزێکی دیکەی جودا لەرەگەزی خێڵەکییەکانن، بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە لەجێگەکانی دیکەش هەر دەبێت ئاوها بێت. Rudolph بۆ تاقە حاڵەتێك پەنا بۆ سەرئەنجامێکی بەرابەریی لەو بابەتە دەبات، هەرچەندە بەبڕوای من بە هەڵەداچووە. لەگەشتو گەرانەکەی کوردستانی نێوەندیدا، هەست بە جوداوازیی کولتووریی نێوان نیوەکۆچەرەکانو وەرزێرە نیشتەنییەکان دەکات. هەوڵدەدات ئەو جوداوازییە لەرێگەی دیاردەیەکی خوارووی کوردستانەوە، روونکاتەوە، ئەویش بەو بیانووەی وەك دەرکەوتووە، عەشیرەتو گۆران رەچەڵەکیان جوداوازە.

پاشان سەبارەت بە کوردستانی نێوەند گریمانەیەکی چڕ دادەرێژێت، کە دەگەڵ گریمانەکەی دووهەممانـدا وێکدەچن، هەرچەندە ئەو جوداوازییە کولتوورییە هەستپێکراوەی ئەو دەیکاتە بەڵگە، زۆر سادەو رەوان بۆ هۆکارەکانی ژینگەو دەوروبەر دەگەرێتەوە، یاخود ئاکامێکی تینو تاوی ئەو رەگەزە جوداوازانەی دییە کە لەو ئاقارەدا دەژیان، یا هێشتا هەر دەژین (وەکی ئەرمەنییەکانو فەلە نەستۆرییەکان). ئەم رەخنەو سەرنجانە لەگوتارەکەی Hutteroth یشدا (١٩٦١ ل ٤٠ ـ ٤١) هەڵشێلراون.

لەچەند حاڵەتێکی سەلمێندراودا، رەوەندەکان بەسەر کۆمەڵگە وەرزێرییەکاندا زاڵبوونو بەتۆبزی سەریان پێنەویکردوون. حاڵە تایبەتەکەی ئەرمەنییەکانی نێوچە گردەلانییەکان، کە پێشان باسمانکرد، یەکێکە لەوانە. لەوەش روونتر، بەسەر هاتی هەمەوەندەکانە. ئەو هۆزە لەسەردەمانێکدا لەو مەڵبەندەی ئێستایان، لەنێوان سلێمانیو کەرکوکدا، گیرسانەوە، کە ئەوروپاییەکان زوو زوو رێیانتێدەکەوت. Barth ساڵی ١٩٥٠ بیرەوەری زۆر تاڵی داگیرکردنی گوندی وەرزێرەکانمان بۆ تۆماردەکات (١٩٥٣، ل ٥٣ ـ ٥٥)، لێ هەمەوەند هۆزێکی ئاسایی نەبوو، چونکە زێتر لەسەر تالانیو برۆو جەردەیی دەژیان، نەك بە ئاژەڵداری[١٠٦].

نموونەیەکی دیکەی داگیرکاری، پشدەرییەکانن. دیارە دەبێت ئەوەش بگوترێت، کە لەریزی خێڵەکییە زاڵو سەرکەوتووەکاندا، گەلەکجار کوردی ناخێڵەکیشیان تێدا بوون. سێهەم نمۆونە لەو ڕووەوە گرنگو سەرنجڕاکێشە، کە هاوچەشنی نموونەی "پێکەوە هەلکردن"ەکەی کوردو ئەرمەنی، لەبەراییدا باسکراوە. Firat (١٩٧٥) دەگێڕێتەوە چۆن هۆزەکەی (هۆزی خرمەك کە وەرزێری نیشتەجێی نێوچەی ڤارتۆی خوار ئەرزڕوومن) لەلایەن هۆزی رەوەندی جبرانەوە ژێردەستخراوە. ئیدی لەودەمەوە جبرانەکان زستانیان لەگوندەکانی خۆرمەك بەسەر دەبردو هەتا ناچاریشیان دەکردن. پشتێر بۆ وڵاتیان دروستبکەن. هەرچەندە خۆرمەك بە هۆز نێودەبرێت، بەڵام کایەو پایەیان لەکن هۆزی جبران، دەیانخزێنێتە ئاستی وەرزێرە ناخێڵەکییەکانەوە.

شایانی گوتنە کە خۆرمەك عەلەویو جبران موسڵمانی سونین. لەسەروەختی ئیمپراتۆرێتی عوسمانیدا گومانی لایەنگیری ئێران لەعەلەوییەکان دەکراو ئەمە پاساو و بیانوویەکی رەوا و ئاسانبوو بۆ جەزرەبەدانو سەرکوتکردنیان.

داخۆ وەرزێرە ناخێڵەکییە بەیدەستکراوەکانو هۆزە زاڵە سەردەستەکانیان، بەڕەگەز لێکجوداوان یان نا، پرسیارێکە پاشان وەرامی دەدەینەوە. هەڵبەت کولتووری لێکجوداوازی ئەوڕۆی هەردوك توێژەکە، نابێتە بەلگە، چونکە دوورنییە هۆکاری دی بەو دەردەی نەبردبن. بۆ ئەوە پێویستمان بە بەلگەی زیندووی بێلایەن هەیە، بەلگە دەربارەی جوداوازییە رەگەزییە بنجییەکان، (دیارە دەبێت لایەنە زمانەوانییە جوداوازەکانیش تێبخوێنینەوەو فەرامۆشیان نەکەین). لایەنی کەم سەبارەت بەگۆران لەکوردستانی ژێروودا، ئەو بەلگەیە بەدەستەوەیە، چ شتێك جووتێرە ناخێڵەکییەکان دەگەڵ دەستەیەکی هۆز ئاساییدا پێکڕا کۆدەکاتەوە، کە هەمان نێویان هەیەو (کۆنفێدراسیۆنی گۆران) یان پێدەڵێن. لەبەشی داهاتوودا هەوڵدەدەم ئەو حاڵەتە بەتێرو تەسەلی روونکەمەوە، چونکە ئەو حاڵەتە پەیوەندییە ئاڵۆزەکانی نێوان رەوەندو جووتێرەکانو گۆڕانی تخووبی رەگەزایەتیو تواندنەوەی دەستەو تاقمە میللیە جوداوازەکان لەنێو یەکدیدا بەڕوونی دەردەخات. من بەنیاز

نیم هیچ سەرەتایەکی پێویست دەربارەی ئەو هەموو شتە زانراوانە، کە لەبارەی گۆران و ئەو هۆزە یەککەوتەیەوە، کە هەمان نێوی هەیە، بکوتمەوە. بەرکورتی لەو بابەتە، کەسانی دی پێشچاویان خستووە(١٠٧)، بۆیە من تەنها بەهێندەی کە بۆ ئێستا گرنگ و بایەخدارە، قنیات دەکەم.

## ٢ـ ١٢ـ گۆران و (*گۆران*)

هێندەی من پێبزانم، Rich یەکەمین ئەوروپایی بووە، کە سەرنجی بۆ ئەو راستییە راکێشاوە، گوایە جووتێرانی نێوچەی سلێمانی، خۆی گوتەنی: "خەڵکانێکن تەواو تەواو لەخێڵەکییەکان جوداواز، بەدەگمەن زەوییەکانیان رەنێو دەهێنن، ئەگەر هەر رەنێوی بیهێنن. قەتیش نابنە سەرباز" (Rich ، ١٨٣٦، ل ٨٨). ئەو جووتێرانەی بەگۆران ناسراون، "بەشێوەو روخسارو جۆری زاریاندا، جودا دەکرێتەوە"، (هەمان سەرچاوە ل ٨١). ئەم سەرنجەی دوایی پێویستی بە روونکردنەوەیەکە: ئێستا جووتێرە ناخێڵەکییەکانی ئەو نێوچەیە، کە تا ئێستاش هەر بە گۆران یاخود زێتر بە مسکێن ناسراون، ئیدی کەم و زۆر بەهەمان زاراوی هۆزەکانی ئەوێ دەدوێن. کێوەکانی داڵەهو، کە دەکەوێتە خوارووی خۆرهەڵاتی سلێمانییەوەو هێند لێیەوە دوورنییە، مەڵبەندی کۆمەڵە هۆزێکی یەککەوتەیە، کە هەمان نێوی (*گۆران*) یان هەیەو بەزمانێکی جودا لە کوردییە بیستراوەکە دەپەیڤن. پێدەچێت ئەو زمانە کە (*گۆرانی*) پێدەگوترێت، بەپێچەوانەی زمانە کوردییە راستەقینەکەوە، کە سەر بەلقی خوارووی زمانە ئێرانییەکانە، ئەم سەر بە لقی سەرووی خۆرئاوای زمانە ئێرانییەکان بێت، هەروەك زاراوی زازا یاخود (دملی) لەژووررووی کوردستان(١٠٨).

شارەزا ئەوروپاییەکانی ئەو بوارە، زۆرجار هۆشیارییانداوە، جووتێرە ناخێڵکیەکانمان دەگەڵ ئەو کۆنفێدراسیۆنەدا لێنەئاڵۆزێت کە هەمان نێوی هەیە، (بۆیە من یەکەم پیتی ئەوەی دواییان بە پیتی گەورە دەنووسم)*.

---

* من بۆ تێکەڵ نەبوونیان، ئەوەی دواییان بەتیپی خوار دەنووسم و لەکەوانەیەکی گۆشەداردا دایدەنێم.

تێبینیو بۆچوونەکانی Rich دەربارەی زمانی جووتێرەکان، وا دەردەخات کە ئەو کەوتۆتە گێژاوی ئەو سەرلێشێوانو ئالۆزییەوە، یاخود ئەوەی لەبارەی زمانی (*گۆرانی*)یەوە زانیویەتی، بەبالای گۆرانیشی بڕیوە، لەو بڕواو بۆچوونەوە کە مادام نێویان یەکە، دەبێت لەڕووی زمانیشەوە یەك بنەچەی چوونیەکیان هەبێت. هەڵبەت Rich زمانەوانێکی چاك بوو، فارسییەکی باشیشی دەزانی، ئەو کاتەی لەسلێمانی بوو، کوردیش فێربوو. دواتر کاتێك چووە سنە، دیتی لەماڵی والی ئەودەمەی میرنشینی ئەردەڵاندا، میرزادەکانو دەستەودایەرەو دەستوپێوەندی والی، لەنێوخۆیاندا بە کوردییە ئاساییەکە نادوێن، بەڵکە بەیەکێك لەزاراوەکانی (*گۆرانی*) دەئاخێون. وەك لەمێوانانی پاشتری دەبیستین، لەکۆشكو سەرای ئەردەڵانییەکاندا، زمانی دڵنەوایکردنو زمانی وێژەیی، هەورامی بووە، کە لەڕاستیدا زاراوەیەکی (*گۆران*) یە[۱۰۹]. ئەو سەرنجە هوردە، بەشی هێندە دەکات، کە بۆچوونەکەی Rich دەربارەی زاراوەی جوداوازی جۆتێرەکانی نێوچەی سلێمانی، بە بایەخەوە تێبڕوانین. لەو لیستەی زاراوە (*گۆرانی*)یانەدا، کە Soane (۱۹۱۲، ل ۳۸۲) ڕێکیخستووە، نێوی شارەزوور دەهێنێت. شارەزوور نێوی نێوچەیەکە، کە یەکەوڕاست کەوتۆتە باشووری سلێمانییەوە. حوکمڕانیی عوسمانی ئەو نێوی شارەزوورەی بۆ مەڵبەندێکی هێجگار بەربەرینتر بەکاردەبرد، کە نێوچەکانی سلێمانیو کەرکووکی دەگرتەوە. بەوپێیە بێت، دەبێت لەکۆندا لەنێوچەی سلێمانی، ئاخێوەرانی یەکێك لەشێوەکانی (*گۆرانی*) هەبووبن، کەواتە پێدەچێت ڕەوابێت بڕێك لەگۆرانەکان بگێڕینەوە سەر ئەو بنەچەیە. ئەوە یەکەمینجار نییە، کە گۆران ئەو زمانە بنچینەییەی لەدەستداوە. لەسنەش زمانی هەورامی تەواو سەری تێداچوو. هەتا لەکن (*گۆران*)ەکان خۆشیان بڕێك دەستەو تاقمی کەم ماون، کە بە (*گۆرانی*) دەدوێن، زۆریان شێوەی بەبرەوی کوردیی کرماشانی فێربوون. پێدەچێت زاراوە کوردییەکانی باشوور، (*گۆرانی*) هێجگار کاری تێکردبنو تینو تاوی زۆربێت لەسەریان. Mackenzie (۱۹٦۱) هۆی ئەو جوداوازییە فراوانەی نێوان زاراوەکانی باکوورو باشووری کوردستان، دەگێڕێتەوە بۆ ئەو تینو تاوە.

واپێدەچێت Rich تەواو دڵنیا نەبووبێت داخۆ گۆران بە کورد یاخود بەیەکێك لەڕەگەزە لێکجوداکانی دابنێت. چەڵێك بە کوردیان لەقەڵەم دەدات و زمانەکەشیان بەزاراوەیەکی کوردی حسێب دەکات، (کە سەبارەت بە ئاخاوتنی کوردی، چ بۆ سەردەمەکەی ئەو چ بۆ ئێستای ئێمە، دەشێت ڕاستبێت)، هەڵێکیش ڕەوەندەکان بە "کوردی ڕاستەقینە" و گۆران بە "وەرزێر ڕەگەز" نێودەبات.

هەروەك وشەکانی گۆران و (*گۆران*) گوزارە لەدوو کۆمەڵی جوداوازدەکەن. کە ناکرێت خۆسەری تێکەڵ و پێکەڵ بکرێن، وشەی کوردیش بە چەند واتایەك بەکاردەبرێت. ئەوروپاییەکان وەکی نێوێکی گشتی بۆ ڕەگەزێکی دیاریکراو، یاخود بۆ گوزارە لەزمانێکی تایبەت بەکاریان هێناوە، لەوباوەڕەوە کە خۆرهەڵاتییەکانیش ئاوها بێ ئەمسەرو ئەوسەر، بەهەمان مەبەست بەکاری دەهێنن. بەڵام دیارە بەهەڵەدا چوون. جوگرافیاناسە عارەبەکانی سەدەکانی نێوەڕاست، وشەی کورد کە کۆکەی (اکراد)ە، بۆ نێونانی گشت ئەو هۆزە کۆچەر و نیوەکۆچەرانەی کە نەعارەب و نەتورك بوون، بەکاردەهێنا. ئەوە برێك هۆزیشی دەگرتەوە، کە ئەوڕۆ هەتا نەتەوەپەرستە توندڕەوەکانی کوردیش، لەڕیزی نەتەوەی کورددا دایان نانێن. جار هەبوو ڕەوەندی عارەبی زمانیش بەئەکراد نێودەبران، (وەکی برێك هۆزی دەوروبەری خۆزستان)[110]. پێدەچێت هەر پاشەڕۆکەی ئەو زمانڕاهاتنە، پاشخانی ئەو بۆچوونەی Richیش بێت، کە ڕەوەندەکان بە کوردی ڕاستەقینە نێودەبات. من لەگۆرانییەکی ئاینیی ئەهلی هەقەکانەوە، کە لەداڵەهو تۆمارم کردووە، بۆم ڕوونبووەوە، کە نێوی کورد ئا بەو واتایەی، خشت بەرامبەر (*گۆران*) دادەنێن[111]. ئەو پیرەمێردەی گۆرانییەکەم لێبیست، خۆشی (*گۆران*) بوو، واتای ئەو نێوانەی ئاوها بۆ ڕوونکردمەوە: "کورد دەوارنشین و ڕەوەندە، گۆران نیشتەجێ و گوندنشینە". لەبوارێکی دیکەدا، هەمان پیاو، نێوی کوردی بەرینتر بەکارهێنا، وەکی نێو بۆ ڕەگەزێك، یاخود (بۆ زمانێك) و (*گۆران*)یشی بەکورد حسێبکرد.

برێکجار واژەی کورد تەنها بۆ گوزارە لەزمانێك بەکاردەهێندرێت، بێ ئەوەی ڕەگەزایەتییەکە تێبخوێندرێتەوەو بێ ئەوەی بیر بەلای ئەوەدا بچێت، کە

خاوەنـەكانی جـۆرە یەكێتییـەك پێكـدەهێنن[112]. بـەتینو تـاوی ئـەو دەیـان سـاڵە رابـوردووەی بزووتنـەوەی نەتەوایـەتی كـورد، ئێـستا بـەكارهێنانی ئابـەو واتایـە، دەگمەنە. زۆربەی كورد ئەو نێوە وەك نیشانەو هێما بۆ رەگەزێك یاخود نەتەوەیەك تێدەگـەن. مـەیلو ئارەزوویـەكی زۆریـش هەیـە، واتـای ئەورۆكـەی ئـەو وشـەیە، بـۆ رابوردووش باپێبدرێتەوە.

دانیـشتووانی هـەورامان، كـە تـا ئـەورۆش هـەر بەیـەكێك لـەزاراوەكانی (*گـۆرانی*) دەدوێـن، (ئەوانـەی Rich بەشـێوەو روخـسار "وەرزێـر رەگـەز" یـان نێودەنێـت)، تـا سەرەتای ئەم سەدەیەش، خۆیان بە گـەلێكی جوداواز لـەكورد دەزانـی. گـەر بـە پێـی بنەچـەی نەریتەكـەیان بێـت، دەبێـت لەدەڤـەرێكی باشـووری خۆرئـاوای دەریـای قەزوێنەوە هاتبن[113]. ئیدی هێدی هێدی هەستی كوردانـەیان لـەكن رسكاوە. تادێـت، پەیوەنـدییان بـەكوردەوە چـڕترو خەسـتتر دەبێـت، تێكـەڵاوی ژنو ژنخـوازی لەنێوانیاندا روو لەزۆرییە، زۆر هەورامی لەشۆڕشی نیشتمانیی كورددا بەشداربوون. وێـرای ئـەوەش، جـوداوازیی كولتووریـان هێـشتا هـەر زۆر زەقو ئاشـكرایە بـە بەراوردكردن دەگەڵ هۆزەكانی دیكەی كورددا، كۆمەڵگەی هـەورامی خـۆی لەخۆیـدا، هەر زۆر كەنارگیرو دابڕاوو داخراوە.

ئەوەبوو بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەكەی بارزانی، تا دواهەمینجاریش لەساڵانی ۱۹۷٤ / ۱۹۷٥دا، بارەگای سەرەكیی ئەو هەرێمەی لەهـەورامان بـوو، كەچـی هـەر بـۆی نـەلوا لەنێو دانیشتوانیدا تەواو جێپێی خۆی بكاتەوەو پشتیوانییان مسۆگەر بكات.

وەنەبێت ئەو دوو واتاییەی لـەواژەكانی كـوردو گـۆران دەوەشـێنەوە، بـەو هۆیـەوە شـوێنپێ هـەلگرتنو دۆزینـەوەی داوی پرۆسێـسی دەسـتەلاتدارێتیو ئاوێتـەبوونو تواندنەوەكـە سـەختو دژواركـەن، كـە هـیچ بەڵگەنامـەو سـەنەدی مێـژوویی لەبەردەسـتاندا نـەبن، "نـەخێر، بەڵگەنامـە هێجگـار زۆرن"، بەڵكـە زێـتر بـەو هۆیەوەیـە، كـە سادەترین گریمانـە، دەتوانرێـت بـە چـەندین بەڵگەنامـە بەرپـەرچ بدرێتەوەو پووچكرێتەوە.

بــەلای Richەوە مەســەلەكە زۆر ســادەو ڕەوان بــوو، لەنێوچــەی ســلێمانی خێڵەكییەكان كەمینـەبوون، (گۆران چوار پێنج هێنـدەی ئـەوان بـوون)[١١٤]، كـەمێك ژووروو‌تر ژمارەیان زێدی دەكرد، زۆر سەروو‌تر، لەنێوچەی ڕەواندزیش، پێانگوتبوو گوایە كەسی وەرزێر ڕەگەزی لێنییە[١١٥].

Rich ئەو سەرنجانەی دەگەڵ ئەو زانیارییە ئاوێتەكردووە، كە خانـەوادەی مـیرە بابانەكانی سلێمانی، لەبنەڕەتدا خـەڵكی ژوورووتـرن‌و لەپـشدەرەوە هـاتوون. لـەوەوە ئـەو سـەرئەنجامەی پوختــەكردووە، كــە گوایــە نێوچــە شــاخاوییەكانی نێوەنــدی كوردستان، زێدی ڕاستەقینەی ئەو كوردە ڕەسەنانەیە، كە لەبنەچەوە خێڵەكیین، (با ئێـستا نیـشتەجێش بـووبن). ئــەوجا كوردەكــان لــەوێوە بـەرەوخوار داكـشاون‌و زەویـوزاری دانیـشتووە گۆرانـە ناخێڵەكییـەكانیان زەوتكـردووە. Rich پێیوابـووە كـە میرنشینی بابان بۆ دابینكردنی ژیـانی، منـەتباری ئـەو داگیركردنەیـە. پاشان زەوی‌و زارە ژێردەســتخراوەكان بەســەر كەســوكاری میرەكانــدا دابەشــكراون‌و ئــەوانیش لەبەرامبــەری ئــەوەدا، ســەرەكهۆزەكەیان وەك ســەردارو ســەرورەری خۆیــان پەســەندكردووە. ئــا بــەوە سیــستمێكی فیــۆدالی هاتۆتەكایــەوەو گۆرانــە ژێــر دەستكراوەكانیش كراوەنەتە كۆیلە.

Rich هـەقی بـووە وا تێبگـات، كـە ئـەو بـارە كۆمەڵایەتییـەی ئـەو لـە كوردسـتانی ژێــروو دیتوویــە، لەســەر بنــەمای ئاوێتــەبوونی (لایــەنی كــەم) دوو كۆمــەڵی ڕەگەزجوداواز هەڵچووە. بەڵام بیرو هزری مەسەلە دوو تاییەكە، كە گوایـە لەلایـەك كۆچەرەكان‌و لەلاكەی دی وەرزێرەكان بوون، بۆچوونێكی ناپەسـەندو سـاكار ئـامێزە. چ زانـستی زمـان‌و چ سەرچـاوە دێـرین نووسـراوەكان، وادەردەخـەن (*گـۆرانی*)، زمـانی گـەلێك بـووە، كـە لەبنـچینەدا دانیـشتووی دەڤـەرێكی خـوار دەریـای قـەزوێن بـووەو پەیوەندی دەگەڵ دەیامییەكاندا هەبووە، یاخود بەشێكی داكشاوتری ئەوان بووە[١١٦].

لەسـەدەی چـواردەهەم بـەدواوە، نیـدی جوگرافیاناسـەكان باسـی گـەلێك بـەنێوی (*گۆران*)ەوە، لەباشووری كوردسـتانی ئەورۆكـەدا، دەكـەن. ژمارەیـەكی زۆر بەڵگەنامـە هەن، كە زمانی (*گۆرانی*) ئـەورۆ ، بەدیلەمییـەكان‌و دەوروبـەری دەریـای قەزوینـەوە

دەبەستنەوە. لێ ئەمە مانای ئەوە نییە ئیدی هەرچی (*گۆرانی*) زمان هەبوون، یان هەن، وەچەی ئەو رەوکردووانەن، یاخود ئەو توێژە کۆمەڵایەتییە دوو توێییە، سادەو ساکار، ئاکامی ژێردەستخستنی ئەو (*گۆران*) نەیە لەلایەن هۆزە کوردەکانەوە. ئەو بۆچوونەی کە گوایە شیرازەیەکی خێڵەکییان نەبووە، پەیوەندی بەوەوە نییەو ناتوانرێت بسەلمێدرێت.

بەلای Richەوە واژەی گۆران (بێ هیچ تیفتیفەدانێك) بەواتای ژێردەستە، ناخێڵەکی، وەرزێر دێت. کوردە خێڵەکییەکانی سلێمانی لەگەڵ ئەو بۆچوونەیدا بوون. کاتێك Rich کلکەسووتەی بۆ میرەکانی بابان کردووەو گوتوویە: گوایە بیستوویە میری ئەردەڵانی هاوسێیان کابرایەکی گۆرانە، خانەخوێکانی بسکەیان هاتۆتێو سەری رەزامەندییان بۆ لەقاندووەو گووتوویانە راستە، بەڵام میر لەبنەماڵەیەکی هێجگار دێرینو شکۆدارەو تیزپێکردنی جوان نییە.

میرەکانی ئەردەڵان (کە ئەستەم بووە بتوانرێت بە "وەرزێری ژێردەستخراو" نێوببرێن)، گۆران بوونو بە زاراوی (*گۆرانی*) پەیڤیون. وەك Rich دواتر دەگێرێتەوە، گەورە پیاوانی کۆشكو سەرای سنەش هەرگۆران بوون، (Rich، ١٨٣٦، I، ل ٢٠١)، ئەو سەربازانەی Rich لەسنە دیتوونی، کورد نەبوون، (هەر وەك سلێمانی، کە چۆن گوایە گۆرانەکان کەڵکی شەڕیان پێوە نەبووە)، بەڵکە هەورامی، بە روخسار درو چەتوونی، "رەگەز وەرزێر"ی پەی پێنەبردوو بوون. بێگومان گۆرانەکانی ئەردەڵان لەرووی کۆمەڵایەتییەوە، بەپێچەوانەی مەڵبەندی بابانەوە، ژێر چەپۆکەی خێڵەکییە کوردەکان نەبوون. سەرگوزەشتە نێودارەکەی گەورە پیاوانیشیان (کە هەر دەبێت لەرەچەڵەکێکی بێگانە کەوتبنەوە، وەك لەکن گەلەك هۆزو میرنشینی کورد باو بووە، خەڵکانێکی دی نووسیویانە، نەك خۆیان[١١٧]. وا پێدەچێت لەسەرەوەختی Richدا بابانەکان بەلووتبەرزیو فیزەوە لەخانەدانانی ئەردەڵانیان روانیبێت، بابانێك کە لەسەدەی شازدەهەمدا کوتێك بوو لە ئەردەڵانو سەرانەی پێدەدا[١١٨].
دیارە لەئەردەڵان گۆرانی زۆر، وەرزێر بوون، بەڵام گەلەك هەورامی جەنگاوەری (*گۆرانی*) زمانیش هەبوونو رەنگە زۆر جۆری دیکەش.

نموونەیەکی گرنگی دی، کۆنفێدراسیۆنی هۆزە (*گۆران*)ەکانە. مەزنو سەردارانی کە تاوەکو سەرەتای سەدەی بیستەمیش دەستەڵاتێکی سیاسی تەواویان هەبوو، لەچینە نیشتەجێکە بوون. بەپێچەوانەوە، برێك کوتە هۆزی ئەو یەکێتییە، کوردی تەواو بوون، لەڕووی زمانو ئاینیشەوە جوداوازبوون لەئەهلی هەقە (*گۆرانی*) زمانەکان، کە پشکی سەرەکیی ئەو کۆنفێدراسیۆنەیان پێکدەهێنا.

سێهەم نموونەی سەرەنجراکێش، میرنشینە گچکەکەی برادۆستە لە کوردستانی نێوەند. ئەو مەزنەماڵەی لەسەدەی شازدەهەمدا هۆزە کوردەکانی خستبووە ژێر رکێفی خۆیەوە، بەپێی گێڕرانەوەی شەرەفنامە بێت، لەڕەچەڵەکدا (*گۆران*) بووە[119].

ئابەو جۆرە وەك دیتمان، لەچەندین حاڵەتدا هۆزە کوردەکان ژێردەستەی دەستەڵاتدارانی (*گۆران*) بوون، پێشهاتێکە هاتنەکایەی ئەستەم دەبوو، ئەگەر (*گۆران*)ەکان گشتیان تەنها وەرزێر بانایە. لەڕاستیدا بەڵگەی ئەوە بەدەستەوەیە، کە لەکۆندا (*گۆران*)ەکان شیرازەیەکی کۆمەڵایەتی دووتوێییان هەبووە، هەر وەك چۆن پاشان لەکوردستانی باشوور دیتراوە: تاقمێکی سوپایی خێڵەکییانە رێکخراو وتوێژێك وەرزێری ناخێڵەکی ژێردەستکراو.

a ـ بەپێی گوتەی ئەو هەورامیانەی (سەر بە خانەوادە دەستەڵاتدارەکان بوون)و من پرسیارم لێکردن، رێکخراوەیەکی لەو بابەتە هەتا ئێستاش لەهەوراماندا هەر بەرقەرارە. بەزمانی هەورامی نێوی سێ هۆزیان بۆ ژماردم: حەسەن سوڵتانیو مستەفا سوڵتانیو بارام بەگی، کە لەسێ بەرەبابی جوداوازی، برای یەکدی کەوتوونەوە. بەگشت ئەندامانی ئەو هۆزانە "خەوانین" دەڵێن: (کە لەسەر کێشی کۆی تێکشکاوی عارەبیی وشەی "خان"، بەواتای "مەزن" داڕێژراوە). هەریەکە چەند پارچە زەوییەکی (گچکەڵە)یان هەیەو کۆمەڵێك وەرزێری رووتەی بێ زەوییان لەبەردەستدایە (کە لێرە "رەعییەت"یان پێدەڵێن). هەورامییەکان بێ هیچ گومانو چەندو چوونێك (*گۆران*)ن: لەڕووی زمانو شێوەو روخسارو کولتوورەوە، لەکورد جوداوازنو دەچنەوە سەر (*گۆران*)[120]. هەورامی لای کورد نێوی بە

تێکۆشەری و کۆڵنەدەری و قارەمانێتی ڕۆیشتووە. ئەمە پێچەوانەی ئەو کەم بایەخییەیە، کە کوردەکان بە گۆرانە وەرزێرەکانی شارەزووری دەدەن.

b ـ زانای میسر شەهابەدین ئەلعومەری، لەنووسینێکی ساڵی ١٣٤٢یدا سەبارەت بەکورد، سەرەتا باسی (*گۆران*) دەکات و دەڵێت: "لەکێوەکانی هەمەدان و شارەزوور گەلێکی کورد بە نێوی (*گۆران*)ەوە هەیە (الکورانیە)، کە گەلێکی بەهێزو جەنگاوەرن و خەڵکەکەی لەسەرباز و وەرزێر پێکهاتوون، (الجندو الرعایا)[١٣١]".

ئەم سەرنجەی کۆتاییان، بیر بۆلای سیستمێکی دوو توێیی بەکێش دەکات.

c ـ بۆچوونی شەرەفنامە لەبارەی (*گۆران*)ەوە روون نییە، بایەخێکی کەمی پێدەدات، برێکجار دوو واتاییش زاڵە، رەنگە بەهۆی سەر لێشێوان و لێتێکچوون و تێکەپێکەڵکردنە باوەکەی نێوان هۆزەکان و میرنشینەکانەوە بێت. بەلام هەر کات باسی (*گۆران*) دەکات، یا بەهۆز، یاخود بە هۆزەکان نێوی دەبات، ئەویش لەرێگەی واژەکانی تایەفە و عەشیرەتەوە. شەرەفخان لە پێشەکییەکەیدا دەنووسێت: هۆزەکانی کورد (تەوائیفی کورد) دەکرێنە چوار دەستەوە: کرمانج، لور، کەلهور و (*گۆران*)[١٣٢]، کە لەرووی زمانەوانییەوە راستە. سەیر ئەوەیە (*گۆران*) دەگەڵ هۆزەکاندا رستدەکات و دەیخاتە ئاستی سێ دەستەکەی دییەوە، کە ئاستی هۆزی تەواوە.

d ـ کۆنفێدراسیۆنی (*گۆران*) پڕمەتەڵۆکەترین دەستەو تاقمە. لەکن ئەوان خەڵکە نیشتەجێکە ژێر چەپۆکەی هۆزە رەوەندەکانی کۆنفێدراسیۆنەکە نیین، مەزن و سەردارانی کۆنفێدراسیۆنەکە، گردەبڕ کورد بوون، بۆ نموونە هەردوو لقەکەی جاف کەلەسەدەی نۆزدەهەمدا خۆیان لەهۆزەکەیان داپچڕاندو چوونە ژێرسایەی (*گۆران*)ەوە[١٣٣]. ئەوانە هێشتا هەر بە موسڵمانێتی مانەوە، لەکاتێکدا هۆزەکانی دی و ناخێڵەکییەکانیش سەر بە ئاینی ئەهلی هەقن. قەڵخانییە رەوەندەکان کە یەکێکن لەهۆزە مەزنەکان، هەر بە (*گۆرانی*) دەدوێن. هۆزی نیشتەجێی تفەنگچی و برێک

لەنیشتەجێ ناخێڵەکییەکانی دیکەی (گۆران)، لەپێناوی یەکێك لەزاراوەکانی کوردیدا، کە لەکرماشانی دەچێت، دەستبەرداری زاراوی (گۆرانی) بوون.

بنەچەی (گۆران)ە رەوەندەکان لەتارماییدایە. رەنگە هۆزێکی کورد بووبن‌و پاشان چووبنە ژێر چەپۆکی (گۆران)ەوە، تا دەستیان بە نوالە زۆرو زەوەندەکانی قەڵەمرەوی (گۆران)دا بگات، (وەك چۆن دواتر جافەکانیش هەر ئاوهایان کرد)، پاشان هێدی هێدی زمان‌و ئاینەکەیان لەبۆتەی ئەواندا تواوەتەوە. یاخود دەشێت لەریشەوە (گۆران)ی "رەسەن" بووبن. ئەمە دەبێتە پاڵپشتێکی دی بۆ ئەو باوەڕەی کە لەبنەچەدا پشکێك لە (گۆران) هۆزئاسایی رێکخرابوو.

ئەو راستییەی کە قەڵخانییەکان هەر بە سەرزارەکی ئەهلی هەقن[١٣٤]، دەشێت بەلای شیمانەی یەکەمدا دایبشکێنێتەوە، بەڵام دەبێت ئەوەش بڵێین، کە رەوەندە موسڵمانەکانیش، تەنها بەسەرزارەکی موسڵمانن‌و زۆر خۆ لەداب‌و نەریتە ئاینییەکان ناگەیەنن. قەڵخانییەکان شێوەگۆرانییەکی ئاواز دیارو ناسراویان هەیە، کە لەئاوازی هەورامی دەچێت، بەڵام دەگەڵ گۆرانی‌و ئاوازی هۆزە کوردەکانی دیدا کەمتر وێکچوونیان هەیە. ئەو شەقڵ‌و خەسڵەتە کولتووریانە زێتر لە (گۆران)ەکانیان نێزیك دەخاتەوە، وەك لەکوردەکان.

تا سەرەتای ئەم سەدەیەش، لقە رەوەندەکانی کۆنفێدراسیۆنی (گۆران) لەورۆ زێتر بوون، بەژمارە هێندەی باڵە نیشتەجێکەی دەبوون[١٣٥]. کەواتە دەشێت بەرلەوە، ژمارەی بەشە رەوەندەکە هێجگار زۆرتر بووبێت، یانی زاڵیی باری دێمۆگرافیی رەوەندەکان، بەر بەو بۆچوونە دەگرێت، کە ئەوانە کوردی گۆرانرێوڕاوبن. ئا بەو چەشنە، من پێموایە ئەوە نیشانەو پتشگیرییەکی دیکەیە بۆ ئەو لێکدانەوەیەی، کە بنەچەی (گۆران) دەستەو تاقمی خێڵەکی رەوەند بوون[١٣٦].

### ٢ـ ١٢ـ ١ـ پێوەندیی نێوان گۆران‌و (گۆران)

لەو هەڵشێلانانەی لەمەوبەرەوە، پشتبەستوو بە سەرچاوە چاپکراوەکان، دەتوانین مێژووی (گۆران) ئاوها پوختەکەین: لایەنی کەم لەسەدەی چواردەهەم بەدواوە،

لەباشووری کوردستاندا میللەتێك دەژی، کە لەباکووری نێوەندی ئێرانەوە بۆ ئەوێ ڕەویکردووە، زمانەکەی سەر بە لقی باکووری خۆرئاوای زمانە ئێرانییەکان بووە، میللەتەکەش نێوی (*گۆران*) بووە. لەڕووی زمانو کولتوورو شێوەو ڕوخسارەوە، لەکورد جوداواز بوون. لەکن ئەو میللەتەش، لەپاڵ وەرزێرەکاندا، لێرەو لەوێ، کۆمەڵێك خێڵەکی هەبوون کە توێژێکی دەستەڵاتدارو هێزێکی سوپاییان پێکدەهێنا. بەڵام ئەوەی روون نییە، ئەوەیە داخۆ ئاژەڵداره رەوەندەکانیش سەر بە کۆمەڵە خێڵەکییەکە بوون یان نا. پێدەچێت ئەو (*گۆران*)ە چیانشینانە دەگەڵ کوردەکاندا هێند وێکچوونیان هەبووبێت، کە نەك تەنها مێژوونووسی کورد شەرەفخانی بەتلیسی، بەڵکە مێژوونووسی میسرییش ئەلعومەری، بەکوردیان حسێب بکات. لەدەمە دەمی کۆتایی سەردەمی مەغۆلەکاندا، کابرایەکی بێگانە پێیان، کوردێك (؟) بەنێوی بابە ئەردەڵانەوە[١٣٧]، دەیانخاتە ژێر فەرمانڕەوایی خۆیەوە، سەرەتا تەنها لەشارەزووردا، لێ پاشان بەرۆگرەکانی دەسەڵاتی خۆیان بەسەر (*گۆران*)و کوردەکاندا بەرینترو فراوانتر دەکەن. تا لەقۆناغەکانی پاشتردا، هێدی هێدی هۆزە کوردە بێگانەکانی ناقارەکانی دی[١٣٨]، جێگە بەتوێژە دەستەڵاتدارەکەی (*گۆران*) لێژدەکەنو کەناریان دەخەن، هەر ئەو دەمانە نێوی گۆران واتای "وەرزێر"ی باڵا دەبڕێت.

ئەمە دەڤەرێکی هێجگار پانو بەرینی گرتەوە، هەتا لەوپەڕی ژووروش، لەمەڵبەندی هەرگییە ئێرانییەکانیش (لەخۆرئاوای ورمێ) وەرزێرەکان نێونران گۆران[١٣٩]. ئەم دیاردەیە ئەو سەرئەنجامەی لێدەپرینگێتەوە، کە دەبێت (*گۆران*)ەکان بە نێوچەیەکی هێجگار بەرفراواندا بڵاوبووبنەوە، (یاخود تەنها نێوەکە، بەسەر بڕێك دەستەو تاقمی دیکەی ژێردەستخراودا سەپاوە).

ئەو راستییەی کە زمانەیەکی ئاخێوەری (*گۆرانی*) گەیشتۆتە کن کەندوولە، کە دەکەوێتە دۆڵێکی باکووری خۆرهەڵاتی کرماشانەوەو سیو پێنج میل لێیەوە دوورە، ئەوە دەگەیەنێت کە تا ڕادەیەك بەمەودایەکی بەرین بەرەو خۆرهەڵات کشاوە، (ئۆسکار مان لەو زاراوە کۆڵیوەتەوە). ئەلعومەری باسی (*گۆران*)ی شارەزوورو هەمەدان دەکات. (*گۆران*)ەکانی هەورامان هەرگیز ژێرچەپۆکەی کوردنەبوون. رەنگە

کۆنفیدراسیۆنی (*گۆران*) (کە ئێستاکە پێی ناوەتە قۆناغی هەڵوەشاندنەوەوە)، زادەی میرنشینێکی لەرەچەڵەکەوە (*گۆران*) بوو بێت، بە بەشداری و ئالیکاری برێك کورد.

## ۲ـ ۱۲ـ ۲ـ تایبەتمەندییە ئاینییەکانی (*گۆران*)

کۆنفیدراسیۆنی (*گۆران*) لەڕوویەکی دیشەوە مەتەڵۆکەیەکە. (جگە لەچەند خێڵێکی کەمی نەبێت، کە تارادەیەك درەنگ تێکەڵیبوون)، ئیدی گشت ئەندامانی، سەر بە ئاینی ئەهلی هەقن. ئەهلی هەق توولێکی توندڕەوی شیعەگەرییە. توندڕەوییەکەی لەوەدایە کە چیدی فرێ بەسەر ئیسلامەوە نەماوە. گوایە ئەم ئاینزایە لەلایەن سوڵتانی ساقەوە دامەزراوە، کە بابی (موسڵمان و سەییدێکی نەوەی پەیامبەر بووە)، لەهەمەدانەوە هاتووە و لەسەرەتای سەدەی چواردەهەمدا لەهەورامان نیشتەجێبووە. سوڵتانی ساق یەکەمجار لەهەورامانەوە دەستی بە بانگهەڵدانی ئاینەکەی کردووە، دێرینترین پیرۆزگەکانی ئاینزاکەش هەر لەوێن. گەلەك لەو ڕاز و نیازانەی بە هەڤۆتی سوڵتانی ساق دانراون، زۆر پێش سەردەمی ئەویش هەرهەبوون و سامانی ئاینیی هاوبەشی ژمارەیەك ئاینزای دیکەی نێوچەکەن، (Muller، ۱۹٦۷). بۆ نموونە ئەم ئاینزایە شوێنەواری زۆری هەڤۆتی نیسماعیلییەکانی پێوە دەچریسکێتەوە (Lvanow ، ۱۹٥۳).

یەکێك لەرێچکە دێرینەکانی ئەو ئاینە، لایەنگرێکی فرەی لە لوڕستان هەبووە. هۆزانڤانی نێودار، بابە تایەری عوریان (کە لە هەمەدان نێژراوە) بە بەرپرسیاری ڕەوتی ئەو قۆناغەی ئاینزاکە دادەنرێت. بە بانگاشەی ئەوەی کە سوڵتانی ساق خەڵکی هەمەدان بووە، تاڵێ پەیوەندییەك دەگەڵ ئەو قۆناغە دێرینەدا رایەڵدەکرێت. وا پێدەچێت (*گۆران*)ەکان یەکەوڕاست هەڤۆتەکانی ئەو رێڕەوە ئاینییەیان پەسەند کردبێت، بەڵام دەیلەمییەکان (کە بنچەی ئەو (*گۆران*)انە، ئەگەر لقێکی خزمیشیان نەبووبێت، ئەوا پەیوەندییەکی توندو تۆڵی دەگەڵیاندا هەبووە)، مەیلیان زێتر بەلای شیعەگەرێتیدا سەریکرد، تایبەت کەوتنە ژێر تاوی

ئیسماعیلییەکانەوە[130]. ئـا لـەو سـۆنگەیەوە رەنگـە هەفۆتـە نوێکـە تـەنها دارشتنەوەیەکی ئەو رازو نیازانە بووبێت، کە تازەکی وەرگیرابوون.

لـەباکووری کوردسـتانیش برێـك کۆمەڵگـە هـەن، کـە هەفۆتـە ئاینییـەکانیان وێکچوونی زۆریان دەگەڵ ئەوانەی ئەهلی هەقدا هەیە. لەنێوەندی تورکیادا چەندین ملوێن زرە شیعەی (قزلباش ـ اخود عەلەوی) کوردو تورك هەن. بەو هۆیەوە کە لەتورکیا ئایین هەمیشە سەرکوتکراوبووە، ئەو ئایینەش قەت دەرفەتی ئەوەی نەدراوە، و .ك لەئێرانی هاوسێیدا بووە ئایینی رەسمیی دەوڵەت، لێرەش بچێتە قاڵبی داوو دەزگەیەکی رێکخراوی سەقامگیرەوە، لەو سۆنگەیەوە مەیلو ئارەزووی توندرەوانە هەر لەئارادایە. بەتایبەت لەنێوچە دەستپێدانەگەیشتووەکانی دەرسیمدا، هێشتا زرپو زیندووە[131]. گەلەك بیرو بۆچوونیان، هەفۆتەکانی ئەهلی هەقەکانی داڵەهوو دەهێننەوە یاد:

ـ باوەڕبوون بە خودایەتی عەلی، کە ئامۆزاو زاوای پەیامبەر بوو. (هەڵبەت موسڵمانە سوننییەکان عەلی تەنها وەك چوارهەمینو دواهەمین خەلیفەی یاسایی ئیسلام دەناسن. بەڵام بەلای شیعەکانەوە یەکەمین ئیمامو تاقە بەرۆگری راستەقینەی محەمەد بووە).

. باوەڕهێنان بەوەی کە کەونو جیهان بە گشت بوونەوەرێکییەوە نیشانەیەکی نەگۆڕی ئێزدانێکی بەتوانای کارامەو کارخەمڵیوی بێ کەموکووڕی تاكو تەنهایە. (ئەمە یەکێکە لەهەفۆتە بنەڕەتییەکانی ئیسماعیلییەکان).

. باوەڕبوون بە دۆنادۆن.

. لەکۆڕی ئەنجامدانی نەریتە ئاینییەکانیاندا کە (جەم)ی پێدەڵێن، ئیماندارەکان لەسەر ئاوازی ئامێرە ژێدارەکان، سروودی سۆفیانە دەخوێنن، (ئەو ئامێرانە لەداڵەهوو تەمبوور، لەتورکیا سازو لە دەرسیم بەغلەمە یان پێدەگوترێت). سازو ئاوازی مۆسیقای هەردوك دەستەکە، نێزیکیو وێکچوونیان زۆرە.

. لەهەردوو مەڵبەندەکەدا ئەفسانە ئایینییەکان هەمان نێوەرۆکیان هەیە[132].

زۆربەی ئەو کوردانەی دەرسیم بە زازا دەپەیڤن، (کە خۆیان دەملی پێدەڵێن. ئەمەش هەمدیسان دەیلەم دەهێنێتەوە یادمان)[١٣٣]، ئەو زاراوە زێتر لە (*گۆرانی*)یەوە نێزیکە، وەك لەزاراوەکانی باکووری کوردستانی خزمی.

برێك وێکچوونی کولتووری دیکەش هەن: بۆ نموونە (*گۆران*)ەکان، بە تایبەتو پلەی یەکەم هەورامییەکان، هەروەکی دانیشتووەکانی دەرسیم، خۆیان زۆر چاكو سەرکەوتووانە دەگەڵ دەوروبەرو سروشتە سەختە رژدو زەردو نالەبارەکەدا (کە وێکچوونی زۆری دەگەڵ دەیلەهی نێوەنددا هەیە)، گونجاندووە. بەوە لەکوردەکانی دی جودادەکرێنەوە، کە باخەوانی دەسترەنگیننو هونەریان لەباخ دروستکردندا نوواندووەو باخی هێجگار پێشکەوتوویان داهێناوە.

مرۆڤ دەتوانێت ئەو هەموو لێکچوونانە بگێرێتەوە بۆ چاوگەیەکی هاوبەش، کە دەشێت تەنها دەیلەمی بێت. گەر بەو پێیە بێت، دەشێت زازاکان لەزێدی رەسەنی خۆیانەوە بەرەو خۆرئاوا رەوی‌انکردبێت، (*گۆران*)ەکانیش بەرەو خوارووی خۆرئاوا ملیان نابێت. وەلێ ئەم گریمانەیە هێشتا دەلاقەی زۆری تێدایە:

A ـ هەورامییەکان کە لەحاند تینو تاوی دەرەکیدا هێجگار قەپێلك داخراوو دابراون، موسڵمانی سوننی خاوەن ئیمانو قەت نەبیستراوە سەر بە ئەهلی هەق بووبن، لەگەڵ ئەوەشدا کە سوڵتانی ساق زۆربەی ژیانی لەهەورامان بەسەربردووەو هەر لەوێش مردووە، لێ شاگردو مورێدە هەرە نێزیکەکانی، خوارنر نە داڵەهوو نێژراون، کە ئاقاری ئەورۆکەی کۆنفێدراسیۆنی (*گۆران*)ە.

B ـ هەر بەو پێودانگە، زۆربەی هەرە زۆری ئاخێوەرانی زازاش موسڵمانی سوننین نەك عەلەوی، زازا عەلەوییەکان کەمینەیەکی کەمن[١٣٤].

C ـ هەڤۆتە ئایینییەکانی ئەورۆی عەلەوییەکانی ئەنەدۆڵ، تارادەیەکی زۆر کەوتوونە ژێر تینو تاوی بەکتاشێتییەوە. حاجی بەکتاش سۆفییەکی رەمەکی بوو، لەسەدەی سێزدەهەم یاخود چواردەهەمدا کایەیەکی گەورەی لەئەنەدۆڵدا دیتووە*. ئەو ئەفسانانەی لەبارەیەوە دەگێردرێنەوە، وێکچوونی زۆریان دەگەڵ ئەوانەی

---

* حاجی بەکتاش وەلی ساڵی ١٣٤٧ کۆچی دوایی کردووە.

سوڵتانی ساقدا هەیە، کە بەنێزیکە لەهەمان سەردەمدا ژیاوە، بەڵام هەزار میلێک لێیەوە دوور بووە. سەیر ئەوەیە حاجی بەکتاش لەکن ئەهلی هەق ناسراوەو هەتا برێکیشیان هەر بە سوڵتانی ساقی خۆیانی دەزانن[١٣٥]. ئەمە بەلگەیەکی روونە بۆ ئەوەی کە پێوەندیی‌و کاریگەرێتی لە نێوان زازاو (*گۆران*)دا هەر بەردەوام بووە، هەتا ئەو دەمەش کە (*گۆران*)ەکان ئیدی دەیلەمی زێدی خۆیان بەجێهێشتووە[١٣٦].

لەنێوان مەڵبەندی سەرەکیی زازاو (*گۆران*)دا، چەندین کوت زمانەی ئایینی‌و زاراوی جودا دەبینین، کە دوور نییە لەکۆندا جەمسەری پەیوەندیی نێوان هەردوو مەڵبەندەکە نەبووبن. لەخوارووی کەرکوکدا کۆمەڵگەیەکی گەورەی ئەهلی هەق هەیە، کە کاکەیین‌و بەیەکێك لەزاراوەکانی (*گۆرانی*) دەدوێن[١٣٧]. زمانەیەکی دیکەی ئاخێوەرانی (*گۆرانی*) باجەلانییەکانن، تیرەیەکن پشکی زۆری مەڵبەندەکەیان دەکەوێتە باشووری مەڵبەندی (*گۆران*)ەوە، جگە لەوێ، برێکیشیان لەنێوچەی خانەقین‌و دەستەیەکیشیان لەباکووری خۆرئاوای موسڵ دەژین. هەرچەندە خۆیان سوننیین، لێ هێشتا برێك شەقڵی تیژڕەوانەی شیعەگەرێتییان پێوە دەزرەقێتەوە. هاوسێی ژێرووی باجەلانەکانی موسڵ، شەبەکە گومڕا لەدین وەرگەڕاوەکانن، بەڵام هاوسێکانی ژوورووی خۆرهەڵاتیان (*گۆران*)یان پێدەگوترێت، ئەمانە بەنێو سوننین، لێ بە یەکێك لەزاراوەکانی (*گۆرانی*) دەپەیڤن[١٨٢]. دەبێت لەم بوارەدا ئێزیدییەکانیش لەیادنەکەین. پێدەچێت ئەمانە داب‌و نەریتی زۆر ئاینی جۆراو جۆریان خواستبێت، لایەنی کەم دەگەڵ ئەهلی هەقدا برێك باوەڕی ئاینیی چوونیەکیان هەیە[١٣٩].

لەئاکامی ئەو راستییەوە کە کۆنفێدراسیۆنی (*گۆران*) لەڕاستەڕێی ئایین لایداوەو ملی بە گومڕاییەوە ناوە، هەندەك لێکۆڵەرەوە نێوەکەیانی گێڕاوەتەوە سەر گەبر، "زەردەشتی" (گەبر ـ ان، گەوران، گۆران). گوایە لەشکرە داگیرکەرەکەی ئیسلام ئەو نێوەی لێناون. دیارە ناتوانرێت بەرپەرچی ئەو شیمانەیە بدرێتەوە، چونکە لایەنی کەم لە دەقێکی کوردیدا نێوەکە بەو واتایە بەکارهێنراوە. هەرچەندە بەڵگەی فرەی

ئـەوتۆ لەبـەر دەسـتاندا نـیین، کـە پێوەنـدیی نێـوان ئـەهلی هـەق و زەردەشـتی بسەلمێنن[140].

مینۆرسکی بیانووی زۆری هێناوەتەوە، بۆ ئەوەی بتوانێت وشەی (*گۆران*) بۆ سەر چاوگەی گاڤبارەکان "گاسوارەکان" بگێڕێتەوە.

ئەمـەش هەمدیـسان بەڵگەیـەکی دی پەیوەندییانـە بـە نێوچـەکانی دەوروبـەری دەریای قەزوێنەوە[141]. دیارە ئەو لەوباوەڕەدا بووە، کە ئـەو وشـەی گۆرانـەی لەلایـەن جوگرافیاناسـە کۆنەکانـەوە نێوبراوە، دەگـەڵ کۆنفێدراسیۆنی ئەوڕۆکـەی (*گـۆران*)دا چوون یەکن و نێوەکە لەوشەی "گاڤبارەکان"ەوە هـەڵگۆزراوە. بـەڵام وەرزێـرە گۆرانـە ژێرچـەپۆکخراوەکان، هـیچ پەیوەندییـەکیان بەوانـەوە نییـەو نێوەکـەی ئەمانـە، لەوشەی "گەبر"ەوە هەڵهێنجراوە[142].

زۆر ڕێتێدەچـێت (*گـۆران*)و گـۆران لـەدوو تۆرەمـەی جـوداواز کەوتبنـەوە. بـەڵام لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەو ماتریاڵـە پێشـچاوخراوانەدا، ئەسـتەمە بتوانرێـت پەیوەنـدیی وەرزێـرە گۆرانـەکانی شـارەزوور بـە کۆمەڵگـەی ئـاخێوەرانی (*گـۆرانی*)یـەوە، یـاخود لایەنی کەم بە هەندەك دەستەو تاقمی کۆنفێدراسیۆنی (*گۆران*)ەوە، پووچکرێتەوە.

**٢ـ ١٢ـ ٣ـ داخۆ (*گۆران*)ەکان چۆن کوردێکن؟**

بـەلای نەتەوەپـەروەرانی کـوردەوە، یـەك تۆزقـاڵ گـەردی گومـان بەسـەر ئـەو ڕاستییەوە نییە، کە (*گۆران*)ەکان و (هەورامیو زازا) کوردن. لـێ زمانەوانانی وەکـی Mackenziو Hadank و Oskar Mann بەهـەمان پێـداگرتن و سـووربوونەوە، بەرپەرچی ئـەو جـۆرە بۆچـوونانە دەدەنـەوە. پێدەچـێت گەلـەك ڕێـڕەو و ڕێبـازی جوداواز هەبن، بۆ سەلماندن یاخود هەڵوەشاندنەوەی ئەو بڕیارەی داخۆ کـێ کـوردەو کـێ کورد نییـە. زۆرجـار پێناسـەکردنی زاراوەکـانی وەکـی "نەتـەوە، گـەل" یـاخود "ڕەگـەزێك"، بـەهۆی بڕیـاردانی پێـشەکی و نەخـستنیەبەر ڕێژنـەی گومانـەوە، بۆچوون و بڕیاری وای لێدەکەوێتەوە، کە کۆمەڵێك بە نەتەوە دابندرێت و کۆمـەڵێکی دی ئەو خەسڵەتەی لێزەوتکرێت. ئیدی پێناسەکە وا دادەڕێـژدرێت، کـە ئـەو حاڵەتـە

تایبەتە بگرێتە خۆ. وەلێ کەس ناتوانێت نکۆڵی لەوە بکات کە ئا ئەو جۆرە بڕیارە کورتبین و سەرپێیانە، زادەی تاسەو ئارەزوویەکی پەتین.

هەڵبژاردنی پێناسەیەکی دیاریکراو، دەشێت ئاکامی سیاسی ئاڵۆزی لێبکەوێتەوە، بۆ نموونە وەك هەڵوێستی دەوڵەتێك، پارتێك، یاخود رێکخراوانێکی دی، بۆ کارکردنە سەر کێشەی میللەتێك. ئایا بڕێك پێناسە رەواتر، یاخود شیاوترن لەهەندێکی دی؟ حاڵەتێکی ئاوها تەماوی و شڵۆێی وەکی گۆران و (*گۆران*) رەنگە بتوانێت بڕێك لایەنمان بۆ روونکاتەوە. پێناسەی زاراوەی وەکی "نەتەوە، گەل" کولتوورێکی هاوبەش دەگرێتەوە (کە دیارە لەتەك هەندەك شتدا زمانێکی هاوبەشی گەرەکە)، خاکێکی هاوبەش و مێژوویەکی هاوبەش دەگرێتەوە. وەك هیچ یەك لەو پێوەرانە بە تاك و تەنها بەشی هێندە ناکات کۆمەڵێکی پێ بکەیتە "نەتەوە، گەل"، ناشبێت هێجگار دەستی لێداگیرێت و بەرتەنگ بکرێتەوە. بۆ نموونە هیچ نەتەوەیەك نییە کولتوورێکی تەواو تەواو هاوبەشی هەبێت.

لەهەرکوێ دەڕوانیت، کۆمەڵێك کولتووری تێکەڵەی فرەچەشن لەئارادان، کە کولتووری تێکڕای چینەکان و پیشەو ئایینەکان ....... هتد. رەنگ پێدەدەنەوە. دیارە بڕێك پێناسە هەن، بەر بەرینترن.

ئایین یەکێکە لەو دیاردە کولتوورییانەی، کە لەخۆرهەڵاتی نێوەندا بایەخێکی هێجگار گرنگی هەیە. بۆ نموونە زۆر کوردی موسڵمان ئێزیدییەکان هەر بەکورد نازانن، تەنها لەبەر ئەوەی ئەوان ئایینێکی جوداوازیان هەیە. مارکسیستەکان بەر لەوەی کۆمەڵێك بە نەتەوە حسێب بکەن، لەبنەما ماددییەکە دەڕوانن، کە بۆ یەکێتی کۆمەڵگەکە بە پێویستی دەزانن. لێرەدا دەبێت پێناسەکەی ستالین بهێنینەوە یاد، کە سەبارەت بە کورد، زۆر گرنگە. لەبەر رۆشنایی ئەو پێناسەیەدا بوو، زۆر لەپارتە مارکسیستەکان، خەسڵەتی نەتەوەیەکیان لەکورددا بەدینەدەکردو مافی چارەنووسیان پێڕەوا نەدەدیت.

چونکە پێناسەکەی ستالین سەبارەت بە نەتەوە، لەتەك کولتوورو خاك و مێژوویەکی هاوبەشدا، ئابوورییەکی هاوبەشی یەکگرتووی راستەقینەو

پێوەندییەکی ئابووری توندو تۆڵ لەنێو خودی ئەندامانیدا، نەك دەگەڵ دەرەکییەکاندا، بە پێویستییەکی بنەڕەتی دادەنێت[١٤٣]. (لەپاڵ هەندەك هۆکاری دیدا، مەبەستی سەرەکیی ئەو پێناسەیە ئەوەبوو، کە پلەو پایەی "میللەت" بە بالای جووە رووسەکان نەبڕدرێت و ئەو خەسڵەتەیان لێدامالدرێت).

دیارە بەلای کۆمەڵناسیکەوە ئەو پێوەرانە بە تەنها هەموو شتێك نیین و بەشناکەن: پرسیاری گرنگ ئەوەیە داخۆ ئەو کۆمەڵە خۆی خۆی بەیەکەیەك دەزانێت و بەو شێوەیە رەفتارو هەڵسوکەوت دەکات. یانی تەنها خۆی لەخۆیدا گەل نەبێت، بەڵکە خۆشی بۆخۆی خۆی بە گەلێك بزانێت و ئەو هەستەی لەدەروونا رسکابێت.

کەواتە با بگەڕێینەوە بەلای کۆنفوێدراسیۆنی (*گۆران*)ەوە: ئایا دەتوانرێت بە کورد دابنرێن نا؟ بەپێی پێوەری زمان، بڕێك لەهۆزە ئەندامەکانی بە کورد حسێب دەکرێن، هەندێکیشیان بەکورد دانانرێن.

هەر بەو پێیە دەشێت لەڕووی مێژوویشەوە بڕێك هۆزیان لەڕیزی کورددا دابنرێن و هەندێکیشیان ناشێت. ئەو بەرامبەرێنە دوو پەلکەییەی کە گوایە (بڕێك لەئاخێوەرانی (*گۆران*) کوردێنراون و دوورنییە لەقۆناغەکانی پێشینیاندا بەهەمان شێوە، کوردیش نەگۆراندرێنرابن)، نەشیاو و نەگونجاون و پێکەوە نالکێن.

پێوەری ئایینی، سێ جاران (*گۆران*) کوتکوت دەکات: ئەهلی هەق ک:-بەکوردی و (*گۆرانی*) دەئاخێون، موسوڵمانە سوننییەکان بە کوردی دەدوێن و ئەمانە کوردی رەسەنن، شیعە کورد زمانەکان.

پێوەری ئابووری، گۆران دەکاتە بەشێك لەکورد، یاخود بەشێك لە کۆمەڵگەیەك. چونکە کۆنفێدراسیۆنەکە خۆی، چیدی یەکەیەکی توند تێکئالاو نەماوە، پەیوەندی ئابووری توندو تۆڵیان زێتر دەگەڵ هاوسێ کوردەکانیاندا هەیە.

پێوەرە یەکلایەنە ناقۆڵاکان دەتوانن لەبەریەکیان برەوێننەوەو لێکیان دابڕن. هەرچەندە زۆر (*گۆران*) خۆ بە کورد دەزانن، لێ تاوەکو کۆتایی سالانی حەفتاش، پڕوپاگەندەی نەتەوەپەروەرانی کورد، نەیهەژاندن و نەیبزواندن. هەتا زۆربەیان

بووبوونه چریکی رژێمی شاو پاسی کوردستانی ئێرانیان بۆ دەکرد. چونکە خۆیان لەمەسەلەی کورد نەدەگەیاند، ئیدی جێگەی بڕواو متمانەبوون. دیارە بەچاوی سووک لەیەکدی روانینی موسڵمانان‌و ئەهلی هەق، کایەیەکی گرنگی ئاڵەو هەڵوێستەدا هەبووە.

### ٢ـ ١٣ـ رەوەندو وەرزێرەکان ـ گەلێک یاخود دوو گەل؟

هیچ گومان لەوەدا نەماوە کە وەرزێرە گۆرانەکانی دەفەری سلێمانی‌و کوردە خێڵەکییەکانی ئاغایان، لەدوو تۆرەمەی رەگەز جوداواز کەوتوونەوە. هەرچەندە ناکرێت بەر بەو شیمانەیەش بگرین، کە دەشێت گشت گۆرانەکان لەرەچەڵەکی (*گۆران*) بن‌و گشت خێڵەکییەکانیش بە بنەچە کوردبن. رەنگە ئەمە سەبارەت بە کوردە ناخێڵەکییەکانی پارچەکانی دیکەی کوردستانیش هەر ئاوها بێت. وەلێ ئەگەر لەوەوە ئەو سەرئەنجامە بوختەکرێت، کە گوایە گشت لەگشتی کورد، بەرەچەڵەک رەوەند بوون‌و خاک‌و مەفتەنی خەڵکە نیشتەجێ دێرینە ناخێڵەکییەکانیان داگیرو زەوتکردووە، هەڵەیەکی گەورەیە. هەڵەیەکی دیکە ئەوەیە وا دابنرێت، کە وەرزێرەکانی ئەورۆو خێڵەکییەکان، وەچەو نەوەی ئەو دوو رەچەڵەکە جوداوازەن.

جارێ ئەستەمە بڕوابکرێت کە تەواوی گەلێک، تەنها لەرەوەندی ئاژەڵدار پێکهاتبێت. هێجگار دژوارەو زۆر سەختیشە مرۆڤ بتوانێت تەنهاو تەنها بە بەروبوومی ئاژەڵ بژێت. رەوەندەکان هەمیشە پەیوەندییان دەگەڵ جووتێرە نیشتەجێکاندا هەبووە، جا ئیدی ئەو پەیوەندییە لەرێگەی ئاڵ‌و وێڵەوە بووبێت، یاخود لەرێگەی راوو رووتەوە، ئەوا پێویستییەکانی ژیان‌و گەلەک شتی دیکەی کەمبایەختریان پێ دابینکردووە.

میدییەکان، کە رەنگە لەتەک کۆمەڵێک نەتەوەی دیکەدا، یەکێک لەگرنگترین رەگەزەکانی بەرەبابی کوردبن، بەپێی ئەو زانیارییانەی لەبەر دەستاندان، ئەوانیش رەوەندو نیشتەجێبوون. رەوەندەکانیان شەرکەرو جەنگاوەربوون، شێوەی ژیانیان

شیاوی ئەو ئەرکە بووەو بۆ ئەنجامدانیشی کاتی بۆ پاشەکەوت کردوون، بەوەی ئەرکی هەرە گرنگی جووتێرە نیشتەجێکان، بژێوپەیداکردن و تێرکردنی سکی لەشکرەکەبووە.

جەنگاوەرە خێڵەکییە ڕەوەندەکان و وەرزێرە ناخێڵەکییە وابەستەکان بڕێکجار وەکی تاقمێکی قەپێلك خڕداخراو پێشچاو دەخرێن، بەتایبەت لەلایەن ئەندامەکانی خۆیانەوە. لەو دەساڵانەی دواییدا، چەندین لێکۆڵینەوە دەریانخستووە، کە شوورەی دەوری نەتەوەو دەستەو تاقمەکان، لەزۆر کەنارو قوژبنی دنیادا، هێجگار بەو رادەیەش کونبڕ نیین. بەو پێیە، هیچ دوورنییە کە شوورەی دەوری دەستەو تاقمەکانی کوردستانیش هێجگار ئاوها قەبەو قووچو داخراو نەبووبێت وەکی ئێستەکە پێی لەسەردادەگیرێت. هەرچەندە بەڵگەنامەی ڕاستەوخۆی کەم لەبەردەستاندان، لێ ئەم سەرنجدانانە هێند بەڵگەی ناڕاستەوخۆیان لێدەچریسکێتەوە، کە سەرئەنجامێکیان لێبوختەکرێت و بگوترێت درزو دەلاقەی نێوان خێڵەکی و ناخێڵەکی، بەردەوام دراونەوە دەم یەك و پێکەوە لکێندراونەوە.

A ـ گەلەکجار ڕەوەندە هەژارکەوتووەکان لەنەداری و ناچاریدا نیشتەجێ دەبن و مل دەبەر وەرزێری دەنێن. دیارە تەنها بە ئاژەڵداری ناتوانن بەڕێوەبچن، چونکە بۆ دابینکردنی ژیانیان پێویستیان بە ژمارەیەکی تەواو ئاژەڵ هەیە، (کەمترین ژمارە بە ٨٠ تا ٢٠٠ سەرێك دەقرسێندرێت).

Rich ساڵی ١٨٢٠ تێکڕای هۆزی جاف بەگشت بنەماڵەو تیرەو تایەفەکانییەوە، بە ١٠ هەزار ڕەشماڵێکی ڕەوەندو ٢ هەزار خێزانێکی نیشتەجێ دەخەمڵێنێت. (Rich، ١٨٣٦، I، ل ١٧٧). ساڵی ١٩٢٠ ژمارەی نیشتەجێبووەکان زۆر هەراوتربووە. لێ وەکی Edmonds سەرنجیداوە، ئەوە ژمارەیەکی گردەبڕ نەبووە. زۆر خێزانی نیشتەجێ هەر لەگەڵ دەرفەتیان بۆ ڕەخساوە، یاخود وایانهەستکردووە کە هەلەکە لەبارترە، سەرلەنوێ لەژیانی کۆچەرایەتی تێهەڵچوونەوە (Edmonds، ١٩٥٧، ل ١٣٩ ـ ١٥٦). ئەمبەرو ئەوبەرێکی بەردەوام لەڕیزی هۆزەکەدا لەئارادابووە، بڕێك کۆچەر نیشتەجێ دەبوون و هەندەك نیشتەجێش دەبوونەوە کۆچەر.

هەنـدەك هـۆزی دی هـەر بـە تـەواوی نیـشتەجێبوون. Rich لەرِستكردنی نێـوی هۆزەكانی مەڵبەندی سلێمانیدا، نێوی برِێكیان دەهێنێت، (Rich، ١٨٣٦، ل ٢٨٠ ـ ٢٨١). هەڵبـەت شـیرازەی خێڵەكییانـەی ئـەو جـۆرە هـۆزە نیـشتەجێبووانە، هیـدی هێـدی خاودەبێتەوە. بەتایبـەت گـەر لەلایـەن هـۆزێكی دییـەوە ژێرچـنگۆڵەخرابن (تیرەكـان تارِادەیەكی زۆر ئەركە سیاسییەكەیان لەدەستدەدەن). بۆ نموونە پلەو پایەی زۆر لەو هۆزانـــەی پـــشدەرییەكان ژێـــر دەســـتەیانكردن، وەكـــی پلەوپایـــەی مـــسكێنە ژێردەستكراوەكانی لێهات، خشت وەكی ئەوان بوونە پشكێكی وابەستە لەسیتەمێكی فیۆدالانەدا.

B ـ لەلایەكی دییـەوە پێدەچێت وەرزێـرە ناخێڵەكییـەكان چ بـە تاكەتاكـەو چ بـە كۆمـەڵ، دابیانـەپاڵ هـۆزە دەسـتەلاتدارەكان. ئـەو هـۆزە نوێیانـەی كـە لـەناكاو قوتدەبوونـەوەو ژمارەیـان بـەخێرایی زیـادی دەكـرد، دەبێـت لەلایەكـەوە ئەنـدامی نوێیـان تێرژابێـت. بـۆ ئاغـای هـۆز ئەسـتەم بـوو بتوانێـت گـشت پیـاوە شـەرِكەرە پێویـستەكان، تـەنها لەتۆرەمـەی هۆزەكـەی خـۆی مـسۆگەربكات. Rich دەربـارەی سیوەیلییەكان دەڵێت: "هەرچـەندە گومـان لـەپاكیی نـەژادیان" دەكرێت، لـێ ئیـدی ئێستاكە هۆزێكنو خۆ لەتێكەڵی وەرزێران دەبوێرن".

(Rich، 1836، I، ل٢٨٠).

لەراستیدا، ساڵی ١٨٢٠، ئەودەمـەی لەشارەزووردا گۆرانـەكان چوار پێـنج هێنـدەی خێڵەكییـــەكان دەبـــوون (سەرچـــاوەی پێـــشوو، ل١٧٧)، لـــە ١٩٢٠دا، وەك Edmonds دەگێرِێتەوە، سێچارەكی دانیشتوانی دەڤەری هەڵەبجە (كە چەقی شارەزوورە) سـەر بەهۆزی جاف بوون. راستە، لەسەروەختی ئاژاوە سیاسییەكانی دەوروبەری ساڵی ١٨٣٠ داو بەتایبـــەت لـــەكاتی بڵاوبوونـــەوەی دەردو پـــەتا كوشـــندەكەدا، گەلـــەك وەرزێـــر مەڵبەندەكەیان جێهێشتو بۆنێوچە دوور لەدەردو بەڵاكان هـەڵهاتن، (Fraser 1834 سەری ئەو دەڤەرەی داوەو ئەو راستییە دەسەلمێنێت)[١٤٥].

لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەی كەسانی سەر بەهۆزەكان لەچاو سـەرجەمی دانیـشتووانـدا بەرِادەیـەكی ئـەوتۆ زێـدیانكرد، كـە بـاوەرِ بهێـنن بـەوەی ژمارەیـەكی هێجگـار زۆری

جوتێران لەسەردەمی پشیووی‌و هەڵلاکانی سەدەی پێشوودا دابیانەپاڵ هۆزەکان‌و بووبنە پشکێك لەوان[١٤٦].

C- پێشتر پەنجەم بۆ ئەوە راکێشا کە گەلەك سەرەکهۆز لەڕەچەڵەکێکی بێگانە کەوتوونەوە. مرۆ دەتوانێت ئەو راستییە بەجۆرێکی دیکەش دەربڕێت: رەعییەتی زۆر لەسەرەکهۆزەکان لەتۆرەمەیەکی دیکەن.

دەشێت لایەنگران‌و دەستوپێوەندی سەرەکهۆز هەر لەڕەچەڵەکەوە سەر بەهۆزەکەبووبن، بەلام دەشێت سەر بەهیچ هۆزێکیش نەبووبن، لێ رەچەڵەکیان هەرچییەك بووبێت، ئیدی هێدی هێدی هۆزێکی یەکپارچەی "راستەقینە" پێکدەهێنن.

نموونەیەکی لەو بابەتە هەر لەم بەندەدا پێشچاوخرا. ئەویش سەرهەڵدانی یەکێتییەکی هۆز ئاسایی بوو لەکن ئاغاکانی دووڕیکانی، کە نیشتەجێی جزیرەی باگوور بوون. ئەو پێشهاتە لەو رووەوە تارادەیەك نائاساییە، کە رەعییەتە نوێکە، وەرزێر بوون نەك شەڕکەر.

پێدەچێت دووڕیکانییە رەسەنەکان هیچ پلەو پایەیەکی ئەوتۆیان لەنێو ئەو وەرزێرانەدا پێنەبڕابێت، کە سوودو دەستکەوتی لێبچننەوە. تا دەساڵێکیش لەمەوبەر ئاغاکان دەستوپێوەندێکیان لەدەوربوو، بێ ئەو دەستوپێوەندانە لەئاوزەنگییان نەدەدا.

دەستوپێوەندیش گشتیان بەڕەچەڵەك دووڕیکانی نەبوون، بڕێك فەلەشیان تێکەڵبوو.

D - دەتوانین بەدڵنیاییەوە بڵێین راست نییە گەر بانگەشەی ئەوە بکرێت گوایە گشت لەگشتی هۆزەکانی کورد لەیەك رەچەڵەکی هاوبەش کەوتوونەوە. پەیوەندی نێوان هۆزە تورك‌و (عارەب)و کوردەکان لەهەشت سەدە زێترە. زۆر هۆزی کورد تورکێنراون‌و گەلەك هۆزی تورکیش کوردێنراون. لەوەش سەرنجڕاکێشتر ئەوەیە، کە پێدەچێت پەیوەندی‌و ئاڵوگۆڕێکی بەردەوامی ئەندامان، لەنێوان هۆزە کوردەکان‌و کەمینە فەلەکاندا لەئارادابووبێت. ئەو فەلانەی بەزمانی ئەرمەنی یاخود ئارامی

دەدوان‌و تـا یەکـەمین جـەنگی جیهـانییش لەسەرتاسـەری کوردسـتاندا دەژیـان، (هەرچـەندە پـاش رەشـکوژی‌و راگواسـتن‌و هـەڵهاتنیان، دەسـتەو تـاقمێکی کـەمیانلێمابووەوە)، زێـتر وەکـی پاشمـاوەی دێـرینترین دانیـشتووانی نێوچـەکە تێیانـدەڕوانرا، کـە پاشـان لەلایـەن هـۆزە کـوردو تورکەکانـەوە بـەتۆپزی ژێردەسـتەکرابوون. ئـەو کەمینانـە تـەنها بـەئایین‌و زمـان‌و تـەکنۆلۆژیای پێشکەوتووتریاندا لەکوردەکان جوادەکرانەوە، دەنا لەڕووی تەن‌و روخسارەوە، هیچ جوداوازییـەکیان دەگـەڵ کـورددا نـەبوو. بۆیـە زۆر گـەڕاڵ لـەوباوەڕەدابوون، گـەر لـەکوردو ئەرمەنـە دانیـشتووەکانی هەرجێیـەکی کوردسـتان بنواڕیـت، وێکـچوون لەنێوان ئەوانـدا زێـترە وەك دەگـەڵ کورد یـاخود ئەرمـەنی هاوڕەگـەزی جێگەیـەکی دیکەیاندا[١٤٧].

رەنگە ئەو وێکچوونە تەنی‌و روخسارییە تارادەیەك بۆ ئەو دابە بـەبرەوەی هۆزە کوردەکان بگەڕێتەوە، کە حەزیان لەهەلگرتنی ژنە فەلە بـوو. لـێ گەلـەکجار هەست بـەوەش کـراوە کـە ژمارەیـەکی هێجگـار زۆر فەلـە خۆیـان بوونەتـە کورد. دوورنییـە لەکۆنـدا پرۆسێسی پێچەوانەی ئەوەش لەئارادانـەبووبێت. Molyneux- Seel سالی ١٩١٤ دەبینێت لەدەرسیم زۆر ئەرمـەنی بوونەتـە کوردی عەلـەوی. مـن بۆخـۆم سالی ١٩٧٦ لەسیعرت برێـك کۆمەڵەی گچکە گچکەی ئەرمـەنم دیـت، کـە تـازەکی سنووری رەگەزایـەتییان بەزانـدبوو. تـەنها بـەکوردی‌و تـورکی دەپـەیڤین‌و بووبوونـە موسڵمانیش. هەندەك لەئەندامە خۆرتەکانیان، کوردی نەتەوەپەرەوەری زۆر چوست‌و چالاکیان لێدەرچووبوو. بەڵام دیارە هیشتا بەو تەواوییە نەبوونە کورد، کـە بتـوانن دان بـەخۆدا بگـرن‌و هـەر لـەپێنج دەقیقـەی یەکـەمی دیدارمانـدا باسـی رەچـەڵەکی ئەرمەنی خۆیانم بۆ نەکەن.

لـەپاڵ ئەوەشـدا تـا ئـەم دواییانـەش لەکوردسـتاندا دەستەو تـاقمی فەلـەی ئـەوتۆ هەبوون، کە شیرازەیەکی هۆزئاساییان هەبوو، تەنها لەڕووی زمان‌و ئایینەوە لەخێڵە کوردەکان جودادەکرانەوە. ترسناکترینیان ئاسوورییە نەستۆریەکانی هـەکاری بـوون، کە لەڕووی سوپاییەوە هاوشانی زۆر لەهۆزە کوردەکانی دیکـەبوون‌و وەکـی ئـەوانیش

زۆر وەرزێری ناخێڵەکی نەستۆری‌و کوردی دەستەڵاتدارە خێڵەکییەکەداو چ لەڕیزی توێژاڵە ژێردەستخراوە ناخێڵەکییەکەدا، کوردو ئاسووری هەبوون[١٤٨].

سریانە فەلە یاقوبییە مێرخاسەکانی کێوەکانی تۆرعابدینیش کە لەنێو هەڤێرکاناندا دەژیان‌و لەباشترین جەنگاوەرانیان بوون، کۆمەڵگەیەکی لەو بابەتە بوون.

بڕێک فەلەی نێوەندی کوردستان ڕەوەندی شوانکارەبوون، بۆ نموونە ئەرمەنییەکانی ڤارتۆ، ئەو هۆزە ئەرمەنییانەی کە بۆ یەکەمینجار Fordin باسیکردوون، لەکۆتایی پەنجاکانی ئەم سەدەیەدا بوونە تاقمێکی هێجگار گچکەو تێکەڵی هۆزی تەییانی کورد بوون‌و دەگەڵ ئەواندا کۆچ‌و ڕەویاندەکردو پاشانیش هێدی هێدی لەبۆتەی ئەواندا توانەوە. هەر ئەو سەردەمانە چیدی بەئەرمەنی نەدەدوان‌و تەنها بەکوردی دەپەیڤین‌و زانیارییەکی هێجگار کەموکورتیان لەبارەی فەلاتییەوە هەبوو[١٤٩].

گەر ئەو دەستەو تاقمە فەلانە شیرازەیەکی هۆزناساییان هەبووبێت‌و لەڕووی سوپاییشەوە توانیبێتیان شان لەشانی هۆزە کوردەکان بسوون، ئیدی چ برو بیانوویەك بۆ ئەوە نامێنێت، کە ئەمە بۆ کوردە ناخێڵەکییەکانیش نەشێت. فەلەکان لەڕووی زمان‌و ئایینەوە هێند لەکوردەکان جوداوازبوون، کە ڕەچەڵەکی نامۆیان ئاشکرا دیاربوو. بەڵام پێدەچێت ئەستەم بووبێت "ئەندامە ڕەسەنەکانی هۆز" لەو کوردانەی "بەسۆز خێڵەکی" بوون، هەڵئاوێردرێن.

E. ناشێت‌و پێناچێت گشت جووتێرە ناخێڵەکییە وابەستەکانی کورد، لەڕیشەوە لەڕەگەزێکی دیکەبووبن‌و لەلایەن خێڵەکییە داگیرکەرەکانەوە هێدی هێدی کوردێنرابن. بۆیە ناشێت، چونکە هەموویان ئەو پەیوەندییە توندو تۆڵەیان بەهۆزە کوردەکانەوە نەبووە. بۆ نموونە لەکافاری هەکاری جووتێری کورد هەبوون وەکی دەشتاییەکانی دیاربەکرو هەولێر، ئەفسەرو فەرمانبەرانی عوسمانی، ئاغا بوون. ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی کوردانددنی ئەو جووتێرانە، تاڕادەیەك گریمانەی مێژوویی ئاڵۆزی گەرەکە، کە هیچ بەڵگەیەك لەوبارەوە بەدەستەوە نییە. زێتر واپێدەچێت

لەودتـەی کـورد هەیـە، جـووتێری کـوردو رەوەنـدی کـوردیش هەمیـشە شانبەشانی یەکدی هەبووبن.

F . جگەلەوە، مانـای ئـەوە نییـە ئیـدی هـەر کوردێـك رەعییـەتی هـۆزە کوردەکـان بـوو، جـووتێری ناخێڵەکی بێـت. لـەکن هەنـدەك لـەهۆزە مەزنـە پێکهـات سیاسـییە ئاڵۆزەکان، بنەماڵەی خـاوەن خانـەی کۆمەڵایـەتی جـوداواز هـەن. برێـك لـەو هۆزانـە مەزنایـەتی هێـزی داکشاوتری ئـەوتۆیی دەکـەن، کـە ئاسـتی پلـەو پایـەیان لـەنێوان هۆزێکی سـەربەخۆو وەرزێـرە ناخێڵەکییەکاندایـە. ئـەم دیاردەیـە هـەر لـەم بەنـدەدا بەنموونـەی پـشدەرییەکان روونکرایـەوە. شـێوازێکی لـەو بابەتـەش لای جـاف بەدیـدەکرێت، تایەفەیـەکی "جـافی رەسـەن" لەتـەك تایەفەیـەکی داکـشاوتردا. دیاردەیەکی دیکەی سەمەرەی لەو بابەتە، بـەڵام بەشێوازێکی دی، لای خۆرمەکـەکان بەدیدەکـەین: هۆزەکـە لـەکۆتایی سـەدەی نۆزدەهـەمو سـەرەتای سـەدەی بیـستەمدا پێکهاتێکی سیاسی تاڕادەیەك سەربەخۆی هەبووە. (هەر بڕوانە ئـەم بەنـدە)، (Firat لەبارەی ئەو دەمـەوە زانیـاری باوەڕپێکراومـان دەداتـێ). ئەوانـە وەرزێـر بـوونو زۆر لەمێژیش بووە نیشتەجێبوون، (با هەندەك خۆرمەك ئاژەڵداریش بـووبنو هاوینـان روویان لەئێلاخ کردبێت). لەگەڵ ئەوەشدا لەلایەن جیرانـە شـەڕکەرە رەوەندەکانـەوە بێ مشتومڕ ژێردەسـتە کـران. پلـەو پایـەی ئـەو هـۆزە هـیچ جوداوازییـەکی ئـەوتۆی دەگەڵ پلەو پایـەی وەرزێـرە ناخێڵەکییەکانـدا نـەبوو. وەلـێ هێـشتا دەگـەڵ کۆمەڵـە وەرزێرییەکانی وەکی (لۆلانو عەبدالان..... هتد)ی هەمان دەوروبەردا جوداوازبوون، چـونکە گـەورەو مەزنـەماڵی خۆیـان هـەبوو. لەسـەردەمی یەکـەم جـەنگی جیهانیـدا کرانە سوارەو بۆ یەکەمینجار عوسمانییەکان چەکیاندانێ، (چونکە عەلەوی بوون، تا ئەو دەمە مافی چەکهەلگرتنیان نەبوو). دەستدرایە پرۆسێسێکی یـاخیبوونو داوای سەربەسـتیی خۆیـان لـەهۆزی دەسـتەڵاتداری جـبران کـرد[١٥٠]. ئـەو پرۆسێـسە، وەك لەبەنـدی پێنجهەمـدا روونیدەکەمـەوە، برێـك تـینو تـاوی لەسـەر بزووتنـەوە پاشترەکانی ساڵانی بیستی کورد هەبوو.

g - جۆرێکی دی لە "تایەفە داکشاو" ەکان کە پێویستە باسکرێن، کۆمەڵە "قەرەج ئاسایییەکان"ن. ئەوانە پلەی کۆمەڵایەتییان هێجگار نزمە. هەتا بچوکترین وەرزێریش لێیان لووتەلایەو بەچاوی سووك تێیاندەڕوانێت. زۆر لەوانە رەوەندو بەکۆمەڵێکی دوو تا پێنج بنەماڵەییەوە دنیا تەیدەکەن. کەلوپەلی شکاو چاکدەکەنەوە، هێلەكو بێژنگو گسكو هەرامەی دی دروستدەکەنو خەریکی لۆتێتین[١٥١].

کوردەکان رەپو رەوان دانیپێدادەنێن، کە قەت ئامادەنیین دەگەڵ ئەو لانەوازە کەنارخراوانەدا ژنو ژنخوازی بکەن.

لەجزیرە لەنێو لانەوازە کەنارخراوەکاندا، لۆتییەکانیش (موتریب)، تاقمێکی تایبەت پێکدەهێننو ئەوانیش ئامادەی ژنو ژنخوازی نیین دەگەڵ قەرەچییەکاندا. هەرچەندە کۆمەڵگە ئەو لۆتییانە پەسەندناکات، کەچی لەشاییو بەزمدا پووڵی چاکیان دەدەنێ. لەکرماشان بەپێچەوانەوە، لەنێو تاقمە قەرەچییەکاندا هیچ جوداوازییەك نییە. لەوێ تاقە بنەماڵەیەك گشت ئەو ئەرکانە جێبەجێدەکات، کە لەشوێنی دی تایبەت بەلۆقو پەلە جوداوازەکانە.

هەڵکشانی پلەی کۆمەڵایەتی بۆ ئەو مرۆڤانە زۆر سەختو ئەستەمە، چونکە شێوەو روخساریانو رەنگی رەشتاڵەیان، رەچەڵەکیان لەقاودەدەن. لەگەڵ ئەوەشدا دەروازەی سنووری نێوان ئەوانەو کوردە راستەقینەکان، تەواو سەرکلۆم نەکراوە. برێکیان زەوییان کڕیوەو نیشتەجێبوونو ملیان دەبەر وەرزێری ناوە. هەتا لەشیرناخ ماڵە ئاغایەکی کورد هەیە، کە دەنگ وایە گوایە لەبنەڕەتدا موتریب بوونو بەلێهاتوویی و زۆرزانیی خۆیان ژمارەیەکی زۆر لەجووتێرەکانیان خستۆتە ژێر رکێفی خۆیانەوە. ئەگەر ئەو واتەواتە راستیش نەبێت، خۆی لەخۆیدا بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە شیمانەی هەڵگڕانی کۆمەڵایەتی بەرپێنەگیراوە. گەلەك موتریبو قەرەچی روویان لەبازێڕەکان کردووەو لەدەزگەکانی دەوڵەت، یاخود لەبواری بیناسازیدا کاریان چنگکەوتووە. هەرچەندە هێشتا هەر دەچەوسێنرێنەوە، وەلێ ئەو کارەی ئەنجامیدەدەن، هیچی لەکاری ئەو کوردانە کەمتر نییە، کە بەدووی

بژێودا عەودالٚ، بۆ باژێڕەکان رەویانکردووە. جگەلەوە واخەریکن ئیدی هێدی هێدی دەتوێنەوەو تێکەڵدەبن.

h ـ کاتێك Rich نێوی ئەو هۆزە دەپرسێت کە میرانی بابانی لێکەوتوونەوە، کۆمەڵێك وەرامی دژبەیەکی چنگدەکەوێتەوە، یەکێك لەو وەرامانە "کرمانج"ە. هەڵبەت ئەم نێوە بۆ چەند هۆزێکی ژێرووی کوردستان بەکاردەبرێت، نەك وەك هاوواتایەکی عەشیرەت، بەڵکە وەك نێو بۆ کۆمەڵە خەڵکێك.

Soane دەنووسێت: هەرچەندە کرمانجەکان پاکترین نەژادی کوردن، لێ تێکڕا بەگشت هۆزەکانی دی، کورد دەگوترێت[١٥٢].

لەژووروی کوردستانیش وشەی کرمانج زۆرجار بۆ دوو مەبەست بەکاردەبرێت:

١. وەك نێوێك بۆ هەموو ئەو کوردانەی بەزاراوی کرمانجیی ژووروو دەپەیڤن. لێ بەگشتی ئاخێوەرانی زازا لەوان هەڵدەبوێردرێن، هەرچەندە بەکوردیش دەزاندرێن. کرمانجی کۆمەڵە زاراوەکانی سەروو دەگرێتەوەو زازاو زاراوەکانی دیکەی خۆرهەلاتو خوارووە.

٢. بەشێوەیەکی گشتی وەك نێو بۆ مسکێنە ژێرچەپۆکخراوە رووتو رەجاڵەکان بەکاردەبرێت. بۆ نموونە وەرزێرە ناخێڵەکییەکانی شاتاق کە ژێرچنگۆڵەی گیرافییەکانن، کرمانجیان پێدەڵێن، بەلام گیرافییەکان خۆیان عەشیرەت یاخود ئاغایان پێدەگوترێت. بەوپێیە لەشیرناخو گوندانی دەوروبەری، بەوەرزێرە ناخێڵەکییە (نیشتەجێبووەکان؟) کرمانج دەڵێن، بەلام چوار تیرەکەی جلەوی سیاسیو ئابوورییانی بەدەستەوەیە، ئاغایان پێدەگوترێت.

ئەودەمەی بۆ یەکەمینجار چوومە شیرناخ، پرسیم داخۆ چ هۆزانێك لەوێندەرێ هەن، یەکێك پاش لێکدانەوەیەکی زۆر وەرامی دایەوە: "ئاغا" و "کرمانج". هەڵبەت لەنێوان ئەو دوو تاقمە ئامالٚ چینەدا، ململانێیەکی بەهێز لەسەر بەرژەوەندییە جوداکانیان لەئارادایە.

دیارە ئەو دوو لۆنەییەی وشەی کرمانج، کە لەباشوور بۆ خێڵەکییە داگیرکەرەکان (بەواتای "پاکترین" کورد)و لەباکوور بۆ کوردە ناخێڵەکییە ژێردەستکراوەکان

بەکاردەهێنـدرێت، نیـشانەیەکە بـۆ ئـاڵۆزیو رسـکاویی پەیوەندییـەکانی نێـوان دوو کوتە خێڵەکییو ناخێڵەکییەکانی کۆمەڵگەی کوردەوارییو وێنەیەکی سافیلکەو سادەو ساکاری تیۆرییەکی چینایەتی لێدەدرەوشێتەوە.

دۆستێکی کوردم کـە زاراوەکـانی مـسکێنو گـۆڕانو کرمـانجم لەگـەڵ شـیدەکردەوە، پاشـان دەگـەڵ ناسـیاوێکی خـۆی کـە لەخانـەوادە دەسـتەڵاتدارەکانی دزەیـی بـوو، باسیکردبوو. ئەو ناسیاوەی گوتبووی گوایە ئـەو سێ زاراوەیە لەنێوچەی دزەییـان (یـانی سـەرووی مەڵبەنـدی جـارانی گـۆڕان، لەکـەناری گردەڵانییـەکانی پـێش چیـا، لەزێواری کوردسـتانی راستەقینەدا)، گوزارە لەچەند دەسـتەیەکی جـوداواز دەکـات. مـسکێن ئـەو جـووتێرە بـێ زەوییانـەن، کـە بـەزەوی دەرەبەگەکانـەوە بەسـتراونەوەو پێبەنـدی ئـەوانن، زاراوەکـە بەرامبـەر وشـەی کۆیلـە دەوەسـتێتەوە. گـۆڕان وەرزێـری گەڕۆکی بێ زەوییـنو کەیو لەکوێ کاریان چنگکەوت، بەڕۆژانەو نانەسکی کاردەکەن. کرمانج بەزۆری وردە مالیکنو سەربەستن.

ئائەمە پڕاوپڕ دەگـەڵ ئـەو روونکردنەوەیـەدا دەگونجێت: دەوروبـەری سـاڵی ١٨٣٠ گەلـەك لەگۆڕانـەکان، دەفـەری سـلێمانییان بەجێهێـشتو بـەرەو ژوور کەوتنـەڕێ. لەکافاری هەولێر خۆی برێك وەرزێری کۆیلەکراوی لێبوون، بەڵام دەگەڵ گۆرانەکاندا چ خزمایەتییـەکیان نـەبوو. بەوپێیـە نێـوی گـۆڕان لێـرە بەسـەر ئـەو وەرزێـرە گەڕۆکانەدا دەبرا، کە زەوییان نەبوو، بەڵام وابەستەی دەرەبەگەکانیش نەبوون.

دیارە ئەمە ئەوە ناگەیەنێت هەرچی ئەوڕۆ بەگۆران ناسـراوە، رەوکـردەی باشـوور یاخود وەچەی ئـەوان بێـت. دەشـێت واتـای واژەکـە بـەرفراوان بـوو بێـت. پێدەچێت کرمانج لێرە ئەو کوردە خێڵەکییانەی ئێستا (یاخود ئەو خێڵەکییە کۆنانە) بـن، کـە لەو دەشتە جێگیربوونو بوونەتە خاوەنی زەوی خۆیان.

أ . لەمەوبەر لەچەند دەرفەتێکدا باسی ئـەو کایەیـەم کـرد، کە دەوڵەتـە هاوسێ بەهێزەکانی کورد لەبواری رێکخراوەی هۆزەکاندا دەیبیـنن، بەتایبـەت لەسـەر ئاستی سـەرکردایەتی هـۆز. کەواتــە پێدەچــێت پەیوەنــدیی نێــوان دەســتەو تاقمــە خێڵەکییەکانو ناخێڵەکییەکان تینو تـاوی دەوڵـەتی لەسـەربێت. Rich دەگێڕێتـەوە

كە لەسلێمانی بەخێڵەکییەکانیان گوتووە سوپاو بەوەرزێرەکان رەعییەت گوتراوە، (Rich: 1936، I، ل٨٨). Sandreczki یش زۆر ژووروتر لەکن هەرکییەکان هەمان دیاردەی دیتووە (1857، II، ل٢٦٣).

هەردووك زاراوەکە، سوپاو رەعییەت، لەولاتانی خۆرهەلاتی نێوەندد‌ا، دوو توێژە هەرە گرنگەکە دەستنیشاندەکەن، سەربازییەکان (کە باج نادەن)و باجدەرەکان (کە بەپلەی یەکەم جووتێرەکان دەگرێتەوە). لەئیمپراتۆرێتی عوسمانیدا سوپایی کەسێك بوو، کە وەك پاداشتێکی ئەرك بەجێهێنانە سەربازییەکەی، تیماری پێدەبەخشرا. واتە زەوی دەدرایەو وەرزێریشی بۆ رادەگیرا تا زەوییەکەی بۆ رەنێوبهێنن. لەبریتی مووچە، باجی لەوەرزێرەکانی وەردەگرت. لەسەرچاوە یاساییەکانی عوسمانیدا، گەلەکجار دەربارەی مەسەلەی لەرەعییەتەوە بوونە سوپایی، هۆشیاری دراوە، تا نەبنە خاوەنتیمار. پێدەچێت لایەنی کەم لەبرێك جێگەی ئیپراتۆرێتەکەدا رووداوێکی نائاسایی نەبووبێت. گەر ئەو جۆرە جێگۆرکێ چینایەتییەش لەکوردستاندا روویدابێت، دیارە دیاردەیەکی بێزۆك نەبووە.

**٢ـ سەرئەنجام**

گومان لەوەدا نییە، کە کوردەکان رەچەلەکێکی تێکەڵیان هەیە. لەو هەزاران ساڵانەی رابووردوودا، لەنێوچەکانی ئەورۆکەی کوردستاندا خەڵێکی زۆر لەرەگەزو زمانی جوداواز ژیاونو بەنێزیکە شوێنەواریان نەماوە. دەبێت زارو زیچیان لەنێو کوردەکانی ئەورۆدا بن. وەلێ من پێموایە هەڵەبێت، کە کوردی خێڵەکیو ناخێڵەکی بەوەچەو نوێنەری دوو گەلو دوو میللەتی جوداواز لێکبدرێتەوە، کە گوایە رەگەزی نێستای کوردیان پێکهێنابێت.

سەرچاوە سەرنجدەرەکان بەروونی پێشانیدەدەن، کە بەردەوام لەنێوان رەگەزو دەستەو تاقمە جوداوازەکانی نێوچەکەدا، بزووتنو چالاکیو تێکچرژانو پێداهەڵقژان لەئارادابووە. رێرەوو چرو پری ئەو بزووتنانە، دەشێت تارادەیەکی زۆر بەباری سیاسیو ئابووری هەر یەکێك لەو رەگەزو دەستەو تاقمانەوە بەندبووبێت.

**خشتەی ژمارە ٥ دیمەنی توێژە کۆمەڵایەتییەکانی کوردستانو ڕێرەوی بزووتنە کۆمەڵایەتیو تاقەکەسییەکانو دەستەو تاقمەکانمان بۆ ڕووندەکاتەوە. سێ توێژی کۆمەڵایەتی مەزن هەن: تاقمە خێڵەکیو ناخێڵەکیو قەرەچی ئاساییەکان. هەر توێژەو شیرازەی قووچهەڵچووی خۆی هەیە. لای وەرزێرەکان زێتر بەملکایەتی زەوییەوە بەندە. لای خێڵە ڕەوەندەکان، ڕوونو ئاشکرا هێزی سوپاییو دەستەڵاتی سیاسی زاڵە. برێك هۆز ژێردەستەی هۆزی دیکەن، ئەندازەی شیرازەی قووچهەڵچووی تاقە تاقەی هۆزەکان، لەیەکدی جوداوازن.**

**بزووتنەکان دەشێت ڕووەو تەنیشت بێت، (لەڕووی جوگرافییەوە، لەهۆزێکەوە بۆ هۆزێکی دی)، هەروەها دەشێت سەرەوژوورو سەرەوژێریش بێت.**

**خێڵەکییەکان نیشتەجێبوونو ملیان دەبەر وەرزێری ناوە، جووتێرەکان بوونەتە ڕەوەند. خەڵکانێك پوورەیان لەدەوری سەرکردەیەکی لێهاتوو بەستووەو هۆزێکی نوێیان پێکهێناوە. برێك هۆز چەپۆکیان بەسەر چەند هۆزێکی دیکەو هەندەك جووتێراندا گرتووە. تاکە تاکەی پیاوان، کەسانی سەر بەهۆزەکان، خەڵکانی ناخێڵەکی، بوونەتە پیاوو گوێڕایەڵی ئاغایەك. لایەنگرانی ئەم ئاغا، یا خەڵکە ڕەمەکییەکە، لەپرێکدا لەئاغایان یاخیبوونو لێیهەڵگەڕاونەتەوەو دەریانپەڕاندووەو ئاغایەکی دیکەیان لەجێ داکردووە، یا بەتۆپەڵ لەهۆزەکەیان جودابوونەتەوە.**

**یاسای تیرەگەری لای ڕەوەندەکانو بەئەندازەیەکی کەمتر لای شەرکەرانیش، شێوازێکی "سروشتیی" ڕێکخراوەیەکی کۆمەڵایەتییە.**

**بەگشتی هۆزە تازە پێگەیشتووەکان ڕەگەزێکی یەك توخمی هێند قووڵیان نییە. گەلەکجار هۆزەکان تەنها لەچەند هۆزێکی یەککەوتە پێکهاتوون، (کە خزمایەتی لەنێوان ئەندامەکانیاندا نییە)، لەدەوری بنەماڵەیەکی ڕێبەر، یاخود چەند بنەماڵەیەکی کەم خڕدەبنەوە.**

**گەر هۆزەکە دێرین بێت، ژنو ژنخوازیو دەرپێتێکەڵی، خوێنی ئەندامانی تێکەڵدەکاتو هێدی هێدی لقەکانی دەبنە تیرەی نیمچە ڕاستەقینە. ئابەو چەشنە ئیدیۆلۆژی هاوئاهەنگیو هاوچارەنووسی خێڵایەتی بەرینتر دەبێت. لەکن ئەو خێڵە**

نیشتەجێبووانەی کە ماوەیەکە شەڕیان نەگێڕاوە، شیرازەی تیرەگەری لاوازتردەبێت، بەتایبەت گەر لەلایەن هۆزێکی دییەوە ژێرچەپۆك خرابن، یانی ئیدی تیرەی خۆ، دەستەڵاتی سیاسی لەدەستداوە. کەسێك سەر بەهۆزێك بێت یاخود نەبێت، پێوەرێکی ڕەهانییە، بەڵکە خەسڵەتێکی ڕێژەییەو لەنێوان ئەو دوو پلەیەدا هەڵبەزو دابەزێکی بەردەوام هەیە.

### ٣ـ ١ـ هۆزی کورد

لـەم بەنــدەدا تــین‌و تــاوی دەوڵەتــەکانی دەوروبــەر لەســەر هـۆزە کوردەکــان یەکالادەکەینـەوە. لـێ بەرلـەوەی بێینـە سـەر باسـی ئـەوەی داخـۆ هـۆزە کوردەکـانی ئەورۆ، لەکایەی کۆمەڵایەتی‌و سیاسییاندا، هەتا چ رادەیەك منـەتباری پەیوەنـدییانن بەوڵاتە هاوسێکانییانەوە، باشتر وایە جارێ باقەیەك لەو خەسڵەت‌و سیمایانەیان، کە لەبەندەکانی دیدا دیاریمانکردن، پوختەکەین:

١ـ خێڵەکییـەکان جـوداوازی لـەنێوان خۆیـان‌و ناخێڵەکییەکانـدا دەکـەن. دیـارە "خـێڵ" لەتـەك واتـا رەســەنەکەی خۆیـدا، مانــای "ئەریــستۆکراتی سـوپایی"ش دەگەیەنێت.

٢ـ هەڵبەت پەیوەندییەکی توندو تۆڵ، بەڵام نـەك بـێ سنوور، لەنێوان خێڵـەکی‌و شوانکاراکانداو خێڵەکی‌و نیوەکۆچەرەکاندا لەئارادایە.

٣ـ لەرووی پێکهاتەوە، سیمای شیرازەیەکی خانەخانـەو چـەند تـوێیی زاڵە. ئەمـە تایبــەت لــەکاتی دوژمنایــەتی‌و کێــشە گەلەییــەکان‌و شــەڕە دەســتەڵاتی رێبــەرە سیاسییەکاندا، ئاشکرا دەبێت.

٤ـــ ئــەم خەســڵەتە راســتەوخۆ لەئیــدیۆلۆژیی یــەك تــوخم‌و تۆوییـــەوە سـەرهەڵدەگرێت. رەنگـە تـەنها لەچـەند حاڵەتێکـدا (هەنـدەك هـۆزو تـیرەی گچکەو دێرین) برێك لەئەندامانی لەبەرەبابێك کەوتبنەوە، دەنا گشت لەگشتیان ئاوها نیین.

٥ـ دیـارە لەرێگـەی دابـی ژن‌و ژنخـوازی‌و دەرپێتێکەڵییـەوە لـەنێوخۆداو لەسـەر ئاستێکی بەرتەسك، تـاوەکو دەگاتـە خانـەو توێـژەکانی خـواری خـوارەوە، خەسـڵەتی یەك توخم‌و تۆوی پتەوتر دەکرێت.

٦ـ لەسەر ئاستی هۆز خۆی، یاخود لقە هەرەگەورەکانی، زۆر بەدەگمەن هەڵوێستی پێکڕایی‌و تێکرایی وەبەردەگیرێت.

٧ـــ گــرنگترین یەکــەی ئــابووری لەخانــەوادە بــەرەوژوور (لــەکن رەوەنــدو نیوەکۆچـەرەکان)، هۆبـەو گونـدن. گونـد وەکـی پـەلێکی هـۆز یـا تایەفـە وایـە، بـەڵام پێدەچێت هۆبە یەککەوتەیەکی هەمیشەیی‌و بەردەوام نەبێت.

٨ـ یەكپارچەیی خاكی هۆز، كە خەسڵەتێكی لاوەكییـە، هەمیـشە لەئارادا نـەبووە. دەشێت لقـەكانی هۆزێـك زۆر دوور لەیەكدییـەوە بـژین، دوور نییـە چـەندین هـۆزو تـیرەی جـوداوازیش لەسـەر پارچـەخاكێك نـەژین. لـەو حاڵەتـە بیژۆكانـە دەرچـێت، ئیدی هۆزو مەڵبەندەكەی پێكەڵپێكی یەكدینو زۆربەی كات یەك نێویان هەیە.

٩ـ كەسایەتی سـەركردە لەهۆزێكـەوە بـۆ هـۆزێكی دی دەگۆڕێـت. زۆربـەیان تاقـە سەرۆكێكی مەزنیان هەیـە، هەرچـەندە كایـەو ئـەركی تـەواو روون نییـە. پێدەچێت سـەرەكهۆزەكان لەكۆنـدا كایەیـەكی گرنگتریـان هـەبووبێت. لەڕاسـتیدا پلـەو پایـەی پەیوەستە بەشەڕو كێشەو هەڵلای نێو هەناوی هۆز خۆیەوە. لـەگن هـۆزە گـچكەكان، زۆربـەی كـات ئاغـای سـەرەكهۆز خـزمو كەسـی ئەنـدامانی هۆزەكەیـەتی، بـەڵام لـەگن هـۆزە گـەورەكان جـۆرێكی دییــە، زۆرجــار ســەرەكهۆزەكە لەرەچــەڵەكێكی بێگانــە بەهۆزەكە كەوتۆتەوە.

١٠ـ سەرەكهۆز یاخود سـەرۆكی یـەكێك لەلقـەكانی هـۆز، تـەنها دەسـتەڵاتی سیاسـی نییە، بەڵكە بەشێوەیەكی گشتی پایەیەكی ئابووری پڕبڕێویـشی هەیـە. شـوانكارەكان گـشت سـاڵێك دیـاری خۆیـانی بـۆ دەهێـنن (چـەند سـەرێك ئـاژەڵ). وەرزێرەكـان، چ خێڵەكییەكانو چ ناخێڵەكییەكان، پشكێكی چاكی داهاتیـانی دەدەنـێ. بڕێكجار ئاغا وەك خاوەنملك وەرزێرەكان تەواو تەواو دادەدۆشێتو دەیانڕووتێنێتەوە.

١١ـ لەبڕێك نموونەوە، ئەو راستییە دەچریسكێتەوە كـە ئەنـدامانی هۆزەكـە، زێـتر ملكەچو پێبەندی سەرۆك خۆیین، نەك هۆزەكە.

(بەڵگـە ئەوەیـە بڕێـك هـۆز لـەژێر فەرمانـدەی سـەرۆكێكی كارامـەو بـەتوانادا، بەشێوەیەكی سەیر پەرەیئەستاندووە، لـێ هەر لەگەڵ نەمانی ئەو سـەرۆكەدا، ئیـدی هۆزەكەش تەفرو توونا بووە).

١٢ـ سەرەكهۆزەكان بۆ بەرفراوانكردنو پتـەوكردنی دەسـتەڵاتو شـوێنپێی خۆیـان، دەگەڵ بڕێك هێزی دەرەكییدا رێكدەكەونو دەبنە هاوپەیمان. زۆركات لەو رێگەیەوە چ نەتـەوەیو گوردێرەكـانی نێـو هۆزەكـەی خۆیـانو چ ئەوانـەی هاوشـانو هاوسـێیان

(ئیدی لەڕیزی هۆزەکاندا بن، یاخود لەڕیزی پارتە سیاسییەکاندا)، بەچەترسێن دەکرێن و پرزەیان لێدەبڕێت.

زۆری ئەم خەسڵەتانە دەچنەوە سەر سیما تایبەتەکانی شوانکارە ڕەوەندەکان و هاوچەشنی هۆزە ڕەوەندەکانی شوێنانی دیکەن. برێک خەسڵەتی سەرۆکایەتی و توێژە کۆمەڵایەتییەکان، ئاکامی برێک ڕووداوی مێژوویی و هەندەك پێشهاتن. لەم بەندەدا ئەو ڕووداوە مێژووییە گرنگانە هەڵدەشێلین، کە گەلەکجار بە "نەریت" ێك لێکدراونەوە تین و تاوێکی چاکیان لەسەر شیرازەی کۆمەڵگەو پێکهاتی هەبووەو هەیە. هەوڵدەدەم گرنگترین گۆڕانە سیاسییەکانی چوار پێنج سەدەی رابوردووی کوردستان پێشچاوبخەم. دیارە بەڵگەو سەرچاوەکان زێتر بەلای ئەوەدا دادەشکێنن، کە پێکهاتی نێوخۆی هۆزە کوردەکان لەسەربنەمای پەیوەندییەکی کۆنی ئەو هۆزانە بەدەوڵەتەکانی هاوسێیانەوە هەڵچووبێت.

سەرچاوەی توێژینەوەکانم وتووێژم دەگەڵ زۆر پیرە کوردا، ژمارەیەك گریمانەیان لاڕسکاندم و رووبەڕووی پرسیارێکیان کردمەوە: هۆزەکان چۆن لەلایەن دەوڵەتانەوە کاریان تێدەکرێت؟

بەرلەوەی دەست بەلێکۆڵینەوەی ئەو هەموو سەرچاوە مێژووییانە بکەم، هەوڵدەدەم ئەم گریمانەیە (یاخود باشترە بڵێم ئەم هەڵشێلانە)، لەسێ بەشەکەی داهاتوودا شیبکەمەوە. بەوپێیە دەتوانرێت وەك بنەمایەکی ئەم تێزە، لەهەڵشێلانە مێژووییەکەی کۆتایی ئەم بەندە بڕواندرێت. دیارە تەنها بەشێك لەو بەڵگەو سەرچاوانەی گریمانەکە پشتی پێبەستوون، دەتوانرێت لێرەدا پێشچاوخرێن، کە لەهەڵبژاردنیاندا دووپێوەر ڕێبەربوون:

a ـ دەبێت باسی قۆناغە گرنگەکانی مێژووی کورد بکات و پەیوەندی بەو هۆزو میرنشینانەوە هەبێت، کە لەمێژووی کورددا کایەیەکی گرنگیان هەبووە.

b ـ دەبێت ئەو پرۆسێسانە روونبکاتەوە، کە گریمانەکە خەریکێتی.

دیارە ناشێت خودی سەرچاوەکە بکرێتە سەنگی محەکی ئەو گریمانەیەی لێیهەڵهێنجراوە. بەڵام وەك دەبینین، بەپێی ئەو بەڵگەو سەرچاوانەبێت، گریمانەکە

هێجگار گونجاو دێته پێشچاو. من بۆخۆم بەئارەزوو هیچ بەڵگەو سەرچاوەیەکم کەنار نەخستووە، کە ئەوەیان لێبوەشێتەوە گریمانەکە بەرپەرچ بدەنەوە، هەوڵیشدەدەم بابەتەکان بەفراوانییەکی تەواوو بەڕیزە پێشچاوبخەم، بەشێوەیەکی وا، کە بێدەردیسەر بتوانرێت جۆرێکی دیکەش رێکخرێت و گریمانەی دیکەشی لێهەڵهێنجدرێت.

### ٣ـ ٢ـ هۆزەکان یەکەیەکی سەربەخۆنیین

ئەگەر لەحاڵەتێکدا باوەڕبەوەش بهێنین، کە گوایە هۆزێکی "رەگەز پوختی" "بێ تین و تاوی دەرەکی لەسەر" هەبووبێت، بواری ئەوە نییە هیچ یەکێك لەهۆزە کوردەکانی ئەوڕۆ بەرەچەڵەك بگێڕینەوە سەری. هەتا لەدوورترین و کەنارکەوتووترین و رێتێنەبردووترین قوژبنی کوردستانیشدا، هۆزی "رەگەز پوخت"ی لەوبابەتەمان پێپەیدا ناکرێت. خۆ دیارە قەت ناشێت و ناشکرێت هۆزانێکی شیرازە تێکەڵ و ئاڵۆزی وەك پشدەرییەکان و هەمەوەند و جافەکان بە "رەگەز پوخت" دابنرێن. بەڵام دەشێت بگەینە ئەو باوەڕەی، کە هۆزەکان لەدێرینترین دەستەو تاقمانێك کەوتوونەوە، کە قۆناغی خێڵایەتی و حوکومەتی دەستەڵاتداری پڕ زەبرو زۆردا، قەتیس ماوەو برێك کارگێڕو کارمەندی لێرەو لەوێیان هەیە. گەر باوەڕ بەو پێشرەوتەی قۆناغی گەشەکردنەکە بهێنن، رەنگە برێك پێچ و پەناو لەڕیزلادانی شیرازەی پێکهاتی هۆزە کوردەکان روونکەینەوە.

بۆ نموونە شیرازەی کۆمەڵایەتی و سیاسی شێواز ئاڵۆز، زێتر لەو ئاقارانەدا دەدیترێن، کە دەکەونە نێوان دەشتاییەکان و کێوەکانەوە. بەپێچەوانەی ئەوەوە، لەنێوچە شاخاوییە سەرکەشەکان و دۆڵەکپە کەم رێتێبردووەکانیدا، زێتر شیرازەیەکی سادەو ساکار زاڵە.

گەر وەك پێگەو سەرەتایەك بەو گەشەو پێشرەوتە رازیبین، ئەوا بەرەو توێژینەوەی هۆکارە رێگرەکان، یاخود هۆکارە یاریدەدەرەکانی گەشەکردنی دەزگا سیاسییەکان رێبەریماندەکات. هەرچەندە من ناخوازم نکۆڵی لەوە بکەم، کە

گەشـەكردنە جوداوازەكـە لـەوبوارەدا كايەيـەكى كاريگـەرى هـەبووە، بـەڵام بـەدوورى نازانم ئەو گەشەو پێشرەوتە لەلايەنێكەوە تارمايى بەسەر هۆشدا نەهێنێت، ئەويش لەبـەر تاقـە هۆيـەك: چـونكە هـۆزە كوردەكـان بـەو پلـەو قۆنـاغى گەشـەكردنە نەگەيـشتوون، كـە بيانگەيەنێتـە ئاسـتى دەوڵـەت، بەڵكـە دەگـەڵ گـشت جوداوازييەكياندا، خۆيان لەخۆياندا قوتكراوەى دەستى وڵاتانى هاوسێيانن.

بەشـێكى چـاكى ئـەم بەنـدە، بـۆ روونكردنـەوەى ئـەو بۆچـوونەى سـەرەوە تەرخاندەكرێت. هەوڵدەدەم دەريخەم، كە هۆزەكـان هەنـدەكجار پڕاوپڕ قـوتكراوەى دەستى دەوڵەت بوون، ياخود وەك زۆرجار روويداوە، مۆركى نەسڕراوەى جێپەنجەى دەوڵەتيان پێوەدياربووە. بۆ يەكـەمينجار كـاتى لێكۆڵينـەوە مەيدانييەكەم، كەوتمـە سـەر ئـەو بـيرەو ئـەو بـاوەڕەم لەلاڕسكا، پاشـانيش تێـڕوانينو پـشكنينى هـوردى سەرچـاوە مێژووييـەكان زێـتر دڵنيـاو پـشت ئەسـتووريانكردم. دواتـريش هـەمان بۆچـوونم <<بەهۆشـيارييەكى بـەجێوە>> لـەگوتارێكى گرنگـى Morton Fried دا بەرچاوكەوت[1].

Thompson ى مێـژوونووس لـەبوارى ديـسپلينى هاوسـێيەتيدا دەريـدەخات، ئـەو شيرازەيەى پێكهاتى سياسى هـۆزە جەرمەنييـەكان، كـە Tacitus باسـيدەكات، ئاكـامى گەشـەكردنێكى خۆبـەخۆ نـەبووە، بەڵكـە بەكاريگـەرێتىو تـينو تـاوى ئيپراتـۆرێتى رۆمـانى بـووە، كـە پێـشتر پەيوەنـدى بازرگـانيى لەگەڵـدا دەسـتپێكردووەو بۆتـە هاندەرێكى چاكى[2].

تاڕادەيەك ئيتنۆلۆجەكان درەنـگ پـەييان بـەو تينوتـاوە زۆرە بـرد، كـە دەوڵـەتان كردوويانە سەر شيرازەى نێوخـۆى ئـەو هۆزانـەى پێوەنـدييان دەگەڵيانـدا هـەبووە[3]. لـەوە سـەيرتر ئەوەيـە، كـە ئـەو وەچـە ئيتنۆلۆجـە كۆنانـە، خۆيـان كاربەدەسـتى حكومـەت بـوونو لـەبڕێك پێشهاتدا راستەوخۆ بەشـداربوونو ئاگايانـە هەوڵيانـداوە تـينو تـاوى دەوڵـەت برەوپێبـدەن. نووسـەرە كلاسـيكەكانى خۆرهـەڵاتى نێوەنـدو خۆرهەڵاتناسـە بـەرۆكرەكانيان، شـكۆداركردنى بڕێـك هـۆز بەفـەرمانى شـاهانە، بەديارەديـەكى زۆر ئاسـايى تێگـەيون. ديـارترين نموونـە هـۆزى شاهـسەڤان (شـا

خۆشەویستان)ە، ئەو هۆزە یەککەوتە تورکەی ئەورۆ لەئازربایجانی ئێراندا دەژێت. وەك لەنێوەکەیەوە دەبریسکێتەوە، ئەمە ئەو تیپە بوو کە شا عەبباسی صەفەوی دەوروبەری ساڵانی ١٥٩٠ لەبەئەمەکترین و دڵسۆزترین لایەنگرانی دایمەزراند[٤]. نموونەیەکی دی هۆزی چەمشکەزەکی خۆراسانە، کە پێدەچێت لەتێکەڵەیەکی کوردی رەچەڵەك جوداواز پێکهاتبێت و هەر لەلایەن هەمان شا عەبباسەوە خڕکرابنەوەو کۆنفیدراسیۆنێکی خێڵەکییان لێپێکهێنرابێت و نێردرابنە خۆراسان و کرابنە یاساوڵی سنوور. تا چ رادەیەك ئەم زانیارییە مێژووییانە راستن و داخۆ بەڕاستی ئەو یەککەوتەیە بووە هۆزێك و تا چ ئەندازەیەك تازەکوورە بوو، مەسەلەیەکن توێژینەوەیان هەروا ئاسان نییە.

ئەوەی زێترو چێتر تۆمارکرابێت، ئەو نموونانەن کە دەستەڵاتی دەوڵەت راستەوخۆ دەستی تێکەڵی کردەوەی سیاسی هۆزێك کردووەو لەو رێگەیەوە شیرازەی پێکهاتنی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری هەڵگێڕاوەتەوەو گۆڕیویەتی. بەو جۆرە پیادەکردنی یاسای مڵکایەتی زەویوزار، یاخود دامەزراندنی سەرەکهۆزێك لەپایەیەکی فەرمانداریێتی دەوڵەتدا، ئاکامی زۆری لێکەوتۆتەوە. هەتا لەحاڵەتێکیشدا گەر دەوڵەت راستەوخۆ دەستی تێکەڵ نەکردبێت، تەنها بوونی دەوڵەتێکی کامڵ و خەملیوو رایەڵکردنی داوی پەیوەندی دەگەڵ هۆزێکدا، بەس بووە بۆ سەرهەڵدانی گۆڕران لەشیرازەی هۆزەکەدا. نموونەی دراماتیکانە بۆ ئەو حاڵەتە، داکەوتن و رەواج پەیداکردنی دراوو پووڵە.

جگە لەوە هۆزەکان لەوڵاتانی خۆرهەڵاتی نێوەنددا، هەمیشە کایەیەکی گرنگیان هەبووە. بەنێزیکە گشت لەگشتی رژێمە پاشایەتییە دەرەبەگییەکان، لەلایەن سەرەکهۆزەکانەوە دامەزراون، بەپشت و پەنای هێزو توانای هۆزەکانیان، دەستەڵاتی دەوڵەتیان سەپاندووەو سەقامگیریانکردووە. ئەوەبوو دواهەمین دوو رژێمی دەرەبەگانەی خێڵەکی مەزن، تا ساڵانی بیستی ئەم سەدەیەش بریان کرد، تا لە ١٩٢٣دا ئەتاتورك دوا فەرمانڕوای عوسمانی، سوڵتان محەمەد وەحیدەدینی چوارهەمی سەرەنگریێ کردو رژێمەکەی هەڵتەکاند. دووساڵ دواتریش رەزاخان دواهەمین پاشای

قاجار، ئەحمەد پاشای هەڵدێرا، (پاشان خۆی تاجی پاشایی لەسەرنا، هەرچەندە ڕەزاخان سەرەگهۆز نەبوو، بەڵکە سەرباز بوو).

هەتا ئالەو دواییانەشدا، ساڵی ١٩٦٣، ڕژێمی ئێران لەرێگەی راپەڕنێکی ئامانج سیاسیانەی قەشقاییەکانەوە (کە کۆنفێدراسیۆنێکی خێڵەکی مەزنی باشووری ئێرانە)، تەواو تەواو خرایە غەرغەرەوە.

**٣ـ ٣ـ نموونەی چەندبارەوە بوو:**

**هۆزەکانو دەوڵەتانی خۆرهەڵاتی نێومند**

گەر برێك سادەو ساکارانە بێژین، دەتوانین کردەوە سیاسییەکانی ئیمپراتۆرێتەکانی خۆرهەڵاتی نێومند بەهەمیشە پاتەکراوە نێوبەرین. ئەو گریمانانەی ئیبن خەلدونو Pareto[٦] دەربارەی پاتەبوونەوەو پەیدابوونی بەردەوامی دەستەی هەڵکەوتەو هەڵبژارتە (Elite ) دایانڕشتووە، گەر چاو لەو فەرامۆشییەیان بپۆشین، کە لەبواری گەشە کۆمەڵایەتیو ئابوورییەکاندا نواندوویانە، ئەوا دەتوانین بڵێین دەگەڵ ئەزموونەکانی ئەم سێهەزار ساڵەی دوایی خۆرهەڵاتی نێومنددا، تاڕادەیەکی زۆر ڕێکدێنەوەو ئامانج پێکن. میرنشینو پاشانشینەکان کاتێك سەرنگوومبوون، کە خێڵەڕەوەندەکان یاخود ڕەشەخەڵکەکە، بەزۆر بووبێت یان بەشێوازێکی دی، دەستەڵاتیان لەدەستی ڕێبەرو سەرکردە لاوازو کزو کەنەفتەکان راپسکاندووە[٧] و خۆیانکردۆتە چینی نوێی دەستەڵاتدار. پاش چەندین وەچە، ئەو دەستە هەڵکەوتووە نیشتەجێبووانە، هێدی هێدی وزەو مەیلو ئارەزووی جەنگاوەرانەیان لەدەستداوەو دەستەڵاتی سیاسییان دارماوە. هەر ئەو دەمانە تاقمێکی دیکەی هۆز دەستەڵاتیان گرتۆتە دەستو میرنشینێکی نوێیان دامەزراندووەو کۆمەڵێکی دی سەرکردەو ڕێبەری سیاسی هەڵبژارتەی نوێ هاتوونە گۆڕێ، کە گرنگترین شەقڵو خەسڵەتی تاقمە هەڵبژارتەکەی بەرلەخۆیان بەمیرات بۆماوەتەوەو بەباڵایان بڕراوە. ئەو گیانو هەستە خێڵەکییەی بنەماو بناغەی زۆربەی میرنشینو پاشانشینەکانی خۆرهەڵاتی نێومند، جێپەنجەیەکی زەقی لەسەر

جەستەی دەزگـە دەوڵەتییـەکانی دوای خـۆی نەخـشاندووە. بـەو پێیـە زۆرچـاك دەتوانرێت بگوترێت دەوڵەتانی خۆرهەڵاتی نێوەنـد، فـوتکراوەی دەسـتی هۆزەکـانن، دیـارە پێچەوانەکەشی هـەر راسـتە. کەواتـە وەك چۆن برێـك هـۆزی کـوردو (هـۆزی دیکـەی خۆرهـەڵاتی نێوەنـد) وێنەیـەکی لەبـەرگیراوەی سـادەو سـاکاری دەوڵـەتانی هاوسێن، هەر ئاوهاش وڵاتانی خۆرهەڵاتی نێوەند، هێشتا هەر خەسڵەتی خێڵەکییانە نێقدەدەنـەوە. دەوڵەتـەکانو خێڵـەکان پێکـراو پێبـەپێی پەیوەندییـەکی بەرامبـەر، هەڵچوونو گەشەیانکردووە. گومان لەوەدا نییە کە هۆزەکـان (لایـەنی کـەم جـۆرێکی تایبـەت لـەهۆزەکان) لـەرووی مێژووییـەوە پێشقەرەوڵی دەوڵـەتان بـوون، لـێ ئەمـە ئەوە ناگەیەنێت، کە هۆزەکان بەو شێوازەی ئەورۆکەیانەوە بەشێك بـوون لەقۆناغـە دێرینەکانی پێشرەوتە کۆمەڵایەتییەکە. دیارە دەوڵـەت جێگـەی هـۆزی نەگرتۆتـەوە، بەڵکـە هـەردوکلایان پێکـراو شانبەشـانی یەکـدیو پەیوەسـت پێکـەوە، هـەنو رەوتـدەکەن[٨].

یـــەکێك لەســـیماکانی گـــشت ئیمپراتۆرێتـــەکانی خۆرهـــەڵاتی نێوەنـــد، جوداوازیکردنیانـە لـەنێوان دەسـتەی جـەنگاوەرانو توێـژاڵی فەرمانبـەران[٩] دەگـەڵ رەشەخەڵکەکەدا. دووپەلکەییەکی لەو بابەتە، وەك لەبەندی پێشوودا باسکرا، لـەکن کـوردە خێڵـەکیو ناخێڵەکییـەکان (و بەیدەسـتکراوەکانی دیـش)، لەئارادایـە. هـەتا هەمان ئەو زاراوانەش بـەکاردەبرێن. ئـەوەبوو لـەبرێك جێگەی کوردستان، بـەپێی دابـی سوارچـاکانەو فیۆدالانـەی ئیمپراتـۆرێتی عوسمـانی، بەخێڵەکییـەکان سـپاهی دەگوترا[١٠]. (دیـارە لەتـەك زاراوی نێوچـەی بـاوی وەك گۆرانو کرمـانجو مـسکێندا)، ناخێڵەکییە ژێرچەپۆکخراوەکان بەگشتی زێتر رەعیيەتیان پێدەگوترێت، زاراوەیـەك کە لەزۆربەی وڵاتانی موسڵماندا بۆ دەستنیشانکردنی خەڵکە رەمەکییـە باجدەرەکە بەکاردەبرێت.

هـەتا شـەقڵی بیرۆکراتییانـەش هەسـتپێدەکرێت، دەشـێت ئاغـای هـۆز کوێخایـەك بەسەر هەرگوندێکییەوە دابنێتو بیانکاتە دەمراستو سەرکاری خۆیو نوێنەرایەتی بکەن، کوێخاش بۆی هەیە میرزایەكو راوێژکارێك راگرێت. هـەتا لەسـەردەمی ژیـانی

میرنشینە کوردەکاندا، برەو بەو بیرۆکراتێتیە دەدراو لاسایی نازنێوو نیشانەو پلەو پایەکانی ئیمپراتۆرێتی فارس‌و عوسمانییان دەکرایەوە.

یەکێك لەوهۆیانەی کە بیرۆکراتێتی لەکەش‌و مەودای کۆمەڵگەی خێڵایەتیدا، بەپاشکەوتوویی‌و نەخەملیوی هێشتۆتەوە، ئەوەیە کە کەوشەنی هۆز هێند فراوان نییە. گەلەك پێشهات‌و رووداوی هەژارو تازەکوورە، دەکرێت یەکەوڕاست لەلایەن سەرۆکهۆزو خۆیەوە رابپەڕێندرێت، کە دیارە بۆ پێکهاتی بەرینتر لەتوانادا نییە.

هۆکارێکی دی ئەوەیە کە زۆربەی زەوی‌و کێلگەکانی کوردستان دێمەکارن‌و پشت بەباراناو دەبەستن. گەر سەکۆو بناوانیش هەبن، کەم‌و گچکەن. ئەو سیستێمە ئاودێرییە فراوانانەی لەئێران‌و میسۆپۆتامیادا هەبوون‌و گوایە رێگە خۆشکەری بیرۆکراتییەکی بەرفراوان بوون، لێرە نەبوون.

توێژە سەربازییەکانی ئیمپراتۆرێتەکانی خۆرهەڵاتی نێوەند، زێتر لەشوانکارە رەوەندەکان‌و جەنگاوەرانێك پێکهاتبوون، کە بەردەوام لەنیوەدورگەی عارەب‌و پشتێنە گردەڵانییە وشك‌و قاقڕەکانی ئۆیرۆئاسیاوە قەتارەیان دەبەست. گەلەکجار ئەو کۆمەڵە هۆزە تازەگەیشتووانە، مشووری دەستەڵاتدارانی نوێیان بۆ ئەو وڵاتانە دەخوارد.

رەنگە یەکێك لەشەپۆلە رەوکردووە ئاری نەژادەکان، هەوێنی راستەقینەی پێکهاتی رەگەزی کوردەکانی ئێستا بووبێت. ئەو کۆچکردووانەی بەمیدیایی‌و فارس ناسراون، لەدواهەمین چارەکی دووهەزار ساڵ بەر لەعیسادا، رێگە باریك‌و تەنگەبەرەکەی نێوان قەوقازو دەریای قەزوێنیان تەیکردو بەرەوخوار داکشان‌و لەخۆرئاوای ئێراندا گیرسانەوە. پێدەچێت دەستەڵاتدارە رەسەنەکانی نێوچەکە بەهاتنیان خۆشحاڵ بووبن، ئەوەبوو ئامێزیان بۆ جەنگاوەرەکانیان کردەوەو ئامێری جەنگی خۆیان پێ نوێکردنەوەو بۆ خزمەتی خۆیان خستیاننەگەڕ. لەبری وی کێلگەو لەوەڕگەی خۆیان پێببەخشین[11]. ئەمە ماوەیەکی خایاند، هەتا ئەو تازەهاتووانە <<یاخود بەشێکیان>> توانییان ببنە چینی دەستەڵاتداری ئەو کۆمەڵگە رەگەز تێکەڵاوە. ساڵی ٦١٢ بەر لەعیسا، میدییەکان پاش صەدان ساڵ شەڕو

تێکبەربوونیان دەگەڵ ئاشوورییەکاندا، نەینەوای پێتەختیان گرتو تالانیانکرد[12]. ماومیەك سەرووی میسۆپۆتامیایان خستە ژێر رکێفی خۆیانەوە. هیچ دوورنییە بەپشتیوانیی سوپای میدی، تەنها رەوەند ئاژەڵدارەکان نا، بەڵکە بەشێك لەمیدییە نیشتەجێکانیش، بەرەو خۆرئاوا رەویان نەکردبێتو لەنێوجەرگەی کوردستاندا نیشتەجێ نەبووبن[13].

هەڵکەوتو پێکهاتە سرووشتییەکەی کوردستان، دەیکاتە نێوچەیەکی سەر زێوارکەوتووی چەندین ئیمپراتۆرێت. هەر ئەو هەڵکەوتە بۆ هێزە دەرەکییەکانی سەختو ئەستەم دەکات، کە بتوانن دەستی بەسەردابگرنو بەتەواوی بیخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە. بەنیسبەت ئیمپراتۆرێتی میسۆپۆتامیاوە، کوردستان هەمیشە سنووری باکوورو باکووری خۆرهەڵاتی بووە. (ئاشوورییەکان ئەو مەڵبەندە باکورییانەیان داگیرکرد، کە کەوتوونە خۆرئاوای کوردستانی نێوەندی ئەورۆوە). لەم دووهەزارو پێنجسەد ساڵەی دواییدا، کوردستان کەوشەنی لێکدابڕی نێوان ئێرانو ئیمپراتۆرێتە مەزنەکانی (وەك رۆمە یۆنانییەکانو بیزەنتییەکانو عوسمانییەکان)ی ئاسیای گچکەبوو. کێوەکانی کوردستان کانگای دووهەمی "جەنگاوەرە خێڵەکییەکان" بوو، کە لەلایەن وڵاتانی هاوسێوە رادەگیران.

(دیارە گوتم <<کانگای دووهەم>>، ئەگەر بۆم هەبێت بیابانەکانی عارەبو گردەڵانییەکانی ئۆیرۆئاسیا بەکانگای یەکەم دابنێم).

ئەمە بەدڵنیاییەوە لەسەردەمی هاتنی میدییەکانەوە ئاوهابوو، هەرچەندە پێدەچێت لەوەبەریش هەر ئاوها بووبێت. مێژوونووسە ئاشوورییەکان باسی پاشای نایریو جەنگاوەرە عەگیدە مێرخاسەکانی مەڵبەندی ئەورۆکەی کوردستانی نێوەند دەکەن. لەسەرتاسەری مێژووی ئیسلامدا بەردەوام سەرکۆزە کوردەکانو هۆزەکانیانمان دێتەوە پێشچاو، کە لەخزمەتی دەستەڵاتدارییە مەزنەکانی دەوروبەریاندا هەڵسووڕاون[14].

نێودارترینیان صەلاحەددینی ئەیوبی بوو، کوردێکی سەر بەهۆزی رەوادی، کە ژەنەراڵێکی ئۆردووی تورك بوو لەشەڕی دژی خاچپەرەوەرندا. ساڵی ١١٧١ خەلافەتی

فاتیمییه شیعەکانی میسری تێك و پێکداو خۆی کردە سوڵتانی نوێی سوننییەکان و تاجی پاشایی لەسەرنا. پاشان سووریاشی خستە ژێر رکێفی خۆیەوەو کردیە بەشێك لەقەڵەمڕەوەکەی. بەرۆگرەکانی تا ساڵی ١٢٤٩ لەمیسرو تا ساڵی ١٢٦٠ لەحەڵەب، حوکمڕانییانکرد.

دیارە ناکرێت صەلاحەددین* وەك نموونەیەکی شیاوی ئەندامی هۆزە کوردەکان وەربگرین، کە چۆتە ریزی سوپای یەکێك لەئیمپراتۆرە هاوسێکانەوە. چونکە ئەو سەرەکهۆزێك نەبوو، هەتا لەکوردستانیش لەدایك نەبووە، بەڵکە لەتکریت (لەکوتە عارەبییەکەی عیراق).

هەڵبەت لەهەڵگەڕان و دەستکەوتنی دەستەڵاتدا، منەتباری کارامەیی و لێهاتوویی خۆیەتی لەبواری سوپاییداو چاکەی نورەددینی ئەتابەگی، کە فەرمانڕەوای سەربەخۆی حەڵەب بوو، دەنا هیچ هۆزو خێڵێك کۆمەککارو پشتیوانی نەبوو.

ئەو هەموو سەرەکهۆزانەی لەژێر فەرماندەیی ئەودا بەپلەوپایەی نزمتر رازیبوون و خزمەتیان دەکرد، دیاردەیەکی ئاساییە. رەنگە بەوهۆیەوە کە نەتوانراوە رەچەڵەکی بگێڕدرێتەوە سەر خانەدانانی هۆزەکەی، مسۆگەرکردنی پشتیوانی هۆزەکانی دی ئاسانتربووەو گشتیان بۆی بەبەینەت بوون. پلەوپایەی تارادەیەك لەپلەی ئەو شێخە دەچێت، کە شکۆو سەروەریی، تخوبی هۆزی بەزاندووە. ئەم بەسەرکەوتنی لەشەڕی کافراندا (دژی خاچپەروەران) شکۆو سەروەریی هێجگار زێدیکردو بەدژایەتیکردنی فاتیمییە گومڕاکانیش، پایەی ئایینیی هەڵکشا.

زۆربەی ئەو هۆزانەی سوپاکەیان پێکدەهێنا، کوردو بەشێکی زۆریان تورك بوون. لەنێوان ئەو دوو تاقمەدا بەردەوام کێشەو ئاشووب بوو. دیارە صەلاحەددین هەرگیز پرکێشی ئەوەی پێنەدەکرا دەستبەرداری بەشێکی مەزنی سوپاکەی ببێت، بۆیە قەت نەیدەوێرا رەگەزی کوردانەی خۆی لەقاوبدات. کەواتە فەرمانڕەوایەتی

---

* لەرۆژگاری دەستەڵاتدارێتی سوڵتان مەسعودی سەلجوقیدا، یەکێك لەکاربەدەستانی سوڵتان، پاراستنی قەڵای تکریت بەشادی باپیرە گەورەی ئەیوبییەکان ئەسپاردووە، بەوهۆیەوە ئەو بنەماڵەیە لەتکریت گیرساوەتەوە. بڕوانە: "شەرەفنامەی هەژار"، ل١٢٥.

ئەیوبییەکان فەرمانڕەواییەکی کوردانە نەبوو، بەڵکە فەرمانڕەواییەکی موسڵمانانە بوو.

### ٢ـ ٤ـ نموونەی چەندبارەوە بوو:
### پەیوەندی نێوان مەڵبەندو کەنارەکانی
(Zentrum und Peripherie)

لەهەرێمە کەنارکەوتووەکانی دەوڵەتانی خۆرهەڵاتی نێوەنددا، لەگۆڕینی تاقمی هەڵکەوتەو هەڵبژارتەدا، هەست بەجۆرە پرۆسێسێکی وێکچوو دەگەڵ ئەوانەی ئەو مەڵبەندانەدا دەکرێت، کە پێوەندییەکی پتەویان لەگەڵیاندا هەیە. لەو کەنارانەدا کایەو رۆڵی هۆزەکان هێشتا زرپو زۆپن، لێ جوداوازییەکی ئەوتۆیان نییە. هەرگۆڕانکارییەك لەحوکمرانیی پێتەختدا روودەدات، وەك دیاردەیەکی تایبەتی، هاندەری ئەو پرۆسێسە تێیدەڕوانرێت، کە لەهەرێمە کەنارکەوتووەکاندا، بەردەوام روودەدات.

بەگشتی جوداوازییەك لەنێوان شێوازی حوکمڕانیی مەڵبەندو هەرێمە کەنارکەوتووەکانیدا لەئارادایە. سیمای دەستەڵاتدارییەکی نێوەندی لەنێوجەرگەداو شێوازی دەستەڵاتدارییەکی وابەستەی ناڕاستەوخۆ، لەهەرێمە کەنارکەوتووەکاندا زاڵە. کوردستان لەوەتەی هەیەو هەتاکو ئێستاکەش، هەمیشە هەرێمێکی کەنارکەوتەی ئەو دەوڵەتانەبووە، کە پێیانەوە جووتباقەکراوە. بۆیە گۆڕانکارییەکانی ئەوێ، لێرە بێئاکامو بێسەرئەنجامی گرنگ نابن. رەنگە هەر بەو جۆرو شێوازە، پێشهاتەکە لەگشت هەرێمە کەنارکەوتووەکاندا رەنگبداتەوە.

بەشێوەیەکی گشتی، حوکمڕانە نێوەندییەکە لەنێو دەستەڵاتدارانی هەرێمەکەدا بەئارەزووی خۆی برێك کەسان هەڵدەبژێرێتو ئەرکی فەرمانڕەواییان پێدەسپێرێت. چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەو کارە، بەپێی کاتو شوێن دەگۆڕرێت.

لێرەدا دەبێت بەوپەڕی بەرفراوانی لەواژەی "وابەستەیی" بگەین. گشت پێوەندییەکی نێوان رژێمو گەل لەڕێگەی ئەو داردەستانەوە دێتەدی، ئەوانیش لەو

ڕوانگەیەوە بەشێوەیەکی بەرین، چەندێتیو چۆنیەتی دەستەڵاتیان دەگۆڕن. ئەوانە بۆ ئەوە ڕاگیراونو دابەستراون، تا لەڕەشەخەڵکەکە باجو سەرباز بۆ ڕژێمی نێوەندی کۆکەنــەوە، لەبەرامبــەر ئــەوەدا تاڕادەیــەکی زۆر دەســتیان بەرهەڵــداکراوەو سەربەخۆییان پێدراوە. تەنها داخوازییەکی لێیاندەکرێت: "پێبەندیو وابەستەییە". لەبری وی گشت پشگیریو کۆمەکێکی دەوڵەتیان لەمەڕ داخوازە نێوچەییەکانیان، بۆ مسۆگەردەکرێت.

ئــەو ســەرەکخێڵانەی دەوڵــەت پــشتیوانییان لێناکــات، تــەنها لەڕێگــەی تڵێنــەوە حوکمڕانی دەکەن (هەرچەندە دەستو پێوەندو چەکداری زۆر، تۆڵەی کەم تڵێنی دەکاتــەوە)، لــێ ئەوانــەی دەوڵــەت دەیانلاوێنێتــەوەو پلــەو پایــەو نیــشانیاندەداتێ، دەستەڵاتێکی فرەیان هەیەو بواری کەشو فشەیان زۆرەو چاکیش خۆ دەنوێنن.

ئەمانــە لەئــەرکی سەرشــانیاندا بەرامبــەر دەوڵــەت، (ئــەرکی بــاج کۆکردنــەوەو ســەربازگرتن، هەمیــشە خــەریکی قاچوقووچــنو گەلــەك لــەوە زێــتر دەســتێنن، کــە دەوڵەت داوای دەکات).

دیــارە لەڕێگــەی ئــەو دەســتەڵاتو شــێوازە ســەپاوانەوە کــە بۆیــان لــواوە، بوونەتــە کۆپیو بەرماوێکی ڕێکخراوی دەوڵەتــە نێوەندییەکــە. ئــەمانیش بۆخۆیــان کۆمــەڵێك سەرەکهۆزو سەرخێڵی گچکەتر وابەستەیانەو پێوەندیی نێوانیان ئاوێنەیەکە، وێنەی پێوەندیی خۆیانو دەستەڵاتدارە نێوەندییەکە ڕەنگپێدەداتەوە.

ئابەو پێیە، پێوەندییەکی تاڕادەیەك ئازاد دەگەڵ دەوڵەتــدا، کارێکی هێجگار زۆر دەکاتە سەر پێکهاتە سیاسییەکە، هەتا دەگاتە ڕیزەکــانی خــواری خــوارەوەش. لەتــەك تینو تاوە سیاسییەکەی دەوڵەتدا، کاریگەرێتی تــینو تــاوە ئابوورییەکــەش زۆر زەقو زاڵە.

بازرگانیو پووڵ هەڵڕشتنو بەرهەمی نــوێ، زێــتر لەخزمــەتی برەوپێــدانو جێپــێ قایمکردنی ئەو توێژاڵە کۆمەڵایەتییــەدان، هەرچــەندە ســەرتاپای پرۆســێسەکە خــۆی لەخۆیــدا پێــشبینی ئــەوەی لێناکرێــتو ئــەو ئاکامــەی لێناچریــسکێتەوە. دیــارە میکانیزەکردنی بواری کشتوکاڵ، دوا ئاکامی ئەو تینو تاوەیە، بەڵام تاقە ئاکام نییە.

سەرەکخێڵێکی گچکە کە دەبێتە وابەستەی دەوڵەتێکی بەهێز، هیچێکی ئەوتۆی نییە لەدەستی بدات، لێ بواری شڵپەو مشەی دەستکەوتێکی چاکی بۆ دەڕەخسێت. هەرچەندە رەنگ هەیە کەمێك سەربەستی خۆی لەدەست بدات، وەلێ بەبرەوپێدانی دەستەڵاتی، بەتێرو تەسەلی تۆڵەی بۆ دەکرێتەوە. دیارە کوردستان بەوە لەزۆر نێوچەی کەنارکەوتەی دی جودادەکرێتەوە، کە سەدان ساڵە مایەی شەڕو تێکبەربوونی چەندین زلهێزە، ئەوە بواری ئەمبەرو ئەوبەرو ئەمسەرو ئەوسەرێکی چاکی بۆ دەستەڵاتدارە نێوچەییەکان رەخساندووەو تاڕادەیەك کەمەکێك سەربەخۆبوونی بۆ مسۆگەرکردوون. بڕێکجار توانیویانە ئەو زلهێزانە بەگژیەکدا بکەنو بەشەڕیانبدەن، هەرچەندە ئەوە بازییەکی خەتەرناکە، بەلاَم دەشهێنێت.

لەمارتی ١٩٧٥دا، گشت جیهان تەماشاچی ئاکامێکی دراماتیکانەی ئاوها بازییەك بوو، کاتێك دوو هێزە نەتەوەیەکەی ئێرانو عێراق (کە خۆیان لەخۆیاندا وابەستەو دنەدراوی ئەمریکاو شووروەوی بوون) لەجەزائیر پێکهاتنو بەوە میرنشینە وابەستەکەی بارزانی[16] لەچەند رۆژێکی کەمدا هەرەسی هێناو دارماو صەدان هەزار کوردی عیراق لەسنوور پەڕینەوەو ئاودیوی ئێران بوون. ئێران کۆمەکی بەبارزانی دەکرد تا لەو رێگەیەوە بتوانێت زەبرێکی سیاسی گورچووبڕ لەعیراق بوەشێنێت، کە لەمێژبوو بەشەڕ هاتبوون. بارزانی بەوەی کە هەمیشە درزێکی ئاواڵەی بۆ رژێمی عیراق هێشتبووەوە، توانیبووی لەبواری پێوەندیی دەگەڵ ئێراندا، تاڕادەیەك سەربەخۆیی خۆی بپارێزێت. ئالەو رووەوە، بارزانی تەنها شوێنپێهەڵگری ژمارەیەکی زۆر لەسەرەکهۆزە کوردەکانی بەرلەخۆی بووە، کە بناوانەکەی لەتەمومژو تاریكو بوومەلێڵی دێرینەی مێژوودا گومە.

بوونی زێتر لەزلهێزێك لەنێوچەکەدا، ململانێو کێشمەکێشو دوژمنایەتی سەرەکخێڵە گچکەکانی مەڵبەندە کەنارکەوتووەکەی خەستتر کردۆتەوەو تاوو تینی لەسەری زۆرە. کاتێك نەتەوەیو گوردێری سەرەکهۆزێك دەداتەپاڵ دەوڵەتێكو

دەبێتە وابەستەی، سەرەکهۆز هیچی پێناکرێت، ئەوە نەبێت کە بداتەپاڵ دەوڵەتێکی دی (یاخود دەوڵەتانێکی دی)و پشتگیرییان مسۆگەربکات.

دژایەتیو دوژمنایەتی ئەو سەرەکهۆزانە لەنێوخۆیاندا، دەبێتە ماكو هەوێنی وابەستەییو پێبەندییان بەو دەوڵەتانەوە. ئەو وڵاتانەی گەرەکیانە جێپێی خۆ لەکوردستاندا بکەنەوە، هەمیشە وێڵی دووی وابەستەیەکن، کە دوژمنو ناحەزی وابەستەی وڵاتەکانی دیکەبێت. بەوجۆرە نەتەوەیو ناحەزە نێوچەییو مەڵبەندییەکان، تا ئەوپەڕی سنوور پشت بەگێرمەو کێشەی وڵاتانی هاوسێو دوور دەبەستنو بەو پێیە دەبنە پێبەندو وابەستەیان.

هێشتا لەهیچ کوێ مرۆڤم نەدیتووە، هێندەی کورد ئاوها ئاگادارو هۆشیاری ململانێو شەڕە دەستەڵاتی نێو دەزگەی دەوڵەتەکانی لەمەڕ خۆیانو وڵاتانی دیکەی جۆربەجۆربن. تا ئەوڕۆش بەردەوام بیرلەو شەوە خۆشە دەکەمەوە کە بەپرسیاری هورد دەربارەی پێوەندیی ئەودەمەی ئەمریکاو شوورەویو چین بۆژۆیانکردم. لەهەوارێکی رەوەندەکان بووین، کە هیچ یەکێکیان هێشتا قوتابخانەیان نەدیتبوو. لەگەڵ ئەوەشدا تاڕادەیەك شارەزاییەکی باشیان هەبوو، گشت رۆژێك هەواڵەکانی دەنگوباسی وێزگەی چەند وڵاتی جۆراو جۆریان گوێ لێدەگرتو ئەوجا دەکەوتنە مقۆمقۆ لەسەر نێوەڕۆکەکەیو شییاندەکردەوە. دیارە گرنگ بەلای ئەوانەوە ئەوەبوو، چ شیمانەیەکی سەربەخۆبوونی کوردستان لەو هەواڵانە هەڵدەوەرێت، (با دامەزراندنی دەوڵەتێکی وابەستەش بێت).

پێبەندیو وابەستەیی لەو بابەتە بەدرێژایی مەودای سوودو دەستکەوت چنینەوەکە بڕدەکات. هەرکات ئەو دەستکەوتانە چوڕبڕبوون، ئیدی دەدرێتەپاڵ هێزێکی دی، یاخود جاری سەربەخۆبوونی تەواو دەدرێت. هەر هێزە نێوەندییەکە کزو لاواز بوو، ئەوجا وابەستەکانی کەنارکەوتەی دەکەونە بزۆزیو نیشاندانی ئارەزووی سەرخۆبوون. رەنگە بەسەرزارەکی هێشتا دڵسۆزیو بەئەمەکییان راگەیەنن، لێ بەردەوام نێوکی ئەو ئەمەکە هەڵدەکۆڵنو نێوەرۆکی پووت دەکەنەوە. لەپڕ سەرپێچی لەباجدان دەکەن، کۆمەکی سوپایی دەبڕنو هەردەرفەت

بوو، بەو پەڕی ئاشکرایی، بانگی سەربەخۆیی هەڵدەدەن. لێ ئەگەر ئەو لاوازییەی هێزە نێوەندییەکە نەتەم بوو، ئەوا بەزوویی پێبەندیو وابەستەیی خۆیان رادەگەیەننەوە.

گەر دەستەڵاتی نێوەندیی بەزوویی نەسەپێتەوە، لەدەڤەرە کەنارکەوتووەکاندا چەندین هۆزی سەربەخۆو دەوڵەتۆچکە سەرهەڵدەدەنو بڕێکیان پەل بەسەر ئەوانی دیدا دەهاوێژنو بەڕادەی دەوڵەتێکی تەواو دەپەنمنو گەشەدەکەن. کەواتە دارمانو داڕوخانی ئیمپراتۆرێتێک، چەندین دەوڵەتی نوێی کەنارکەوتەی لێدەکەوێتەوە، کە هەریەکەیان وێنەیەکی لەبەرگیراوەی گچکەڵەی کۆنە ئیمپراتۆرێتەکەن. بەڵام مەرج نییە تەنها کۆنە وابەستەکان ببنە فەرمانڕەوای سەربەخۆ. ئەو ئاشووبو ئاژاوەیەی لەدارمانی دەستەڵاتە نێوەندییەکە دەکەوێتەوە، گرژبوونو قووڵبوونەوەی دژایەتیو دوژمنایەتی کەسایەتییە مێملەکانی یەکدی لەهەرێمە کەنارکەوتووەکاندا، رێگە بۆ سەرهەڵدانی لەپڕو خێرای سەرکردەو رێبەرێکی نوێ خۆشدەکات.

بۆ روونکردنەوەی ئەم پرۆسێسە، پەنا دەبەمە بەر رووداوە مێژووییەکەی میرنشینی مەڕەوانییەکان، ئەو میرنشینە کوردەی سەدەیەکی تەواو، دەوروبەری (٩٨٥ تا ١٠٨٥) بەشێکی مەزنی کوردستانی سەربەخۆ حوکمڕانی دەکرد[١٧]. دەستەڵاتی نێوەندی لەم حاڵەتەیاندا بەدەست خەلیفەی عەبباسییەکانی بەغداوە بوو.

لەبەغدای پێتەخت، بومیهییەکان کە میرنشینێکی دەیلەمی بوو، ساڵی ٩٥٥ جڵەویان گرتەدەستو دەستەڵاتی لاوازی خەلیفەیان بووژاندەوە. بەڕەسمی هەر خەلیفە پێشەواو سەرفوماندان بوو، لێ لەڕاستیدا سەرەگوریسی دەستەڵات بەدەستی بومیهییەکانەوە بوو. سەریان بەحەمدانییەکان نەویکرد، کە میرنشینێکی عارەبی بوو، ماوەیەکی زۆر سەربەخۆ فەرمانڕەوایی بەشی باکوورو نێوەندی میسۆپۆتامیایان دەکردو (هەتا سێ ساڵ بەغداشیان حوکمڕانی دەکرد). بومیهییەکان فەرمانداریێتی حەڵەبو موسڵیان دایە دەست دوو لقی خانەوادەی حەمدانییەکان. ئەمانە هەمیشە لەهەڵپەی ئەوەدابوون، کە سەربەخۆبوونی تەواو وەدەست بهێننو

نێوچەی دەستەڵاتیان بەرینتربکەن. ئەو دەمانە لەرِیزی موسڵمانانندا، فاتیمییەکان کە لەقاهیرە حوکمرِانییان دەکردو سوریاش لەکەوشەنی قەڵەمرەوی ئەواندا بوو، سەرسەختترین دژو دوژمنی عەبباسییەکان بوون.

سێهەمین ئیمپراتۆریتی ئەودەمە، ئیمپراتۆریتی بیزەنتی بوو. دوو پاشانشینە نیمچە سەربەخۆکەی ئەرمەن، یەکێکیان لەئەنی بەنێوی میرنشینی بەقرەدییەوەو ئەوی دی لەڤان بەنێوی ئەرتسرونیانەوە، کایەیەکی ئەوتۆیان نەبوو.

هەڵبەت نابێت لێرەدا هۆکاری ئایینی فەرامۆشکرێت. خەلیفەکانی عەبباسی هەرچۆن بووبن، لەلایەن گشت موسڵمانە سوننییەکانەوە وەك سەرکردەو رێبەر پەسەندکراون، واتە وەك سەرکردەی دنیایی‌و دینی. بوەیهییەکان‌و ئەو ئۆردووانەی بۆ گرتنەدەستی دەستەڵات کۆمەکیان پێدەکردن، شیعەی دوازدە ئیمام بوون، کە دوورنییە یەکێك نەبێت لەو هۆیانەی ئاوها لەکن زۆربەی هەرمزۆری کوردە سوننیەکان دزێوو ناپەسەندی کردبوون. فاتیمییەکان، شیعەی ئیسماعیلی حەوت ئیمام بوون. کەواتە هاوئایینزایی، حەمدانییە سوننییەکانی لەنێو گشت هێزە دەرەکییەکاندا کردبووە پەسەندترینیان.

دەربارەی دامەزرێنەری میرنشینی مەرِەوانی، هێندە دەزانین کە کوردێك بووە بەنێوی باز یاخود بادەوەو لەبنچینەدا شوانکارە بووە، پاشان بۆتە جەردەو بەتاقمێك لەپیاوەکانییەوە بازێرِی ئەرچیش Ercis و برِێك بازێرِی گچکەی دیکەی نێزیکی سنووری ئەرمێنیایان داگیرکردووەو لەجێگەیەکی دیدا بەپێشەوای هۆزی حومەیدی نێودەبرێت. دیارە چ پێویست بەپەرچدانەوەی ئەو پایە نزمییەی ناکات: لەو جێگانەی دەوڵەت سەرەکهۆز دەستنیشان ناکات، بۆ هەلگرانی خێرا لەکۆمەلگەدا، هیچ بەرهەڵستێك نییە لەق نەکرێت‌و هەڵنەقەندرێت. لەنێو هۆزە کوردەکانیشدا، گەلەکجار هەتا زارۆکانی سەرەکهۆزیش، بەرغەل دەلەوەرِێنن.

لەسەروەختی حوکمرانی عدود الدولە ی بوەیهیدا، کە دەستەڵاتدارێکی زەبر بەدەست بوو، باد لەکێوەکان خۆی داگرت‌و هێور لێیدانیشت، پاش مردنی عدود الدولە دۆست‌و لایەنگرانی فرەی لێخرِبوونەوە[٨]. هێرشی بردەسەر بازێرِی

میافارقین، (سلڤانی ئەورۆ)، کە ئەودەم والییەکی مەڕەوانیی حوکمڕانیی دەکرد، ساڵی ٩٧٣/ ٩٧٤ بێ دەردیسەر شارەکەی گرت، چونکە دانیشتووانی ئالیکاریی و پشتگیرییان دەکرد. پاش ماوەیەکی کورت نێوچە پڕ خێرو بێرەکانی ئامەد (دیاربەکر)و نوصەیبینیشی خستە ژێر رکێفی خۆیەوە. برایەکی خۆی کردە قوماندانی میافارقین و خۆی بەرەو باشوور هێرشی بردو موسڵی داگیرکردو ئەو ئۆردووەی هەڵبڕی، کە بوەیهییەکان و حەمدانییەکان لەدژی کۆیانکردبووەوە. هەتا بەغداشی خستە مەترسییەوەو هەڕەشەی گرتنی کرد، وەلێ شکاندیان و ناچاری پاشەکشەبوو، گەڕایەوە بۆ میافارقین. پاشان ئەو قوماندانەی ناچارکرد، کە بۆ راوەدوونانی نێردرابوو، گشت لەگشتی دەڤەری دیاربەکری بۆجێبهێڵێت[١٩].

حەمدانییەکان هیچ چارەیان نەما، ملیانداو بەومرازیبوون کە بەشی زۆری خاکەکەیان بەباد دۆڕاند. پاشان لەسەر ئەوە رێککەوتن کە باد ئاقارەکانی باشووری فەرمانڕەواییەکەی خۆی، (تۆرعابدین و جەزیرە)، وەك وابەستەیەکی حەمدانییەکان، حوکمڕانی بکات. دیارە ئەوانیش بۆخۆیان وابەستەی بوەیهییەکان بوون و منەی دەرفەتێکیان دەکرد بۆ پساندنی داوی وابەستەیی و وەدەستهێنانی سەربەخۆیی[٢٠]. کە سامسام الدولە ی بوەیهی لەساڵی ٩٩٠دا مرد، حەمدانییەکان هەوڵیاندا دەرفەتی رەخساوی کزی و لاوازی دەستەڵاتی نێوەندی بقۆزنەوەو سوودێکی لێهەڵهێنجن. جارێ هەوڵیاندا ئەوەی بەبادیان دۆڕاندبوو، لێیبستێننەوە. باد لەنێزیکی کێوەکانی تۆرعابدین، ئۆردووەکەی کۆکردەوەو پێوەندیی بەموسڵاوییەکانەوە کرد (کە دیارە هاوئامانجی بوون). رەنگە ئەگەر لەشەڕگەی کێوەکانی تۆرعابدیندا نەکوژرابا، توانیبای موسڵ داگیربکات[٢١].

پاش خۆی سێ خوارزاکەی، یەکەیەکە حوکمڕانییان گرتەدەست و جێگەیانگرتەوەو توانییان بەرپەرچی هێرشە دەرەکییەکان بدەنەوەو تێکیانشکێنن، (ئەوەبوو بیزەنتییەکان هەوڵیاندا کەناری سەرووی گۆلی ڤان بخەنە ژێرچنگی خۆیانەوە). دوژمنایەتی و دژایەتی نێوخۆ جووتەبرای یەکەمیان کەنەفت و لاواز کردبوو، تا برای سێهەم، ئەبونەصر توانی بەسەر تەگەرەکاندا زاڵبێت و هێمنی و

ئاسایش بەرقەرار بکات. سەردەمی درێژی حوکمڕانییەکەی، لەساڵی ١٠١٠ەوە تا ١٠٦١ بەقۆناغی خۆشگوزەرانیو گەشەو شکۆفەی کولتوور دادەنرێت. لەڕێگەی پەیوەندیی دۆستانەیەوە دەگەڵ قەیسەری بیزەنتیو خەلیفەو بوەیهییەکاندا، توانی جێپێو زەمینەی دەستەڵاتی خۆی پتەوو قایم بکات[٢٢]. لەیادی سێهەمین ساڵی حوکمڕانیو سەقامگیربوونی دەستەڵاتیدا، هاوکات نوێنەرانی هەرسێ زلهێزەکە بەدەستو دیاریو لەقەبو نیشانەوە ڕوویانکردە کۆشكو سەراکەی، (کە لایەنی کەم تەنها بەنێو دەیانکردە وابەستەی خۆیان). سەرەتا نوێنەری خەلیفەو بوەیهییە پارێزەرەکانی چوونە کنی. دیاری زۆریان پێبوو، جبەو جلکی خاوەنشکۆیان، لەقەبی ناصر الدولة، ئەوجا ودمێك، کە نێوی گشت شارو شارۆچکەو قەڵاکانی دیاربەکری تێدا نوسرابوو.

چەند ڕۆژێك دواتر، نێردراوی ئەبوعەلی مەنصوری حوکمڕانی فاتیمی بەدەستو دیارییەکی فرەوە گەیشتو لەقەبی عیزز الدولة ی بۆ هێنابوو. پاش چەند ڕۆژێکی دی نێردراوی باسیلیۆسی قەیسەری بیزەنتی بەدیاری دانسقەو نایابەوە گەیشت. ئەو دانپێدانانەی سێ زلهێزەکەی ئەو سەردەمە، هۆکارێکی بنجی بوون بۆ سەربەخۆبوونی ئەبونەصرو برەو پەیداکردنی دەستەڵاتو بەهێزبوونی حوکمڕانییەکەی[٢٣]. نامەدیشی خستە سەر خاکی خۆیو خاوەنشکۆیانە حوکمڕانیی دەکرد، هەروەکی حوکمڕانانی قاهیرەو بەغدا[٢٤]. دەستوپێوەندە بیرۆکراتەکانی لەجێگەو مەڵبەندە جوداوازەکانی جیهانی ئیسلامەوە خڕبووبوونەوە.

پەنابەرانی سیاسی بەخێردەهێنرانو خۆشهاتنیان لێدەکرا، بەوە ئەو حوکمڕانییە نوێیەیان کردبووە دەوڵەتێکی کۆسمۆپۆلیتی.

مەخابن سەرچاوەکان هیچ زانیارییەکی بەکەڵکی ئەوتۆمان دەربارەی شیرازەو پێکهاتی نێوخۆی دەوڵەتی مەڕەوانییەکان پێناگەیەنن، وەکی ڕەگەزی سەربازانیو ڕەچەڵەكو تێکەڵی دانیشتووانی.

Minorsky (کە پێدەچێت لە ابن الآسیری مێژوونووسیەوە وەرگرتبێت)، باد بەپێشەوای حومەیدییەکان نێودەبات و دەڵێت بۆ دواهەمین جەنگی دژی حەمدانییەکان، ژمارەیەکی زۆری کوردی بەشنەڤی کۆکردبووەوە[٢٥]. لەگوتەکانیەوە

ئـەوە دەدرەوشـێتەوە، کـە گوایـە دەبێـت پـشکی هـەرەزۆری سـوپاکەی لەجـەنگاوەرە خێڵەکییـەکانی کـورد پێکهاتبێـت. بـەڵام دانیـشتووانی باژێڕەکـان زۆربـەیان کـورد نەبوون، پشکی هەرە زۆریان فەلەو جوو بوون[٢٦].

ئەبوعـەلی، یەکـەمین بـەڕۆگری بـاد، گازنـدەی ئـەوە دەکـات، کـە دانیـشتووانی میافـارقین، بەتایبـەت "تورکـە گێلـە بوودەڵەکان" پـشتی ئـەویان نـەگرتووە، بەڵکـە داویانەتـەپاڵ حەمدانییـەکانو هـەتا دژی سوپاکەشـی جـەنگاون. هـەر هەسـتیان بـەوەکردبێت کـە سـەربازێك یـاخود کـوردێکی دی بەچـاوێکی نـزم تێیانـدەڕوانێت، دەستبەجێ کوشتوویانە، بێ ئەوەی هیچ پرسێك بەفەرمانڕەوا بکەن[٢٧].

پشکی زۆری جووتێرەکانیش فەلـەبوون، (لەئاسوورییە یاقوبییـەکانو ئەرمەنییـە گریگۆرییەکانو برێك فەلەی سەر بەکڵێسەی ئۆرتۆدۆکسی یۆنـانی بـوون)[٢٨]. هـیچ پێناچێت کە ئەو دەمانە کورد لەو ئاقـارە خـەریکی وەرزێـری بـووبن، چونکە وەکی میللەتێکی کێونشین باسدەکرێن، کە بەپلەی یەکـەم لەسـەر ئاژەڵـداریی‌و جـەردەیی‌و راوو رووت ژیاون[٢٩].

کەواتـە توێـژە سـوپاییەکەی دەوڵـەتی مـەڕەوانی، زێـتر لـەکوردە خێڵەکییـەکان پێکهاتبوو. وەرزێرو پێشەگەرو بازرگانـەکان، زێـتر فەلـەو جـوو بـوون. فەرمانبـەران زێتر عارەب‌و دواتریش فەلە ئاسوورییەکان بوون.

پەیوەندییـەکانی خاوەنـدارێتی لـێڵ‌و نادیـارن، روون نییـە داخـۆ مەڕەوانییـەکان قەت زەوییان بەکرێداوە یان نا، داخۆ بەچ مـەرج‌و لـەکام حاڵەتـدا. تـەنها کۆپلەیـەك لەمێژووکەی أبن ألآزرق دا هەیـە، کـە باسی وازهێنـان لەمڵکایـەتی زەوییـەك دەکـات، بەڵام ئەمەش تەنها حاڵەتێکی تایبەتییە.

پاش مردنی ئەبونەصر کارامـەترین کوڕی، کە ئەبولقاسـم بـوو، بـووە بـەڕۆگری. وەلێ کوڕەکەی دیکەی کە نێوی سەعید بوو، ئاژاوەیەکی زۆری نایـەوە، تـا بـەپووڵ‌و زەوی دڵیدرایەوەو رازیکرا[٣٠].

فەرمانبەرانی شارەکانی دیکە، کەسانێك بوون لەمەڵبەندەوە دەستنیـشان دەکـران، کـە زۆربـەی کـات خـزم‌و کەسـی خانـەوادە دەسـتەڵاتدارەکەی میافـارقین بـوون.

دوورنییە وەکی فەرماندە سوپاییەکانی ئۆردووە خێڵەکییەکان، لەبریتی مز، زەوییان نەدرابێتێ (بەکرێ)، وەکی لەوڵاتە ئیسلامییەکانی دیکەدا باوبوو، هەرچەندە هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نییە.

بەمردنی ئەبونەصر، دەوڵەتی مەڕەوانییەکان پێینایە قۆناغی دارمانەوە. گرنگترین هۆکاری دەرەکی، پەیدابوونی تورکە سەلجووقییەکان بوو لەخۆرئاوای ئێران و میسۆپۆتامیادا. ئەم رەوەندە جەنگاوەرانە، بەتامەزرۆییەوە جەردەییان دەکرد. توغرول بەگی مەزن و سەرکردەیان نەیدەتوانی بەر بەم ئارەزووە شیرینەیان بگرێت، تەنها هەوڵی خاوکردنەوەیانی دەدا. ئەبونەصر دەگەڵ دوو ژەنەراڵی سەلجووقیدا، کە توغرول بەگ خاکی مەڕەوانییەکانی بەکرێدابوونێ، بەشەڕهات و توانی دەریانپەڕێنێت. چەلێك دواتر سەلجووقییەکان موسڵیان گرت و تاڵانیانکرد. ئەبونەصر هەمدیسان بەسەریاندا سەرکەوت و لەشاری بەدەرنان. ساڵی ۱۰۵۵ توغرول بەگ بەغدای گرت و لەناکاو لەجێگەی بوەیهییەکان، سەلجووقییە سوننیە توندڕەوەکان بوونە پارێزەری خەلیفە. ئەبونەصر ناچار بوو بەپووڵ و دیاری، گەردنی خۆی لەکن توغرول بەگ ئازادبکات و رازی بکات لەنیازی گرتنی وڵاتەکەی پەشیمانبێتەوە. لەبەزم و هەرای شەڕە تەختی ئەبولقاسم و سەعیدی کوڕانی ئەبونەصردا، سەعیدیان پشتگیری توغرول بەگی مسۆگەرکردو بەسوپایەکی مەزنی سەربازانی تورکەوە گەمارۆی میافارقینیدا. وەلێ ئەم ئۆردوومش بەپووڵ رازیکرا: کە سەعید خۆی بەبڕێك مڵك رازی بوو، ئیدی سەربازە سەلجووقییەکانیشی بە۵۰ هەزار دینار رازیکران و کشانەوە[31].

پەلهاویشتنی سەلجووقییەکان لەوکات و ئان و ساتانەوە دەستیپێکرد. هێرشی سەرەکییان بۆ سەر بیزەنتییەکان بوو، وەلێ پێخوستی شەڕەکە خاکی مەڕەوانییەکان، یاخود خاکێکی هاوسێیان بوو، بۆیە ئارامی لەبەر ئەبولقاسم هەڵگرتبوو. ساڵی ۱۰۷۱ سوڵتانی سەلجووقی ئاڵپ ئەسلان لەمەلازگرد، کە ئەودەم پشکێك بوو لەخاکی مەڕدوانییەکان، بەسەر قەیسەری بیزەنتی، رۆمانۆسی چوارهەمدا سەرکەوت و شکاندی. لەپڕێکدا ئیدی مەلازگەردو ئەخلات بوونە خاکی

سەلجووقییان‌و ملکی کرێگرتەکانیان. ساڵی ١٠٨٤ هێرشێکی دیکەی سەلجووقییەکان بەنیازی تێکشکاندنی مەڕەوانییەکان دەستیدرایە. میافارقین‌و ئامەدیان گەمارۆدا.

ئەبولموزەففەری پێشەوای مەڕەوانییەکان، (کە کوڕی ئەبولقاسم بوو)، پێتەختی بەجێهێشت‌و بۆ جزیرە هەڵهات‌و ئەرکی بەرگریکردنی شاری بەوەزیرەکەی سپارد. راوێژکارانی سوڵتان پێشنیازیانکرد، کە سوڵتان تەنها جزیرە بخاتەسەر ملکی خۆیی‌و هەردوو باژێڕە مەزنەکەی (میافارقین‌و ئامەد) بۆ ئەبولموزەففەر جێبهێڵێت. ئەبولموزەففەر بۆ گوتووێژو ڕێکەوتن لەسەر دیاریکردنی سنووری باشووری خاکەکەی، چوو بۆ دیداری سوڵتان.

سوڵتان لەخواستی خۆی نەهاتە خوارەوەو بەوپێیە هەرچی هەبوو، سەلجووقییەکان لەساڵی ١٠٨٥ دا لێیانسەند. وەك دڵدانەوەیەك بڕێك زەویوزاریان لەئێران دایە. ئیدی لەوەدەمەوە هەردوو ویلایەتە کۆنە مەڕەوانییەکان، کەوتنە ژێردەستی فەرماندارانی سەلجووقییەوەو باجیان بۆ سوڵتان دەنارد.

پاش هەر قۆناغێکی هەرەسهێنانی دەستەڵاتی نێوەندیی، کاتێك چەند دەستەڵاتێکی گچکەڵەی سەربەخۆ لەکەنارەکانەوە سەرهەڵدەدەن، دەستەڵاتێکی نێوەندیی بەهێزو تۆکمەش لەمەڵبەندا دێتە کایەوە (وەك پێشتر لەنموونەی سەلجووقییەکاندا دیتمان)، لەوڕێیەوە سەربەخۆیی میرنشینە کەنارکەوتووەکان بەرپێدەگیرێت‌و گەلەکجاریش هەڵدەتەکێندرێن. ئەو هێزە نێوەندییە نوێیە، دەشێت میرنشینێکی نوێ بێت‌و لەهەناوی یەکێك لەدەستەڵاتدارییە سەربەخۆ کەنارکەوتووەکانەوە هەڵتۆقیبێت، یاخود دەشێت ئاکامێکی ئەو چارەسەریانەبێت، کە ڕژێمی کۆن دەستیدابوویە.

لەگەشتی ڕووداوە مێژووییەکانی بەشەکانی داهاتوودا، هەردوك نموونەکە دەبینینەوە. هەڵبەت هیچ چاوەڕوانی ئەوە لەحوکمڕانە پێشتر سەربەخۆکان ناکرێت، لەپڕێکدا گوێڕایەڵی‌و وابەستەیی خۆیان رابگەیەنن، بۆیە دەستەڵاتی نێوەندی هەوڵدەدات لەو ئاقارانە دەریانپەڕێنێت، یاخود بەهەر شێوەیەك بێت بەسەریاندا زاڵبێت. ڕەنگە ئەمە هۆکاری ئەوەبێت، کە سەرەکهۆزەکانی دەفەرە

کەنارکەوتووەکان ئاوها بەزوویی ملکەچیی خۆیان بۆ گشت دەستەڵاتێکی نێوەندیی نوێ رادەگەیەنن، کە جێپێو بەرژەوەندێکی لەکوردستاندا هەبێت.

دیارە لەترسی ئەوەی نەبا مێملێو گوردێرێکی لەجێگەی داکرێت، بەتایبەت گەر ئەو کەسە لەلایەن دانیشتووانەوە بەگەن کرێت. یاخود دوورنییە حوکمڕانێکی نامۆی (سوپایی) بیرۆکرات نەکرێتە دەستەڵاتداری نێوچەکە. لەم حاڵەتەی دواییاندا دالەنگینو شلۆقی هێز هەربەردەوام دەبێت، چونکە قەت غەوارەیەك ناتوانێت بێ گێرمەو کێشە، جێگەی دەستەڵاتدارێکی نێوچەیی بگرێتەوە[٣٢].

ئاکامی ئەوە دارمانو لەبەرئێکڕاندنەوەی ئەو یەکێتیو یەکڕیزییەیە، کە حوکمڕانی پێشتر سەپاندبووی. گەلەك سەرەکهۆزی گچکە شێلگیرانە هەڵپەیانە هێندەی دەکرێت لەو هێز دالەنگینو شلۆقییە دەستکەوت بچننەوە. شەڕمزرتانێی چاوچنۆکانی تینووو شەیدای هێزو دەستەڵات باڵدەکێشێت، گەر مەزنو میرێکی ئەوتۆی لەئارادانەبێت، کە بزانێت چۆن لغاویان لەدەم دەنێتەوە، هۆزەکە یاخود دەوڵەتەکە کوتکوتو کەلەپاچە دەکرێت[٣٣]. بەوپێیە زۆر هۆز بۆ پاراستنی یەکێتیو یەکڕیزی خۆی، منەتباری کەسایەتییەکی بەهێزی بەوەجە، وەکی دەستەڵاتدارێکی خاوەن ئەزموونی ژیری کورد، نێزیکەی چوارسەدە لەمەوبەر ئاوها سەردەمێکی لەو بابەتەمان بۆ پێشبینی دەکات:

ولایت زسلطان چوخالی شد

رئیس بهرقریه والی شد*

(کە وڵات سەرکردەو رێبەری نەما ئیدی کوێخای هەرگوندێك بۆخۆی دەبێتە میرێك)[٣٤]

ئەو پرۆسێسە گشتییەی پێشتر دەستنیشانمان کرد، ئێستاکە روونتری دەکەینەوە. بەشی داهاتوو نموونەی مێژوویی لەو بابەتەمان پێشچاودەخات.

---

* رەوانشاد "هەژاری موکریانی" ئەم دێڕەی ئاوها کردۆتە کوردی: "تاوێ دنیا بێ میرە گزیر لەجێی وەزیرە"

## ٣ـ ٥ـ جووتباقەكردنی كوردستان بەئیمپراتۆرێتی عوسمانییەوە[٣٥]

هێرشی تورك و مەغۆلەكان لەسەدەی یازدەهەمەوە تا سەدەی چواردەهەم بۆ سەر خۆرهەڵاتی نێوەند، شلۆقی و نائارامی و گۆڕانی سیاسی زۆریان بەدەمەوەبوو. لەشاڵاوەكانی قۆڵی باكوور و خۆرئاوایانەوە، رژانە ئەرمینیای گەورەو گچكەوەو لەو ڕووەوە كارێكی فرەشیان كردە سەر بارە جوگرافیاییە بەرینەكەی كورد[٣٦].

لەكۆتایی سەدەی پازدەهەم و سەرەتای سەدەی شازدەهەمدا، بەگەشەسەندنی دوو ئیمپراتۆرێتە فرەنەتەوە بەهێزەكەی عوسمانی و فارسی، بارێكی سیاسی نوێی هێورتر هاتەكایەوە. ماكی هەرە گرنگی نائارامی و تێكهەڵقرژانی ئەو دوو دەوڵەتە، كوردستان بوو.

دیارە سەرەكهۆزە كوردەكان و هۆزەكانیان لەو بوارەدا كایەیەكی گرنگیان هەبوو. لەنیوەی یەكەمی سەدەی شازدەهەمدا، سەركەوتنە سەربازییەكان و هەڵوێستە سیاسییە ژیرانەترەكانی دەوڵەتی عوسمانی، بردانی پشكی هەرەزۆری كوردستانیان بۆ مسۆگەركرد، چونكە توانییان لایەنگیری و پشتگیری میرە كوردە دەستەڵاتدارەكان وەدەستبهێنن. ئەو سنوورەی ئەودەمە لەنێوان هەردوو ئیمپراتۆرێتەكەدا سەپاو چەسپا، ئیدی لەسەدەكانی پاشتردا تەنها گۆڕانكارییەكی كەمی بەسەردا هات.

### ٣ـ ٥ـ ١ـ قەرەقۆینلۆو ئاق قۆینلۆ

پاش مردنی تەیمووری لەنگ لەساڵی ١٤٤٠دا، ئەو ئیمپراتۆرێتەی لەسووردەریاوە* تاوەكو خۆرئاوای ئەنەدۆڵ درێژبووبوونەوە، زۆر بەخێرایی دارماو لەبەریەك هەڵوەشایەوە. لەوپەڕی خۆرئاوایەوە، عوسمانییەكان كە فەرمانڕەوای میرنشینێكی

---

* سووردەریا ئەو رووبارەیە كە لەنێوچەی ئامانجانی ئۆزبەگستان، لەچۆمەكانی نارین و قەرەدەریا پێكدێت و درێژییەكەی ٢٩٩١ كیلۆمەترەو دەرژێتە دەریای ئاراڵەوە. لەدێرینی زۆر كۆندا Laxartes ی پێگوتراوە. (بڕوانە ئینسكلۆپیدیای Brockhaus ، چاپی نۆزدەهەم، بەرگی پێنجەم، ل٢١٢، Mannheim، ١٩٨٦).

گچکەڵەی تورك بوون، هەوڵیاندەدا میرنشینەکانی دیکەی لەبابەتی ئەوەی خۆیان ژێردەستە بکەن‌و بیانخەنەسەر قەڵەمڕەوەکەیان. لەئازربایجان‌و کوردستان دوو کۆمەڵە هۆزی یەککەوتەی جوداوازی تورك، دوو دەوڵەتی سەربەخۆی قەرەقۆینلۆ‌و ئاق قۆینلۆیان لێدامەزراند. مەڵبەندی سەرەکیی یەکەمیان، نێوچەکانی باکووری گۆلی ڤان بوو، لێ کەمێك پاش مردنی تەیموری لەنگ، قەرەیوسفی رێبەرو سەرکردەیان، پشکی زۆری ئازربایجانی داگیرکردو خستییە ژێر رکێفی خۆیەوە.

بەڵام هۆزی یەککەوتەی ئاق قۆینلۆ بازێڕی ئامەد (دیاربەکر لەخۆرئاوای کوردستان)ی کردە پێتەختی خۆی. ئەودەمە قەڵەمڕەوەکەیان هێشتا گچکەو سنوورەکانیان نادیاربوون. لەدەوروبەری ساڵی ١٤٥٠دا، زۆربەی میرنشینە کوردەکان ژێرچەپۆکەی قەرەقۆینلۆ بوون، بەڵام میرە کوردەکانی خۆرئاوای ئەو ئاقارە، وەکی بەتلیس‌و سیعردو حەسەنکێف، تەنها بەنێو وابەستەو پێبەندی دەستەڵاتدارانی قەرەقۆینلۆ بوون[٣٧].

قەرەیوسف پاش ئەوەی لەدەستی تەیموری لەنگ هەڵهات‌و گەڕایەوە، کچەکەی خۆیی دایە میر شەمسەدینی بەتلیس، ئەویش بەشێك لەخاکەکەی خۆیی پێشکێشکردو لەشکاندنی ئەو ئۆردووەی تەیمور ناردبوویە سەری، یارمەتیدا[٣٨]. ئەو میرە کوردە زێتر وەك هاوپەیمانێك دەهاتە پێشچاو، نەك وەکی وابەستەیەك.

خۆرئاوای ئەوێ، یانی کوردی دەڤەرەکانی ماردین‌و ئامەدو خەرپووت‌و ئەرزنجان، ژێر چنگۆڵەی دەستەڵاتدارانی ئاق قۆینلۆ بوون. پێدەچێت کوردەکان لەململانێ‌و شەڕەزرتانێی ئەو دوو حوکمڕانییەدا، کە پێخوستی زۆربەی شەڕەکانیان میسۆپۆتامیا بوو، (واتە خوارووی خۆرئاوای سنووری کوردستانی ئەوڕۆ)، کایەیەکی ئەوتۆیان نەبووبێت[٣٩].

لەساڵی ١٤٦٠ بەدواوە، ئوزون حەسەنی سەرکردەی بەتواناو کارامەی ئاق قۆینلۆ دەستیکردە پەلهاویشتن بەرەو خۆرهەڵات‌و بەئۆردووە تورکەکەیەوە حەسەنکێف‌و سیعرتی داگیرکرد. ئەو شاڵاوانە دەنگی زەنگی مەترسی بوون بۆ قەرەقۆینلۆ، چونکە ئەو نێوچە داگیرکراوانەیان بەقەڵەمڕەوی خۆیان دەزانی.

بۆیە جیهانشای سەرکردەیان بەخۆیو لەشکرێکەوە هێرشی بردە سەر ئوزون حەسەن. ساڵی ١٤٦٧ لەشکرەکەی جیهانشا شکاو خۆشی لەکاتی هەڵهاتندا ئەنگاوتراو کوژرا. ساڵانی پاشتر ئاق قۆینلۆکان پشکی هەرەزۆری کوردستانیان داگیرکرد. ساڵی ١٤٧٠ دەفەری جزیرەیان خستە ژێر چەپۆکی خۆیانەوە. ساڵی پاشتر، یاخود درەنگترێک قەڵاکانی بەتلیسو چوڵەمێرگی (پێتەختی کوردەکانی هەکارییان) گرت[٤٠]. ئیدی ئوزون حەسەن تەواوی کوردستانی داگیرکرد. شەرەفنامە دەگێڕێتەوە، گوایە: "خەریکی ئەوەبوو رەچەڵەکی خانەوادە خانەدانو رێبەرەکانی کوردستان ببڕێنێتەوە، بەتایبەت ئەوانەیان کە لەوەبەر دابوویانەپاڵ سوڵتانی قەرەقۆینلۆو لایەنگیری خۆیان بۆ گەیاندبوو"[٤١].

پاش ئەوەی ئوزون حەسەن، بەرۆگرەکەی تەیموری لەنگی لەئێراندا شکاند، ئیدی بووە مەزنی گشت ئازربایەنجانو بەشێکی زۆری ئێران، تەورێزیشی کردە پێتەختی نوێی خۆی.

لەخۆرئاواشەوە ئیمپراتۆرێتی عوسمانی کەوتە پەلوپۆهاویشتن.

سوڵتان محەمەدی دووهەم (ناسراو بە "فاتیح"، کە لە ١٤٤٤داو پاشانیش لە ١٤٥١ەوە تا ١٤٨١ حوکمڕانیی کرد)، لەسەر حسێبی دەوڵەتە تورکە گچکەکانی دیکەی ئەنەدۆڵ، پشکێکی ئەوروپای گرت.

ڤێنیسیاییەکان* کە دیتیان پێدەچێت لەئاکامی پەلوپۆهاویشتنی عوسمانییانەوە بەرژەوەندیی بازرگانییان بکەوێتە مەترسییەوە، داوای پەیمانو هاریکاریی سوپاییان لەئوزون حەسەن کرد.

میرنشینە تورکەکەی قارەمانیش هانای کۆمەکی دژە عوسمانیانی بۆ ئاق قۆینلۆ برد. ئۆردووە نێردراوەکەی ئوزون حەسەن، پاش چەند سەرکەوتنێکی سەرەتا، ساڵی ١٤٧٣/ ١٤٧٤ لەتۆقاتو سیڤاسی نێزیکی ئەنگۆرا خراپ شکێندرا. هەرچەندە ڤێنیسیاییەکان بەڵێنی کۆمەکیان دابوو، لێ بەڵێنی خۆیان نەبردەسەر[٤٢].

---

* مەبەست خەڵکی شاری ڤێنیسیا، یاخود (بوندوقیە) یە.

مەملووکە حوکمڕانەکانی سوریاو میسر، کە ئوزون حەسەن تا ئەودەمە پێوەندییەکی دۆستانەی دەگەڵیاندا هەبوو (هەتا بەناردنی کلیلی ئەو شارانەی گرتبوونیو کەللەسەری مەزنە کوژراوەکانی قەرەقۆینلۆ، هێماو نیشانەی ملکەچیی خۆشی بۆ ناردبوون[43]، لەو کێشمەکێشەدا بێلایەن مانەوە. دیارە لایان روونبوو، هێندەی ئەو دوو زلهێزە نوێیە سەرقاڵی بەربەرەکانێی یەکدی بن، نایانپەرژێت شاڵاو بۆ سەر خاکی ئەوان بەرن. بۆیە ئەو تێکبەربوونەیان هیچ لەبەر گران نەبوو.

ئوزون حەسەن ساڵی ١٤٧٨ مرد، کوڕەکانی کەنەفتو لاوازبوون، حوکمڕانییەکەی دارماو لەبەریەکڕوییەوە. سەرەکهۆزە کوردە ژێردەستەکانی، یەکەمین کەسانێك بوون کە دیسان بانگی سەربەخۆبوونی خۆیان هەڵدایەوە. کەمێك دواتر سەرکردەیەکی نوێ دەستی بەسەر میراتی ئاق قۆینلۆیاندا گرت، کە کوردستانیش پشکێکی بوو، ئەویش ئیسماعیلی کوڕی خانەوادەیەکی شێخزادەی صەفەوییەکان بوو، کە بووە پاشای ئێران.

### ٣ـ ٥ـ ٢ـ صەفەوییەکان

ئەم ئیمپراتۆرێتە بەناوی صەفییەدینی بابی هۆزەکەوە نێونرا، کە صۆفییەکی بەوەجی خاوەنشکۆی نووڕانی سوننی بووەو ساڵانی ١٢٥٢ـ ١٣٣٤ لەئەردەبیل ژیاوە[44]. لایەنگرانێکی فرەی لەخۆی خڕکردۆتەوە، کە گەلەکیان رەوەندی تورکو مەغۆل بوون، مەغۆلێکی زۆر لەسەردەستی ئەودا بوونە موسڵمان. هەرچەندە صەفی هیچ رێبازو هەڤۆتو رێنماییەکی تایبەتی نەبوو، لێ لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکێکی زۆر لەدەوری تەریقەتەکەی خڕبووبوونەوەو خۆیان بەوابەستەو ملکەچو پێبەندێکی بێ چەندو چوونی خۆیو بەرۆگرانی دەزانی. ئەردەبیل بووبووە جەرگەی بڵاوکردنەوەی ئەو تەریقەتە. هەر دەگەڵ جونەید لەساڵی ١٤٤٧دا بووە رێبەری، گۆڕانکارییەکی بنبڕو ناکاو لەهەناوی ئەو تەریقەتە سۆفیزمەدا رسکا. ئەم شێخە سەوداسەری سەرەڕۆییو شەڕانییە، زێتر سەرگەرمی گەڕانو سووڕانەوەبوو، بەتایبەت پاش ئەوەی جیهانشای سەرکردەی قەرەقۆینلۆ لەئەردەبیلی بەدەرنا.

دەگەڵ ئوزون حەسەندا، کە خوشکی خۆیی دابوویە، پێوەندییەکی دۆستانەی بنیاتناو سەرکەوتووانە هەوڵیدا لەنێو تیرەو هۆزە تورکە ڕەوەندەکانی نێوەندو خوارووی خۆرئاوای ئەنەدۆڵدا، لایەنگران پەیداکات. ئەو هۆزانە تەنها بەسەرزارەکی بووبوونە موسڵمان، دەنا مەیلو ئارەزوویان زێتر بەلای لادانو گومڕاییدا دایدەشکاند. هەر زووتر بزووتنەوە شیعەگەرییە توندڕەوەکان لایەنگرانی شەیدای لەنێو ئەو هۆزانەدا پەیداکردبوو. ڕەنگە ئەمە یەکێك لەو هۆکارانەبێت کە شێخ جونەید خۆیی‌و پاشانیش حەیدەری کوڕی‌و ئیسماعیلی کوڕەزای (کە دواتر بووە شا)، بەهەمانجۆر ڕێبازێکی لادەرانەیان هەڵبژارد. ئەو توندڕەوییەی لەڕێزلێنانی عەلیدا دەینوێنن، تەنها یەکێکە لەشەقڵەکانیان، هەتا ئەو پلەیەی کە هێدی هێدی شێخەکانیشیان لەکن لایەنگرانیان گەیەندراونەتە پایەی گیانی ئێزدان تێزاوێك[٤٥].

خەلیفەکانیان پڕوپاگەندەی ئایینیان دەگەیاندە گشت قوژبنێکی ئەنەدۆڵ. بەتایبەت لەنێو هۆزە تورکە ڕەوەندەکانو ڕەشەخەڵکە لادێییە هەژارو ڕووتەڵە نیشتەجێکاندا (وەك تورکە نیشتەجێبووەکان، یاخود دانیشتووانە دێرینە بەموسڵمانکراوەکانی)، برەوێکی چاکی هەبوو. لایەنگرانی ئەم شێخە صەفەوییە، لەدیاردەی ئەو شەدە سوورەوە، کە هۆزە تورکە تازە باوەڕهێنەرەکان دەیابەست بەسەریانەوە، بەقزڵباش (سەرسوور) نێویان دەرکرد. شێخەکان بەپشتیوانیی باڵە سوپاییەکەی ئەم ڕێبازە، چوون بەگژ پاشانشینە ناموسڵمانەکانی باکووردا و غەزایان لەدژیان دەستدایە. چوون بەگژ دواهەمین قوڵلەی بیزەنتیدا لەتەرابزوون (تا پاشان ساڵی ١٤٦١ عوسمانییەکان گرتیان)، چوون بەگژ جۆرجیاو وڵاتەکانی دیکەی قەوقازدا، بەتایبەت بەگژ شیرواندا.

ئیسماعیل هێشتا منداڵ بوو، کە بابی لەجەرگەی شەڕگەی دژە شیرواندا کوژرا. ئەو مێرمنداڵە ناچاربوو بۆ گیلانی شاری شیعەیان هەڵبێت، چونکە ئاق قۆینلۆ سوننییەکان دەستیان بەسەر ئەردەبیلدا گرتبوو، ترسیان لەتەریقەتی صەفەوی هەبوو، دەیانەویست ریشەکێشی بکەن. کە ساڵی ١٤٩٩ ئاق قۆینلۆکان بەهۆی دووبەرەکی‌و ململانێی نێوخۆوە دەستەڵاتیان لەکزییدا، ئیسماعیل لەحەشارگەی

هاتــەدەرو گەڕایــەوە بــۆ ئــەردەبیل. بــەهاری دوایــی چــووە ئەنــەدۆڵ (دیــارە وەك نــەریتێك چــووە ئــەرزنجان) تــا پاشمــاوەی ســوپا گوێڕایەڵەکــەی لــەخۆی کۆکاتــەوە. لەماوەیــەکی کەمــدا بــووە قومانــدانی حــەوت هــەزار لایــەنگر، کــە لەگشت قــوژبنێکی جوداوازی ئەنەدۆڵەوە خڕبووبوونەوە، بەتایبەت ڕەوەندو وەرزێرە تورکەکان[٤٦].

دوورنییە بڕێك دەستەو تاقمی کوردیشیان تێکەڵ نەبووبێت، هەرچەندە لەڕیزی ئۆردووەکەی ئیسماعیلدا هیــچ نێویــان نــەهاتووە. لــێ چــەند ســاڵێك پاشــتر، لەڕیزی قزڵباشاندا هەمیشە نێوی دوو هۆزی باکووری کوردستان دووبارە دەبنەوە: ئەوانیش هەردوك هۆزی چەمشکەزەك‌و خنسلوون[٤٧].

ئیسماعیل یەکەوڕاست شاڵاوی نەبردە سەر ئاق قۆینلۆ، بەڵکە سەرەتا هێرشیکردە سەر شیروان. ڕەنگە ئەمە بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە بووبێت، چونکە باب‌و باپیریشی لەو پێناوەدا سەریاندانا. پاش ئەوەی شیروانی داگیرکرد، ئەلوەندی دواهەمین حــوکمڕانی ئــاق قۆینلــۆ لــەئازربایــنجان، بەلەشــکرێکەوە پەلاماریــدا. ئیــسماعیل لەشــکرەکەی ئەلوەنــدی تێکشکاندو هــەڵیبڕین، ئازربایــنجانیش وەك میوەیــەکی گــەییو، بەئاســانی کەوتە مــستییەوە. ئــەوجا تــاجی پاشــای لەســەری خۆنــاو ســاڵی ١٥٠١ ڕێبــازی شیعەی دوازدە ئیمامیی کردە ئایینی ڕەسمیی وڵاتەکــەی[٤٨]. ســاڵانی دواتــر یەکەیەکــەی ئــەو سەرکردە گچکانەی تەفرو توونا کرد، کە هەریەکە کوتێکی میراتی حوکمڕانێتی ئــاق قۆینلۆیان بۆخۆ بڕدابوو[٤٩].

وەلــێ کوردستانی هــەروا بــەو ئاســانییەی ئازربایــنجان بــۆ ژێردەســت نــەخرا. زۆر لەمیرە کوردەکان دەیــان ســاڵ بــوو ســەربەخۆو ئــازاد، حوکمڕانییــان دەکــرد. هەڵبــەت ئەمە بەنیسبەت ئەمیربەگی موصلوشەوە، فەرمانــدارە تورکەکــەی بــاژێڕی دیاربــەکر لەسەردەمی ئاق قۆینلۆدا، هەرئاوها بوو، ئەویش جاڕی سەربەخۆبوونی خۆیدا.

مەترسی هەرە گەورە لەمیرنشینــە تورکەکەی زولقەدر (ئەلبــستان)ەوە ســەریهەڵدا، کــە دواهــەمین حــوکمڕانیی ســەربەخۆی نێــوان ئیمپراتــۆرێتی عوسمــانی‌و کۆنــە دەستەڵاتدارانی ئاق قۆینلۆ بوو[٥٠].

ـەلانودەولەی حوکمڕانی لەو هەوڵەیدا بۆ دەستبەسەرداگرتنی کۆنە خاکی ئاق قۆینلۆ، توانی چەندین قەڵاو قوللەی دەروبەری دیاربەکر بگرێت. کاتێك شا ئیسماعیل بەخۆیی‌و بیست هەزار سەربازەوە پەلاماری ئەو یاخییەیداو شکاندی، ئەمیربەگی موصلوی فەرمانداری دیاربەکریش ملکەچیی خۆیی ڕاگەیاند. شا خەلاتێکی چاکی کرد، بەڵام لەو پایەی پێشوویدا نەیهێشتەوە، بەڵکە کردییە والی خوراسان‌و ناردی بۆ هیرات‌و لەکوردستانی دورخستنەوە، کە دەستەلاتێکی زۆری تێدا پەیداکردبوو. لەجێگەی ئەو محەمەدبەگی ئوستاجلوی زاوای خۆیی کردە والی دیاربەکر[51].

قومانداریێتی باژێری ئامەد هێشتا هەر بەدەست قەیتماس بەگی برای ئەمیربەگەوە بوو، سەرپێچی لەوەدەکرد کە تەسلیمی محەمەدبەگی ئوستاجلوی بکات‌و هانی کوردە سوننییەکان دەدا دژی ئۆردووی شیعەی تورکی ئوستاجلو ڕاپەڕن. کاتێك شا ئیسماعیل بەخۆی‌و لەشکرە مەزنەکەیەوە هات، قەیتماس بەگ هانای کۆمەکی بۆ زولقەدر برد. محەمەدبەگی ئوستاجلو کوردێکی هێجگار زۆری کوشت‌و سوپا کۆمەککارەکەی زورلقەدر بەزاند. هەر بەو شێوازە خوێنرێژانەیە دەستەلاتی خۆی بەسەر ماردین‌و جزیرەو موسڵیشدا سەپاند، "گەلەك کوردی کوشت‌و زۆری تالان کردن"[52].

سیاسەتی شا ئیسماعیل بەرامبەر بەکورد، هەروەکی سیاسەتی ئوزون حەسەن بوو. هەردوك گەلەك سەرەکهۆزی کوردیان هەڵقەندو پیاوی دەستنێژی خۆیان لەجێگەداکردن. ئەو کاربەدەستە نێوچەییانەی لانەبران‌و هێنرانەوە، هیچ یەکێکیان لەخانەوادە خانەدانە دێرینەکان نەبوون، بەڵکە زێتر نەتەوی‌و ناحەزی ئەوان بوون‌و لەوانیش پایە نزمتربوون[53]. ڕاپەڕینەکانی ئەو سەرەکهۆزە کوردانەی دژی ئەو سیاسەتە دەوەستانەوەو هەوڵی پاراستنی ئازادیی خۆیان دەدا، هێجگار دڵڕەقانە سەرکوت دەکران.

وەفدێکی کورد کە لەشازدە سەرەکهۆز پێکهاتبوو، بەهیوای ئەوەی شا نەرمتر ڕەفتاریان دەگەڵ بکات‌و پارێزراو بن، چوونە بارەگای زستانەی شا لە (خۆی)و

پـەنايان بـردو ملكەچـيی خۆيـان راگەيانـد، لـێ سـەرپاكيان گـيرانو خرانـە بەندينخانەوە (ئەو رووداوە دەبێت سالّی ١٥١٠، يـاخود ئـەو دەوروبـەرە بووبێت)[٥٤].
شا برێك فەرماندەی هۆزی قزلّباشی متمانـە پێكراوی خـۆيی نـاردە مەلّبەنـدی ئـەو ميرانە، تا خەلّكەكە بەچەترسێن بكەنو سـەريان پێنـەوی بكـەن. هەلّبـەت هۆكـاری ئايينييش لەو مەسەلەيەدا كايەيەكی گرنگی هەبووە، هەرچەنـدە هەميشە زێدەڕەوی لەهەلّسەنگاندنی ئەو لايەنەدا دەكرێت. ئاشكرايە زۆربـەی كوردەكـان سـونـنی بـوون، لـێ شـا ئيـسماعيل ئـايينزای شـيعەی دوازدە ئيمـامی كـردە ئـايينی رەسميـی دەوڵەتەكەیو ئۆردووەكەی گەلەك شيعەی توندڕەوو تەنگەتيلەكـەی تێـدابوو. ديـارە ئاوها حالّەتێك هەردەبێت دژايەتیو كينەوەريی نێوان كوردو توركی سەردەستـەيانی لێبكەوێتەوە.

### ٣ـ ٥ـ ٢ـ تێڕامانێكی رووداوەكان لەژێررا

زۆربـەی سەرچـاوە مێژووييـەكانی ئەوسـەردەمە كـە دەربـارەی ئـەو قۆناغـە نوسـراون، لەڕوانگـەی چـينە دەسـتـەلاّتدارەكەوە لەپێـشهاتەكان دەڕوانـن. مێـژوو كراوەتە تۆماری جەنگو ململانێيكی شێلگيرانەی سەرەڕۆيانەی نێوان مەزنو گـەورە پياوانو سەركردە سوپايیو سياسـييەكانی تـوركو كـورد، دەربـارەی رەشـەخەلّكەكەو كايـەو پايـەيان، هـەر هـيچ نابيـستين. ديـارە دەبێـت ئـەو چـەند مێژوونووسـە فەلـە بندەسـتانەی، كـە بـەزمانی ئـارامی رووداوەكانيـان بـۆ تۆمـار كـردووين، لـەو حالّەتـە هـەلّبوێرين. ئـەوەتا يـەكێك لەوانـە، باسـی داگيركردنـی جزيرەمـان لەلايـەن محەمەدبـەگ ئوسـتاجلووەوە بـۆ دەگێڕێتـەوەو پـەردە لەسـەر پاشـهاتو ناكامـەكانی هەلّدەداتـەوە[٥٥]. كورتيلـە هەوالّێكـە دەربـارەی ئـەو كارەسـاتو مەرگەسـاتە يـەك لەدووی يەكانەی، كە مالّی وەرزێرو شارييەكانيان كـاولكرد، قزلّبـاشو كوللـەو كـورد، زنجيرەيەك بەلاّی مالّوێرانكەری نەپساوە بوون:

شا ئيسماعيل كە خۆی بەخودا دەزانیو تەواوی خۆرهەلاّتی گـرت، پيـاوە دلّڕەقە، دلّڕەشـە، دەهۆبازەكـەی، محەمەدبـەگی كـردە حـوكمڕانی ئـەرمينيا. رايـسپارد هـەر

میرێک لەڕوویدا راستبووەوە، بیکوژێت، هەر شارێک لەدژی وەستایەوەو راپەڕی، خاپووریکات. میر شەرەفی پاشای جزیرە سەری نەوی نەکردو ئامادەنەبوو دیاری بۆ محەمەدبەگ بنێرێت، ئەویش لەڕقاندا لەشکری کردەسەری‌و میری بەزاند. "تەواوی ولاتەکەی تالانکرد، مالاَت‌و ولساتی وەبەردا، ژمارەیەکی بێشوماری لەرەشەخەلکەکە کوشت، قەشەو شەمماس‌و منداڵ‌و جووتێرو پیشەسازو لاوو پیرێکی هێجگار زۆری سەربڕی، گوندەکانی سوتاندو کلێسەو پەرستگەی وێرانکردو گەنج‌و ژنێکی زۆری بەخسیرو کۆیلەکرد. میر شەرەف ناچاربوو دەگەلی رێککەوێت‌و هەتا خوارزایەکی* خۆشی دایە".

ساڵی دوایی کوللە ژیانی خەلکی تالکرد، ساڵ وەرگەڕایەوە میر شەرەف راپەڕی. محەمەدبەگ دەستبەجێ لەشکری ناردە سەر بۆتان، کە مەلبەندی کوردەکانی دەستوپێوەندی میر بوو.

موسلمان‌و فەلەیەکی زۆریان کوشت. میر شەرەف بۆ ئەوەی رێگەی داگیرکردنی بازێڕی جزیرە لەمحەمەدبەگ ببەستێتەوە، فەرمانی چۆلکردنی شارەکەیداو سەرلەبەری خەلکەکە (بەتایبەت فەلەکان) شاریان چۆلکردو پیاوەکانی میر شاریان گرتێبەردا.

میر خۆی‌و کوردەکانی پیاوی بۆ قەلاکەی نێو کێوانی، بۆ شاخ هەلهاتن. کە قزلباش گەیشتن، کەوتن بەسەر وێرانەی شارداو هیچ بەبەرەکانییەکیان تووش نەهات. دانیشتووانیان ناچاری گەڕانەوەکردو شاریان سەرلەنوێ پێدروستکردنەوە.

شار هێشتا تەواو ئاوەدان نەکرابووەوە، بەدبەختییەکی دیکە بەرۆکی دانیشتووانی گرت. هەر لەگەڵ قاوی ئەوە داکەوت کە گوایە شا ئیسماعیل لەلایەن "گەلێکی قارەمانی تەپلەی کەپەنك بەسەر"ەوە پەلاماردراوەو شکێندراوە، گشت هۆزە کوردەکان یەککەتن‌و لەمەکۆی کێوەکانیانەوە دابارین‌و پەلاماری قزلباشیاندا.

---

* زمانی ئالمانی جوداوازی لەنێوان خوارزاو برازادا ناکات، کچی هەردوك هەر بە Nichte و کوڕیان بە Neff نێودەبات، بۆیە روون نییە داخۆ کچی برای مەبەستە، یاخود کچی خوشکی.

فەرمانڕەوای جزیرە بەزێندرا. محەمەدبەگ دەستبەجێ کۆمەکی ناردو لەلایەن ..یشتووانەوە، کە بەحسرەتەوە بوون لەدەستی کوردەکان رزگاریان بێت، پێشوازی کران. بەڵام ئەو ئۆردووە تازەهاتووە لەبریتی چاکە، شاریان تاڵانکردو خەڵکیان ئەنجن ئەنجنکرد. سەرەتا دەستیانکردە ئەشکەنجەدانی گەورە پیاوانو فەلەو موسڵمان، ژنانو کچانیان ئەتك کرد.

ئەوجا ڕەشکوژییە بێئامانەکە دەستپێکرا، ئۆردووی تازە هاتوو، بێ جوداوازی، فەلەو موسڵمانو خەڵكو ئاژەڵیان پەلپەلدەکرد، "هەتا بەزۆر سواری ژنی ئەمو ئەویش دەبوون"..... "شار هەمدیسان کەوتەوەبەر نێڵە نێڵی ئاگر. ئەو موسڵمانو ئاسووریو جووانەی لەڕەشکوژییەکە قوتاربوون، یەخسیرکرانو پێشدران.

هەرچی لەڕێگەی دووری ئەو سەفەرە زۆرەملێییەدا پەکی دەکەوت، دەمودەست دەیانکوشت. ئەو بەندە بەدبەختانەی گیانیان دەرکرد، گشت لەگشتیان لەدۆرگەو وڵاتە دوورەکان بەکۆیلەیی فرۆشران".

## ٣ـ ٥ـ ٤ـ ململانێی نێوان عوسمانیو صەفەوییەکان

کە مرۆ لەسیاسەتی شا ئیسماعیل دەڕوانێت، هیچ سەیری پێنایەت گەر کورد، یاخود زێتر گەورە پیاوە دەستەڵاتدارە نەریتییە هێشتا زیندووەکانی، هانا بۆ زلهێزێکی دی بەرن کە ئومێدی ئەوەی لێبکرێت لەدەست زوڵمو جەوری صەفەوییەکان قوتاریانکات، دیارە تاقانە زلهێزی ئەودەمەش ئیمپراتۆرێتی عوسمانی (سوننی) بوو. هەتا سوڵتان بایەزید (لە ١٤٨١ەوە تا ١٥١٢) لەسەر حوکم بوو، شا ئیسماعیل نێوانی دەگەڵیدا خۆشبوو. بایەزید لەپیریدا کزو کەنەفت بوو بوو، هێشتا خۆی مابوو، کوڕەکانی لەسەر بەرۆگریی بەشەڕهاتن. هەر ئەو کاتانە، ساڵی ١٥١١، کڵپەی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتیو ئایینی هەڵایساو بەزوویی لەکوانووەکەیەوە، کە تەقە Teke ی باشووری خۆرئاوای ئەنەدۆڵ بوو، تەنییەوەو مەڵبەندەکانی دیکەی ئیمپراتۆرێتەکەی گرتەوە. ئەو هێندە زانیارییەی لەبارەیەوە هەمانە، ئەوەی

لێدەپرینگێتەوە، کە مەسەلە نارەزایی قزڵباشەکان بووبێت، هەرچەندە پێناچێت شا ئیسماعیل راستەوخۆ دەستی تێدا هەبووبێت.

دواتر، ئەودەمەی ویلایەتەکانی خۆرهەلاتیش ئاشووبیان تێکەوت، ئەوجا شا ئیسماعیل دەستی تێوەردا. نور عەلی خەلیفەی روملوی نوێنەری خۆیی ناردە ئەرزنجان، بۆ نێو خاکی ئیمپراتۆریتی عوسمانی، تا **کۆمەك بەقزڵباشە راپەریوەکان** بکات و (ناراستەوخۆش پشتگیری مورادی **کورەزای بایەزید** بکات، کە یەکێك لەداخوازیکەرە هەرە لەپێشەکانی **تەختی سوڵتان بوو**). نورعەلی بەپشتیوانی **قزڵباشەکانی ئەوێ، توانی چەندین تیپ لەو سوپایە بشکێنێت**، کە والی و سەلیمی **یەکەمی تازەچووە سەرتەخت ناردیانەسەری.**

**سەلیم کە نێوی (تەنگەتیلە) یان لێنابوو، نازدارو لاوێنەراوی سوپاو دوژمنێکی** سەرسەختی شا ئیسماعیل بوو. پێشان حوکمرانی **تەرابزوون بوو (کە لەساڵی** ١٤٦١ەوە بووبووە بەشێك لەخاکی ئیمپراتۆریتی **عوسمانی)، هێرش و شالاوەکانی** بۆسەرخاکی صەفەوی، دەردیسەری زۆری بۆ شا ئیسماعیل نابووەوە. **یەکێك لەهەنگاوە** بەردنگارییەکانی، گرتن و خنکاندنی ژمارەیەکی زۆر **لەقزڵباشەکانی** ژێردەستەی بوون، (برێك سەرچاوە باس لە ٤٠ هەزارکەسێك دەکەن)[٥٧]

ئیدی **هەردوکلا** بیانووی شەریان بۆ سازابوو. بۆ ئالۆزکاندنی زێتری حاڵ و بارەکە، **محەمەدخان ئوستاجلو** (کە تەنها حوکمرانێکی دەمرووت بوو)[٥٨] بەجوێنی هێجگار **دزوێنەوە** داوای بەرامبەرێنی لەسوڵتان **سەلیم دەکرد.**

زستانی ساڵی ١٥١٣/ ١٥١٤، سوڵتان سەلیم خۆی بۆ جەنگ کۆککردو لەبەهاردا **بەلەشکرێکی** ١٠٠ هەزارکەسییەوە بەرەو **خۆرهەلات ملینا. محەمەدخان ئوستاجلو** لەبەردەم هێرشەکەیدا خۆی پێرانەگیراو نێوچەکەی بۆ چۆڵکردو گشت دانیشتوانی **گردەلانییەکانی** ئەرمینیای ناچارکرد بۆ ئازربایجان رەوبکەن و فەرمانیدا هەرچی بۆ **خواردن دەشیا**، بیسووتێنن، بەنیازی ئەوەی بیابانێکی چۆڵ و قاقڕی تێنەپەڕ **لەنێوان هەردوك** دەوڵەتی عوسمانی و **صەفەویدا، بنیاتبنێت. لەگەڵ ئەوەشدا سوڵتان توانی بەکۆمەکی** ٦٠ هەزار باری حوشتر ئازووقەوە، ئەو مەودایە ببڕێت. لەئۆگوستی

١٥١٤دا سوپای هەردوك ئیمپراتۆریتەكە لەنێزیكی چاڵدیران (كە دەكەوێتە سەرووی خۆرهەلاتی گۆلی ڤانەوە) رووبەرووی یەكدی وەستانەوە. شا ئیسماعیل خراپ شكێندراو سەلیم تەورێزی داگیركرد[٥٩]. لێ كێشەی لۆجیستیكی ئۆردووی عوسمانیی ناچاركرد بەر لەهاتنی زستان خۆبكشێنەوە.

ئیسماعیل تەورێزی دەستكەوتەوەو سەرلەنوێ فەرمانڕەوایانی خۆی بۆ ویلایەتەكانی خۆرئاوا ناردەوە. محەمەدخان ئوستاجلو لەشەڕی چاڵدیراندا كوژرا، شا قەرەبەگی برای كرایە بەرۆگری‌و پلەو نێوی خانیشی پێبەخشرا. دوو براكەی دیكەشی، عەوازبەگ‌و ئولاش بەگ، كرانە والی بەتلیس‌و جزیرە. كە قەرەخان گەیشتە دیاربەكر، دیتی میرە كوردەكەی یاخیبووەو دانی بەسەروەریی‌و مەزنیی سوڵتان سەلیمدا ناوەو بۆ دەرپەڕاندنی صەفەوییەكان هانای كۆمەكی بۆ بردووە.

### ٣ـ ٥ـ ٥ـ سیاسەتی عوسمانی لەحاند كورد

بەپێی شەرەفنامە[٦٠] هەر زووتر، بەر لەهێرشەكەی سوڵتان سەلیم بۆ سەر صەفەوییەكان، بیست میری كورد ملكەچیی‌و لایەنگیری خۆیان بۆ سوڵتان دەربڕیبوو. كوردێكی خەڵكی بەتلیس دنەدەری ئەو هەنگاوەبوو، كە نێوی ئیدریسی بەتلیسی بوو، سەردەمێك سكرتێری یەعقوبی سەركردەی ئاق قۆینلۆ بوو (یەعقوب كوڕی ئوزون حەسەن بوو). ئیدریس مێژوونووسێكی لێهاتووو دیپلۆماتێكی كارامەبوو. بەپێی سەرچاوە عوسمانییەكان[٦١] واپێدەچێت گوێڕایەڵ‌و خزمەتگوزارێكی سوڵتان سەلیم بووبێت، سەلیم دەیزانی بەهرەو تواناو شارەزاییەكی چاكی لەبواری مەسەلەی كورددا هەیە، بۆیە ناردی پشتیوانیی كوردی بۆ مسۆگەربكات. شەرەفنامە بەزمانێكی هێجگار ناسك‌و بەوپەڕی رێزو نەوازشەوە باسی ئیدریس دەكات، چونكە ئامۆژگاریی میری كردووە كە پشتی سوڵتان سەلیم بگرێت‌و بەهەگبەی پڕ بەڵێنی ئەمەكداری‌و پشتیوانییەوە بۆ پێتەخت گەڕاوەتەوە.

ساڵی ١٥١٤، كاتێك لەشكری عوسمانی نێزیكی ئامەد بووەوە، دانیشتوانی دەروازەكانی شاریان بۆ كردنەوە. لەشوێنەكانی دی، وەكی سنجەقی نێوچە

شاخاوییەکان، کوردەکان دواهەمین ئۆردووی داگیرکەری قزڵباشیان راوەدوونا. گەلەك میری کورد توانییان قەڵاکانیان لەقزڵباش بستێننەوەو خۆ لەکۆتیان رزگارکەن[٦٢].

لێ وەکی پێشان باسمانکرد، سوڵتان بەخۆیو لەشکرە مەزنەکەیەوە، بەر لەهاتنی زستان بەرەو خۆرئاوای ئەنەدۆڵ خۆی کێشایەوە. لەئاکامدا شا ئیسماعیل لەشکری کردەوە سەر کوردستان، بەهیوای دەستخستنەوەی دەستەڵاتی لەدەستچووی. میرە کوردەکان یەککەوتنو پێکرا دژی هۆردووی قزڵباش راستبوونەوە. لەو هەڵوێستەیاندا ژەنەراڵ بیغلو محەمەد پاشا*، کە سوڵتان سەلیم کردبوویە حوکمدارو قوماندانی سوپای تخووبی خۆرهەڵات، کۆمەكو پشتگیریی دەکردن. گێڕانەوەکەی شەرەفنامە لەباری چۆنییەتی دامەزراندنی بەحوکمدارو قوماندان، جێگەی سەرنجو تێڕامانە. هەتا ئەگەر رووداوەکەش لەڕاستیدا ئاوها نەبووبێت، دەبایە هەر بەشێوازێکی لەوبابەتە بایە:

کە سوڵتان تەورێزی جێهێشتو بەرەوخۆرئاوا کەوتەڕێ، میرە کوردەکان ئیدریسیان بەو داخوازییەوە ناردە کنی، کە مافی بەمیرات بۆ بەجێماویان لەوڵکەی بابو باپیرانیاندا بۆ بسەلمێنێتو تکاشیان ئەوە بوو، کە یەکێك لەخۆیان بکاتە بەگلەربەگی، تا پێکرا بەڕێبەرایەتی ئەو کەسە، دژی قەرەخان بجەنگنو لەکوردستان دەریپەڕێنن. شایانی باسە کە بەگلەربەگی لەئیمپراتۆرێتی عوسمانیدا قوماندانی سوپاو حوکمداری ئەیالەت بوو (کە لەویلایەت گەورەتر بوو)، ئەو پایەیە تەنها بەکوڕانی سوڵتانو ژەنەراڵە پایەبەرزەکان دەدرا[٦٣]. سوڵتان لەئیدریسی پرسی داخۆ کامە میر شایانی ئەو پلەی سەرکردایەتیەیە. ئیدریسی بلیمەت لەوەرامدا گوتی: "گشتیان، هەڵبەت بەکەمێك جوداوازییەوە، وەکی یەك وان، کەسیان ئامادەنیین سەر بۆ ئەوی دی دابنەوێنن. بۆ ئەوەی بتوانن دژی قزڵباش

* نووسەر Biyiqli Muhammad ی نووسیوە، بەڵام دیتم مامۆستا هەژار لەشەرەفنامەدا بەبیغلو محەمەدی نێوبردووە، چونکە ئەم راستەوخۆ لەدەقە فارسییەکەی وەرگرتووە، پێموایە ئەمەیان راستربێت. بڕوانە: "شەرەفنامە"، ١٩٨١، چاپی تاران، ل٧٤٦.

کاریگەرانەو یەکگرتوو بجەنگن، باشتر وایە ئەو پایەیە بەکەسێکی خزمەتگوزاری ئەوتۆی تەختی سوڵتان بدرێت، کە گشت میردکان گوێڕایەڵی فەرمانی بن".

سا هەر ئاوهاش بوو، بیغلو محەممەد کرایە بەگلەربەگی کوردستان[٦٤].

قەرەخان، سەرکردەی قزڵباش، هەر پاش گەیشتنی فەرمانیدا گرنگترین بازێڕ کە ئامەد بوو، گەمارۆیبدەن. لەو بازێڕانەوە کە هێشتا لەژێر رکێفی قزڵباشاندا بوون، وەکی ماردین‌و حەسەنکێف‌و نورفە، کۆمەکی دەگەیشتێ. گەمارۆکە ساڵ زێتری خایاندو قوربانییەکی فرەی (کوژراوو زامدار)ی لەخەڵکەکە خواست.

(Hammer باس لە ٥٠ هەزارکەسێك دەکات)، لێ قزڵباشان نەیانتوانی شارەکە بگرن. ئەو دەمانە کوردستان بەهۆی چەندین بەرژەوەندی جوداوازو دژەوە، کە باری جەنگ سازاندبوونی، لەئاڵۆزی‌و باڵۆزییەکی تەواودا بوو. دیارە نەدەتوانرا بەر بەو هەموو تێکەو لێکەو ململانێیەی وەکی کوردی تاج‌و تەخت ویست، سوننی‌و شیعە، عوسمانی‌و صەفەوی بگیرێت‌و لێکجوداکرێنەوە. ئەو کوردە خێڵەکییە جەنگاوەرانەی بەفەرمانەدەی میرەکانیان دابوویانەپاڵ بیغلو محەمەدو ژەنەراڵە نێردراوەکانی دیکەی سوڵتان، گەلەك زەبری گورچوبڕیان لەقزڵباشان وەشاند. کوشندەترینیان ئەو مستە بوو، کە هێزە کوردەکان لەقووچ حەسار تێیانسرەواندن. گەلەکیان، یاخود زۆربەیان کوژران‌و ئەوەیش کە گیانی دەرکرد، بۆ ئێران هەڵهات[٦٦].

ئیدی لەودەمەوە پشکی هەرەزۆری خاکی کوردستان بووە بەشێك لەئیمپراتۆرێتی عوسمانی: سەرتاپای ویلایەتی دیاربەکرو بەشی هەرەزۆری ژوورووی عێراقی ئەورۆو هەرچی دەکەوێتە خۆرئاوایەوە.

سلێمانی بەرۆکری سەلیم، بیست ساڵێك دواتر، سنوورەکەی بەرەوخوارتر داشکاند. برێك هۆزو میرنشین لەژێر رکێفی فارسەکاندا مانەوە، ئەوانی دی لەصەدان ساڵەکەی لەوەدوادا، چەندین جار ئەمبەرو ئەوبەرو ئەمسەرو ئەوسەریان کرد. هێشتا سنوورەکە تەواو نەچەسپیبوو، ئەو دەزگەی فەرمانڕەواییەی ساڵی ١٥١٥ دانرا، جگە لەچەند گۆڕانێکی کەم نەبێت، ئیدی چوارسەدەی رەبەق وەکی خۆی

مایەوە. ئەو جێپەنجەو بەرهەمی کۆشش‌و هەوڵی ئیدریسی بەتلیسی بوو، کە سوڵتان دەسەڵاتێکی بێسنووری دابوویە. ئەو میرانەی کە لەشەڕی دژە قزڵباشاندا کۆمەکیانکرد، کردنییە حوکمڕانی سنجەقە بەمیرات جێماوەکانی خۆیان. هەرچەندە ئەمە لادانبوو لەیاسا گشتییەکەی ئیمپراتۆرێتەکە، چونکە ئەو پلەو پایانە تەنها بەکاربەدەستانی سوپا دەدران‌و نەدەشیا وەك میراتی مامەڵەیان دەگەڵ بکرێت. (هەر لەم بەندەدا بەدوورو درێژی باسی شیرازەی پێکهاتی ئەو حوکمڕانیانە دەکەین).
شەرەفنامە کە تۆمارگەی مێژووی زۆربەی خانەوادە دەسەڵاتدارەکانی کوردستانە، دەگێڕێتەوە کە ئەو میرانەی ئیدریس دایمەزراندن، گشتیان لەو خانەوادە کۆنینانەبوون، کە صەدان ساڵ بوو پاشا ئاساییانە فەرمانڕەواییان دەکرد ـ هەڵبەت جارجارەش دەستهێنراوەتە رێگەیان‌و لەحوکمڕانی دوورخرانەوە .. ئاق قۆینلۆو صەفەوییەکان سیاسەتی دارماندنی دەسەڵاتی ئەو خانەوادانەیان گرتبووەبەر، لەهەرکوێ توانیبیان حوکمڕانی تورکیان لەجێ داکردوون، یاخود کوردی کەمتر ئەریستۆکراتیان لەجێگە داناون. عوسمانییە داگیرکەرەکان بەپێچەوانەوە، جێپێ‌و بنکەی ئەریستۆکراتییە کۆنەکانیان بوژاندەوەو سەقامگیریان کردن، بواری هیچ تازە بەخۆداکەوتوویەکیان نەدەدا چکێك دەسەڵات بۆخۆی بڕدات.
(لەبەشی داهاتوودا هەوڵدەدەم ئەو شێوازە بەجۆرێك روونکەمەوە کە هەمان مێژوو لەڕوانگەیەکی بەرتەسکتری هەندەك میرنشینی کوردەوە، یاخود باشتر بڵێین خانەوادە دەسەڵاتدارەکانییانەوە بگێڕمەوە).

## ٣ ـ ٦ـ مێژووی سیاسی بڕێك میرنشینی كورد

### ٣ـ ٦ ـ ١ـ مەلیكی حەسەنكێف

حەسەنكێف بازێڕێكی شوورەداری دێرینی كەنار دیجلەیەو دەكەوێتە نێوان ئامەدو جزیرەوە. تا ئەم سەردەمانەی دواییش، زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانی فەلەی یاقووبی بوون (سریانیو ئەرمەنیو فەلە ئاسوورییە عارەب زمانەكان). دانیشتووانی دەڤەرەكانی دەوروبەری، تاوەكو ئەوڕۆش یاقووبیو موسڵمانو كوردی ئێزیدی (چ خێڵەكیو چ ناخێڵەكی)و بڕێك عارەبن.

ئەو سەردەمەی بۆ مەبەستەكەی ئێمە گرنگە، دانیشتووەكانی زێتر هەمەڕەنگ بوون، لێ شەرەفنامە تەنها باسی هۆزە كوردەكانو فەلە وەرزێرە بەیدەستكراوەكان دەكات. چەند ماوەیەكی كورتیلەی لێدەرچێت، ئیدی نێزیكەی صەد ساڵێك لێرە تەنها تاقە خانەوادەیەك حوكمڕان بوو، ئەو خانەوادەیەی بانگەشەی ئەوەی دەكرد كە گوایە وەچەی صەلاحەددینی ئەیوبییە. شەرەفنامە لەڕیزی یەكێك لەو پێنج خانەوادەیە حسێبیاندەكات، كە قەت تەواو سەربەخۆ نەبوونو لەقەبی شاهانەی رەهایان نەبووە، لێ جارجارە دراوو سكەیان لێداوەو نێویان لەخوتبەی هەینییاندا خوێندراوەتەوە[٦٧].

ئەمانە لەقەبی "مەلیك" یان هەبوو. مەلیك ئەشرەف كە هاوچەرخی تەیموری لەنگ بوو، سەری بۆ نەوییكردو ملكەچیی تەواوی خۆی بۆ راگەیاند (كە دیارە لەڕووی مادییەوە زیانی زۆری پێكەوت). سەردەمێكی دوورو درێژ فەرمانڕەوایی كردو هێمنیو ئارامی باڵیكێشابوو. پاش مردنی (لەسەرەتای سەدەی پازدەهەمدا)، مەلیك خەلیلی كوڕی، بەڕازیبوونی گشت خێڵە گەورەو گچكەكان، چووە سەرتەختو جێگەی گرتەوە[٦٨].

هەڵبەت قەرەقۆینلۆ قەت بۆی نەلوا حەسەنكێف بخاتەژێر ركێفی خۆیەوە. مەلیك خەلیل دانی بەسەروەریو شكۆو رێبەرایەتی شاروخی كوڕی تەیموری لەنگدا نــاو ئەودەمــەی هاتــە نێوچــەی ڤــان بــۆ بەگژداچــوونی قەرەیوسـفی ســەركردەی

قەرەقۆینلۆ، کە تازەکی جاڕی سەرخۆبوونی خۆیدابوو، مەلیك خەلیل ملکەچیی خۆی بۆ ڕاگەیاند. سەردەمی حوکمڕانێتی ئەمیش، بەئاشتیو ئارامیو بەختەوەریی رابورد. "چ سوپاو چ میللەت، لەبەخشندەییو دلاوایی دادوەریی، رازیو کامەرانو بەختەوەر بوون"[٦٩].

بەرۆگری مەلیك خەلیل، مەلیك خەلەفی برازای بوو، کە چەندین جار لەجەزیرە بەگژ هۆزە مەزنەکانی بۆتانی هاوسێیدا چوو. لەسەروەختی حوکمڕانیی ئەمدا، ئوزون حەسەنی سەرگەورەی ئاق قۆینلۆ، بەربلاوکردنی کەوشەنی دەستەلاتی دەستدایە! هۆردووەکەی گەمارۆی حەسەنکێفیدا. مەلیك خەلەف لەلایەن برازاکەی خۆیەوە نامەردانە کوژراو دەروازەکانی شار بۆ تورکان ئاوالەکران. پیاوکوژەکە چاوەڕوانی ئەوە بوو ئوزون حەسەن لەپاداشتی ئەو دلڕەشییەیدا بیخاتە سەر تەختی مامی، لێ ئەوە دژی پرنسیپی سیاسی ئەو پاشایە بوو! بۆیە باژێڕەکەو دەڤەرەکانی دەوروبەری دایە کرێ بەیەکێك لەسەرەکهۆزە تورکەکان.

مەلیك خەلیل، یەکێك لەبراکانی مەلیك خەلەفی کوژراو، دەربازبوو، خۆی گەیاندە سوریاو لەوێ خۆی شاردەوە تا شەڕەزرتانێی نێوخۆ، ئاق قۆینلۆی کەنەفتو لاوازکرد. ئەوجا گەڕاوە مەلبەندەکەی خۆیو داوای کۆمەكو پشتگیری لەڕەعییەتەکەیو خزمانی کرد. میرشا محەمەدی شێرۆیی یارمەتییەکی زۆری دا - مەزنانی هۆزی شێرۆیی هەمیشە دەکرانە وەزیری دەرباری مەلیکانی حەسەنکێف -. نوێنەرانی هۆزو تاقمە جۆربەجۆرەکان لەژێر سەرکردایەتی مەلیك خەلیلدا گردبوونەوەو بەڕێبەرێتی ئەو بەرەو سیعرد جمانو پاشانیش بایاندایەوە سەر حەسەنکێفو هەردوو باژێڕەکەیان لەژێر چنگی ئاق قۆینلۆ رزگار کرد. مەلیك خەلیل بووە پاشایەکی سەربەخۆ. ئیدی هیچ یەکێك لەمەزنانی کوردستان نەگەیشتە پلەو پایەی ئەوو نەیدەتوانی شان لەشانی بسوێت، تا مردن پاشایانە ژیا. مەلیك خەلیل یەکێك لەخوشکانی شا ئیسماعیلی صەفەوی مارەکرد. لێ کاتێك دەگەڵ پازدە میری دیکەی کورددا، بۆ راموسینی شیپانەی شا ئیسماعیل چوونە تەورێز، شا گرتنیو لەگۆشەی زیندانی پەستاوتن.

تەنها مافێك كە شا ئیسماعیلی ژنبرای پێڕەوادیت، ئەوەبوو رێگەیدا ژنو زارۆكانی ببینێت. ئیدی حەسەنكێف كەوتە دەست قزڵباشان، ئەوانیش دایانە دەست هۆزی بەشنەڤی. بەشنەڤییەكان قینێكی هێجگار زۆریان لەمەلیك خەلیل بوو، لەسەر ئەوەی گوایە سەرەكهۆزەكەیانی بەكوشت داوە. پاش شەڕەكەی چالدێران، مەلیك خەلیل دەرفەتی هەڵهاتنی بۆ رەخساو بەرەو حەسەنكێف تێیتەقاندەوە. دیتی خەڵكەكە لەسەر هەڵبژاردنی یەكێك لەو قوماندانانەی كە پێدا رادەپەرموودرێت سەردوكاریی جەنگی دژە قزڵباشان بكا، خەریكن بەشەڕ دێن. زۆربەی هۆزەكان پشتی سلێمانی كوڕی مەلیك خەلیلیان دەگرت، بڕێكیش پشتگیرییان لەیەكێك لەئامۆزاكانی دەكرد. ئەو دووكوتییە لەبەرژەوەندیی بۆتانییەكان بوو، گەمارۆی باژێڕی سعردیانداو بڕیاریاندا باژێڕەكە لەقزڵباش بستێننەوە بیخەنە ژێر ركێفی خۆیانەوە.

لێ مەلیك خەلیل لەماوەی چەند رۆژێكی كەمدا، هەردوكلای رەعییەتەكەیی پێكهێنایەوەو یەكیخستنەوە. بۆتانەكان ناچاربوون دەست لەسیعرد بەردەنو مەلیك خەلیلیش خێرا خستییەوە ژێر ركێفی خۆیەوە. بەشنەڤییەكانیش كە حەسەنكێفیان بەدەستەوەبوو، تەسلیمی مەلیك خەلیل بوون، ئەویش لێیانخۆشبووو هیچ سزایەكی نەدانو دەگەڵیاندا رێككەوتەوە، دڵی سەرەكهۆزەكانیشی بەوەدایەوە، كە لەتۆڵەی خوێنی بابی كوژراویدا، گوندێكی پێبەخشی.

روون نییە داخۆ حەسەنكێف پاش ئەوەی خرایەژێر ركێفی ئیمپراتۆرێتی عوسمانییەوە، كەوتە چ ئاستو پایەیەكەوە، لێ مەلیك خەلیل تا مردنی فەرمانڕەوایی كرد. چوار كوڕەكەی پاش خۆی لێیانبووە شەڕو ناخۆشی. حسەین كە بووە یەكەمین بەرۆكگریو چووە سەر تەخت، دوو برایی تووڕدایە زیندانەوە.

چوارهەمیشیان كە سلێمانی ناو بوو، بۆ كن خەسرەو پاشای فەرمانڕەوای عوسمانییان لەئامەد هەڵهات. پاشا حسەینی بەكوشت داو سلێمانی لەجێگەدا كرد. گێرمەو كێشەی دەگەڵ براكانیداو كینەی هۆزەكان لێیو تاوانباركردنی بەكوشتنی حسەین، ژیانیان لێ تالكردو ناچاری وازهێنانیانكرد. بۆخۆی دەستی لەكار

کێشایەوەو کلیلی گشت قەڵاکانی تەسلیمی خەسرەو پاشا کرد. بەوە کۆتایی بەفەرمانڕەوایی خانەدانی حەسەنکێف هات. سوڵتان تۆڵەی بۆ سلێمان کردەوەو کردییە فەرمانڕەوای شاری ئورفەو پاشانیش گەلەك جێگەی دی. هەریەك لەبراکانیشی هێندە ملکیان پێبەخشرا، کە بەوپەڕی تێرو تەسەلی پێیبژێن.

### ٣ـ ٦ـ ٢ ـ هەکاری و میرەکەی[٧٠]

مێژووی ئەم میرنشینە بۆیە گرنگە، چونکە خاکەکەی ساڵانێکی زۆر لەژێر تاوی دەستەڵاتدارانی صەفەویدا بوو، وەك بازێڕێکی مەزنی سەرسنوور، تامەتامەی هەردوو ئیمپراتۆرێتەکەی دەدا. هەرچەندە سروشت هەڵکەوتێکی پێبەخشیوە، کە دەستی هێرشبەرانی بێگانەی بەزەحمەت بگاتێ، لێ لەگەڵ ئەوەشدا میرەکانی پێویستیان بەشارەزایی و لێهاتوویەکی سیاسی چاك هەبوو، تا بتوانن سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن. بەشێکی زۆری دانیشتووانی ئەم میرنشینە ئاسووری بوون، (ئەو فەلانەی بەزمانی ئارامی دەپەیڤین و ڕێسای نەستۆرییانەیان پەیڕەوی دەکرد). نیوەیان وەکی زۆربەی فەلەی جێگەکانی دی، وەرزێری ژێر دەستەو رەعییەتی هۆزە کوردەکان بوون. نیوەکەی دیکەیان بەپێی دابی خێڵایەتی ڕێکخرابوون و کرابوونە جەنگاوەرانی مرۆتۆقێن[٧١] .

وەك لەمەودوا دەبینین، ئەوانیش لەسیاسەتی میرنشینەکەدا کایەیەکی گرنگیان دیتووە. خانەدانانی خانەوادە دەستەڵاتدارەکەی، بانگەشەی ئەوەیاندەکرد، کە گوایە لەتۆرەمەی خەلیفەکانی عەبباسین و جارجارە دراوی خۆیان لەسکە دەدەداو نێویشیان لەخوتبەی هەینییاندا دەخوێندرایەوە. وەك دەردەکەوێت، لەسەردەمەکانی کۆنتردا، کوردەکانی هەکاری لەژێرووتر، لەڤان و چۆڵەمێرگ ژیاون و لەوێ نێویان دەبرێت[٧٢]، (چۆڵەمێرگ ئێستە هەکاری پێدەڵێن). میرو مەزنانی مەڵبەندێکیان حوکمڕانی دەکرد، کە پارێزگەکانی هەکاری و ڤانی ئەوڕۆی دەگرتەوەو دادەکشا بەرەو خوار تا دەگیشتە باکووری عیراق.

ئەودەمەی تەیموری لەنگ دای بەسەر کوردستاندا (ساڵی ١٨٣٧)، میر عیزەدین شێر فەرمانڕەوایی ئەو دەڤەرەی دەکرد. مەردانە لەڕووی گەلە لەشکری

هێرشهێنەراندا راستبووەوە، لێ کاتێك دیتی تەیمور هیچ دەست لەڕەشەخەڵکەکە ناپارێزێت و خراپ جەزرەبەیان دەدات، ناچاربوو کۆڵبدات. یەکێك لەخزمانی کە نێوی نەسرەددین بوو، خۆی خزاندە قەڵا سەخت و رژدە دەست پێدانەگەیشتووەکەی ڤانەوەو درێژەی بەجەنگی بێئاکامی دژ بە هۆردووی تەیمووری دا، بەدەردیسەرییەکی زۆر راپەڕینەکەی تێکشێنراو خامۆشکرا. رەنگە ئەوە هۆی ئەوەبێت، کە تەیموور قنیاتی بەوەکرد، هەکاری هەر بەنێو بکاتە وڵاتێکی وابەستە. دانی بەسەروەریی عیزەدین شێردا ناو ملك و سامانی ماڵەباوانی پێبەخشییەوەو تەواوی دەستەڵات و فەرمانڕەوایی دایەوە دەستی. ئەو خانەوادەیەش لەئاستی تەیموورو بەرۆگرانیدا گشتیان بەئەمەك و دڵسۆز مانەوە. کاتێك شاروخی کوڕی تەیموور لەشکرکێشی بۆ تێکشکاندنی راپەڕینی قەرەیوسف (دامەزرێنەری دەوڵەتی قەرەقۆینلۆ) دەکرد، مەلیك محەمەدی کوڕی عیزەدین چووە دیداری، تا ملکەچی و گوێرایەڵی خۆی بۆ راگەیەنێت و ملکی خۆیی سەرلەنوێ پێ خەڵاتکرێتەوە.

شەرەفنامە لەمەودای فەرمانڕەوایی قەرەقۆینلۆدا، هیچ لەبارەی ئەو خانەوادەیەوە ناڵێت، واپێدەچێت ئەو خانەدانانە هەرچەندە ئاشکرا سەر بە **تەیمووریەکان** بوون، ملکەچیی خۆیان بۆ فەرمانڕەوایانی نوێ دەربڕیبێت، بۆیە **نووسەری** شەرەفنامە کە دۆستێکی نێزیکیان بوو، لەو رووەوە بێدەنگیی **هەڵبژاردووە.**

**ئوزون حەسەن**، سەرکردەی قەرەقۆینلۆ، ژەنەڕاڵە تورکەکانی راسپارد چۆڵەمێرگی **پێتەختی هەکاری بگرن**. شارەکە بەهۆی شڵ و پەیتی یەکێکی دی لەمەزنانی **خانەدانەکەوە، کە هیچ گوێی** بەتکاو هانای راوێژکارانی نەداو چ پێویستییەکی بەرگریگردنی **دابین نەکرد** بوو، گیرا. میر کوژرا، (رەنگە زۆری دیکەش لەوانەی ترسی ئەوەیان **لێدەکرا** کە لەپاشەڕۆژدا یاخی بن و راپەڕین و شۆڕش دژی داگیرکەران بەرپاکەن، رەگەڵی کوژرابن).

هەرێمەکە خرایە ژێر دەستەڵاتی هۆزی دومبلییەوە*، کە تاقمێکی دەمارگرژی شێلگیری خەڵکی دەوروبەری جزیرە بوون. دونبلییەکان پەیوەندیی دۆستانەی نێوان شێخ ئەحمەدی سەرۆکیانو ئوزون حەسەنیان بۆ ئەوە قۆستەوە، کە بەنێوی ئاق قۆینلۆودو بە سەرەڕۆیی و سەرکەشیی خۆیان داگیرکاریی بکەن. مەڵبەندو نێوچەکانی خۆرهەڵاتی هەکاری کەوتنە ژێرچنگو دەستەڵاتی ئەوانەوە. ئەمانە کۆنفێدراسیۆنێکی تێکەڵ لەچەند هۆزە کوردێکی رەچەڵەك جوداواز بوون، کە لەژێر فەرماندەی شێخ مەحمود نێوێکدا یەککەوتبوون (نێوەکەشیان هەر لەنێوی ئەوەوە هەڵگۆزیبوو)و گوێڕایەڵو خزمەتگوزاری ئاق قۆینلۆ بوون.

کاتی خۆی قەرە یوسف دەستبەرداری مەڵبەندەکانی ئاشووتو خۆشاب بوو، کە ملکی هەکارییان بوونو بۆ مەحمودییەکانی جێهێشت. میر حسەین بەگی کوڕی شێخ مەحموود، کە نازدارێکی ئوزون حەسەن بوو، بەڕەسمی کرایە فەرمانڕەوای ئەو مەڵبەندانەو بڕێك نێوچەی دیکەشیان درایەدەم. بەو جۆرە میرنشینی هەکاری کەوتە ژێرچنگی دوو هۆزە کوردی بێگانەی داردەستی ئاق قۆینلۆوە.

ڕێکەوت وابوو، چەند بازرگانێکی ئاسووری دەڤەری دز (یەکێك لەمەڵبەندەکانی پێنج هۆزە یەککەوتەکە)، گەلەکجار بۆ کارو کاسبی ڕێگەیان دەکەوتە سوریاو میسر. یەکێك لەنەوەکانی خانەدانانی هەکاری، کە نێوی ئەسەدەدین بوو، لەمیسر دەژیا، لەوێ لەخزمەت سوڵتانی چەرکەسییەکاندا سەرباز بوو. بازرگانە ئاسوورییەکان نێوبانگو شۆرەتی دەبیستنو دەچنە کنی، تکای لێدەکەن دەگەڵیان بگەڕێتەوەو وێرانەی ماڵەباوانی ببووژێنێتەوە.

ئەویش دەستبەجێ بەگوێیاندەکاتو رەگەڵیاندەکەوێت. قەڵاکەی دز، یەکێك بوو لەو قوللانەی بەدەست دونبولییەکانەوە بوو.

---

* لەشەرەفنامەی هەژارو پوختەیەکی مێژووی کوردو کوردستانی مامۆستای هێژا محەمەد ئەمین زەکی بەگ دا، دونبولی نوسراوە. بڕوانە: ل٢٤٠ی شەرەفنامەو ل ٣٨٢ی پوختەیەکی مێژووی کوردو کوردستان، ب ٢.

رەعییەتە فەلەکان دەبایە بەردەوام دارو تفاقیان بۆ قەلاتەکە سەر خستبا. ئەسەدەدینو چەند کەلەمێرێکی عەگیدی هۆزەکەی، جلکی فەلەیان دەپۆشنو دەچنە نێو قەلاکەوەو بەو چەکانەی لەنێو بارەدارەکاندا شاردبوویانەوە، دونبولییەکان تێکدەشکێنن. لەماوەیەکی هێجگار کورتدا زۆربەی مەلبەندەکانی هەکاری لەژێرچنگی هۆزەکانی دونبولی رزگار دەکەن.

دەربارەی دونبولییەکان، وەك دەبیستین لەسەردەمەکانی پاشتردا لەئازربایجان، (لەدەوروبەری خۆی) وەك وابەستەیەكو داردەستێکی صەفەوییەکان دەژێن.

مەحموودییەکان دژێکی خەتەرناك بوون. هێشتا زۆر کوتی کۆنە میرنشینی هەکارییان لەژێر چنگدا مابوو، چەند جارێك بە کۆمەکی ئۆردووی تورکی (ئاق قۆینلۆکان)، ئەسەدەدینیان بەزاند.

تا ئەودەمەی ئەسەدەدین کۆمەكو یارمەتی بەتلیسی مسۆگەر کرد، ئەوجا مەحموودییەکانی تێکشکاند.

زاهید بەگی نەوەی ئەسەدەدین، خۆی خزانە ژێر سایەو پەنای شا ئیسماعیلەوە. پێدەچێت شا ئیسماعیلیش متمانەی بەو زێتربوو بێت وەك لەمیرە کوردەکانی دی، بۆیە کردییە میری بەرۆگری باپیری. پاش خۆی میرنشینەکەی کرایە دوو کوتەوە: میرنشینی وەستان (لەباشووری خۆرهەلاتی گۆلی ڤاندا)و میرنشینە راستەقینەکەی هەکاری. سەیید محەمەدو مەلیك بەگی کوری بوونە میری ئەو دوو میرنشینە.

رووداوو پێشهاتەکانی ئەو قۆناغە تا رادەیەك سەرشێوێنەرن، شەرەفنامەش زۆر شتی روون نەکردۆتەوە، لێ ئاشکرایە ململانێو کێشمە کێشی عوسمانیو صەفەوییەکان لەسەر ئەو مەلبەندە سنوورییانە، گیانی دوژمنایەتیو رقەبەرایەتی نێوهەناوی خانەوادە فەرمانرەواکانی ئەو دەڤەرەی برەوپێداوە. لەسالی ١٥٣٤ ەوە ئیدی هەکاری بەنێو بۆتە پشکێك لەئیمپراتۆرێتی عوسمانی، لێ لەراستیدا سەربەخۆ حوکمرانی کراوە.

یەکێك لەکورانی مەلیك بەگ دایە پال شا تەهماسبی کوری شا ئیسماعیل. یەکێکی دیکەیان جووە دیاربەکرو عوسمانییەکان ملکێکی فرەیان خەلاتکرد. سالی

١٥٧٨ لەشەڕی چاڵدیرانی نێوان عوسمانیو صەفەوییەکانەوە بەشداریی کرد، بەدیل گرتیانو دایانە دەست برازایەکی خۆی، کە لەڕیزی ئوردووی صەفەوییاندا بوو، برازاش دەستبەجێ فەرمانیدا مامی بکوژن.

دەستەیەك لەکوڕانی ئەو خانەدانە وەك نوێنەرێکی بابیان حوکمڕانیی هەرێمو شارۆچکەکانی هەکارییان دەکرد. سوڵتانە عوسمانییەکانو شاکانی ئێرانیش بەهەمانجۆر کوڕەکانی خۆیان دەکردە والی، بەدوو مەبەست:

١. تا جڵەوی فەرمانڕەوایی لەمستی خانەوادەکە خۆیدا بمێنێتەوە.

٢. تا ڕەقیبو مێملە خەتەرناکەکانیش لەپێتەخت دوورخرێنەوە.

زەینەڵ بەگی کوڕە گەورەی مەلیك بەگ لەبابی هەڵگەڕایەوەو بەکۆمەکی مەزنانی هۆزەکە بەزاندیو خزاندییە زیندانەوە. لێ مەلیك بەگ توانی هەڵبێتو یەکەمجار ڕووی لەودستان کرد بۆکن سەیید محەمەدی برای، لەوێوە بەرەو بەتلیس تێیتەقاندو بەوپەڕی ڕێزەوە پێشوازیی لێکرا. سەیید محەمەد بۆ دەرپەڕاندنی زەینەڵی برازای لەچۆڵەمێرگو یەکخستنەوەی گشت لەگشتی خاكو مەفتەنی خانەوادەکەی بەرێبەرایەتی خۆی، پشتگیریی هۆزی مەزنی پنیانشی مسۆگەر کرد.

زەینەڵ بەگ یەکەوراست پاش ئەوە خۆی دەگەیەنێتە ئازربایەنجان، تا پشتگیرییو کۆمەکی صەفەوییەکان بۆ دەستخستنەوەی هەکاری مسۆگەر بکات. هەر لەگەڵ هەستدەکات هیواکەی بێئاکامەو ڕەنجی ناکامەو صەفەوییەکان خەریکن سەیید محەمەد دەلاوێننەوە، بەهەمان دڵی پڕ لەهیواوە ڕوو لەئەستەموڵ دەکات. ڕۆستەم پاشای وەزیری دەرباری سوڵتان سلێمان، ئەو دەم لەبیرو هزری ئەوەدا دەبێت ئەو دەڤەرە ئامالٚ سەربەخۆیە بەتەواوی بخاتەوە ژێر ڕکێفی عوسمانییانەوە، لێ لەپەیوەندی زەینەڵ دەگەڵ صەفەوییەکاندا، بێئاگا نابێت، بۆیە داوای لێدەکات وەك بەڵگەو نیشانەیەکی گوێڕایەڵیو ملکەچیی، ژنو زاڕۆكو خزمو خوێشانی نێزیکی بگێرێتەوە بۆ نێو کەوشەنی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی. هەر زەینەڵ دەگاتەوە هەکاری بۆ هێنانەوەی ماڵو منداڵو سامانی، هەواڵی کەنار خستنی ڕۆستەم پاشا دەبیستێت.

ئیدی ناوێرێت روو لەئەستەموڵ بکاتەوە، سەرلەنوێ بە ئومێدی میهرەبانیو خۆشنوودیی شا تەهماسب، بەرەو ئێران باپێدەداتەوە. لێ ئا لەو دەمانەدا پەیوەندیی صەفەوییەکان دەگەڵ سەیید محەمەددا ڕووەو چاکی دەچێت، هیچ روو بەزەینەڵ نادەنو لووتی لێومردەگێڕن. هەر لەگەڵ دەبیستێت سوڵتان هەمدیسان میهرەبانیی نواندۆتەوەو رۆستەم پاشای سەروەری کردۆتەوە بەوەزیر، دەستبەجێ ڕێگەی ئەستەموڵ دەگرێتەوەبەر.

بەڵام پێدەچێت وەزیر مەیلی دەگەڵ زەینەڵ نەمابێت، لێی لووتەلا دەبێتو لەبریتی فەرمانی شاهانە بۆ کردنەوەی بەمیری وڵاتی هەکاری، دەینێرێتە بۆسنەو ملکێکی زۆری پێدەبەخشێت تا پێی بژێت.

لەو سەرو بەندەدا ئەسکەندەر پاشای میری میران لەڤان، کە میری هەکاری بەنێو بەردەستەی بوو [٧٣]، خراپ لەسەیید محەمەد هەڵدەپێچێتو قینی لێهەڵدەگرێت. ئەم سەرەکهۆزە دەستەڵاتی خۆی لەهەکاریدا تەواو سەقامگیر کردبوو، لەژێریشەوە داوی پەیوەندیی دەگەڵ صەفەوییاندا رایەڵکردبوو [٧٤]، رەنگە زێتر بەمەبەستی هاوکێشیو راگرتنی شایەنی هێزی هەردوکلایان بوو بێت، نەك دڵسۆزیو مەیلی بەلای صەفەوییەکاندا. ئەسکەندەر پاشا لەڕێگەی دەهۆبازییەوەو بەکۆمەکی مەحموودییەکان (کە هێشتا خۆشاییان بەدەستەوە بوو) توانی سەیید محەمەد لەداونێتو بیگرێتو پاشانیش بیکوژێت. تکاش لەئاستانە دەکات، زەینەڵ بەگی بۆ بنێرنەوە، تا بۆ رزگارکردنی هەکاری کۆمەکی پێبکات، (وەکی راوێژکار، یاخود ئەفسەرێکی سیاسی).

زەینەڵ بەگ، ماوەیەکی کورت پاش گەیشتنی، بە شۆفاریو زوانگیری بۆ سەرسنووری ئێرانی دەنێرن. بەڕێکەوت تووشی بایەندوربەگی برای دێت، ئەویش هەمان کاری بۆ ئێرانییان دەکردو شا بەهەمان ئەرك ناردبووی. جووتەبرا بەشەڕ دێن، بایەندوربەگی تێدا دەکوژرێت. زەینەڵ بەگ دەستەیەك لەیاوەرو هاوەڵانی بایەندور بەدیل دەگرێتو بەدیاری بۆ ئەسکەندەر پاشایان دەباتەوە. ئەو دڵسۆزیو ملکەچییەی بەرامبەر عوسمانییەکان، بەکردنییە میری هەکاری پاداشت دەدرێتەوە.

مێژووی ئەو خانەدانە ماوەیەکی زۆر ئاوها درێژەی کێشاو بەو پێودانگە ڕەوتی دەکرد، هەڵێك بۆ کن عوسمانییەکانو چەڵێك بۆ کن صەفەوییەکانو دەمێك بۆ سایەو پەنای خانەوادە خانەدانەکانی دیکەی کوردستانو هۆزە یەککەوتەکانی هەکاری. هەتا لەنێوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا دواهەمین میری هەکاری، کە یەکێك لەنەوەکانی ئەو خانەدانە بوو، لەسەر کار لابراو دەستەڵاتی لێسەندرایەوە. لێ هەتا ئەوڕۆکەش لەهەکاری، سیاسەت هەربەو شەقڵە ڕەوت دەکات.

## ٣ـ ٦ـ ٣ فەرمانڕەوایانی چەمشکەزەك

چەمشکەزەك ئەوڕۆکە دەڤەرێکی چەپەری، ڕێتێنەبردووی، کەم تۆژراوەی، کەم خەڵکی، هەرێمی دەرسیمە. شەرەفنامە وەك یەکێك لەنێودارترینو بە شۆرەترین خانەوادەکانی کوردستان باسی خانەوادە فەرمانڕەواکەی دەکات (هەرچەندە دوورنییە لەڕەچەڵەکدا سەلجووقی نەبن)[٧٦]. مڵكو قەڵەمڕەویان هێند بەرینو فراوان بوو، کە سووكو ئاسان نێوی گشت (کوردستان) یان لەبریتی مەفتەنو زێدی خۆیان بەکاربردووە. گەلەك خێڵی گەورەو گچکە گوێڕایەڵی فەرمانی ئەو خانەوادەیە بوون، ئەو خانەدانانە خاوەنی ٣٢ قەڵا بوون. هەتا لەپڕ وەیشوومترینو ترسناکترین ڕۆژانی ڕەشی وەکی هێرشی جەنگیزخانو تەیمووری لەنگو قەرەقۆینلۆی قەرەیوسفیشدا، هەر مڵكو سامانی خۆیان بە دەست خۆیانەوە مابوو. لێ دەگەڵ دەرکەوتنو سەرهەڵدانی نوزون حەسەندا، دەستەڵاتیان بەخێرایی دایە کزیو لەپرێکدا دامرکایەوەو پووکایەوە.

گەر متمانەو باوەڕ بە گێڕانەوەکانی شەرەفنامە بکەین، ئەوا فەرمانڕەوایانی ئاق قۆینلۆ، منەو هەڵپەی ئەوەیان بووە، گشت لەگشتی میرنشینو حوکمڕانییەکانی کورد خاشەبرکەن، بەتایبەت ئەوانەیان کە دابوویانەپاڵ قەرەقۆینلۆ. خەربەنداو کە تیرەیەکی هۆزی ئاق قۆینلۆ بوو، کردیانە سەر میرنشینی چەمشکەزەك بۆ بەیدەستکردنو ژێرچەپۆکخستنی. هەتا داگیریشیانکرد، لێ پاشان شێخ حەسەن، میرە لاوەکەی، لەشکرێکی بەهێزی لەڕەعییەتەکەی پێکهێناو هێزی داگیرکەری

توركی دامالّەخاسکردو لەخاکی خۆی توورپیدانە دەرەوە. ئیدی خۆی‌و بەرۆگرانی ملك‌و مەفتەنی خۆیان بە دەستەوە مایەوە هەتا سەردەمی شا ئیسماعیل.

هەڵوێستیان بەرامبەر شا ئیسماعیل زۆر دۆستانە بوو، رەنگە لەو سۆنگەیەوە بوبێت، کە ئەوانیش پەیڕەوانی ئاینزایەك بوون کە دەگەڵ ئاینی قزڵباساندا جوداوازییەکی ئەو تۆی نەبوو، لایەنی کەم هەردوکلا شیعەبوون[٧٧]. کاتێك شا ئیسماعیل، نورعەلی خەلیفە روملوی سەرەقوماندان‌و حوکمڕانی ئەرزنجانی کردە سەر چەمشکەزەك، حاجی رۆستەم بەگی میری، بێ بەرەنگاربوونەوەو دەستکردنەوە تەواوی ولاتەکەی دایە دەستی‌و ئالای تەسلیمبوونی هەلکرد. ئەمە پێچەوانەی هەڵوێستی سی ساڵ لەوەبەری بوو بەرامبەر عوسمانییەکان. ئەوە بوو ساڵی ١٤٧٣ـ ١٤٧٤ ئەو لەشکرەی ئاق قۆینلۆو سوڵتان محەممەدی تێکوپێك شکاند، کە ویستیان قەلای کەماخ بگرن‌و دژدارەکەشی بەنیاز بوو تەسلیمی سوڵتانی بکات. ئەودەم حاجی رۆستەم بە گشت هێزو توانایەوە بەرەنگارییکرد، لەوەدواش قەلاکەی تەسلیمی شا ئیسماعیل کرد.

پاشان چووە دیداری شا ئیسماعیل‌و ئەویش لەدەرباری خۆیدا پێشوازیی لێکردو وەك خەرامانێك، لەبریتی چەمشکەزەك کردییە حوکمڕانی هەرێمێك لەئێراندا.

دانیشتووانی چەمشکەزەك‌و لەدەست تاوان‌و کوشتوبڕی نورعەلی هێجگار بێزارو ناڕازیبوون، چونکە دەستیدایە ملهوری‌و گەلەك لەمیرو مەزنانی هۆزەکەی کوشت. ئیدی گەورەو بچوکی نێوچەکە لەدەستی وەزاڵە هاتن‌و دەستیاندایە چەك‌و لێی راپەڕین، دیارە هاتنی نۆردووی عوسمانیش (هێرشەکەی ساڵی ١٥١٤ی سوڵتان سەلیم) پاڵپشت‌و هاندەرێك بوو بۆ هەژاندنیان. راسپێریان نارد بۆ ئێران بەدووی حاجی رۆستەمدا، تا هانی گەڕانەوەی بدەن. لێ حاجی رۆستەم کۆشك‌و تەلاری خۆی جێهێشتبوو، دووی شا ئیسماعیل‌و لەشکرەکەی کەوتبوو، خۆی گەیاندبووە کنیان لەچاڵدیران‌و هەتا کرابووە ئەندامی ئەنجومەنی قوماندانییش. پاش تێکشکاندنییان، حاجی رۆستەم ویستی سەنگەر بگوێزێتەوە کن عوسمانییان. چووە خزمەت سوڵتان سەلیم‌و بەڕامووسینی رکێفی شادبوو. لێ هەرهەمان رۆژ بەفەرمانی سوڵتان

لەسەری دراو یەکێك لەنەوەکانیو چل کەسی دی لەخزمانیو ئاغاو مەزنانی هۆزەکەی بەدوویدا کوژران.

کاتێك پیر حسەین بەگی کوڕی، کە هێشتا لەئێران بوو، ئەو هەواڵەی بیست، بڕیاریدا سەری خۆی هەلگرێتو بچێتە میسرو پەنا بۆ کن پاشایانی چەرکەس بەرێت. وەلێ لەرێ تووشی پیرەمێردێکی زونهاری دانای دنیادیتە دێتو ئامۆژگاریی دەکات روو لەئاستانەی سولتان بکات. بەگوێی پیرە دەکاتو دەچێتە هەواری زستانەی سولتان سەلیم لەئەماسییەو لاشیپانەی ماچدەکات. سولتان لەکەنەمێریو بوێری ئەو خورتە سەری سوڕدەمێنێتو دەستبەجێ میرنشینی چەمشکەزەکی میراتی ماڵە باوانی پێدەداتەوە، فەرمانیش بەمحەمەد پاشای بیغلو دەدات، چەمشکەزەك لەقزلباشان پاککاتەوەو پیرحسەین بەتەختو بەخت شادکاتەوە. لێ پیر حسەین لەسەر کۆمەکی محەمەد پاشا ڕاناوەستێتو خۆی دەستبەجێ قەومو قیلەو لەشکری کۆدەکاتەوەو هێرشی دەباتە سەر قزلباشانو لەخاكو مەفتەنی خۆی دەریاندەپەڕێنێت. ئیدی سی ساڵی رەبەق بە ئاشتیو ئارامیو کامەرانی حوکمڕانیی دەکات.

لەپاش خۆی، شازدە کوڕەکەی نەیانتوانی پێکبێنو بەتەبایی بژێن، ئاشووب کەوتە نێوانیانەوەو هانایان بۆ سولتان سلێمان برد، ئەویش وڵاتی چەمشکەزەکی بۆ کردنە سێ کوتەوە، سەقمان کوتە بەفەڕو پڕ خێرو بێرەکەیان، بووە ملکی سولتان، ئەیاغەکەشی کرایە دوو سنجەقی مەچەنگەرو پەرتەكو بەدەست خانەوادەکەوە مانەوە. بڕیاریشدرا ئەو سەرانەو باجەی بەنێوی جزیەوە لەڕەعییەتە فەلەکان دەسەندراو تا ئەودەمە بۆ خەزێنەی میربوو، ئیدی بۆ خەلیفە بنێردرێت. هەریەك لەو چواردە برایانەش کە نەکرانە حوکمڕان، تیمارو زەعامەتی گەورەو گچکەیان پێبەخشرا. پاشان یەکێکیان ژیرانە تکای لەسولتان کردو سنجەقی سەقمانی وەك میراتیی ماڵە باوانی پێدرایەوە.

پێشتر چەند جارێك باسی تیمارو باجو خەراج کرا، لەبەشی داهاتوودا، کە دێینە سەر باسی جۆری فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆریێتی عوسمانیو شێوازی ژێر چەپۆکخستنی

کوردســـتان‌و جووتباقــه‌کردنی بــه‌و سیــستێمه‌وه‌، ئــه‌و مه‌ســه‌له‌یه بــه‌هوردی رووند‌ه‌که‌ینه‌وه‌.

# تێبینی و سەرنج و سەرچاوەکان

## تێبینییەکانی بەشی سەرتڵ و سەرەتا

١. بریتین لەشۆڕشەکانی مەکسیك و رووسیاو چین و ڤێتنام و جەزایر و کوبا.

٢ـ ئەم دیاردەیە لەلایەن دەزگاکانی راگەیاندن و پڕوپاگەندەی عیراقەوە زەق و قەبەدەکرا، دەنا وەکی دی رژێمی عیراق خۆی بەردەوام هەوڵیدەدا لەرێگەی هاریکاری و پەیوەندییەوە دەگەڵ ئەو جۆرە کەسایەتییە کوردە نەریتییانەدا، جێپێی بارزانی و نیشتمانپەروەرانی کورد کەچ و لەقکات.

٣ـ لەو بوارەدا دووبەرەکی هەناوی پارتەکەو لەگەڕخستنی ئەندامە سەرکردایەتییە شارییە رادیکالەکانی بزووتنەوەکە لەساڵی ١٩٦٤ دا، پێشهات و دیاردەو هۆکارێکی گردەبڕبوون. بڕوانە: (ڤانلی، ١٩٧٠، ل ٢١٨ ـ ٢٢٥)، (Kutschera، 1977، ل ٢٤٦ ـ ٢٥٢)، (جەواد، ١٩٨١، ل ١٦٣ ـ ١٧٣)، (ئیبراهیم، ١٩٨٣، ل ٥١٧ ـ ٥٣٢).

٤ـ لەسەروەختی پیادەکردنی یاسا جەنگییەکەی ساڵانی ١٩٧١ ـ ١٩٧٣دا، بێشکچی درایە دادگاو سزادرا. یەکەم رژێمی ئازاد هەڵبژێردراوی پاش ئەو سەردەمە، لەساڵی ١٩٧٤دا فەرمانی لێخۆشبوونی گشتیدا و ئەویشی گرتەوە. بێشکچی هەر لەسەر خۆخەریککردن بەکێشەی کوردەوە بەردەوام بوو، چەند کتێبێکی دیکەی بڵاوکردەوە، کە رەخنەبوون لەئیدیۆلۆژی کەمالیست و سیاسەتی تورکان لەحاند کورد، بەو هۆیەوە دیسان خزێندرایەوە زیندان. پاش بەسەرچوونی ماوەی سزاکەی، سەرلەنوێ لەسەر ئەو نامەیەی کە لەزیندانەوە بەدزییەوە بۆ هەندەرانی ناردبوو، درایەوە دادگاو سزادرایەوە، هەرچەندە تا نووسینی ئەم کتێبەش ئەم سزایەی دواییانی نەچەشتووە.

٥. یەکێك لەو رەخنە گونجاوانەی کە نووسەر "نموونەی پیاوی بەهێز"ی نێوناوە لەلایەن Bailey و Barth و برێکی دییەوە قۆزراوەتەوە، بڕوانە: (Thoden van Velzen, 1973).

٦. پێموایە نارەوایی دەرهەق بە Alavi دەکەم، گەرپێ لەوە نەنێم کە ئەویش پەیی بەو راستییە بردووەو دەڵێت: دەبینین سیاسەتی فراکسیۆن لەکۆمەڵگە وەرزێرییەکاندا، مانای دانەدواوەی کێشەی چینایەتی ناگەیەنێت، هەردوکیان لەبارودۆخی جوداوازدا شێوازی سیاسی جوداوازیان لێدەکەوێتەوە. هیچ یەکێکیان دەستبەرداری پێبەندییە بنجییەکەی وەکی خزمایەتی نابن، کە پێش خۆدەرخستن بۆ هاریکاری چینایەتی دەکەوێتەوە. هەڵسوکەوتو رەفتارە سیاسییە چڕەکان پێشانی دەدەن پێبەندییە بنجییەکە بەکامە ئاست گەیشتووە".

٧ـ ئەو پشکەی سیاحەتنامەکەی ئەولیا چەلەبی کە دەربارەی کوردەو باسی سەفەری دیاربەکریمان بۆ دەگێڕێتەوە، منو چوار برادەرم تەرجەمەمان کردووەو تێبینیو سەرنجو پەراوێزمان خستۆتەسەر. بڕوانە (Boeschoten ,1988 / Bruinessen). بۆ زانیاری زێتر لەبارەی ئەولیاو سەفەرەکەی کوردستانیو دەستنووسو سیاحەتنامە چاپکراوەکانیەوە، بڕوانە سەرتڵی ئەم کتێبە.

## سەرنجەکانی بەندی یەکەم

١. نەخشە رەسەنەکە، بەختیاریو لوڕی بەکورد لەقەڵەم داوە، کە من بەڕاستی نازانم، بۆیە دەستکاریم کردو راستمکردەوە.

دەقە رەسەنەکە لەچەندین سەرچاوەدا چاپکراوەتەوە، وەکی (Rambout,1947)و (Vanly,1970).

٢- Devlet is tatisik Enstitutsu, genel nufus sayimi 1955, (Ankere, 1956)

٣. سەرژمێرەکە هەر بەپێنج ساڵ جارێك لەرۆژێکی مانگی ئۆکتۆبەردا دەکرێتو ژمارەیەکی زۆر کەسانی نیوە راهێنراو پێهەڵدەستن. بەو پێیەی لەکوردستانی تورکیا گەلەك گوند هەن، کە لەپێتەختی مەڵبەندەکەوە بەکەمتر لەدوو رۆژ نایانگەیتێ، قەت ناشێت سەرنووسان رێیان تێیکەوێت. نەو حەمکە رەوەندانەی من دیتمن، دەیانگوت لەوەتەی هەن، سەرنووس نەکراون.

٤- A.T. Wilson: 1931, S. 18; H. Field 1949, The Anthropology of Iraq , Teil 1, Nr. 1, S. 104 – 105.

٥- Vanly in Chaliand; 1978, S. 227 -232.

٦ـ بڕوانە سەر ژمێرییەکەی ١٩٦٦ کە لە (Almanac of Iran ) (تاران، ١٩٧٥، ل ٣٣٦)دا پوختەکراوە.

٧ـ بڕوانە: (Almanac of Iran,1975, S .428)، چەند ساڵێك پێشتریش هەرهەمان ژمارەی دەستنیشان کردبوو. بۆیە بەمەزندە ژمارەکەو ڕێژەی زیدەبوونی دانیشتووان بەپێی ئەو ساڵە بەسەرچووانە راستکرابووەوەو گەیاندرابووە ٢,٥ ملوێن.

٨. بڕوانە: (Dam, 1979, S. 15) بەپێی توێژینەوە دێموگرافییەکان ڕێژەکە بە ٨٪ دادەنێت. هەروەها بڕوانە Nazdar لە (Chaliand, 1978, S. 309 - 312)دا کە خەملاندنێکی ماقوول بۆ ساڵی ١٩٧٦ دەکاتو ژمارەیان دەگەیەنێتە ٨٢٥ هەزار، کە دەکاتە ١١٪ی دانیشتووان.

٩. وەسپێکی شیرینی ئەو شێوازە نابوورییە لە (Hutteroth 1959)دا دەبینین. ئەو نیوەکۆچەرانە بەوەرزێری یایلایی نێودەبات، کە لەوشەی Yaylaی تورکییەوە وەریگرتووەو مانای زەنوێر یاخود نوالانو لەوەرگەی کێوان دەگەیەنێت.

١٠. لەسەردەمی ئەتاتورکو ڕەزاشادا، تورکیاو ئێران تەونی تاوانی نیشتەجێکردنی زۆرەملێی ڕەوەندەکانیان خستەگەڕ، بڕوانە: (بێشکچی ١٩٧٧)و (Salzmann, 1971). هەڵبەت ئەو سیاسەتە نوێ نەبوو، هەر لەسەدەی حەڤدەهەمەوە حکومەتی عوسمانی هەوڵی بەزۆر نیشتەجێکردنی هۆزە ڕەوەندەکانی دەدا، بڕوانە (Orhonlu,1963 ). دیارە لەپشت پەردەی ئەو نیشتەجێکردنەوە، مەبەستێکی سیاسی حەشاردرابوو، ئەویش چەسپاندنو سەقامگیرکردنی سنووری نێودەوڵەتییان بوو.

بەددانان بەو سنوورانەدا، ڕەوەندەکان کە لەوەرگەی هاوینەو زستانەیان لەچەند وڵاتێکی جوداوازدا بوون، ناچارکران یا ڕێگەو هەواری کۆچیان بگۆڕن، یاخود بەهێجگاری دەستبەرداری ژیانی کۆچەرێتی ببن.

١١. له (Hutteroth, 1959 )دا بەچاکی هۆزە ڕەوەندەکانی تۆرۆسی کوردو ڕێگەی کۆچو ڕەویان ڕوونکراونەوە. ڕۆژنامەنووسی تورک (Fikret Otyam) باسێکی هێجگار سەرنجڕاکێشی دەربارەی هۆزی ڕەوەندی بەریتانو تەنگوچەڵەمە زۆرەکانی نووسیبوو، سەرەتا لەڕۆژنامەی جەمهوریەتدا بڵاوکرایەوەو پاشانیش کرایە کتێب، بڕوانە (Otyam, 1976 ).

کۆمەڵناسی تورك سمایل بێشکچی کارنامەی دوکتۆرییەکی نایابی دەربارەی مەزنترین هۆزی ڕەوەندی ژووررووی کوردستان، هۆزی عەلیەکانو کێشەو گرفتەکانیو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکانی نووسی، بڕوانە (Besikci, 1969 ).

١٢ـ (Peter )و (Mugal Andrews ) سەرنجیان بۆ ئەو ڕاستییە ڕاکێشام، کە ڕەشماڵی کورد بەوە لەدەواری ڕەوەندی میللەتانی دی وەکی (عارەبو بڕێك تاقمی تورکو پەشتۆکان) جودا دەکرێتەوە، کە ستوونی ڕەشماڵەکە لەبنمیچەکەیەوە سەردەهێنێتە دەرەوەو بەپارچەیەکی توندو تۆڵ لەهەمان قوماشی دەوارەکە، ڕاگیردەکرێت، ئەمە یانی لەبنەوە بێ پشتیوانە. ڕاستیو دروستی ئەو سەرنجەم لەکن گشت کوردە دەوارنشینەکانی کوردستانو خۆراسان، بۆ دەرکەوت.

١٣ـ بەلەبەرچاوگرتنی بڕێك پیشە، تینو تاوی کاریگەری ئەم هۆکارەمان بۆ ڕووندەبێتەوە. ساڵی ١٨٤٠، مسیۆنار Badger دەبینێت، کە بڕێك لەکارگەی پەموو ڕێسینە گەورەکانی شاری تۆقات Tokatی ئەنەدۆلی نێوەند، کە ساڵانێك لەوەبەر کاریان چاك بەڕێوەدەچوو، خەریکن تەواو لەنێودەچن، چونکە خاوەنەکانیان ناتوانن دەگەڵ شمەکە چاکە هەرزانەکانی لەلیڤەرپوڵو مانشیستێرەوە هێنراودا، هەنگاو هەلگرنو کێبەرکێیان پێناکرێت، بڕوانە: (Bader, 1982 I, S. 23 ).

فۆن مۆلتکە ساڵی ١٩٣٨ بەپاپۆڕی هەڵم دەچێتە دەریای ڕەش، وەك دەگێڕێتەوە، باری کەلو پەلی کارخانەسازیی لەدەرەوە هێنراو، بایی یەك ملوێن مارك زێتر دەبوو، بڕوانە:

.( von Moltke, 1882, S. 199)

Badger دەبینێت، وەك ئاكامێكی كردنەوەی رێگە بازرگانییە نوێكان، چەندین بازێڕی گرنگی كوردستان، لەوانەی كە لەوەبەر چەقی بازرگانیی بوون، بەتایبەت دیاربەكرو بەتلیس، ئیدی هێدی هێدی نرخو بایەخیان لەدەستدەدا.

١٤. ئەو باوەڕەی كە گوایە زمانی كوردی سەر بەلقی سەرووی خۆرئاوای زمانە ئێرانییەكانە، ماوەیەكی زۆر باوو سەپاوبوو. لێ مەكەنزی ئەو باوەڕەی خستەبەر رێژنەی گومانەوەو سەلماندنی كە زمانی كوردی لەڕاستیدا رەنگە لێكچوونی زێتری دەگەڵ لقی خوارووی خۆرئاوای زمانە ئێرانییەكاندا هەبێت، بڕوانە:
.( Mackenzie, 1961b)

١٥ـ بڕوانە (Bynon, 1979 ). هەروەها بڕوانە لێكۆڵینەوەی مەكەنزی لەدیالێكتەكان (a 1961)، كە زێتر خەریكی دیالێكتەكانی لقی ژێرووو كەوشەنە تێكەڵاوەكەی ژێرووو ژوورووو بووە. بەبڕوای من جوداوازی ئەو دوو دەستەیەی بەجوانترین شێواز روونكردۆتەوە.

بڕێك نموونەی ساكار ئەو لادان لەیاسا گشتییەو جوداوازیی نێوان ئەو دوو زاراوە دەردەخەن:

ژوورووی كوردستان: ئەز نان دخووەم ـ من نان خوارد
ژێرووی كوردستان: من نان ئەخۆم ـ (من) نانم خوارد
ژێرووی خۆرهەڵات: نان ئەخووەم ـ (من) نان خواردم

ژوورووی كوردستان: ئەز تە چێ دبینم ـ من تو چێ دیت
ژێرووی كوردستان: من تۆ چاك ئەبینم ـ (من) چاكم تۆ دیت *
ژێرووی خۆرهەڵات: من تۆ چاك ئەبینم ـ (من) تۆ چاك دیم

ـ mi "م"و ـ Î "ی" پاشگری كەسی یەكەمو دووهەمی تاكن. خوارد ـ خووە ـ رەگی رابوردووو ئێستای كاری (خواردن)ن. دیت ـ وبین ـ رەگی بینین.*

---

* لەڕاستیدا ئەو دەنگی/ ت/ ی كۆتاییەش كلۆر دەبێت، واتە دەسوتێت و سەریتێدا دەچێت و تەنها (دی) دەگوترێت، نەك (دیت).

* لێرەدا ناچارم وەك زمانەوانێك بێمەدەنگو کەمێك بەدرێژی بەر پەرچی ئەو بۆچوونە هەڵانەی کاکی نووسەر بدەمەوە:

١. دیت ـ رەگی کرداری (بینین) نییە، بەڵکە رەگی (دیتن)ە، هێندە هەیە شێوازی کاری ئێستا / داهاتووی دیتن، بەتایبەت لەزاراوی ژێروودا سەری تێداچووەو بینین جێگەی پێلێژکردووە. جگەلەوەی دەنگی /ت/ی کۆتایی رەگەکەش لەرنەدراوەو تەنها دی ـ ماوەتەوە. هەر /دەبین/ دەگوترێت نەك /دەدیت/، کە بەدووری نازانم ئەو خۆبواردنە لەبەکارهێنانی کرداری (دیتن) پش لەمێژبوو فەوتابوو، تازەگی لەزمانی نووسیندا باوی هاتۆتەوە.

٢ـــ لەکارنامەی دوکتۆریەکەمداو لەو گوتارەدا کە دەربارەی (کردارو کات)ی کوردی نووسیومەو لەژمارە ٢٥،٢٤ی گۆڤاری مامۆستای کورددا بڵاوکراوەتەوە، هەوڵمداوە ئائەم بۆچوونە هەڵەیە هەڵتەکێنمو بیسەلێنم کە لەکوردیدا تەنها تاقە رەگێکی کردارمان هەیەو بانگەشەی چەوتی سەپاوی بوونی رەگێکی کردار بۆ ئێستا /داهاتووو یەکێکی دی بۆ رابوردوو، هەڵەیەکی باوەو هیچ بنچینەیەکی نییە.

٣. ئەو جوداوازیانەی نووسەر پێشچاوی خستوونو پێشتریش باسیکردوون، بەنیسبەت زاراوی گشت زمانێکەوە هەر ئاوهاو شتێکی لەو بابەتەو دیاردەیەکی ئاساییَن. ئەو جوداوازییە لێکسیکالی فۆنۆلۆژیو هەتا مۆرفۆلۆژییانەش هەن، بۆیە زاراویان پێدەڵێن، دەنا بێ جۆداوازی دەبنە زمانێکی بێ زاراو.

تەنها شتێك کە زمانی کوردیو زاراوەکانی لەزمانانی دیکە جودادەکاتەوە، ئەوەیە کە باری جیۆپۆلیتیکیو شیرازەی کۆمەڵایەتی کورد، مۆڵەتی گەشەکردنو فراژیبوونی زمانەکەو دروستبوونی زمانێکی یەکگرتوویان نەداوە. هەڵبەت کاکی نووسەر یەکێکە لەشارەزا چاکەکانی بارەسەختە سیاسیو کۆمەڵایەتیەکەی کوردستان، دابەشبوونی نەتەوەو خاکەکە بەسەر پێنج دەوڵەتی جوداوازو بەدگومان لەیەکیدا، یاساخکردنی ئاخاوتنو نووسینی کوردی لەزۆربەیاندا، نەبوونی پەیوەندی راستەوخۆو ناراستەوخۆی وەك ئامرازەکانی راگەیاندنو رۆشنبیریی ئازاد (رادیۆ، تەلەفزیۆن، گۆڤار، رۆژنامە، کتێب..... هتد)، نووسینی ئەو کوردییە کەمەی بەردەوام بەفایچی سانسۆر هەڵدەپاچرێت بەسێ ئەلفو بێی جوداواز، تەشەنەی پەتای کلۆڵیی نەخوێندەواریو سەرکوێری لەنێو پشکی هەرەزۆری میللەتەکەدا، کۆڵەی کوردیان کوتاوەو باری زمانەکەیان صەد هێندەی دی سەختکردووە. جگەلەوە کاریگەریتی زمانی داگیرکەران لەدێرزەمانەوە لەسەر زاراوەو زمانی هەر پارچەیەك، شوێنەوارێکی بەدو شێوێنەریان جێهێشتووە.

(دیاره ئەمە بەنیسبەت هەموو زمانێکەوە هەروایە، بۆ نموونە زمانێکی مەزنو زیندووی وەکی ئالـەمانی، تـەنها چل سالی سنووری دەستکرد، درزو شەبەقی گەورەی خستەنێو هەمان زمانی هەردوو کوتەکەوە. خۆرهەلات لەژێر تینو تاوی رووسیداو خۆرئاوا لەژێر تینو تاوی ئەمریکیدا، گۆڕرانکاریی سەیرو عەنتیکەیان بەسەردا هات. (سالی ۱۹۸۵ توێژینەوەیەکی زمانەوانیانەم لەوبارەیەوە نووسیو لەسیمینارێکی زانستگەی سالزبورگدا پێشکەشمکرد. لەو لێکۆلینەوەیەمدا هەولمدا مەوداو ئەندازەی ئەو درزو تلیشەی قوتکردنەوەی دیواری سنوورێك دەیخاتە نێوزمانی نەتەوەیەکەوە، دەستنیشان بکەم. گەیشتمە ئەو ئاکامەی جوداوازیی هێجگار گەورەی لێدەکەوێتەوە. هەرچەندە دەبێت ئەوەش لەیاد نەکەین کە تەنها چل سالی مێژووی ئەوان، لەچاو نێزیکەی هەموو مێژووی کورددا، هەر هیچ نییە).

بەهەرحال، ئەو جوداوازییەی نێوان کاتی رابردووی کرداره تێپەرەکانی ئەو زاراوانەی کاکی نووسەر باسیدەکات، شتێك نییە لەجێگۆرکێی، یاخود تێداچوونی برێك لەو راناوە کەسییە لکاوانەی کە Klitik یان پێدەگوترێت، ئەویش لەهەموو حالەتێکدا نا، بۆ نموونە لەکاتی رابردووی کرداره تێپەرەکاندا، لەزاراوی ژووروودا کردارەکە Klitik ی بەرکارەکە Objekt وەردەگرێت، لێ Klitik ی کارا Subjekt ، سەریتێدا دەچێت:

| | |
|---|---|
| من شڤانان دیت | (من شوانەکانم دیت) |
| شڤانان ئەز دیتم | (شوانەکان منیان دیت) |
| کەچکێ تۆ دیتی | (کچەکە تۆی دیت) |
| شڤێن ئەم دیتن | (شوانەکە ئێمەی دیت) |

هەتا لەخودی تاکە زاراوەیەکی وەکی ژێرووشدا، لەرستە بنچییەکاندا بواری جێگۆرکێی Klitik ە زۆرە:

(من) چاکم تۆ دیت

(من) چاك تۆم دیت

(من) تۆم چاك دیت

دیاره لەرستە سەرزارەکییەکانیشدا ئەو بوارە هەر هەیە:

چاکم دیتیت

چاك دیتمیت، (چاك دیمیت)

بەلام کە دەلێت: زاراوەی ژێروو بۆ کرداری کارابزر Passiv، رەگێکی تایبەت بەخۆی هەیە، کە لەژووروودا نییە، دەکەوێتە هەلەیەکی گەورەترەوە، چونکە وەك لەخوارەوە روونیدەکەینەوە، زۆر لەراستی دور دەکەوێتەوە:

ئاشکرایە هیچ دیاردەیەکی ڕێزمانیی، بێ گۆڕانێکی مۆرفۆلۆژیی ڕووونادات، دیاردەی کارابزریش لەزاراوی ژێرووودا لەرێگەی لکاندنی پاشگری ـ را (ra) وە بەرەگی کردارە تێپەرە ئاساییەکەوە دێتە دی:

گیرا، کوژرا، خورا..... هتد

لێ لەزاراوی ژووروودا کرداری هاتن پێش بەچاوگی کردارە تێپەرەکە دەگرێت‌و کارابزری لێسازدەکات:

هاتە گرتن، هاتە کوشتن، هاتە خوارن..... هتد

کە دوورنییە کەوتنەوەی ئەو جوداوازییە، ئاکامێکی چاولێکەری، یاخود تین‌و تاوی زمانێکی بێگانە نەبێت لەسەر یەکێکیان، یاخود تاوی دووزمانی جوداواز نەبێت لەسەر هەردووکیان.

دەربارەی پاشگری ـ ەوە (ewe ـ) کە دەڵێت لەژێرووودا هەیەو لەژووروودا نییە، ڕاست نییە:

١ـ جاریّ پاشگرەکە ـ وە (we ـ) یە، نەك ـ ەوە، پەیدابوونی ئەو بزوێنی /ە/ یە لەنێوان کردارەکەو پاشگری ـ وەدا ناچارییەکی فۆنەتیکییە، کە ئەو بزوێنە لەنێوانی کۆنسۆنانتەکان‌و نیوە بزوێنی /W/ دا دەسەپێنێت.

٢ـ هەمان پاشگر لەژووروشدا لەشێوەی /ڤە/ /ve/ داو بۆهەمان واتاو مەبەست هەیە، لێ لەبرێك بێچووە زاراوی ژووروودا، تایبەت لەزاراوی جزیرو بۆتاندا دەبێتە پێشگر، وەك "ژیانەوە__ ڤەژین"، "گرتنەوە__ ڤەگرتن".

لەهەندەك بێچووە زاراوی دیکەی کرمانجیی ژووروودا، وەك زاراوی بادینان، هەمان /ڤە/ یەو هەروەك زاراوی ژێروو بەپاشگری ماوەتەوە، وەك "هاتڤە، گەڕاڤە".

لێرەدا بوار نییە چیدی لەسەری بڕۆم، هێندە دەڵێم جوداوازییەکان زۆر لەوە قووڵترو فراوانترن، کە کاکی هێژا پەنجەی بۆ ڕاکێشاون، لێ جوداوازیی ئاسایی زاراوەکانی زمانێکن.

تکایە بڕوانە:

1- Emir Djeladet Bedir Khan und Roger Lescot; "Kurdishe Grammatik, Kurmsnci – Dialekt",

Kurdisches Institut, boon, 1986, S.246.

"ڕێزمانی کوردی، زاراوی کرمانجی".

2- Ali Sarwat; "Themen aus der Kurdischen Wortbildung", Diss. , Universitat Salzburg, 1992.

"هەندەك بابەتی وشەسازیی کوردی"

تاقــە توێژینەوەیــەکی ڕێــک و پێــک لــەبارەی زاراوی زازاوە، ئــەو ژمــارە زۆرە تێکستانەن، کـە Oskar Mann کۆیکردوونـەوەو Karl Hadank شـیکردوونەوە، بڕوانە:

(Mann und Hadank 1932 )، هەرچەندە ئەو مەتریالانەش بڕێك پرسیار بــێ وەرام دەهێڵنەوەو تەواو تینوێتی ناشکێنن.

مالمیــسانژ بیلۆگرافیایــەکی دەربــارەی زاری زازا ڕێکخــستووەو لــەگۆڤاری هێڤــی ئینستیتوتی کوردی پاریسدا، ژمارە ۳، فێبریوەری ۱۹۸۳، ل۱۱٤ ـ ۱۱۷ بلاّوکراوەتەوە.

گەلەکجار لەسەرچاوەکاندا دەنوسرێت گوایە ئاخێوەرانی زازا، زمانەکەیان بـەدەلی نێودەبـەن. خۆرهەلاّتناسـەکان بەگـشتی لـەوباوەڕەدان، کـە ئـەو نێـوە داڕێـژراوێکی مێتاتێزانەیە* لەوشەی دەیلەمییەوە، لەومشتومڕەدا کە لەبەندی دووهەمدا لـەبارەی ڕەچـەڵەکی کـوردەوە کردوومانــە، ئەمــەمان وەك بەڵگەیــەکی بــەهێز بەدەســتەوە گرتــووە. هەرچـەندە مـن بۆمدەرکـەوت کـە گەلـەك لـەزازا چاوساغەکانم (بەتایبـەت ئەوانەی مۆدکیو ئەرزنجان) هەرگیز نێوی دەلییان نەبیستبوو. بـەلاّم هەنـدێکی دی هەبوون، کە نێوەکەیان بیستبوو، ناڕاستەوخۆ لەزانـستکارە ئەوروپاییەکانـەوە بـەوان گەیـشتبوو. واپێدەچێت تـەنها بەشـی خۆرئـاوای ئـاخێوەرانی زازا، خۆیـان بـە دەلـی نێوبەرن.

---

3- Ali Sarwat; "Die Auswirkung der Trennung durch Mauer und Stacheldraht in der Deutsch – Deutschen Alltagssprache", Universitat Salzburg, 1985.

"تێنو تاوی دیوارو دڕکەزی لەسەر زمانی ڕۆژانەی هەردوك کوتەکەی ئاڵەمانیا".

4- "جەمال نەبەز: زمانی یەکگرتووی کوردی"، بامبێرگە، ۱۹۷٦، ل ۲۹ ـ ۳۰.

*Metathese وشەیەکی لاتینییەو لەزانستی زماندا بەواتای جێگۆڕکێی دەنگ دێت، وەکی سەرینو سەنیر، زیخو خیز، جەرگو جگەر، تەرزەو تەزرە..... هتد.

١٧ـ بۆ توێژینەوە لەبارەی زاراوەی گۆرانییەوە: بڕوانە ئەم سەرچاوانە، کە تارادەیەك سەرکەوتووانە زاری هەورامییان توێژیوەتەوە:

1- (Benedictsen und Christensen, 1921)
2-(Mann und Hadank, 1930) (Mackenzie, 1966)

کارەکەی مانو هادانك ماتریالی دەربارەی دوو زاراوی گۆرانی دیکەی تێدایە. دەقی ئەدەبی گۆرانیو هەڵشێلانو شێکردنەوەی لەکتێبەکەی (Soane, 1921)دا بلاوکراوەتەوە.

م. موکری ژمارەیەکی زۆر دەقی ئاینی دێرینی زاراوی گۆرانی کۆکردۆتەوەو تەرجەمەی کردوونو پەراوێزو سەرنجی بۆ نووسیون، بڕوانە (موکری، ١٩٧٠، ١٩٧١).

پێدەچێت ژمارەو فراوانیی ئەو نێوچە چەپەرانەی لەکوردستانی عیراق بەزاراوی گۆرانی دەئاخفن، لەوە بەرینتربێت، کەتا ئێستا دەقرسێندران. تەنها هۆزی باجەللانی ئاقارەکانی خۆرهەڵاتی موسڵو برێك کوتی نێوچەی خانەقین نییە، بەڵکە شەبەكو سارلیو گۆرانەکانی دەڤەرەکانی باکوورو باکووری خۆرهەڵاتی موسڵیش دەگرێتەوە، هەروەها بەشێکی گەورەی هۆزی زەنگەنەو کاکەییەکانی نێوچەی کەرکوکیش بەزاراوی گۆرانی دەپەیڤن.

١٨ـ بۆ ئەو تەریقەتانە بەگشتی، بڕوانە: (Muller, 1967).

١٩ـ بۆ زانیاریی زێتر لەبارەی عەلەوییەکانی دەرسیمەوە، بڕوانە: (Bumke, 1979)، ئەو لێکۆڵینەوانەی کە جەختی ئەوە دەکەن گوایە عەلەوییەکان دەستەیەکی گومڕای لەدین وەرگەڕاون: (Trowbridge, 1909)، (Melikoff, 1982).

٢٠ـ بۆ زانیاریی زێتر لەبارەی ئەهلی هەقەوە، بڕوانە:

(Minorsky, 1920, 1921, 1928, 1943)، (Ivanow, 1953) (Edmonds, 1957, S. 182 -201, 1969).

٢١ـ سەرچاوەی گرنگ لەبارەی ئێزیدییەوە:

(Layard, 1849, S.275 -309; 1853 I, S. 46 -95).

Layard پەیوەندییەکی دۆستانەی چاکی دەگەڵ ڕێبەرانی ئێزیدی نێوچەی شێخاندا هەبوو، لەئەستەموڵیش بۆ ئێزیدییەکان تێکەوت. هەروەها بڕوانە:

(Edmonds, 1967) ،(Drower, 1941) ،(Lescot,1938) ،( Menzel, 1911) .(Furlani, 1940)

کتێبیش: (The Pike Report on the CIA, London, Bertrand Russell Peace Foundation, 1977).

رای ڕەسمیی عیراق لەو ڕووەوە، لەگوتەو ئاخاوتنە ڕۆژنامەگەرییەکانی صەددام حسێندا ڕەنگدەداتەوە. ئەو گوتانەش پاشان کراونە کتێب (1977a, 1977b).

٣١- برێك لەو هەنگاوو هەڵوێستانە لەڤانلی ١٩٧٨دا پوختە کراون.

هوردتر ئەو هەواڵانەن، کە بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوە کوردییە عیراقییەکانی هەندەران پەخشیاندەکردن، وەك پێشمەرگە: بڵاوکراوەی سەرکردایەتی کاتیی پارتی دێموکراتی کوردستان.

The Spark : بڵاوکراوەی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان. برێك سەرنجی کورتیلە، کە لەخزمەتی ڕژێمی بەغدادایە لەکتێبەکەی (Wimmer1981)* دا دەیبینین. یەکێك لەسەرچاوە گرنگەکان، ئەو کتێبەی کۆمەڵناسێکی پۆڵۆنییە کە لەبواری گەشەپێدانی کشتوکاڵدا لەعیراق کاریکردووە، بڕوانە: (Dziegiel,1981).

٣٢- یەکێك لەوانە، سەعید ئێلچی بوو کە تەرمەکەی نێزیك ئەو گوندەی بارەگای سەرەکیی تاقمە چەپییەکەی دیکەی سەعید قرمزتۆپارقی لێبوو، دۆزرایەوە. پیاوەکانی بارزانی ئەمەی دواییان گرتو بەنهێنی درایە دادگای شۆڕشو سزای کوشتن درا.

---

* Norbert Wimmer ، یەکێکە لەو نوتریشیە قەڵەمو ویژدان فرۆشانەی کە لەپێناوی مشتێك پووڵدا، سنووری شەرم دەبەزێننو درۆو دەلەسە دەکەنە سەر مەشقی خۆیانو پەردەی حەیا، زراو زڕ دادەدڕێنن. کتێبەکەی: "عیراق، دێموکراسییەکی شۆڕشگێڕانە. سیستێمی سیاسی، پارتی بەعس، کوردەکان"، 1981,Innsbruck ، یەکێکە لەو کتێبە هەرە بێ نرخانەی کە موخابەراتی عیراق بەزەبری پووڵ بەرهەمی هێناوەو تەرجەمەیەکی دەقاو دەقی پڕو پاڵانتەو تەڵەکەبازییەکانی ڕژێمە مرۆکوژو خوێنرشێژەکەی شەللاتییەکانی بەغدایە بەئاڵەمانی. نۆربێرت ڤیمەر بەخێری گوایە زانستکارەو لەزانستگەی ئینسبورك مامۆستایە.

٣٣. دەربارەی پێشهاتەکانی کوردستانی تورکیا، لەشوێنی دیکەدا بەدوورو درێژی کۆڵیومەتەوە، بڕوانە: (Bruinessen, 1982, 1984 a, 1988).

٣٤. بڕوانە: (Tilgner, 1983)، (Bruinessen, 1981, 1986)

٣٥. ئەم بابەتە بەدوورو درێژتر لە (Bruinessen, 1988)دا دەبینیت.

## سەرنجەکانی بەندی دووهەم

١. بڕوانە: (Lach,1940)، (Barth,1953,1960)، (Rudolph,1967)، سەرچاوەی گرنگی دی، توێژینەوەکانی (Rondot, 1937)، (Hutteroth, 1959, 1961)ن.

٢. بڕوانە: (Rondot, 1937, S.16 – 22).

٣ـ M.Sahlins لەکتێبە وانەییەکەیدا "Tribesmen" خشتەیەکی لەو بابەتە بەکاردەهێنێت. یەکێك لەپلەکان بەرامبەر گوند دادەنێت. لێ خوێنەر دەبێت هۆشیاربێت کە ئەم پێنج پلەیە تەنها بەمەبەستی دەمەتەقێ جوداوازییان لەنێواندا دەکرێت‌و هیچ مەرج نییە هاوجووتیان لەکن کورد هەبن.

٤ـ هەڵبەت هەروا رێکەوت‌و هەڵکەوت نییە، کە ئەو دوو شێرازەی پێکهاتە جوداوازانەی لەو بیرو بۆچوونە بەدەردەکەون، دەشێت بەشێوازێکی وێکچوو پێشانبدرێن. پێوەندیی نێوان عونسورەکانی بەپێکهاتی وێکچوویانەوە، دوولایەنە، پەیوەندن بەو بەرەبابەی لێیکەوتونەوەو بەو خانەو توێژەی تێیکەوتوون. هەردوك سیستێمەکە یەك تاقەجۆر عونسور تێدەخوێننەوە، تاقەکەس یاخود خانەو توێژەکەی.

٥ـ بڕوانە: (Barth, 1953, S.25). من بۆ خۆم کاتێك لەژەنیوەر/ فێبریوەری ١٩٧٥دا دەگەڵ تاقمێك پزیشکدا، کە بۆ کوتانی لادێیەکان دەچوون، چوومە نێوچەی باڵەکایەتی، لیستەیەکم بۆ شێرازەی پێکهاتی خێزانەکان رێکخست، گوندەکانم بەسەر D, C, B, Aدا دابەشکردو خانە خانەکردنێکی وەکی ئەوەی Barthم بۆ دانان:

| پێکهاتی خێزانەکە | D | C | B | A | سەرلەبەری خێزانەکان |
|---|---|---|---|---|---|
| ناتەواو | - | - | - | ١ | ١ |
| بێوەژن و منداڵان | - | | ٢ | ١ | ٣ |
| خانەوادەی کرۆك تەواو | ١٨ | ٢٤ | ٢٨ | ٢٦ | ٩٦ |
| خێزانی دووژنە | ١ | ٢ | - | ٤ | ٧ |
| کرۆکی خێزانێك بەدایکی | | | | | |
| پیاوەکەو کەسوکاری ڕەبەنییەوە | ٢ | ١ | ١ | ٣ | ٧ |
| کرۆکی خێزانێك بەکەسوکاری | | | | | |
| ڕەبەنی پیاوەکە | ٢ | ١ | ٢ | ٤ | ٩ |
| کرۆکی خێزانێك بەباوکی | | | | | |
| پیاوەکەوە | ١ | ٣ | ٢ | - | ٦ |
| ئەو خێزانەی بەشەباب | | | | | |
| تێیاندا زێتر | ٢ | ١ | - | ١ | ٤ |
| | | | | | |
| هەمووی | ٣٦ | ٣٢ | ٣٥ | ٤٠ | ١٣٢ |

### ٦ـ هیچ سەرژمێریکی هوردو ڕێکوپێك لەبەردەستاندا نین.

پرۆژەیەکی توێژینەوەی (وەزارەتی کاروباری گوندەکان لەئەنقەرە، ١٩٦٤/ ١٩٦٥ ) برێك زانیاریی داوە. دەڵێت: لەئورفە کە پارێزگایەکی تێکەڵەی کوردو عارەبەو گوایە یەکە پارێزگایە لەزۆری دەرەبەگاندا، لەکۆی ٦٤٤ گوندەکەی، ٤٨ دانەیان ملکی تاقە کەسێکن، (یانی بەگشت زەوی و کێڵگەکانیەوە)، ٢٩ گوندیشیان ملکی تاقە خێزانێکن، ٢٨ گوندیش ملکی بنەماڵەیەکن، ئەو ژمارانە بەو هوردییە پێشانی نادەن، داخۆ تاچ مەودایەك زەوی و مافی ملکایەتی لەدەستی بنەماڵەکاندایە. برێك بنەماڵە لەگوندێك زێتریان بەدەستەوەیە، هەندێکیان تەنها بەشێك لەچەند گوندێك، بۆیە لەخشتەکەدا دەرنەکەوتوون. زۆر بنەماڵە، لەترسی یاسای دابەشکردنی زەویوزار، دەستوبرد لەکوت کوتکردن و بەخشینەوەی زەویوزارەکانیان بەسەر ئەندامانیدا، دەکەن، لەوانە منداڵانیش، بایاساش ڕێگەی ئەوە نەدات، بۆ لەخشتەبردنی کاربەدەستان، پێچوپەنا زۆرە. (بۆخۆم لەسوریاو ئێران و عێراق

ئـەودەم دیـت، لـێ لـەتورکیا یاسـای چارەسـەرکردنی کێشەی زەویـوزار هێـشتا خـەیاڵ پلاوە).

٧. لەڕاستیـدا پاشگری - ان نیشانەی کۆیـە، لـێ دەگـەڵ نێـوی هۆزانـدا - ان نابێتـە - ێـن، وەکـی لـەکۆکردنی نێـوی دیکـەدا بـاوە، بەڵکـە پاشـگرێکی (ـ ێـن)ی زێـدە وەردەگرێت*:

---

* بەداخەوە کاکی نووسەر لێرەشدا کەوتۆتە گێژاوێکی ڕێزمانیی بێ سەروبنەوە، ئەو پاشگری (- ێن)ە زێدەیەی ئەو باسی دەکات، شتێك نییە لەنیشانەی ناسراوی کۆی نێومکە، یاخود ئاوەڵنێومکە زێتر، لەدۆخی خاوەندارێتی، لەحاڵەتی خستنەپاڵدا Genetiv کە خاوەندارێتی نێومکە، یاخود خەسڵەتی نێومکە لەڕێی ئاوەڵنێومکەوە پێشاندەدات، بۆ نموونە:

هەسپێ مستۆ (ئەسپەکەی مستۆ)

} "ناسراو"

هەسپێن مستۆ (ئەسپەکانی مستۆ)

لـێ: هەسپنە بۆز (ئەسپانی بۆز) "نەناسراو

باژێڕێ مەزن (شارە گەورەکە)

} "ناسراو"

باژێڕێن مەزن (شارە گەورەکان)

لـێ: باژێڕنە مەزن (شارانی گەورە) "نەناسراو"

لەحاڵەتی کۆو چەندین ئیزافەی بەدووی یەکدی هاتوودا، گشتیان پاشگری - ێن وەردەگرن، بۆ نموونە:

کۆنێن کۆچەرێن وەلاتێ مەێن ڕەش (ڕەشماڵەکانی کۆچەرەکانی وڵاتی ئێمە)

هەسپێن بۆزین قەنج (ئەسپە بۆزە چاکەکە)

کەواتە وەك ئەو نموونانە دەریدەخەن، پاشگری - ێن هیچ پەیوەندییەکی تایبەتی بەهۆزو تیرەوە نییەو پاشگرێکی گشتییەو دەتوانێت (یاخود دەبێت) بچێتە سەر هەر نێوێك یاناوەڵنێوێك، کە لەدۆخی خاوەندارێتی، یاخود لەحاڵەتی خستنەپاڵدا بێت، تکایە بڕوانە:

Emir Djeladet Bedir Kean und Roger Lescot; "Kurdische Grammatik, Kurdische, Institut, Bonn, 1986, S.268 – 269.

"عـەلیکانێن سـەرحەد" ـ "سـەرحەدی عـەلیکانیان" کـە دەکەوێتـە بـاکووری جزیرەوە.

ئەو پاشگری (ـ ان)ە نێوی هۆزو مەڵبەندەکەشی دیاریدەکات، هەڵبەت تـەنها بـۆ نێوی هۆزی کوردان بـەکارنابرێت، بەڵکە بـۆ نەتـەوەکانی دیکـەش، بـۆ نموونـە کـە دەڵـێن: "ترکـان" مەبەسـت تـورك‌و هەرجێیەکـە، کـە تورکـەکانی لێـدەژین، لـەوە بەرفراوانـتریش مەبەست دەوڵەتی فرمنەتەوەی تورکیایە.

ئەندامانی هۆزی عەلیکان، (عەلیکی) یـان پێـدەگوترێت، ئـەوە بەنیـسبەت هـەموو شتێکی هۆزەکـەوە هەروایـە (زاراوەیـان، سـترانیان، مێگـەلیان)، جارهەیـە وشـەکە بـۆ گشت هۆزەکە بەکاردێت، لـێ بۆ مەڵبەندیان نا. زۆرجار نێوی ئـەو هۆزانـەی بـە ـ ان کۆتاییـان دێـت، نێـوی کەسـێکیان لەتەکدایـە، بـۆ نموونـە عـەلیکان، لەعەلیکـەوە. هەڵبەت برێك هۆزیش هەن، کە ئـەوان بـەنێوی مەڵبەندەکەیانـەوە نێونـراون، نـەك بەپێچەوانەوە، وەکی پشدەر، کە بـەواتای (ئـەودیو تلّـیشی تاشـەبەرد) دێت. نێوەکـە سەرەتا هێمایەك بووە لەلایەن هاوسێکانی خۆرئاوایانەوە بۆ دەستنیـشانکردنی گـشت ئـەو هـۆزە گـچکانەی لەنێوچـەکەدا ژیـاون، بـەکارهێنراوە، پاشـان کـە لەژێرسـایەی سەرکردەیەکی مەزندا یەکیانگرتووە، خۆیان نێوەکەیان وەرگرتـووەو بەسـەرخۆیاندا بڕیوە. ئەوڕۆ هەتا ئەو کەسانەش کـە لـەودیوی تلّـیشی گابەردەکەشـەوە نـاژین، هـەر پشدەرییان پێدەگوترێت.

٨ـ مـن بـۆ خـۆم وشـەی "تەقـە"م لاپەسـەندترە لـە "شـەڕ"، چونکە ئـەو وشـەیە روونـــتر دەریـــدەخات، کـــە لـــەو رووبەڕووبوونەوەیـــەی هۆزەکانـــدا، چ روودەدات. وێدەچێت بەقەسـتی کوشـت تەقـە لەیەکـدی نەکـەن (دەزانـن تیراوێـی دوژمنایـەتی چەندە دەردناکە)، زێتر مەبەستیان ترساندن‌و تۆقاندنی بەرامبەرەکەیە. پێـدەچێت ئەمە دیاردەیەکی گشتی بێت‌و بـۆ کێشمەکێـشی گـشت هۆزەکـان بـشێت، (بـۆ نموونـە بڕوانـە توێژینـەوەی شـەڕە گـەورەکانی جـەنگاوەرانی محەمـەدی (پەیامبـەر) لەگـەڵ دژەکانی مەککەیدا، لەکتێبی

"M . Rodinsons ,' Muhammed ' "دا.

هەڵبەت شەڕی ئەو تیرەو هۆزانە بەشێك بوون لەجەنگێكی فراوان. لێ لەوەتەی چەك یاساخكراوەو فیشەك قاچاخەو نرخی هێجگار هەڵكشاوە، شەڕی نێوان هۆزەكان شەقڵی "دەستبلاوی‌و بەفیڕۆدانی" بەخۆوە گرتووەو مەبەست تەنها نێودەركردنە.

لەكاتی یەكێك ئالەو جۆرە شەڕانەدا لەباتمان بووم‌و بۆیاندەگێڕامەوە: "هۆزی بەكران بیست‌و چوار ساتی رێك، بێ پسانەوە تەقەیانكرد، تفەنگیان هێجگار زۆرە، هۆزێكی گەلەك بەهێزن". لەگەڵ ئەوەشدا كەسێكی تێدا نەكوژرا بوو. لەبارەی هۆزێكی دی‌و شەڕێكی دییەوە، بەشدارانی بەوپەڕی بەخۆنازییەوە بۆیاندەگێڕامەوە: "یەك ملوێن فیشەكمان تەقاند"، دیارە بێ ئەوەی كەسێكیشی تێدا زامدار بووبێت. ئەمە پێچەوانەی هەواڵە كۆنترەكانە، ئەوەتا Ross ، ئەو پزیشكەی سالی ١٨٣٣ چووبووە سەردانی میری رەواندز، دەنووسێت: "شەڕ خەسڵەتێكی خۆڕسكی كوردە، بۆ خۆم مێرد منداڵی دوازدەو پازدە ساڵانم دەدیت لەو شەڕەی دواییدا ئەنگاوترابوون‌و زۆر بەسەختی زامدار بووبوون. پێموایە شەڕەكانیان خوێنێكی زۆری تێدا دەرێژرێت".

بڕوانە: (74- Fraser; 1840 I, S.73 )

٩. بڕوانە: (Barth, 1953, S.38 )

١٠. بەپێی یاسای توركیا، زەوی چیاكان بەلەوەڕگەكانیشیەوە، ناشێت ببنە ملكی تایبەت، بەڵكە هەر بەملكی دەوڵەت دەمێننەوە.

لێ وەكی زۆربەی زەوییە ئەمیرییەكانی تەختانییەكان، گەلەكجار كەسایەتییە نێوچەییە بەهێزەكان چنگی بەسەردادەگرن‌و وەكی ملكی تایبەت مامەڵەی پێوەدەكەن. (Huttoroth1953, S.150-152) وای بۆ دەچێت كە ئەو دیاردەیە بۆ هۆی بەگەڕخستنی ئەو یاسای دابەشكردنی زەویوزارە دەگەڕێتەوە، كە لەنێوەڕاستی سییەكاندا خرایەگەڕ. بەپێی ئەو یاسایە سەرتاسەری وڵاتەكە كوتكوتكراو بەسەر پارێزگاو قەزاو ناحیەو گونددا دابەشكرا. سەركردەی هەڵبژێردراوی هەر بازێڕ یا گوندێك، كە دەبووە دەستەڵاتدارترین پیاوی نێوچەكە، وەك ملكی خۆی مامەڵەی

بەو زەویانەوە دەکرد، کە لەڕووی ئیدارییەوە سەر بەکەوشەنی دەستەڵاتی بوونو بڕێك کوتی بەرەوەندەکان دەدایەکرێ. گەر رەوەندەکان لەدانی کرێکە سەرپێچییان کردبا، ڕێگەی هامشۆو کۆچو رەوی لێدەبەستنەوە.

دیارە رێیتێدەچێت ئەمە بۆ بڕێك جێگەو هەندێك حاڵەت راست بووبێت، لێ مـن گومانم هەیە لەوەی ئەوە دیاردەیەکی گشتیو سەراپایی بووبێت. پێموایە Hutteroth لەو رووەوە چاوچنۆکیو زەبرو زۆری هێزە نێوچەییە رەسەنەکان بەکەم دەگرێت.

دیارە گشت دەستەڵاتدارێك ناتوانێت داوای کرێ لەرەوەندەکان بکات. (بەپێچەوانەوە، دانیشتووانی گوندی کاڵ، کە لەنێوچەیەك بەهەمان نێوەوە دەژین، دەبایە کرێیان بەهۆزی رەوەندی تەییان دابا، چونکە وایانداەدنا، کە گوایە ئەو گوندە لەسەر خاکی ئەوان قوتبۆتەوەو گشت مەڵبەندەکەیان بەملکی خۆیان دەزانی، هێزێکی ئەوتۆشیان هەبوو، کە خواستو ئارەزووی خۆیان بسەپێنن).

لەو سۆنگەیەوە کە کرێ داواکردن لەلایەن فەرمانرەوای شارێکەوە یاساشکێنییە، یارۆی دەستەڵاتدار ناتوانێت بێ چەندو چوونو دەردیسەر پشت بەهێزێکی دەوڵەتیی وەکی ژەندرمەو پۆلیس ببەستێتو بیانکاتە پاسەوانی بەرژەوەندیو گیرفانی خۆی.

تەنها ئەوانەی دەستەڵاتی تەواوو چەکداری تایبەتی خۆیان هەیە، یاخود دۆستایەتیو پەیوەندیی تایبەتیان دەگەڵ دەستەڵاتدارە هەراوترەکاندا هەیە، ئەو کارەیان بۆ دەچێتە سەرو دەتوانن داوای کرێ بکەن. بۆ نموونە گیرافییەکان پەیوەندییەکی لەو بابەتەیان هەیە: کۆنە وەزیری بەرگریو نائیبی ویلایەتی ڤان Ferit Melen دۆستێکی دێرینو هاوکارێکی نێزیکی گیراڤییەکانە، (هەتا بڕێك سوورن لەسەر ئەوەی کە گوایە بۆ خۆی هەر گیراڤییشە).

١١ـ دەڵێن گوایە ساڵی ١٩٧٥ کرێکەی ٧٠ هەزار لیرەی تورکی بووە، (کە ئەودەم دەیکردە نێزیکەی پێنج هەزار دۆلار)و دەبایە سەد خانەوادەیەکی تەییان کە تەنها سێ چوار مانگێك لەلەوەڕگەکانی دەژیان، لەئەستۆیان گرتبا.

١٢ـ هەرچەندە بەڵگەیەکی دڵنیاو سەلمێنەرمان بەدەستەوە نییە، بەڵام برێك هێماو نیشانەی ئەوتۆ هەن دەریدەخەن کە گوندنشینەکان لەکۆندا مافی تێکرایی‌و پێکراییان لەڕەنێوهێنانی کێڵگەکاندا هەبووە. لێ ناشێت‌و ناتوانرێت بەملکایەتی مشاعی لەقەڵەم بدرێت‌و بکرێتە هاوتای ئەو دیاردەیەی Weulersse لەبارەی سوریاوە دەگێڕێتەوە. (لەسوریا زەوی ملکی گشتی بووە، یەکەیەکەی خێزانەکان رەنێویان هێناوەو بەردەوام بەیەکسانی بەسەر گشت پیاوانی گونددا سەرلەنوێ دابەش کراوەتەوە).

پێناچێت دیاردەی لەو بابەتە قەت لەکوردستان هەبوو بێت.

لەگوندە چیاییەکانی کوردستانی نێوەند، هەر لادێییەك مافی ئەوەی هەیە کوتەزەوییەکی کێڵگەکانی گوند بگرێتەدەست، ئەمە ماف‌و یاسایەکی تا ئێستاش پەیڕەوکراوە، هەرچەندە جوداوازیی نێوان ملکایەتی‌و مافی رەنێوهێنان، نێوان وردە مالیك‌و وردە کرێگرتە، تەواو روون‌و بێ گرێ‌و گۆڵ‌و ئاشکرا نییە.

١٣ـ دیارە دەبێتە زێدەڕەوی گەر بگوترێت هەمیشە گشت پیاوانی گوند ئامادەدەبن‌و بەشداریی لەو نەریتەدا دەکەن. ئەو دابە لەگوندێکەوە بۆ گوندێکی دی دەگۆڕێت‌و جوداوازییان زۆرە. زێتر پەیوەندیی بەکەسایەتی سەرگەورەی گوندو هۆکارە کۆمەڵایەتی‌و ئابوورییەکانەوە هەیە. لەو نوێژی هەینییانەدا کە خۆم دیتمن، بەدەگمەن زێتر لەنیوەی پیاوانی ئاوایی ئامادەی دەبوون، (زستانان چونکە کارو فەرمان کەمترە، بەشدارانی لەوانەی هاوینان زێترن). ئەو تاقە نوێژە بارانەیەی دیتم، تەنها هەرزەکارانی گوندو پیاوێکی بەساڵداچوو تێیدا بەشداربوون. رەنگە پیاوەکانیش بۆ ئەوە ئامادەبووبن، تا چکێك لەو خۆراکانەیان پێببڕێت، کە ژنانی ئاوایی تایبەت بۆ ئەو بۆنەیەیان دروستکردبوو.

ئاپۆرەی خەڵکەکەش بەووری لەدوورەوە لەبەزمەکەیان دەڕوانی.

١٤ـ بڕوانە: (Rondot, 1937, S.22 - 26)

١٥. بڕوانـه: (Rich, 1937, S.280 ) ریـچ دەگێڕێتـەوە گوایـە پـشکێکی هۆزەکانی لوڕستانو کوردستانی عیراق لەژێر فەرماندەی جافدا بوون. بەوپێیە جـاف توانیویـە گشت کاتێك سێصەد سوارو زیاد لەهەزار پیادە خڕبکاتەوە.

١٦. بڕوانە: (Edmonds, 1957, S.146 )

١٧. باشترین شێوازی دیاریکردنی شیرازەی قووچ هەڵچووی جاف لە (Barth,1953, S.444) دا دەبینین.

١٨. بڕوانە: (Millingen, 1870, S.83)

١٩. بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤٨.

٢٠. بڕوانە: (Taylor, 1865,S.55) هۆزی ملان لەو سـەردەمەدا بـە ٦٠٠ دەوارێـك لەقەڵـەم دەدات. (A.Jaba, 1870) پـشت بەسەرچـاوەکانی پـێش ١٨٥٠ دەبەسـتێتو بـاس لـە ٤٠٠٠ دەوارێـك دەکـات. ئـەو ژمارانـەی ( Sykes, 1908, S.409 ff)و(Rondot,1937, S.34 – 38) نووسـیویانە، جێگـەی گومـانن. هـەواڵی رەسمیـی "Notes on Kurdish tribes" (Bagdad, Govt. press, 1919)وا رادەگـەنێت کـە سـەرکەوتنی ئیـبراهیم ئاکـامێکی دانـانی بـوو بەقومانـدانی هێـزە بـەکرێگیراوەکانی سوارەی حەمیدی. (لەبەندی سێهەمدا باسـی کەسایەتی ئیـبراهیم دەکـەینو بـەتێرو تەسەلی لەبارەیەوە دەدوێین).

٢١ــ بـۆ نموونـە لـەنێو هـۆزە یەککـەوتووەکانی هەڤێرکانـدا، هـۆزی عـەلیکانیان لەنێودایـە، ئـەولاتریان بەرەوخۆرهـەلات، تـاقمێکی گـچکەڵەی دی بەهـەمان نێـوەوە لێیە. لەو سۆنگەیەوە کە عـەلیك نێوێکی دانـسقە نییـە، دوورنیـە هـەردووکلا جـودا لەیەکدی، بـەنێوی دوو عـەلیکی جوداوازەوە نێونـەبرابن. لـێ لـەکن خەلیـچانەکانی خوارووی خۆرئاوای کێوەکانی تۆرعابدین، بنەماڵەیەکم دیت نێوی هەسنان بـوو، ١٥٠ کیلۆمەترێك نەولاتر بۆلای خۆرهەلاتەوە، هۆزێکی مـەزن بەهـەمان نێـوەوە هـەبوو. هەسن یانی "ئاسن" (کە لەڕیـشەی سـەرزارییەکەیەوە بـۆ هـەردوکلایان شـیاوە). لـێ لەمەیاندا ناشێت دوو دەستە بێ ئەوەی هیـچ تـاڵی خزمایەتییـەکیان لەنێوانـدا بێـت، جودا لەیەکدی هەمان نێویان هەبێت.

٢٢. بڕوانه لیستەی نێوی هۆزه گرنگەکان لەم سەرچاوانەدا: (شەرەفنامە، ١٥٩٦)، (Blau 1858, 1862)، (Jaba 1870)، (Sykes, 1908)، (Gokalb, 1975)، هەروەها لەژمارەیەکی زۆر لەراگەیەندراوە رەسمییەکانی هێزی داگیرکەری ئینگلیز لەعیراقدا.

٢٣. بڕوانە: (Leach, 1940, S.13 – 14)

٢٤. بڕوانە: (Barth, 1953, S.36 – 37)

٢٥. بڕوانە: (Rudolph, 1967, S.23 – 27)

٢٦. بۆ نموونە بڕوانە: (Edmonds, 1957, S.145 – 148) ( Barth, 1953, S.35).

٢٧. دەربارەی ئاینی ئەهلی هەق بڕوانە گوتارەکەی مینۆرسکی "ئەهلی هەق"و ئەو سەرچاوانەی سوودی لێوەرگرتوون، لەئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا. لەکوردستان خەڵکی سێ دەڤەری دابڕڕاو لەیەکدی، سەر بەئاینی "ئەهلی هەق"ن: نێزیکی کەرکووک، خۆرئاوای کرماشان (کێوەکانی ژوور جادەکەی بەغدا ـ کرماشان)، دەڤەرەکانی نێوان کرماشان و هەمەدان. ئەم دوانەی دواییان لەسەردەمەکانی کۆندا نێوچەیەکی یەکپارچەی بەرفراوانی ئەهلی هەق بوون، لێ لەرێگەی پەل و پۆهاویشتنی ئاینی رەسمیی وڵاتەکەوە، کە ئاینزای (شیعەیە)، کەل و کەچ بوون. تاقمی دووهەمیان (مەبەستی ئەوانەی خۆرئاوای کرماشانە) (بێ لەبرێك هۆزیان) کە هەندەك دەستەو تاقمی وەکی سنجابیو کەلهورەکان دەگرێتەوەو بەشێکن لەکۆنفوێدراسیۆنی گۆران، جارجارە بەئەهلی هەقەکانی داڵەهوو نێودەبرێن، بەنێوی کێوەکانی داڵەهووەوە، کە گەورەترین پیرۆزگەو جێنزرگەیانی لێیە. ئەوێ بۆ گەلەکیان، وەکی مەککەی موسڵمانان وایە. ئەهلی هەقەکانی ئەوێ، هەتا بەپێی پێوەری ئاینزاکەی خۆشیان، کەم ئیمان و باوەڕ کزەڵەن.

٢٨. بڕوانە: (Rudolph, 1967, S.27 ).

٢٩. بڕوانە: علی رەزم ئارا: "جغرافیای نضامی ایران"، بەندەکانی: "پشتکوە"، "کرمانشاهان"، "کردستان" و "ئازربایجان باختری"، تهران، ١٩٤١.

٣٠ـــ بــۆ نموونــه بلْباســەکانیش کــه لەســەدەی نۆزدەهەمــدا بەشــێك بــوون لەکۆنفوێدراســیۆنێکی خێڵــه نیــوه کۆچــەرەکانی خۆرهــەڵاتی کــەرکووك، هــەر بەعەشــیرەت نێــودەبرێن. مــن قــەت زاراوەیــەکم بــەرگوێ نەکــەوت کــه تێکــڕا بەشێوەیەکی گشتی بەواتای "کۆنفوێدراسیۆن" بـەکاربرێت. دیـاره دەبێـت ئـەوەمان لاڕوون بێــت، کــه گەلــەك ســەرنجدەری ئــەورووپایی تــەنها لەســۆنگەی ئــەو دوای پەیوەندییــه بەربەرەڵایــەی لــەنێوان تــیرەو بنەماڵەکانــدا هەیــەو بــەهۆی ئــەو یەکڕیزیو یەکێتییه بێ چەندو چوونەوەو لەپەلەکاریو هەڵەشەییەوە، زۆر هۆزیان به "کۆنفوێد راسیۆن" نێوبردووه.

هیچ پێوەرێکی روونو ئاشکرا بۆ جوداوازیکردن لەنێوان هۆزو کۆنفوێدراسیۆندا نییه، بەو هۆیەوە مرۆ لەبەکارهێنانی یەکێك لەو دوو زاراوەیەدا سەرپشكو ئازادە.

٣١. لەخۆرهـەڵاتو ژێـرووی کوردسـتان بـەوەرزێره بەیدەسـتکراوه ناخێڵەکییـەکان دەگوترێت (گۆران). دیاره نابێت دەگەڵ نێوی هۆزی گۆراندا لێمان تێکبچێت. (تکایـه لەوبارەوە بڕوانه بەندی دووهەمی ئەم کتێبه).

٣٢. بڕوانه: (H. Sanddrezki, 1857 II, S. 263 ).

٣٣. بڕوانه: (Rudolph, 1967, S. 28 - 29 ).

٣٤. بڕوانه: (Hay, 1921, S. 65).

٣٥ـ (Rudolph, 1967, S. 28) بەتونـدی بەرپەرچـی ئـەوە دەداتـەوە کـه وشـەی ئێل بەو واتایه بەکارهێنرابێت. لێ من لەگەڵ ئەو بوچوونەی Rudolphدا نیم، کە پێیوایه ئێل لەڕیشەوە هاوواتایەکی گونجاوو پڕاوپڕی عەشیرەتە. وشەکە لەبنەچـەدا تورکییەو گوزاره هـەم لەکۆنفوێدراسـیۆنی هـۆزێکی مـەزنو هـەم لەمەڵبەندەکەشـی دەکـات. بـەپێی بۆچـوونی Lambton (بڕوانــه وشــەی "ئـێلات" لەئینـسکۆلۆپیدیای ئیـسلامدا)، زاراوەکـه لەسـەردەمی ئیلخانییەکانـەوە لەئێرانـدا، بـۆ دەسـتنیـشانکردنی هۆزه کۆچەر (یاخود نیوەکۆچەرەکان) بەکاربراوە. هەر بۆ ئەو مەبەستەش لەلایـەن گەڕیدەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە بەکارهێنراوە.

٣٦ـ بۆ نموونه دەربارەی بەختیارییەکان بڕوانه: (Garthwaite 1977 ).

٣٧. بڕوانە: (Hay, 1921, S. 65).

٣٨. بڕوانە: (Rondot, 1937, S. 4, 15).

٣٩ـ بڕوانـە: (قورئـان، 5 :49 (45) 2, :173 (178)) تەرجەمەکـەی Max Henning.

٤٠. بڕوانە: (Barth, 1953, S. 72 – 77).

٤١ـ بۆ نموونـە هـەوڵی کوشـتنەکەی محەمـەد جـەلال بوچـاك، کـە یـەکێك لـەئاغا نێـودارو دەسـتەڵاتدارەکانی دەڤـەری سـیڤەرك و ئەنـدامی پارلـەمانی تـورکی بـوو، لەلایـەن کۆمـەڵێك لاوی سـەر بـەپارتی کارگـەرانی کوردسـتانەوە، لەڕۆژنامـەو ئامرازەکانی راگەیاندندا زایەڵەیەکی زۆری دایەوە. ئەم رێکخراوە کە زێتر بەئاپۆچی ناسـراوە، یەکێکـە لـەڕادیکالترین ئـەو رێکخـراوە کوردییانـەی، کـە بەتونـدی دژی ئالیکـاری ئاغاکـان دەگـەڵ دەوڵـەتی تورکیـادا دەوەسـتێتەوەو دەسـتی کوشـندەیان لێدەوەشـێنێت. ئاپۆچـییەکان ئارمـانجی جوداخوازیانـەیان بـەتیتۆلێکی دامـاڵراو لەمارکسیزم پێچاوەتەوەو بەپلـەی یەکـەم بنـچکیان لـەنێو لاوانـی گونـد وێرانـکراوی ریشەکێـشراوو ئـەو گەنجـە شـاریانەی کـە هـیچ تروسـکەیەکی هیـوا لـەفراژیبوون و هەڵگرانی باری ژیاندا بەدیناکەن، لەنێو لاوانی کۆڵکە خوێندەواری ریـزی خـوارەوەی چـینە نێوەڕاسـتەکاندا، داکوتـاوە. لاوانـی لـەو بابەتـەبوون، سـاڵی ١٩٧٩ هەوڵیانـداوە محەمەد جەلال بوچاك بکوژن. هەرچـەندە هەوڵەکەیان سـەرینەگرت، لـێ سـەرنجی دەزگەکانی راگەیانـدنی بـەلای ئاپۆچییەکاندا راکێشا. گەلـەك هـەوڵی لـەو بابەتـەی بەنێوی "دادگای شۆڕشەوە"ی بەدوواداهات.لەوبارەوە بڕوانە: (Bruinessen, 1982, S. 213 – 216).

٤٢. بڕوانە: (Taylor, 1865, S. 51).

٤٣ـ بڕوانـە: قورئـان 2 :174 (179)، یەکەوڕاسـت پـاش دەقـە راگوێزراوەکـەی پەراوێزی 39.

٤٤. گەلەکجار بۆیاندەگێڕامـەوە، کـە گوایـە لەکۆنـدا هـەرکات کێـشەیەك بخوڵقایـە، ردێنـسپییانی هـۆز کۆدەبوونـەوەو هـەوڵی چارەسـەرکردنیان دەدا. گـشت بڕیـارێکی

گرنگ لەسەر ئاستی عەشیرەت، یاخود خوارتر، بەدەست ئەنجومەنێکی راوێژکاریی لەو بابەتە بوو. لێ قەت نموونەی پێشهاتێکی بەڕاست رووداوی لەوبابەتەم نەبیست.

٤٥ ئەودەقە لە (Rondot, 1937, S. 34 ff) خوازراوە.

٤٦ ژن‌و مێردکردنی ئامۆزا، لەکۆمەڵگەی خێڵەکیی خۆرهەڵاتی نێوەندا، بابەتی دەمەتەقێیەکی فرەی سەرچاوە ئێتنۆلۆژییەکانە. پشکی هەرەزۆریان لەمەڕ کۆمەڵە دیاردەو باس‌و بابەتێکن، کە لەم رووەوە بۆ ئێمە هێند سەرنجڕاکێش نیین، بۆیە من دەیانبوێرم. ئەوەی گەرەکییە زێتر لەوبارەوە بزانێت، بابڕوانێتە: (Fortes, 1953)، (Barth, 1954 )، (Murphy, 1959, 1967 Kasdan)، (Patai, 1965)، ( Cole, 1984).

٤٧ لەکۆی ٢١ حاڵەتی ژن‌و ژنخوازیی نێو هۆزی هەمەوەند، کە Barth توێژیونییەوە، نۆیان لەنێوان ئامۆزای یەکدیدا بوون، شەشیان لەگەڵ خزمانی دیدا بوون. لەکن وەرزێرە ناخێڵەکییەکان مەیلی ژن‌و ژنخوازیی لەنێوان ئامۆزادا، گەلەك کەمترە. لە ٥٢ حاڵەت، تەنها شەشیان لەوبابەتەبوون. دوازدەیان دەگەڵ خزمانی دیکەیدا بوون، بڕوانە: (Barth, 1953, S. 68 ).

ئەو ژمارانە هێند لەو ژن‌و مێردایەتییانە زێتر نیین، کە رێکەوت‌و لێك نێزدێکی، هەڵبژاردنی هاوسەرەکەیان پێکیهێناوە.

٤٨ پێدەچێت ئەمە بەنیسبەت کۆمەڵگە بەدووەکانەوە راستبێت، کە کۆمەڵناسان زێتر عەوداڵیانن. بەقسەی Evans ـ Pritchard: "لەکن بەدووەکانی Cyrenaika ماڵەکەی خۆی لەماڵەکانی دی لەپێشترە، خانەوادەکەی خۆی لەخانەوادەکانی دی لەپێشترە، تیرەکەی خۆی لەگشت تیرەکانی دی لەپێشترە. لەگەڵ ئەوەشدا هەستی هاوچارەنووسی‌و پێکرایی گشت بەدووەکانی ولاتەکە زاڵە، بێگوێدانە یەك توخمیی خێڵەکییانە، بۆ نموونە هەستی پێکراییان لەبەرامبەر شارو شارییەکاندا، یاخود یەککەوتنی رەوەندی عارەبان لەبەرامبەر تورکەکاندا، یاخود هێرشی داگیرکەرانەی ئیتالیاییەکان عارەب‌و تورکی موسڵمانی لەبەرامبەر کافراندا یەکخست"...... هتد.

٤٩ بڕوانە: (Badger, 1852, I, S. xii, 183, 265)، بەقسەی (Fraser, 1840, I,S.68--69) میرنشینەکە لەدەمەدەمی داگیرکردنیدا، دوژمنایەتی نێوخۆیی دایوەشاندبوو.

٥٠ بڕوانە: (Malcolm, 1815 S. 541 – 542).

٥١ لەکوردستانی تورکیا زۆرشتی سەیرو سەمەرەم لەو بارەیەوە بیست. (Sykes, 1908, S. 470) باسیدەکاتو پەنجە بۆ ئەوە رادەکێشێت کە بەگشتی لێکئالۆزانێکی زۆر لەنێوان ئەفسانەی مەلانو هۆزی بەنێو ئامۆزایدا، کە هەمان نێوی هەیە، دەکرێت چەند چاوساغێکم باسی تەنها دوو هۆزیان نەدەکرد، بەڵکە سووربون لەسەر ئەوەی کە لەبنچینەدا سێ هۆزبوون، سێهەمیان کە بابا کوردی بووە، هۆزەکانی باشووری لێکەوتوونەوە (زۆریان بۆ نێوەندی کوردستان رەویانکردووە). Firat (کە نووسەرێکی کوردە) نێوی ئەو هۆزانەش دەهێنێت، کە لەوسێ بەرەبابە کەوتوونەوە، بڕوانە: (Firat, 1946, S.10- 23, 144 - 149 ).

٥٢ بڕوانە: (Rondot, 1937, S. 25).

٥٣ـ نموونەی زۆر زەق‌و دیار، هۆزی پشدەرو بابەکرئاغای سەرۆکێتی، کە وابەستەو دابەستەیەکی دەستەڵاتدارانی ئینگلیزبوو. Edomonds کە یەکێك بوو لەئەفسەرە سیاسییەکانی ئینگلیزو پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ بابەکردا هەبوو، لەوەپاش دەنووسێت، "دەگەڵ بابەکر"دا، یاخود "دژە بابەکر"، خۆی لەخۆیدا مانای "دەگەڵ دەوڵەت"دا، یاخود "دژە دەوڵەت"ی دەگەیاند، بڕوانە: (Edmonds, 1957, S. 230).

٥٤ هەڵبەت گەلەکجار هەوڵدەدرێت شەڕو پێکداهەڵقژان بە "نەریت"، کۆمەکی بێگانەش (بەتایبەت کۆمەکی دەوڵەت) بە "ڕێبازی نوێ" بۆ گەیشتنە دەستەڵات نێوبنرێت. ئەوە مسۆگەرترە، ئاسانترە، پڕ سوودترەو صەدان ساڵە پەیڕەودەکرێت.

کوردەکان لەوەتەی هەن، لەتخووبو کەناری ئیمپراتۆرێتە مەزنەکاندا ژیاون. هەرکات وشەی "نەریت" بۆ کۆمەڵگە خێلەکییەکان بەکارهێنرا، نابێت

والێکبدرێتەوە کە ئیدی لەتینو تاوی هۆکارە دەرەکییەکان بێبەری بووەو بۆخۆی رەوتێکی کۆمەڵایەتی سەربەخۆبووە.

٥٥ـ ئەوەی پەیوەندی بەبەهرەی تێگەیشتنی ئەو ئەفسەرە سیاسییانەوە هەبێت، لە (Hay 1921 )، (Lees 1928)و (Edmonds 1957)دا دەیبینین.

٥٦ـ دەربارەی جاف، بڕوانە (Barth, 1953, S. 34 – 44).

لەبارەی هەرکییەوە سەرچاوەی نوێی باوەڕپێکراوی ئەوتۆمان لەبەردەستدا نییە. کێشانو داخستنی سنوورەکان، ئەم هۆزەیان کردۆتە سێ کوتی دابڕاو لەیەکدییەوە (لەتورکیاو ئێرانو عێراقدا). بەگزادەکانیان زۆر دەستەڵاتو بڕشتی نەریتییانەی خۆیان لەدەستداوەو ئێستەکە وەك هۆزێکی سەربەخۆ لەنێو هەرکییەکانی ئێراندا دەژین.

٥٧ـ بەگزادەکانی جاف بەسەر سێ لقدا دابەشبوون، دووانیان لەسەرووەختی سەردانەکەی Barthدا بەحەوت پشت دەچوونەوە سەر بەرەبابێك، خزمایەتی دەگەڵ لقی سێهەمدا، بناوانەکەی کۆنترە. "سەرکردەو مەزنانیان دەشێت لەهەر یەکێك لەو لقانەدا هەڵکەوێت". بڕوانە: (Barth, 1953, S. 41 ).

٥٨ـ یەکێك لەکوڕانی ئاغای خەلیجان، کە تورکان بەپێشچاوی خۆیەوە گشت دەستەڵاتێکی دادیارییان لێزەوتکردبوو، بۆیدەگێڕامەوە: "ئاغای ئەوڕۆ چیدی ئاغا راستەقینەکەی جاران نەماوە، بەڵکە زێتر پیاو ماقوولێکە، <<حوکم ناکات>>".

٥٩ـ کەواتە نازنێوی <<ئاغا>> لای کورد واتایەکی دیکەی جودای هەیە لە <<ئاغا>>ی تورك. ئاغای تورکان دەوڵەمەندی گوندە، خاوەنی زەوییە، لێ مەرج نییە هێزو دەستەڵاتی سیاسی بەدەستەوەبێت. ئاغای کوردان هەرچەندە دەستەڵاتدارە، وەلێ دەشێت رووتەو هەژاریش بێت.

٦٠ـ "نێوو شۆرەتی سەرەکهۆز تارادەیەکی زۆر بەندە بەدیوەخانەکەیەوە، تا بەخشندەترو دەستو دڵ والاتر بێت، <<پیاو>> ترە". بڕوانە: (Hay, 1921, S. 47 ).

لەزاراوی ژووروودا وشەی "مەرد"ی فارسی دوو شێوازی هەیە: مەرد بەواتای (بەخشندەیی و دڵاوایی)،مێر بەواتای ئازایی و عەگیدی و مێرخاسی. کەواتە ئاغا دەبێت هەم مەردیش و هەم مێریش بێت.

٦١ـ بابەتێکی فرە پاتەوەبوو لەسەرگوزشتەی کوردیدا، باسی چارەنووسی ئەو ئەفیندارەیە، کە گراوییەکەی بێ سەروشوێن دەچێت، ئەویش لەکەناری دووریانێکدا چایخانەیەك دروستدەکات، چونکە ئەوێ چێترین شوێنە بۆ دەستخستنی هەواڵی دڵبەرە لەدەستچووەکەی. لەسەروەختی جەنگی کوردانی عیراقدا، تەتەرو پێشمەرگەکان کە لەبەرەکانی جەنگ دەگەڕانەوە، لەچایخانەکان دەنووستن. ئەوانە هەواڵ و زانیاری تەواویان دەربارەی باری جەنگ بەلادێییەکان دەگەیاند، راستترو پوختتر لەوەی وێزگەو ئامرازەکانی پڕوپاگەندە رایاندەگەیاند.

٦٢ـ "لەڕاستیدا لەزۆر شوێن دیوەخان زێتر یانەی گوندە وەك لەوەی ملکی تایبەتی سەرگەورەی ئاوایی بێت". بڕوانە: (Hay 1921, S. 52).

٦٣ـ بڕوانە: (Leach, 1940, S. 28).

٦٤ـ هەڵستان یاخود هەڵنەستان لەبەریەکێك کە دێتە شوێنێکەوە یاخود بەبەردەمدا رادەبوورێت، ئەورۆ لەتەواوی دونیادا هەمانجۆرە. هەتا نیشاندانی رێزەکەش جۆرو پلەی هەیە، جارهەیە تەنها جووڵەیەکی بۆدەکەن، وانیشاندەدەن کە گوایە گەرەکیانە لەبەری هەڵستن، بێ ئەوەی بەڕاستی لەبەری راستببەنەوە، یاخود هەڵدەستن، لێ تەواو راستنابنەوەو دەمودەست رۆدەنیشنەوە، یاخود برێکجار تەنها خۆ قیتدەکەنەوەو بۆ پێشاندانی رێز سەرێك دەچەمێننەوە.

٦٥ـ نابێت زێدەڕەوی لەو ئالۆزی و ئانارامییەدا بکرێت، کە کرێکارانی رەوکردوو بەسەر باری پەیوەندیی نێوخۆی لادێییەکانیدا دەهێنن. ئەو کرێکارانە بەپۆل روو لەو شوێنانە دەکەن. لەتورکیا زستانان روو لەو گوندانە دەکەن، کە کێڵگەی بەرفراوانی پەموو، یاخود باخی بەرینی میوەیان لێیەو دەگەڵ لادێییەکاندا پەیماننامەیەك مۆردەکەن. کرێکارەکان پەیڕەوی پەیوەندییە نەریتییەکانی خانەوادەو خێڵەکانیان دەکەن. یەکدوو ردێنسپی گوند بەرپرسیاریی گشت

لادێییـەکانی دی دەگرنـە ئەسـتۆ. لـەخۆرئاوا ئـەو کرێکـارە رەوکردووانـە تـەنها پەیوەندییان بەیەکدییەوەو لەنێوخۆدا هەیە.

٦٦ـ بڕوانە: (Barth, 1953, S. 22 ).

٦٧ـ Edmonds (1957, S. 22 )و Bois (1965, S. 36 - 37 ) دەنووسن زەکات، لەڕاستیدا مەبەست دەیەکی دەغڵودانەو لیستەیەکی دوورو درێژ بۆ کەرانەو سەرانە فیۆدالییەکانی دی دەکەن، لێ مەخابن پێمان نالێن کامانەیان گشتیین و کامانەیان تایبەت بەشوێنێکن و داخۆ لەخێڵەکی و ناخێڵەکییەکان هەمان ئەندازەو وەکی یەك دەستێندرێن، بەو پێیە تەنها لایەنێکی کەمی بوون و بەردەوامیی فیۆدالیزمی کوردمان بۆ رۆشندەکەنەوە.

پێدەچێت ئەو زەکاتەی ئاغان بۆ مزەختی دیوەخانیان دەیستێنن، لایان حەرام نەبێت، چونکە بۆ تێرکردنی سکی رێبوارانی برسییەو قورئان فەرمانی لەو بابەتەی داوە، بۆ نموونە بڕوانە (قورئان 92 ;17 – 18 ,70 ;22 ff)، ئەمە مانای وایە لەنێوان یاسای ئیسلام و رەفتاری فیۆدالانەدا، تارادەیەك هاوئاهەنگییەك لەبەکارهێنانی زەکاتدا بۆ سوودی گشتی، لەئارادایە.

<<تکایە بۆ نرخ و پایەی زەکات لەیاساکانی ئیسلامداو دەستووورە تایبەتییەکانی، بڕوانە Juynboll (1930, 80ff) >>.

٦٨ـ ساڵی ١٩٧٥، ئەو دەمەی چوومە کن تیرەی سەکری هۆزی باڵەك، (Leach نەچووبووە کن ئەم تیرەیە)، نکۆڵییان لەوەدەکرد کە قەت ٥٠٪ داهاتیان بەئاغا دابێت وەك Leach باسیدەکات. Leach لەڕاستیدا هەرگیز نەیدیتووە چەندیان خاوە بەئاغا داوە، پێدەچێت خۆشی گومانی لەبانگاشەکەی خۆی هەبێت، کە پێچەوانەی گوتەکانی Hayە، (Hay دەڵێت تەنها ١٠٪ی داهاتیان داوە). تیرەی سەکر بەگوتەی خۆیان قەت ١٠٪ زێتریان نەداوە. لێ جارجارە بێگاریان پێکراوە. هەرچەندە لەورووەوە بیریان هێند تیژنەبوو، کە بتوانن بەبەڵگەوە دڵنیام بکەن.

٦٩ـ بڕوانە: (Leach, 1940, S. 15).

٧٠ـ دەربارەی تاپۆ و پیادەکردنی، بڕوانە بەندی سێهەم.

٧١ـ بڕوانە: (Leach, 1940, S. 17 ).

٧٢ـ بڕوانە: (Leach, 1940, S. 68).

٧٣ـ بڕوانە: (Hay, 1921, S. 68).

٧٤ـ لەنیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەدا، ئەوە رەفتاری تێکڕای ئاغاکانی ژێرووی کوردستان بوو، بڕوانە: Edmonds (1957, S. 224 – 225).

٧٥ـ ئەوە هۆکاری مێژوویی هەیە، چ مەنگوڕ چ مامەش بەشێك بوون لەکۆنفوێدراسیۆنێکی مەزن بەنێوی بڵباسەوە، کە لەساڵەکانی سی سەدەی نۆزدەهەمدا لەلایەن میری رەواندزەوە (میری کوێر)، بەیدەستکرا. پشکێکی کۆنفوێدراسیۆنەکە (بەشی زۆری مامەش و مەنگوڕ)، بەدیوی ئێراندا رەویانکرد. کۆنفوێدراسیۆنەکە لەنێوچوو، هەتا نێوەکەشی بەدەگمەن دەکەوێتە سەرزاران، لێ هێشتا هەستی تێکەڵی و هاوبەشی لەنێوان هۆزەکانیدا هەرماوە. مامەشەکانی عیراق مەزنێکی دەستەڵاتداریان نییە. لەهەواری زستانەیان، کە گوندەکانیانە، دەدەنەپاڵ عەلی ئاغای مەنگوڕ، (کە سەروەختێك یەکە دەستەڵاتداری نێوچەکەبوو).

لەئێلاخ و لەوەڕگەکانی هاوینەیان، لەودیوی سنوور بەدیوی ئێراندا، دوور لەلەوەڕگاکانی مەنگوڕ، لەکن هاوسێکانی مامەشیان، سەر بەمەلا قادر عەباسی سەرەکهۆزی مامەشەکانی ئێران، یاخود سەر بەکوێخا باوەیس ئاغان، کە بەنێو سەرەکهۆزی مامەشەکانی عێراقەو لەدیوی ئێران دەژێت و وەك مەزنێك تێدەڕوانن، (لەم بوارەدا چاوساغەکانم یەکڕا نەبوون و زانیاری پێچەوانەی یەکدیان دەدامێ).

لێرەدا نموونەیەکی روونی لێکترازانی هێزی سیاسی و ئابووری دەبینین: هەتا ١٩٦١یش مامەشە گوندنشینەکانی عیراق ناچاربوون زەکات بەئاغاکانی پشدەر بدەن (بەلقەکەی سەر بە بابەکر ئاغا). هەموو ساڵێك پیاوە چەکبەدەستەکانی بابەکر دەهاتن و دەیەکیان کۆدەکردەوە، بڕێکجار پیاوانیشیان بۆ بێگار راپێچدەکرد. مامەشەکان لەوە کزو لاوازتربوون، کە بەرگرییان لەخۆ پێبکرێت (تەنها شەش گوند بوون)، دیارە مەنگوڕانیش نەیاندەخواست لەسەر مامەش دەگەڵ لەشکری بەهێزی پشدەرییان بەشەڕبێن و کێشە بۆخۆ بسازێنن. پشدەرییەکان لەڕووی ئابوورییەوە

لەگـشتیان تۆکمـەتر بـوون. مامەشـان بیریـان لـەوە نـەدەکردەوە لـەکاتی کێـشەو پێداهەڵقژاندا پشتی هیچ هۆزێکی دژ بەپشدەرییەکان بگرن. هەرکێشەیەکی ئـاڵۆزی نێوخۆش هەبایە، هانایان بۆکن عەلی ئاغا دەبرد، نەك بابەکر ئاغا، یاخود کوڕانی.

کۆتایی پـەنجاکان بابـەکر هەوڵیـدا گشت زەویـوزاری مامەشـان بەتـەواوی بۆخـۆی بڕبدات (ئەمە ئەو دەمانەبوو کە یاسای نوێی تاپۆو قەباڵە لەوئاقارەدا بەگەڕخرا)، مامەشـان راپـەڕین و دژی ئـەو هەوڵـە وەسـتانەوە. کودەتاکـەی قاسـم و بزوتنـەوەو زریانە کۆمەڵایەتییەکانی دژ بەدەرەبەگان، مامەشانی بـۆ چـەندین سـاڵ تاڕادەیـەکی زۆر ئـازادو بێمنـەتکرد. لـێ سـاڵی ١٩٦١ کـوڕانی بابـەکر٣٠٠ سـوارێکیان کردەسـەر مامەشـان و چـوار گونـدیان ئاورتێبـەردان و چـواردە پیاویـان کوشـتن. ئـەوانی دی گونـدەکانیان بەجێهێـشت و هـەڵهاتن، دوور لـەوێ داڵدەیان دۆزییـەوە، لـێ سووربون لەسەرئەوەی چیدی زەکات بەپشدەرییان نـەدەن. رووداوە سیاسییەکان ئیـدی بـواری ئەوەیان لەپشدەرییان تەنی، کە بوێرن رەفتاری لەوچەشنە بنوێننـەوە. ئەمـە بڕێـك مامەش بۆیانگێڕامەوە، هەرچـەندە دەشـێت هەنـدەك لـەڕووداوو پێـشهاتەکان پـاش و پـێش خـرابن. لـەتێڕوانین و بـەراوردکردنی لەگـەڵ هـەواڵی رۆژنامـەکانی ئـەو سـەردەمەدا، پێدەچـێت ئـەو راپەڕینـە میللییـە بووبێـت کـە بـە (چـەکدارانی بزووتنـەوەی دژە دەرەبەگایـەتی) نێـوبراوەو لەمایـسی ١٩٥٩دا روویـداوە، پاشـان پـشدەرییەکانیش چـەند قـشڵەیەکی پـۆلیس و بڕێـك مەخفـەری سەرسـنووریان داگیرکـردووە. هەواڵـەکانی ئەودەمـە دەگێڕنـەوە، کـە چـەکدارانی بزووتنـەوەی دژە دەرەبەگایەتی، بەپـشتیوانیی هێـزی فڕۆکـەوانیی عێراقی، پـشدەرییەکانیان بـەدیوی ئێراندا هەڵبڕیوە (Oballance, 1973, S. 71 ). گەر ئەمە راسـتبێت، ناکرێـت رۆڵـی چالاك و بوێرانەی مامەش لەدەمەدەمی ئـەو پێـشهاتانەدا لـەیادکرێت. ئەمـەش ئـەوە ئاشکرا دەکـات، کـە بـۆچ پـشدەرییەکان پـاش ١٩٦١یـش چیدی هـەوڵی هەڵمەتبردنـەوە سەر مامەش و بەیدەستکردنەوەیان نەدان.

٧٦ـ ئـەو دەقـە لـە (Anderson, 1974, S. 108f ) راگوێزراوە. هەسـتهەژێن ئـەو سـەرنجانەن کـە Qwen Lattimore لەگوتارە نایابەکـەی ١٩٥٧یـدا، دەربـارەی ئـەو

جۆره سیستێمه گوێڕایەڵانەیەی گەلەك کۆمەڵگەی خێڵەکی نووسیویە، بەتایبەت لاپەڕەی ٥٢. (Anderson یش پەنجەی بۆ ئەو گوتارە راکێشاوە).

٧٧- بڕوانە E. A. Thompson: "The Early German " (Oxford 1965) کە لەلایەن Andresonەوە لەکتێبەکەی ١٩٧٤یدا روونکراوەتەوە، بڕوانە لاپەڕەکانی ١٢٧ _ ١٢٨.

٧٨- بڕوانە: (Edmonds, 1957, S. 217)، من تامەزرۆم بزانم داخۆ میراودەڵییەکان لەو جوداوازییەی Edmonds لەنێوان بەیدەستکردنی رەوای نورەدینییەکانو ژێرچنگۆڵەخستنی نارەوای دەستەو تاقمەکانی دیدا کردوویە، رازین.

٧٩- بابەکر لە(Hay, 1921)دا، بە "ژیرترینو گرنگترین کەس لەنێو ئەو سەرەکهۆزە زۆرانەی دیتوومن" نێودەبرێت.

"بەهێزترین سەرەکهۆزی کوردستانو گوێڕایەڵترینیانە"، (هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٣٩). "پیاوێکی پیاوانەو خزمەتگوزارێکی یاساو رێکوپێکییە". بڕوانە (Notes on the Tribes of Southern Kurdistan, Bagdad, Gov. Press 1919, S. 16).

٨٠ بڕوانە: (Edmonds, 1957, S. 217).

٨١ بڕوانە: (Notes on the Tribes of Southern Kurdistan, S. 11).

٨٢- ئەو زانیارییانەم دەربارەی رووداوو پێشهاتەکانی سی ساڵی رابوردوو، لەئەنجامی گفتوگۆ دەگەڵ برێك رەعییەتی پشدەریو یەکێك لەئاغاکاندا، لەفێبریوەرو مارتی ١٩٧٥دا چنگکەوت.

٨٣ بڕوانە: (Barth, 1953, S. 53 – 55) ئاوها باسدەکات.

٨٤ بڕوانە: (Barth, 1953, S. 56).

٨٥ بڕوانە: (Barth, 1953, S. 59).

٨٦- بڕوانە: ( Naval Intelligence Division, Iraq and the Persian Gulf, 1944, S. 375).

٨٧ بڕوانە: (Notes on the Tribes of Southrem Kurdistan, S. 10).

٨٨. بڕوانه: (Hay, 1921, S. 165 ).

٨٩. له (Wilson, 1931, S. 112) راگوێزراوه.

٩٠. Anderson ئاوها لێکیدەداتەوە: "لەولاتانی خاچپەرەوەردا لەکۆنەوە وەرزێری نیشتەجێ هەبوون، کە دەبایە چینێکی کۆیلەیان پێکهێنابا، لێ بەلەنێوبردنی گشت لەگشتی ئاغاکانیان، سیستێم‌و شێرازەی ڕێکخراوەیشیان هەڵتەکێنرا، لەو ڕێیەوە شێوازی بەرهەمهێنانەکەشیان هەڵوەشێندراوە". بڕوانە: ( Anderson, 1974, S. 151).

٩١ـ بۆ نموونە بڕوانە: Rich, 1836, II, S. 108 – 110; Forbes, 1839, S. 409–411;vonMoltke,1882,S.246;Sykes,908 لێـــرەو لـــەوێ Lehmann-Haupt, 1926 II / 1, S. 240.

٩٢. بڕوانه: Diary of Major E. Noel on Special Duty ( Bagdad, Gov. Press 1919).

٩٣. بڕوانه: (MONTAGNE, 1932, S. 58).

٩٤. هۆزی بەخۆنازیوی میران، یەکێك لەهۆزە زۆر حسێب بۆکراوەکانی نێوەندی کوردستان، بەهۆی داخستنی سنووری نێوان تورکیاو سوریاوە، ناچاربوون ڕێگەی کۆچ‌و ڕەوی خۆیان وازلێبهێنن. ئیدی لەسوریا گیرسانەوە. تا ١٩٤٥یش هێشتا هەر خێوەتنشین بوون، فیزیان نەیدەهێنا مل وەبەر وەرزێری نێن، تا ئەوڕۆکەش زۆریان ڕازینیین دەست بدەنە گاسن‌و هەوجاڕ.

پەیدابوونی مەکینە ئەو کۆسپەی هەڵتەکاند، ئێستەکە مەکینەو مەکینەچی رادەگرن‌و زەوییان پێ ڕەنێودەهێنن، بێ ئەوەی پێویست بەوەبێت پلەی خۆیان دالەنگێننە ئاستی وەرزێرێکەوە.

٩٥ـ بەسەرهاتەکە ئاوهابوو، هەرچەندە کوڕانی عوسمان‌و محەمەدیش مافی ڕەوایان بەبەشێك لەوملکانەوە هەبوو. کە دەیەکی داهاتیان بەسلێمان دەدا، مەسەلەکە زێتر دانانبوو بەسەروەریی‌و مەزنییدا وەك لەوەی ملکانەبێت بەدەردبەگێك.

بـۆم روونـنـەبووەوە داخـۆ مێگەلـەکانی عـەباس بەسـەر میراتگرانیـدا بەشـکران، یاخود ئەوانیش تەسلیمی ئاغای هۆزکرانو وەك ملکی هـەمووان مامەڵـەدەکران. لـێ لەشوێنانی دی بۆمدەرکـەوت کـە مێگەلـەکان بەسـەر میراتگرانـدا بەشـدەکرێنو وەك ملکـی تایبـەت مامەڵـە دەکـرێن. پێدەچـێت لـەکن دورکییـەکانیش هـەر ئاوهابێـتو تێکـڕای ئەنـدامانی خانەوادەکـە، لایـەنی کـەم بڕێـك بـەروبوومی مێگەلـەکانیان پێـدەبڕێت. هەڵبـەت گـەر بـازاڕی بازێڕێـك نێزیکیـان نـەبێت، پـوولێکی ئـەوتۆیان لەبەروبووی ئاژەڵ چنگ ناکەوێت. کەمبوونەوەی ژمارەی ئاژەڵی ڕاگیراوی هەرماڵێك بەوە پاساودەدرێت، کـە ئیـدی لەبیـستەکانەوە ڕێگـەی هامـشۆی ئـێلاخو زەنوێرەکـان زەحمـەتکراون. کێڵگـەکان بڕەویـان سـەندووەو داهاتیـان لەئاژەڵـداریی زێتربـووە، ئاژەڵداری بۆتە قۆرخێکی ئاغا.

٩٦. بەقسەی چاوساغەکانم ئەو پێشهاتو دیاردانە بۆ ئـەو سـەردەمە شـتێکی نـوێ بوون، کە پێناچێت ڕاستبێت.

ئاکامێکی بارە تایبەتەکەی جەزیرە ئـەوەبوو، کـە پێـشهاتو دیـاردەی لەوبابەتانـە خێرا پزیسکیان دەهاویشتو بەزوویی دەیانتەنییەوە، بۆیە زێدەڕۆی نییـە گـەرنێوی سەرهەڵدانی "چینێکی نوێ"ی لێبنرێت.

٩٧. بۆم روونەبووەوە داخۆ کامە لقی خانەوادەکـەی ئـەو گونـدە تایبەتـە، تـاپۆی زەوییەکانیان پێبڕا، هەرچەنـدە چاوساغەکانم پێیانگوتم ئەوە هیچ بایـەخێکی نییـە، چونکە تەنها ئاغای هۆز دەتوانێت زەوییەکان بفرۆشێت.

٩٨. بەگوێرەی قسەی نەستەقو پەندی پێشینیان بێت، مامو برازا مێملی یەکدین، بەپێـچەوانەی خـاڵو خـوارزاوە کـە پـشتو پـەنای یەکـدین (چـونکە هـیچ گێرمـەو کێـشەیەکی مـاددی لەنێوانیانـدا نییـە): "خـاڵا خـوارزێ ڕاکـرن، ئاپـا برازیـدا کـرن" خاڵ، خوارزای هەلگڕاند، مام، برازای هەڵتڕاند. ڕەنگە ئەو کێشەو ململانێ خۆڕسکە ماکی ژنو ژنخوازی ئامۆزاو بنئامۆزا بێت، ئـەو جـۆرە ژنو ژنخوازییـە پێـشانیدەدەن چۆن بەرژەوەنـدییـە جوداکـان یەکـدەخاتو پێکـەوە دەیانـسازێنێت. بڕوانـە هـەمان بەڵگەو بیانوو لە (Barth, 1954)دا. خاڵێك کچەکەی خۆی تەنها بـەنیازی یارمـەتی

دەداتــە خوارزایــەکی، لــێ ژنو ژنخــوازی لــەنێوان ئامۆزایانــدا زێــتر هۆکــاری سیاســی هەیە.

دەستودڵ والآیی غالب لەحانـد برازاکەیـدا، شـتێکی کـەم نـەبوو، چونکە شـیربایی کچی خانەوادەیەکی ماڵە مـەزنانی هـۆز، لایـەنی کـەم ٦٠٠٠ لیرەیـەکی تـورکی دەبێـت (ئەودەمە دەیکردە ١٥٠٠ دۆلارێك)، ئەمە گەر خوازبێنیکەر خزمێك بێت، خۆ ئەگـەر بێگانەیەك بێت، ئەوا نرخەکەی دوو هێندەو زێتریشە.

٩٩ـ بـۆ مەسـەلەی گرنگـیو نـرخو بایـەخی هەڵسـتان لەبەرکەسـێك، بڕوانـە ئـەم بەندەو پەراوێزی ژمارە ٦٤.

١٠٠ـ دەربـارەی عـەلیكو راپەڕینـەکانیو ئـەو پارێزگارییـەی لەفەلـەکانی کـردووە، لەچەند راپۆرتێکی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا دەیخوێنینەوە، بڕوانـە ئـاکتی ( F. O. 371 )، سـاڵی ١٩١٩، بـەژمارەی 3050 /163688 /149523 /107502 /44A . شەمعون حەننای هاوسـەنگەری عـەلیك، هـەوێنی گەلـەك سەرگورشـتەی قارمانانـەی فەلەکانی تۆرعابدینە.

١٠١ـ هەمان دیاردە لەسەروەختی هەڵبژاردنەکاندا گەلـەکجار لەکوردسـتانی تورکیـا هەستپێدەکرێت. فراکسیۆنەکانی هەرجێیەك، یاخود هۆزو تیرە دوژمنـەکان، دەگـەڵ پارتــە دژەکانــدا یەکــدەگرن. هەرچوارســاڵ جارێــك، لەدەمــەدەمی هەڵبژاردنەکانــدا، کێــشە کۆنــەکان کڵپەدەســتێننەوە، تونــدتر لــەجارانی بەرلەیــەکگرتن دەگــەڵ پارتــە سیاسییەکاندا.

١٠٢ـ بەپێی گوتەی چاوساغێکی گیراڤی لـە ٦٠ خێزانـی گوندەکـەی ٢٠ یـان گیراڤـی بوون، لەگوندێکی هاوسێیان لـە ٥٠ خێـزان ١٠ خێزانیـان گیراڤـی بـوون. گشت زەویو کێڵگەکان ملکی گیراڤییەکانن.

بۆم روون نەبووەوە چەندێك ملکانە دەستێنن، بـەلآم گەیـشتمە ئـەو بـاوەڕەی کـە بڕێکیان زێتر لە ٥٠٪ خاوە دەدەن.

١٠٣ــ بەهــەرحاڵ، بڕێــك حاڵــەتی ڕەوکردنــی بەکۆمــەڵی مــسکێنەکان زانــراون. سەرەتای سییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، ئەودەمەی کێشەو هەڵلای نێوخۆی میرنشینی

بابـــان، هێـــزو وزەی دادەچـــۆڕاندن‌و تاعوونەڕەشـــەش وڵاتەکـــەی دادەوەشـــاندن (1832/1831 )، جووتێرەکـان بـەپۆل زێـدی خۆیـان جێدەهێـشت‌و رووەو بـاکوور سـەریانهەڵدەگرت، بـۆ ئاقارەکـانی ژێردەسـتی بـەهێزترین‌و تونـدو تیـژترین، وەلـێ دادوەرتـرین مـیر، مـیری سـۆران لەڕەوانـدز، مـیر محەمـەدی کـوێر، بڕوانـە: ( Fraser, 1840 I, S. 177 ).

١٠٤ـ بڕوانـە: Lynch, 1901, II, S. 423; Christoff, 1935, S. 24ff; Frodin, 1944, S. 18 – 17.

١٠٥ـ راگرتنـی خـوارتر لەکـەمترین ژمـارەی پێویـست ئـاژەڵ، بـۆ رەوەنـدەکان هـیچ خێرێك ناداتەوە، یاخود هـەر دەسـتنادات، (قرسـاندنـە جۆربـەجۆرەکان لـەنێوان ٨٠و ٢٠٠ سەردان).

وەکی گشت رەوەنـدەکانی دی، (بۆ نموونە بڕوانە: (Barth, S. 350, 1962 )و ئەو باسـەی دەربـارەی تـیرەی باسـەری نووسـیویە "Nomads of South Persia ") "رەوەنـدەکانی باشـووری ئێـران"، هـەژارترینیان‌و زۆر دەوڵەمەنـدەکانیان، یەکـەم کەسـانێکن کـە نیـشتەجێ دەبـن، باهۆکارەکانیـشیان جـوداوازبن. پووڵدارەکانیان روو لەبازێرەکان دەکەن، تـاوەکو پەیوەندییـە بازرگانییـەکانیان گەشـە پێبـدەن‌و نێزیکـی دەرووەکـانی دەسـتەڵاتی سیاسـی بـن. دیـارە ئـەوەی لێـرەدا بـۆ ئێمـە گرنگـە، نیشتەجێبوونی هەژارەکانیانە.

١٠٦ـ مێژووی پڕ هەژان‌و کارەساتی ئـەم هـۆزە تارادەیـەکی چاك تۆمـارکراوە. ئـەو یەکەمین ئەوروپاییانەی سەرەتا بەدەڤەرەکەیاندا تێپەڕیون، لەزانیارییـدا کەمـەکێك رژدو دەم نووقاوبوون.

Rich تـەنها نێویـان دەهێنێـت (S.281,1836 )، Fraser کـە 1834 بەوێـدا تێپەڕیوە، بەتۆقێنەری جافێکی زۆر نێویان دەبات (S. 167, I,1840 )، Ainsworth ساڵی ١٨٨٨ لەسەروەختێکدا چۆتە کنیان، کە لەشۆڕش‌و راپەڕیندا بوون دژی دەوڵەتی تورك.

١٠٧ـ بڕوانـه سـەرتڵەکەی Karl Hadank لـه ( Mann und, Hadank, 1938)دا، ( Minorsky,1928,1943)، ( MecKenzie,1961 )، گوتارەکـــــانی "ســــــنه"و "کوردەکـان" لەچـاپی یەکـەمی ئینـسکلۆپیدیای ئیـسلامدا، (هـەردوویان لەنووسـینی MecKenzieین، هەروەها "گۆران" لەچاپی دووهەمی ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا، کـه ئەویش هەر لەنووسینی MecKenzie یه.

١٠٨ـ بڕوانـه (MecKenzie, 1961b, 1966). بـۆ تەشـقەڵه بـەزاراوی گـۆرانی (ماچـۆ) دەڵـێن، کـه لەوشـەی گـوتی ئـەو زاراوەیـەوە وەرگـیراوەو نیـشانەیەکه بـۆ جوداوازیی لەگەڵ زاراوەکانی دیدا. پێدەچێت خەڵکی نێوچەکه نێوێکی تایبەتیان بۆ ســەرجەمی ئــەو کۆمەڵــه زاراوانــه نــەبێت، (زمانەوانــه ئەوروپاییــەکان گــشت کۆمەڵەکەیان نێوناوە گۆرانی)، خەڵکەکە زاراوەکانی خـواروو بەهـەورامیو پـاوەییو عومرانی Omrani نێودەبەن.

یەکەم زمانەوان کـه ئاشـکرای کـرد گوایـه ئـەم دیالێکتـه سـەر بـەزمانێکی دیکەیـه نەك کوردی، Oskar Mann بـوو. بڕوانـه: Kurdisch – Persisch Forschungen, (Abt. I, 1909, S. XXIII, Anm. 1).

ماتریالەکانی مان لەبارەی زاراوی گۆرانییـەوە وەك پاشمەرگەیـەکی لەلایـەن Karl Hadank ەوە بڵاوکرانەوە، بڕوانه: .

( Mann und Hadank, 1930)

زمانەوانی دانیمارکی Benedictsen ساڵی ١٩٠١ ماتریالێکی زۆری دەربارەی زاراوی هــەورامیو پــاوەیی کــۆکردەوە. دەستنووســەکانی ئــەویش ســاڵی ١٩٢١ وەك پاشمەرگەیـەکی بڵاوکرانـەوە، بڕوانـه: (Les dialects d Awraman et de pawa. Textesrecueillis par A. M. Benedictsen revus et Publies avec notes et une esquisse de grammaire Par A. Christensen. Kopenhagen 1921).

سێهەمین توێژینەوەی بابەتانە، هەرچەندە زۆر بەداخەوە تەنها پشت بەزانیاریی تاکە چاوساغێك دەبەستێت، کە لەئینگتەرا تووشی هاتووە، ئەوەکەی ساڵی ١٩٦٦ی مەکەنزییە.

١٠٩ـ بڕوانە: (Soane, 1921 )، (Fuad, 1970 ) XVII ، XXIII ـ XXI .

١١٠ـ بڕوانە "عێلات" لەئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا، چاپی دووهەم، کە لەلایەن A. K. S. Lambton، هەروەها "کوردەکان" لەچاپی یەکەمدا، ساڵی ١٩٤٢، لاپەڕە ٧٥، لەلایەن مینۆرسکییەوە.

١١١ـ ئەو سترانە دەربارەی گەڕانەوەی موسڵمانە کوردەکانی (ڕەوەندەکانی) تۆرعابدینە بۆ ئامێزی ئاینی ئەهلی هەق، لەسەر دەستی سوڵتانی ساقی دامەزرێنەریدا، کە بەگۆران نێودەبرێت. بەپێی نەریتی ئەهلی هەق، سوڵتانی ساق کوڕی سەییدێکی هەمەدانی بوو، کە نێوی شێخ عیسیٰ بووەو نێزیکی هەورامان نیشتەجێبووە. پێدەچێت بەزاراوی هەورامیش ئاخافتبێت، گشت کردارو مۆجیزەکانیشی بەهەورامی تۆمارکراون.

١١٢ـ کاتێك لەنێوچە ڕەگەزە تێکەڵەکاندا لەخەڵکم دەپرسی داخۆ کوردن یاتورك، یاخود فارس، زۆرجار وەرامیاندەدامەوە کە کوردیش‌و تورکیش‌و فارسیشن، واپێدەچێت مەبەستیان ئەوە بووبێت گوایە بەهەرسێ زمانەکە دەپەیڤن.

١١٥ـ بڕوانە Rich، سەرچاوەی باسکراو، ل١٠١. هەرچەندە ئەوە ڕاست نییە کە گوایە لەودەڤەرانەی ژووروو وەرزێری ناخێڵەکی بەیدەستکراو نەبوون، لێ Rich لەوەیاندا ڕاستدەکات کە دەڵێت ئەو وەرزێرانە قەت بەگۆران نێونەبراون.

١١٦ـ بڕوانە سەرنجی ژمارە ١٠٧و سەرچاوە دەستنیشانکراوەکان.

پێدەچێت زاراوی زازایی باکووری کوردستانی خزمیشی، پەیوەندییەکی بەدەیلەمییەکانەوە هەبێت. زۆربەی زازاکان خۆیان بەدملی نێودەبەن. وادیارە زاناکان لەوەدا یەکڕان کە نێوەکە جێگۆڕکێی دەنگی بەسەردا هاتووەو لەوشەی "دەیلەمی"یەوە هەڵگۆزراوە. بڕوانە (Minorsky, 1928, S. 91, 105)،

.(Mann und Hadank, 1930, S. 18 – 19; 1932, S. 4 – 6)

دەیلەمیەکان کە میللەتێکی ئاری نەژادبوون، لەبنەچەدا دانیشتووی باشووری دەریای قەزوێن بوون، پاشان بەرەو خۆرئاوا رەویانکرد.

لەسەدەی نۆهەمدا چوونەسەر رێبازی شیعەگەری‌و پێدەچێت زێتر شەقڵە ئیسماعیلییەکەیان وەرگرتبێت. یەکێك لەخانەوادە دەستەڵاتدارەکانی دەیلەمییەکان، کە بوەیهییەکان بوو، پشکێکی زۆری ئێران‌و هەتا ساڵی ٩٤٥بەغداشی داگیرکرد. هەرچەندە خەلیفە نێوو پلەی خۆی لەدەستنەدا، بەڵام دواچکی دەستەڵاتی لەدەست دەرهێنرا، تەنها بۆ نێو لەسەرتەخت هێشتیانەوە، بۆ ئەوەی سوننیەکان دان بەهێزو دەستەڵاتیاندا بنێن‌و رەواییان پێببەخشن.

بەنێوی زۆر جێگەو شوێندا ئاشکرا دەبێت کە زۆربەی خەڵکە رەمەکییەکەی ئەو میللەتە، بەرەو خواروو و خوارووی خۆرئاوا رەویانکردووە. جوگرافیاناسی عارەب یاقووت ئەلحەمەوی باسی جێگەیەکمان لەشارەزوور بۆ دەکات بەنێوی دەیلەمستانەوە، بڕوانە: (Minorsky, 1943, S. 81 ). مێژوو نووسی میسری شەهابەددین ئەلعومەری دەنووسێت گوایە هێرشی مەغۆلەکان، گۆڕانکارییەکی مەزنی جێگەو رێگەی میللەتانی بەدەمەوە بوو. کوردەکانی دانیشتووی شارەزوور بەرەو سوریاو میسر رەویانکردو میللەتێکی دیکە جێگەیانی گرتەوە، کە کورد نەبوو. بڕوانە: (Minorsky, 1943, s. 85-84 ) کە لەشەهابەددینەوە راگوێزراوە. گوایە نێوی ئەو تازەهاتووانە ناخوێندرێتەوە، لێ مینۆرسکی خۆی لەو باوەڕەدایە، کە ئەو نێوە لەگۆران زێتر ناشێت شتێکی دی بێت. من گومان لەو مەسەلەیە دەکەم، چونکە شەهابەددین لەشوێنی دیدا بێ گرێ‌و گۆڵ نێوی گۆران دەهێنێت‌و بەبەشێك لەمیللەتانی کوردیان دادەنێت. ئەو دەمەی ئەو زانیارییانەی بۆ تۆمارکردووین، ساڵی ١٣٤٣، گۆرانەکان لەکێوی شارەزوورو هەمەدان دەژیان.

١١٧ـ گرنگترین سەرچاوە دەربارەی مێژووی بنەماڵەی ئەردەڵان ئەمانەن: "شەرەفنامە، دەقە فارسییەکەی، ل٨٢ ـ ٨٩"، مێژووی نێوچەکە کە لەلایەن "عەلی ئەکبەر خان"ەوە نوسراوەو (Nikitine,1921 ) بۆی پوختەکردووین، هەروەها

مێژووەکەی شاعیر مەستورە خانم، "تەئریخی ئەردەڵان"*، (ناسر ئازادپوور لەسنە بڵاویکردۆتەوە. ساڵی چاپی لەسەر نییە). هەروەها مێژووەکەی "خوسرەو ئیبن موحەمەد بەنی ئەردەڵان: تاریخ". E. I. Vasileva ساڵی ١٩٨٤ لەمۆسکۆ بڵاویکردۆتەوە. هەروەها بڕوانە: (80 - 79 .Rohrborn, 1966, S )و ئەو سەرچاوانەی لەوێدا دەستنیشانکراون.

١١٨. ( Parmaksizoglu, 1973, fol. Hades Faksimile).

١١٩. "پوشیدە نماند کە اصل حکام برادوست از طایفەء گۆران است". (شاردراوە نییە کە مەزنانی برادۆست لەبنەچەدا گۆرانن). بڕوانە: شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسی، دەقە فارسییەکە، ل٢٩٦.

١٢٠ـ دیارە هەرامەیەکی سەیری نائاسایی لەو بابەتەبووە، کە Rich دیتوویەو بەتەقیلەی سەربازانی هەورامی نێوی دەبات. Hadank ئەو کڵاوە بەدیاردەیەکی کولتووری تایبەت بەگۆران باسدەکاتو پێیوایە بەوە لەکورد جوادەکرێنەوە. ئێستەکە ئەو کڵاوە چیدی لەسەرناکرێت، لێ هۆزی بڵباس وەرزێرە ناخێڵەکییە بندەستەکانیان تا ئەورۆش هەر بەکڵاو سپی نێودەبەن، کە پێدەچێت هێنانەوەیادێکی ئەو تەپلەیە بێت. دیاردەیەکی دی لەو خەسڵەتە کولتوورییانەی کە هەورامییەکان لەنێو هاوسێ کوردەکانیاندا نێوداردەکات، هێجگار وەستاییو دەسترەنگینییانە، دەتوانن لەتەڵزمەدارێك هەرچیت دەوێت بۆت بتاشن. ١٢١. بڕوانە: (Minorsky,1943,S.83-84 )، بەپێی تەرجەمەکەی Quatremeres.

١٢٢. بڕوانە: شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسی، ل٣١، دەقە فارسییەکەی.

---

* مامۆستایانی هێژاو کارامە، کاك دوکتۆر حەسەن جافو کاك شکور مستەفا، دەسترەنگینانە دەقی ئەو کتێبەی ماهشەرەفخانم (مەستوورەی کوردستانی) یان لەفارسییەوە کردۆتە کوردیو ساڵی ١٩٨٩ لەبەغدا بەچاپیان گەیاندووە. بڕوانە: "مەستوورەی کوردستانی: مێژووی ئەردەڵان، د. حسن جافو شکور مستەفا کردوویانە بەکوردی، بەغدا، دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپی یەکەم، ١٩٨٩".

١٢٣ـ ئەوانە جافی Tcysiو جافی MuridWeysi* بوون، ساڵی ١٨٥٠چوونەپاڵ گۆرانەکان. بڕوانە: Minorsky، "سنە"، لەئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا، چاپی یەکەم. هەروەها بڕوانە: (Nikitine, 1922, S. 79ff.); (Rabino, 1920, S. 22).

١٢٤. قەڵخانییەکان خۆیان (جەم) یان نییە، تەنها کاتێك لەو ڕێسا ئاینییانەدا بەشداری دەکەن، کە بەڕێکەوت ڕێیان دەکەوێتە گوندێكو ئەو کۆبوونەوەیەی تێدا سازدەکرێت. هیچ یەکێك لەو سرووده ئاینییانەیان لەبەر نییە، کە بۆ ئەهلی هەق هێجگار گرنگن.

ئەو قەڵخانییانەی من لەگەڵیاندا دووام، کەم گوێیان بەدۆنادۆن دەدا، کە یەکێکە لەهەڤۆتەکانی ئەهلی هەق. لەماتەمینی مردووانیاندا دەیکەنە شیوەنو شەپۆڕ، بەپێچەوانەی باوەڕی ئەهلی هەقەوە، لایەنی کەم بەپێی هەڤۆتەکانی، ناشێت لەماتەمدا زێدەڕەوی بکرێت، چونکە گیان نامرێت، بەڵکە تەنها خۆی لەجەستەیەکی خەستە رزگار دەکاتو بەزوویی لە لەشێکی گەنجدا دەژێتەوە. تەنها ئەرکو ڕێسایەکی ئاینی، کە قەڵخانییەکان پێیەڵدەستن، سەردانی مەزارو جێنزرگەو پیرۆزگەکانی ئاینی ئەهلی هەقە.

١٢٥. بڕوانە: (Rabina, 1920, S. 22).

١٢٦ـ بۆچوونەکان دەربارەی ڕەچەڵەکی کۆنفوێدراسیۆنی گۆڕانو پەیوەندییان دەگەڵ ئەو گۆرانانەدا کە شەهابەددین ئەلعومەریو شەرەفخانی بەدلیسی باسیاندەکەن، لێك جوداوازن. مینۆرسکی کۆنفوێدراسیۆنەکەی ئەوڕۆ بەوەچەی ئەو گۆرانە کۆنە ڕەسەنانە دەزانێت، (دیارە بێ لەو کوردانەی کە لەم دواییانەدا تێکەڵیان

---

* پێموایە نووسەر نێوی هەردوو تیرەکەی بەهەڵە تۆمارکردووە، یەکەمیان دەبێت تایشەیی بێتو دووهەمیان یادەبێت میر وەیسی بێت، لەتیرەی قادر میر وەیسییەوە، یاخود دەبێت مەبەستی جافی مورادی بێت. چونکە دوو تیرەکەی یەکەم بوون رەگەڵ چەند تیرەیەکی دی لەدەست جەوری میرەکانی ئەردەڵان هەڵهاتنو چوونەکن گۆرانەکان.

بۆ زانیاری زیچتر لەوبارەوە، تکایە بڕوانە: (مەحمود عەزیز حەسەن: کورتەیەك لەمێژووی هۆزی جافو باسی هەندێك لەتیرەکانی، چاپخانەی نەوڕەس، سلێمانی، ١٩٨٥).

بــوون). Rawlinson (کــە ئەفــسەرێکی ئینگلیــز بــوو، فەرمانــدەی ئۆردوویــەکی پێکهــاتوو لــەهۆزی گــۆرانی ســەر بــەمیرە فارســەکەی حــوکمڕانی کرماشــان بــوو)، دەگێڕێتەوە گوایە کەلهوڕەکان (کە هۆزێکی گەورەی کوردی، نیشتەجێی نێوچەکانی باشــووری گــۆران بــوونو دووهێنــدەی ئــەوان دەبــوون) گوتوویانــە گــشت لەگــشتی گۆرانــەکان لەتۆرەمــەی هۆزەکــەی ئــەوانن. ئەمــە چاوساغەکەشــی ددانــی پێــداناوە. بڕوانە: (Rawlinson, 1839, S. 36).

Mannو Rabino بۆچوونێکی جوداواز لەم بانگاشەیە دەردەبڕن. ئەوان پێیانوایە کە گوایە کۆنفوێدراسیۆنی گۆران، زادەو ئاکامی بەیدەستکردنی دانیشتووە ڕەسەنە زار گۆرانەکانی نێوچەکەبووە، لەلایەن هۆزە کوردەکانەوە، تایبەت لەلایەن کەلهوڕو زەنگەنەکانـــــەوە، بڕوانـــــە: (Rawlinson,1920,S.8–9). ســـــەرکردەکانی کۆنفوێدراسیۆنەکەی گــۆران، خۆیــان کــەلهوڕ نــەبوون، لــێ خانــەوادە خانەدانــەکانی هەردوکلا، لەڕێی ژنو ژنخوازییەوە تێکەڵبوون. (ئەمە زانیاریی خۆمە).

لەڕاســـتیدا ســـەرکردەکانی کـــەڵهوڕ، لەســـەدەکانی هـــەژدەو نـــۆزدەدا، هـــەوڵی ڕەواندنـــەوەی گــەوی تــینو تــاوی دەستەڵاتدارانی گۆرانیــان داوە، هەڵبــەت ئــەودەم شێلگیرانەتر لەساڵی ١٩٠٠، (ڕەنگە ئەمە بنەمای بۆچوونی Mannو Rabinos بێت).

کاتێك محەمەد عەلی میرزا، کە میرێکی فارس بوو، ساڵی ١٨٠٨ نێوچەی زەهابی دەستخستنەوە، (نێوچەی زەهاب مەڵبەندێکی گۆران نشینەو تا ئەودەمە بەنێو سەر بەئیمپراتۆرێتی عوسمانی بوو)، گەورە پیاوانی گۆرانی کردە حوکمڕانی، بڕوانە: (Soane, 1912, S. 382)، (Rabina, 1920, S. 15 – 16).

پەیوەندیی نێوان گۆرانو کەلهوڕ تاڕادەیەك تێکچڕژاوە. بڕێك کەڵهوڕ ئەهلی هەقن، (دیارە زۆربەیان شیعەن). شەرەفنامە لەباسی فەرمانڕەوایاندا، بەشی "ئومەراو حوکام"، کەمێك بەپەنامەکی بۆ باسی کەڵهوڕ دەچێتو دەڵێت: <<هۆزەکەیان (واتە هۆزی فەرمانڕەوایانی کەڵهوڕ) گۆرانیان پێدەگوترێت، یاخود وەك گۆران تێیاندەڕواندرێت>>. (عشیرت أیشان را گۆران میخوانند)، بڕوانە (دەقە

فارسـییەکەی شـەرەفنامە، ل٢١٧). هەڵبـەت شـەرەفخان لـەو دەستنیـشانکردنەدا مەبەستی گشت هۆزەکانی کرماشانو ژووررووی لورستانە، پێکرا.

بەهـەرحاڵ، نیـشانەی پەیوەندییـەکی دێرینـەی دوورو درێـژ لـەنێوان گـۆرانو کەڵهوڕدا هەیە، لێ ژێرچەپۆکخستنی لایەکیان لەلایەن لاکەی دییەوە نا.

١٢٧ـ ئەمـە بانگەشـەی شـەرەفنامەو مێـژووی ئـەو خانەوادەیـە خۆیـەتی، بڕوانـە سـەرنجی ژمـارە ١١٧. بـەپێی ئـەو سەرچـاوانەبێت، بابەئـەردەڵان وەچـەی میرانـی مـەڕەوانی بـووە. مـەئموون بـەگی نـەوەی، ئـەو رەچـەڵەکەی بابەئـەردەڵان بەدرۆدەخاتـەوە، لـەبریتی وی - دیـارە بـەپێی مـۆدەو بـاوی ئـەو رۆژەی خانـەوادە خانەدانـەکان خۆیـان پێـوە هەڵدەکێـشا - بـابو بـاپیرانی لەتۆرەمـەی هەنـدەك لەعارەبەکانی یارو یاوەری پەیامبـەر کەوتوونـەوە. بڕوانـە: ( 2B Parmaksizoglu, 1973, facs ).

١٢٨. مەرج نییە لەباکوورەوە هاتبن، وەك ریـچ پێـی لەسەردادەگرێت. بۆ نموونـە جافەکان لەخۆرهەڵاتەوە، لەکوتە کوردستانەکەی ئێرانەوە هاتوون، لەو جێیـەوە کـە تائەوڕۆش برێك بەشی هۆزەکەی هەرلێماوە. لـەوێ باجدەری میرنـشینی ئـەردەڵان بـوون. بـەپێی گێڕانـەوەی دەمـاودەم، زۆر هـۆزی خـوارووی کوردسـتان لەنێوچـەکانی ژووررووەوە بۆ ئەوێ رەویانکردووە، بۆ نموونە بڕوانـە: گوتـاری "لـەك"ی مینۆرسـکی لەئینـسکلۆپیدیای ئیـسلام، بـەرگی یەکەمـدا. مینۆرسـکی پێیوایـە ئـەوە بەنیـسبەت کەڵهورو هەندەك لەوانەی بەزاراوی لەکی دەدوێن راستە.

١٢٩. بڕوانە: "Sandreczki; 1857, II, S. 263".

١٣٠ـ لەسـەدەی یازدەهەمـدا ئیـسماعیلییە قەرمەدییـەکان توانییـان لەرێگـەی پڕوپاڵانتەوە سەرکەوتنی چاك لـەنێو دەیلەمییەکانـدا وەدەست بهێـنن. لایـەنی کـەم سـەرەتا توانییـان مـەزنانی دەیلـەمیی وەکـی ئەسـفەرو مـەردەویج، پاشـانیش برێـك لەڕێبەرانی میرنشینی موزەففەرییە بەلای خۆیاندا راکێشن. بڕوانە:

W. Madelung, 'Ismailiyya', E. I.2" .

"

١٣١- زۆربەی ئەو زانیارییانەی نووسەرە ئەوروپاییەکان دەربارەی ئاینی کوردەکانی دەرسیم نووسیویانە، نابەجێو شێواون، چونکە لەموسڵمانی تەنگەتیلکەی ئەوتۆیان وەرگرتووە، کە "قینی زۆریان لەعەلەوییەو چاویان پێیاندا هەڵنادێت". هێندەی من پێبزانم، چێترین نووسینێك کە بەیەکێك لەزمانە ئەوروپاییەکان دەربارەیان نوسرابێت، ئەوەکانی (Molyneux–Seel, 1914)و (Trowbridge, 1909)ن. زانیاریی زێتر لەوبارەوە لەکتێبی دوو نووسەری خۆولاتیدا دەدیترێن، کە ئەوانیش: ( Dersimi, 1952, S. 21 - 32)و (Firat, 1970, S. 231 – 54)ن. هەردووکیان بۆیە گرنگو سەرنجراکێشن، چونکە زانیاریی فرەیان دەربارەی رێساو هەفوەتو دابو نەریتەکانی ئەو ئانزایە تێدایە. هەرچەندە هەردوك نووسەر خۆ لەو باوەڕو هەفوەتانە دەبوێرن، کە کزەڵی ئیمانیان پێشاندەدات. کارنامە دوکتۆرییە چاپنەکراوەکەی ساڵی ١٩٧٢ی Öztürkیش زانیاریی هێجگار زۆری تێدایە، هەروەها بڕوانە: ( Bumke, 1979).

١٣٢- چیرۆکێکی هەمیشە پاتەکراوە هەیە، ئەویش کێبەرکێی دوو جادووگەرە: یەکێکیان تەشقەڵە بەوی دی دەکات، سواری نەڕەشێرێك دەبێتو مارێك دەکاتە قامچی دەستیو رووەو یارۆی گوردێری دەتاژوێت. یارۆش دەستبەجێ تیغە دیوارێکی خشت لەپێشیدا قوتدەکاتەوە، (یاخود لاوێك رادەسپێرێت هەڵیچنێت)و پاشان فەرمان بەبۆرە دیوار دەدات بداتە غار، بەو جۆرە مێملەکەی ددان بەسەرکەوتوویی و کارامەییدا دەنێت.

لەداڵەهوو ستزانێکم تۆمارکردووە، لەوسترانەدا دەڵێت گوایە کارامە سەرکەوتووەکەیان سوڵتانی ساقو گوردێرەکەشی پیرمیکائیل نێوێکە. Molyneux – Seel. یش لەدەرسیم سەرگورشتەیەکی لەو بابەتەی بیستووە، لێ گوردێرەکان سەییدی نێوچەکە خۆی بوون، هەتا شوێنەواری دیوارەکەشیان پێشاندابوو، بڕوانە: (Molyneux – Seel, 1914, S. 58). Lucy Garnettیش هەمان چیرۆك دەگێڕێتەوە، لێ لەوەیاندا حاجی بەکتاش پاڵەوانەسەرکەوتووەکەیە، بڕوانە: (Lucy Ganett, 1912, S. 163).

(حاجی بەکتاش لەکن عەلەوییەکان هەمان کایەی سوڵتانی ساقی ئەهلی هەقی هەیە).

١٣٣- بڕوانە پەراوێزی ژمارە ١١٦ی بەرایی.

١٣٤- لەدەرسیمیش زۆر هۆزی گچکە هەن بەکرمانجی دەپەیڤن.

بڕوانە ئەو لیستەیەی نوری دەرسیمی کردوویە لەلاپەڕەکانی (٤٢- ٥٦)ی کتێبەکەی ١٩٥٢یدا.

١٣٥ـ تاقە هێمایەك بۆ حاجی بەکتاش لەداڵەهوو بیستبێتم، لەهۆنراوەیەکی صۆفی نەورۆزدایە (صۆفی ساڵی ١٨٥٠ مردووە)، لەدێڕێکیدا دەڵێت: "تاجری حوجرەی حاجی بەکتاشم"، دێڕێك کە کەس لەوێ تێینەگەیشت. ئەوانەی نێوەکەی حاجی بەکتاش بەلایانەوە ئاشنابوو، گیانیان بەدۆنادۆنی یەکێك لەحەوت فریشتەکان دەزانی.

کاکەییەکان (کە دەستەیەکی سەر بەئەهلی هەقن‌و لەنێزیکی کەرکوك دەژین‌و لەبنەچەدا لەهەورامانەوە هاتوون)، حاجی بەکتاش بەسوڵتانی ساق تێدەگەن. "جارێك سوڵتانی ساق موریدەکانی جێدەهێڵێت‌و خۆی دەکاتە حاجی بەکتاش‌و روو لەئەنەدۆڵ دەکات. سەد ساڵ بەئەدۆڵدا دەسوڕێتەوەو ئەوجا بۆ هەورامان دەگەڕێتەوە، کەچی خەڵکەکە پێیانوابووە هێشتا بیست‌و چوار ساتی پێنەچووە". بڕوانە: (Edmonds, 1969, S. 93). هەمان سەرگورشتەم لەدوکتۆر بەهرام ئیلاهی پێشەوایی ئاینیی لقە چارەسەرخوازەکەی ئەهلی هەق بیست، کە نیشتەجێی تارانە.

١٣٦ـ لەگوتارێکدا کە پاش ئەوەی لەم بەندەبووبوومەوە چنگم کەوت‌و خوێندمەوە، پشتگیرییەکم بۆ ئەم بۆچوونە پێشچاوکەوت، بڕوانە: (1909,Trowbridge). عەلەوییە چاوساغەکانی (هەرچەندە بەداخەوە نەینووسیوە خەڵکی کامە جێگەی تورکیا بوون، لێ خۆی ئەوماوەیە لەعەنتەب (غازی عەنتەب) ماوەتەوە)، گوتوویانە گوایە نێوەندی ئاینەیەکیان لەبازێڕی کەرەندی نێزیك کرماشانە، هەتا نێوی راستەقینەی سەییدە رێبەرەکانی دەفەری داڵەهووشیان هێنابوو، بڕوانە: (سەرچاوەی پێشوو ل٣٤٢).

ئەمە مانای وایە تا دەوروبەری سالانی ١٩٠٠یش، عەلەوییەکانی تورکیا چوونەتە دیدەنیو زیارەتی پیرو پیاوچاکانی ئەهلی هەقو مەزارو جێنزرگەکانیان.

١٣٧- بڕوانە (201 - Edmonds, 1957, S. 182 )، (Edmonds, 1969 ).

١٣٨- دەربارەی باجەلان بڕوانە: (Mann und Hadank S. 33 – 42, 1930).
دەربارەی شەبەك، بڕوانە: (Vinogradov 1974).

١٣٩- بەپێی باوەڕو بۆچوونی ئەهلی هەقو ئێزیدییەکان، تاقمێك فریشتە، کە حەوت نەفەرن، جێگەی دیاریان هەیە، لەکن ئێزیدییەکان مەلەك تاوس دەستەلاتدارترینییانە، کە ئەهریمەنێکە بۆخۆی، لێ بێ خەسلەتە بەدو نالەبارەکانی. لەکن ئەهلی هەقەکانی دالەهوو، فریشتە داود هەمان جۆرەو ئێزیدییەکان بەهاوباوەڕی خۆیان دەزانن.

١٤٠- (Minorsky,1943,S.77 ) دەقێك لەلاپەڕە ١٧٤ی کتێبەکەی Socin (Kurdische Sammlungen) رادەگوێزێت، کە دەڵێت: "نەجوولەکەم، نەموسلمانم، نەفەلم، نەگۆران". وەك دەردەکەوێت لێرەدا گۆران هێمایەکە بۆ ئاینی چوارهەمین، بەوپێیە گێڕانەوەی ریشەی وشەکە بۆ سەرگەبرانو ئەوجا گۆران، پشت ئەستووردەکات. یاخود رەگی وشەکە ناگەڕێتەوە سەر زەردەشتێتی، بەلکە دەچێتەوە سەر ئەهلی هەق، کە ئاینی گۆرانە؟

دەبێت لەوە خاترجەم بین، کە هیچ بەلگەیەکی دلنیا بەدەستەوە نییە بتوانێت بێ ئەمسەرو ئەوسەر، ئاینی ئەهلی هەق بگێڕێتەوە سەر زەردەشتێتی. ئەهلی هەقەکانی دالەهوو لەڕاستیدا رێز لەشەیتان دەگرن، لێ شەیتان لای ئەوان وەکی ئەهریمەنی زەردەشتی نیشانەی بەدیو کەچ رەفتاریی نییە. هەروەها ئەوپەڕی رێز لەئاگریش دەگرن، وەلێ ئەمە لەلای زۆربەی کوردە موسلمانەکانیش نەریتو باوە (بۆ نموونە لەزۆربەی جێگەکانی کوردستان، میزکردن بەئاگردا، هێجگار شوورەییە).

Lecostیش هەمان بۆچوونی هەیە بەرامبەر تینو تاوی زەردەشتێتی لەسەر باوەڕی ئێزیدییەکان، بڕوانە:

.( Lcost, 1975, S. 48 - 54)

١٤١- بڕوانه: (Minorsky, 1943, S. 75, 86).

١٤٢- بڕوانه: (Minorsky, 1943, S. 77 – 78).

١٤٣- "نەتەوە کۆمەڵگەیەکی مێژووکردی تۆکمەیە، لەسەر دینگەی هاوبەشێتی لەزمان، داب‌و نەریت، ژیانی ئابووریی‌و کولتورێکی پێکراییی هەڵچووە"، بڕوانە:( J. Stalin; "Der Marxismus und die nationale Frage", 1913, in; ". Koln, 1976, S. 26 ).

وەك ئاشکرایە ستالین لە ١٩١٧دا کرابووە قۆمیسەری مەسەلەی نەتەوایەتی لەڕووسیای شۆڕشگێڕیدا. بۆ نموونە بڕوانە: ( E. H. Carr; The Bolschevik Revolution, vol. I; 281 ff. ).

١٤٤- ڕەوان شاد مینۆرسکی ، کە یەکێکە لەتۆرەڤانە مەزنەکانی بواری مێژووی دێرینی کورد، لەسەر بنەمای بەراوردکردنی ئەو بەڵگە مێژوویی‌و زمانەوانییانەی تۆژیونییەوە، میدییەکان بەتۆرەمەی کورد دەزانێت، بڕوانە: (Minorsky, 1940 ).

ئەو لەوباوەڕەدابوو، بۆ یەکخستنی کولتوری کوردی، بەتایبەتی زمان، بنەچە میدییە هاوبەشەکە مەرجە.

زمانەوانی کارامە، MacKenzie، بەڵگەی زمانەوانییانەی دیکە بەدەستەوە دەگرێت‌و جۆرێکی دیکە هەڵیاندەسەنگێنێت‌و دەگاتە ئەو ئاکامەی کە زمانی کوردی، بەپێچەوانەی میدی‌و پارثییەوە، سەر بەگروپی باکووری خۆرئاوای زمانە ئێرانییەکان نییە، بەڵکە سەر بەگروپی باشووری خۆرئاوای ئەو زمانانەیە. ئەو کۆمەڵە خەڵکەی بەو زاراوە دەپەیڤیین، هەمان شیرازەی کۆمەڵایەتیی وێکچووی میدییەکانیان هەبووە.

١٤٥- بڕوانە: (Fraser, 1840 I, S. 146, 148, 177).

١٤٦- لەو سۆنگەیەوە کە یاسا تۆمارکراوەکانی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی، رستکردنی رەعایا (یانی ڕەشەخەڵکە بەیدەستکراوەکان، تایبەت ومرزێران)ی لەڕیزی سپاهیدا (یانی لەڕیزی جەنگاوەرە وەجاخزادەکاندا) یاساغکردبوو، بیر بۆ وەی دەچێت، کە

لایەنی کەم لەبڕێك کوتی ئیمپراتۆرێتەکەدا دیاردەیەکی زەق‌و دیاری وەبەرگیراو بوو‌بێت.

١٤٧. بۆ نموونە دەربارەی دانیشتوانی ساسۆن بڕوانە:

(Lehmann – Haupt 1926, II / 1, S. 438). هەروەها Minorskyیش لەگوتاری "کوردەکان"دا کە لەئینسکلۆپیدیای ئیسلام، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەمدا نووسیویە، سەرنجی لەوبابەتەی تۆمارکردووە.

١٤٨. Lehmann – Haupt باسی وەرزێری بەیدەستکراوی کوردو نەستۆری دەکات، بڕوانە: (Bd. I, S. 289 – 290). Richیش باسی ملهوڕی‌و سەرەڕۆیی یەکەم نێردراوانی تورك بۆ دەڤەری خێڵە نەستۆرییەکان دەکات‌و دەڵێت خەڵکەکە لەوان زێتر تۆقیون وەك لەکوردە خێڵەکییە درەکان. دەڵێت بۆ بەدبەختی هەر نەشیانزانیوە دەعبایەك هەیە بەنێوی سوڵتانەوە، بڕوانە: ( S. 275 – 280 Rich, 1936, I).

١٤٩ـ ئەرمەنییەکانی ڤارتۆ بەکوردی پەیڤیون‌و پشکی زۆریان ڕێسای ئاینیی خۆیان لەبیرچۆتەوە، بڕوانە: (Hutteroth S. 57, 1959).

١٥٠. بڕوانە: (Firat, 1979, S. 165 – 187).

١٥١. وەك بڕێك جێی دی، ئامێرە مۆسیقییەکانی وەکی دەهۆڵ‌و دەف‌و زوڕنا بڤەو تابوون. ژەنینی یەکێك لەو ئامڕازانە لەنێو کوردانەدا ئەوپەڕی سوکایەتییە. لەهەندەك شوێن کەمانچەش هەمان چەشنە. لێ تەمبوور ژەنین شتێکی ئاساییەو بەوچاوە سووکە تێیناڕواندرێت. بۆ ئەوەی پێمبسەلمێنن کە تەمبوور ژەنین شتێکی ئاساییە، بۆیاندەگێڕامەوە، گوایە بڕێك ئاغاو خانەدانیش هەن تەمبوور دەژەنن.

١٥٢ـ Soanc بیست هۆزی گرنگی ژماردووە، لەوانە نۆیان خۆیان بەکرمانج لەقەڵەم داوە، لەکوردستانی ژێروو: پشدەرو بڵباس‌و شوان‌و بابان بوون. پشکەکەی دی کە کوردیان پێدەگوترێت (دیارە تەنها لەژێرووی کوردستان)، بریتین لە: مەریوان‌و بانە‌و جاف‌و هەمەوەند‌و شەرەفبەیانی‌و باجەلان‌و هەورامی! گۆران! و کەڵهوڕو سنجابی. من لام روون نییە ئەو جوداوازییە لەسەر چ بنەمایەکە، بێگومان

لەســەر بناغــەی زمــان نییــە، چــونکە دەســتەی دووهــەم لــەرووی زمانــەوە پەیوەندییەکــەیان کــەمێك کزەڵەیــە، تــەنها زارەکــانی جــاف و بابــانن، کــە چ جوداوازییەکی ئەو تۆیان نییە. بڕوانە: (Soane, 1912, S. 406 – 407).

## سەرنجەکانی بەندی سێهەم

١ـ ".... زۆربەی هۆزەکان لەهەنـدەك ڕەوەوە وەك دیاردەیـەکی لاوەکـی دەنـوێنن. پێدەچێت ئاکامی پرۆسێسێك بـن، کـە تـێن و تـاوی کۆمەڵگەیـەکی شیرازەچڕ لەسـەر کۆمەڵگەیەکی شیرازە ساکارتر ڕەنگپێبدەنـەوە. گـەر بتوانرێت ئەمـە بسەلمێنـدرێت، ئەوا دەبێت وەك کاردانەوەیەك بەرامبەر شیرازە سیاسییە چڕو ئاڵۆزەکان لەهەست و نەستی خێڵەکییانـە بڕوانـدرێت، کـە تاکـە هـەنگاوی ناچاریانەو پێویـستە لـەڕەوتی گەشەکردندا. بڕوانە:

( M. Fried, 1968, S. 15).

٢ـ بڕوانـە: "The Early Germans" (E.A. Thompson, Oxford 1965). پوختەیـەکی لەلایـەن P. Andersonەوە ڕاگوێزراوە، بڕوانـە: ( 'Von der Antike zum Feudalismus", Frankfurt, 1978, S. 127ff).

٣ـ دیاردەیکـە لەلایـەن گەلـەك مرۆڤناسـەوە هەسـتپێکراوە، P.Brown زاراوەی "Koloniale Satrapie"* بـۆ بـەکارهێناوە: "لەهیـچەوە دەسـتەڵاتێکی فـراوان بـۆ فەرمانبـەرە خۆولاتییـەکان دادەتاشـرێت و دەسـتیان بەرهەڵدادەکـەن چـییاندەوێت بیکەن و حوکمڕانییە داگیرکەرەکەش پشتیوانییان لێدەکات".

ئــەوەتا Neuguinea مــان بەنموونــە بــۆ دەهێنێتــەوە، کــە خــۆی لــەوێ بەتوێژینەوەیـەکی مەیـدانیی هەڵـستاوەو بۆچـوون و دیـدی ئـەو هەڤاڵانەیـشمان بـۆ رادەگوێزێت، کە لەجێگەی دی هەستیان بەو دیاردەیـە کـردووە. "لـەبڕێك حاڵەتـدا

---

* Satrap ووشەیەکی فارسی کۆنەو یۆنان و ئاڵمانەکانی دێرین لێیانخواستوون. لەسەردەمی هاخامینیشییەکاندا لەقەبی فەرمانڕەوا مەزنەکان بووە. ساسانییەکانیش بۆ میرەکانیان بەکاریانبردووە. بڕوانە ئینسکلۆپیدیای Brockhaus، بەرگی چوارهەم، ل٥٢٩.

لەهیچی نەبوو دەزگەیەکی سەرکردایەتی خێڵەکی فوتکراوەتەوە، لەهەندێك جێی دی هەرچەندە بەر لەکۆلۆنیالیکردنی جۆرە سەرکردایەتییەکی نەریتی لەئارادابووە، لێ پاش ئەوەی دەستەڵاتدارییە داگیرکەرەکە ددانی بەدەستەڵاتیدا ناوە، کایە کۆمەڵایەتییەکە بەشێوەیەکی سەیر گۆڕراوە". بڕوانە:

(P.Brown,"From Anarchy to Satrapy",in; American Anthropologist 65/1963,1-15)

ئەز پێموایە تین‌و تاوی دەوڵەت لەسەر هۆزەکان لەو نموونە پێشچاوخراوە بنەبڕترە. ئەوەتا Terry Ranger ناچارانە دەڵێت: "هۆزە ئەفریقاییەکان بۆ بوون‌و ژیانیان، منەتباری کۆلۆنیالە داگیرکەرەکانن".

٤- بڕوانە "شاهسەڤان" لەئینسکلۆپیدیای ئیسلام، چاپی یەکەمدا، کە لەلایەن V.Minorsky ەوە نوسراوە. Richard Tapper دەریخست کە ئەو بڕوا باوەی گوایە شاهسەڤان دەستکردو داهێنراوی دەستی شاعەبباسە، بێجێ‌و بێبناغەیە. رەنگە شاهسەڤانەکانی ئەردەبیل بەر لەکۆتایی سەدەی حەڤدەهەم نەبووبنە کۆنفوێدراسیۆن. زاراوەی شاهسەڤان، زووتر (هەر لەسەردەمی شائیسماعیلەوە)، بۆ گشت ئەوانە بەکاردەبرا، کە کاتی جەنگ بەهانای شاوە دەچوون‌و ئەمەکدارانە بۆی دەجەنگان، هەرچەندە هیچ بەڵگەیەك بەدەستەوە نییە، کە ئەو پیاوانەی ئەودەمەی لەشێوازی خێڵێکداو لەژێر سایەی ئەو نێوەدا کۆکردبێتەوە.

هەڵوەشاندنەوەی خێڵەکان‌و سەرلەنوێ دروستکردنەوەو رێکخستنەوەیان، کردەو کۆشەیەکی ئاسایی شابوو، دیارە دەستەواژەی "دروستکردنەوەی هۆز" ناشێت پڕاوپڕ بەپێی واتای وشەکان مامەڵەی دەگەڵ بکرێت.

٥- تەنها ئەو راپەڕینە خۆی، لەتوانایدا نەبوو رژێمەکە هەڵتەکێنێت، دیارە گەر هاتباو دەگەڵ بزووتنەوە سیاسییە پێشکەوتووخوازەکان، یاخود هەتا دەگەڵ کۆنەپەرستەکانیش، جۆرە ئالیکاری‌و هاوکارییەك کرابا‌و پێکرا دژی شاو پڕۆگرامەچارەسەرییەکانی تێکۆشابان، کاریگەرێتی‌و ئاکامێکی مەزنتری دەبوو.

بڕوانە: (P. Avery, "Modern Iran', London, 1968, S. 504 ).

٦. ئیبن خەلدوون (1406–1332) لەموقەددیمەکەیدا سەرنجە بەنرخەکانی خۆی لەبارەی کردە سیاسییەکانی مەغریبەوە تۆمار دەکات.

بڕوانە دەقە تەرجەمەکراوەکەی: (Franz Rosenthal, London, 1958). ئێستا تازەکی خەریکە بایەخدان بەو کەڵە تۆرمڤانە پێشقەرەوڵەی زانستی نوێی کۆمەڵناسی دەژێتەوەو گیانی تێدەزێتەوە، (بۆ نموونە بڕوانە: Gellner, 1982 ).

ئابووریناس و کۆمەڵناسی ئیتالیایی V.Pareto (1848–1923)، پێشنیازی تیۆرییەکی گشتیو سەراپایی بۆ گۆڕانکارییە سیاسییەکان کردووەو لەوباوەڕەدایە چشتێك نیین لەخولخواردنێکی بازنەییو گەوییەکی خوداپێداوان زێتر. پێیوایە هەر خوداپێداوێك جارێك لەجاران بۆ ماوەیەك دەستەڵاتی کەوتبێتەدەست، ئیدی نەرمو نیانتر، مرۆڤ دۆستانەتر رەفتار دەکاتو چیدی کەڵکی بەرگریکردن لەمافی خۆی پێوەنامێنێت". پاش ماوەیەکی کورت لەلایەن خوداپێداوێکی بەهێزترەوە هەڵدەدێردرێت.

V. Parcto, The Rise and Fall of the Elites, Totowa, N. J., 1968.

دەربارەی رەخنە لەوجۆرە بیرو بۆچوونە، بڕوانە: Turner, 1978، بەندی سێهەم.

٧. دیارە خێڵەکییەکان نەیانتوانیوە هەمووکات لەڕێگەی داگیرکردنی مەڵبەندێكو ژێرچەپۆکخستنی خەڵکەکەیەوە (ئیدی گەر دەزگەیەکی خاس گەشەکردوویان هەبووبێت یان نا)، جڵەوی دەستەڵاتی سیاسی بگرنەدەست. گەلەکجار خەڵکە نیشتەجێکە خێڵەکییە نامۆکانیان بەپارە راگرتووەو کردوویاننە پیاوو یاساوڵی خۆیان.

جاربووە لەوجۆرە رەوتی پێکەوەژیانە، کۆمەڵگەیەکی شیرازە هەراوتر کەوتۆتەوە. نموونەی ئەوە ئیمپراتۆرێتی میتانییەکان بوو (دوو هەزارساڵێك بەر لەدایکبوونی عیسا). هووریتییەکان کە میللەتێکی دانیشتووی ژوورووی میسۆپۆتامیا بوون، بەزمانێکی نەسامیو نەهیندۆئێرانی دەپەیڤین، ئەودەمە وایان لێهات بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێك دەستبدەن، کە چەند هۆزێکی شەڕانی پەیوەستو ئاوێتەیان بوون.

هیندۆئێرانییەکان لەبەرزاییەکانی گورگانەوە (لەکەنارەکانی خوارووی خۆرهەلاتی دەریای قەزوینەوە) بەرەو خۆرئاوا جمانو لەگن هووریتییەکان گیرسانەوە. ئەوانە جەنگاوەرانێك بوون، کە ئەسپیان رادەگرتو گالیسکەی سوپاییان پێرادەکێشان. واپێدەچێت هیندۆئێرانییەکان بێ کێشەو گرفت بووبنە چینی دەستەلاتداری ئیمپراتۆریتی میتانی. (Ghirshmann, 1977, S. 26 ) دەلێت بەپێی سەرچاوەکان بێت، پێناچێت هیچ داگیرکردنو شەڕو هەللایەك روویدابێت. ئیدی هیندۆئێرانییەکان دەستێکیان بەدەولەتەکەدا هێناو سەرلەنوێ رێکیانخستنەوە، کارێك کە تەنها بەهووریەتییەکان خۆیان ئەنجام نەدەدرا. بەگوتەی زانایەکی شارەزای دیکە، هەردوو میللەتە تێکەلەکە (هووریتییەکانو هیندۆئێرانییەکان)، هێند جووت لەتەك یەکدیدا دەژیان، کە زاراوەی ئاوێتەیان بۆ بشێت. بڕوانە:
(H. Otten, "Hethiter, Hurriter und Mitanni",in Fischer-
.(Weltgeschichte 3. Die altorientali- schen Reiche II, 1966, S. 129

٨ـ مەسەلەیەك كە نامەوێت لێرەدا پێیدا رۆبچم، بەلکە گەرەکمە تەنها قامکی بۆ رابکێشم، مەترسیی ئالۆزکانی زاراوەکانە.

دەبینین زاراوەی "هۆز" بۆ ئەو یەکێتییە سیاسییە یەککەوتانەی بەر لەهاتنەکایەی دەولەت هەن، یاخود بۆ هۆزێکی نیوە ئاوێتە بووی لەکەنار ئیمپراتۆریتێکدا ژیاوە، یاخود بۆ ئەو هۆزەی خۆی دەولەتێك حوکمرانی دەکات. بەهەرحال هەرچەندە ئەو جۆرە هۆزانە گەلەك خەسلەتی وێکچوویان دەگەل یەکدیدا هەیەو دەشێت هەر هەمان پێکهات لەچەند کاتو قۆناغێکی جوداوازدا هەرسێ دیاردەکە بگرێتەخۆ، لێ برێك جوداوازیی دیارو زەقیشیان دەگەل یەکدیدا هەیە.

٩ـ لەئیمپراتۆریتی عوسمانییدا بیرۆکراتی بەشەقلێکی سوپا دادەنرا.

١٠ـ بۆ نموونە بڕوانە: (Rich, 1936 I, S. 88 ).

١١ـ بڕوانە: (Ghirshman, 1977, S. 51) ( R. Labat in; Fischer-
.(Weltgeschichte 4. Die altorientalischen Reiche III, 1967, S. 19

١٢. کوردە نەتەوەپەروەرەکان ئەو رۆژەیان کردۆتە سەرەتای دەستپێکردنی ساڵی میدی یاخود کوردی. بەوپێیە ساڵی ١٩٧٧ لەساڵنامەی کوردیدا دەکاتە ٢٥٨٩.

١٣. رێیتێدەچێت، هەرچەندە خەرمانەی گومانیشی هێشتا هەر بەسەرەوەیە، ئەو بەڵگە مێژووییانەی Minorsky، مەزنترین شارەزای ئەو بوارە تەتەڵەی کردوون، ئەوەیان لێدەردەوشێتەوە کە گەلەك میدی لەکوردستانی ئەوڕۆکەدا نیشتەجێبوون و بوونەتە تۆرەمەی کورد. هەرچەندە هیچ سەرژمێرێك دەربارەی بزووتن و جێگۆڕکێی خەڵکەکە لەبەردستاندا نییە. تەنها بەو هێندەی کە پاشاکانی میدیا ماوەیەکی دوور و درێژ ژووروی مێسۆپۆتامیایان لەژێر رکێفدا بووە، ناتوانرێت ئاوێتەبوونی نەژادیی رەشە خەڵکە ژێردەستەکەیانی لێبوختەکرێت. هێندەی پەیوەندیی بەبەڵگە زمانەوانییەکانەوە هەبێت، یەکرایی لەئارادا نییە. Minorsky 1940 گەیشتە ئەو سەرئەنجامەی کە زارەکانی زمانی کوردی بناغەیەکی هاوبەشی قووڵی زمانی میدییان هەیە، هەرچەندە MacKenzie بیانووی چاك بۆ ئەو تێزەی دەهۆنێتەوە، کە گوایە زمانی کوردی سەر بەدەستەی ژێرووی خۆرئاوای کۆمەڵەی زمانە ئێرانییەکانە و فرێ بەسەر دەستەی ژووروی خۆرئاواوە نییە، کە گوایە میدییەکانیش پشکێکی بوون).

لەو سۆنگەیەوە ئەو سەرئەنجامە پوختەدەکات، کە کوردەکان لەتۆرەمەی میدییەکان نەکەوتوونەوە، بەڵکە نەوەی کۆمەڵێکی ئێرانیی دیکەن و سەرەتا لەنێوچەیەکی ژێرووی خۆرئاوای ئێران ژیان و پاشان لەوێوە بۆ کوردستان رەویانکردووە، بڕوانە: (MacKenzie 1961b)*. پێموایە هەردووك نووسەر

---

* مامۆستایانی هێژاو ژیهاتوو تۆفیق وەهبی و جەمال نەبەز، هەریەك بەکایەی خۆی، وەرامی گونجاو شیاوی ئەو بانگاشانەی مەکەنزییان داوەتەوەو دژی ئەو تێڕوانین و باری سەرنجانەی وەستاونەوە، بڕوانە: گوتارەکەی مامۆستا تۆفیق وەهبی: " The Origins of the Kurds and their Languages" لەژمارە ٩ و ١٠ی تەمموزی ١٩٦٥ی گۆڤاری "کوردستان"ی ئۆرگانی (کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لەئەوروپا)، لە ل ٢٣ — ٢٨ دا.

بەزۆری پشت بەبەڵگەو بیانووی زمانەوانانە دەبەستن، هەرچەندە مەرج نییە ئەو تاقمەی کوردەکان پشکی زۆری زمانەکەیان لێخواستووە، هەمان ئەو تاقمەبێت کە بەشی زۆری توخمو تۆویان بەکورد بڕاوە، یاخود پێکهاتی سیاسییان بۆ کورد بەمیرات ماوەتەوە.

١٤ـ چەندین نموونە لەگوتاری "کوردەکان"ی Minorskyدا دەبینین، کە لەئینسکلۆپیدیای ئیسلام، چاپی یەکەمدا بلاْویکردۆتەوە.

١٥ـ بۆیە نەتەوەپەروەرانی کورد بەرامبەر ئەو کوردە نێودارانە هەستێکی دوولایەنەیان هەیە. هەر بەوهۆیەوە رژێمی عیراق، چەکدارە بەکرێگیراوەکانی کورد، ئەوانەی لە ١٩٦٢ەوە دژی نیشتمانپەروەرانی کورد دەجەنگن، نێوی (فرسان صلاح الدين) <<سوارەی صەلاددین>>ی لێناون. ئەو خۆفرۆشانە لەئەوروپا زێتر بە "جاش" ناسراون، ئەو نێوەی کە نیشتمانپەروەرانی کورد لێیناون.

١٦ـ دیارە پایەو جێپێی بارزانی تەنها لەرێگەی کۆمەکی دەرەکییەوە بلندو سەقامیگیر نەبووە. نێوو شۆرەتی دێرینەی خانەوادەکەی، (چ وەکی شێخو چ وەکی نەتەوەپەروەرانێکی ئەزەلی)، کارامەییو لێهاتوویی لەبواری لەشکر کێشیدا، سەرکەوتنەکانی وەکی سەرکردەی هێزێکی جەنگاوەر، هەستو هۆشی گەشاوەی نیشتمانپەروەرێتی جەماوەر، ئەمانە گشت لەگشتیان دەگەڵ بەهرەی میکافیللییانەی لەرەفتارو قۆستنەوەی هەلدا، بەو پلەو پایەیان گەیاند.

بەهەرحاڵ ئەو کۆمەکە دەرەکییەی بەپلەی یەکەم لەئێرانەوەو (لە ١٩٧٢ش بەدوا، لەلایەن ئەمریکاوە) پێیدەکرا، شێوازی کەسایەتیو جۆری دەستەڵاتدارێتییان تەواو گۆڕی. ئەو وەزیرانەی ساڵی ١٩٧٤ داینان، تەنها خۆی بۆی هەبوو لێیانبپرسێتەوە، ئەمە بەنیسبەت هێزە چەکدارەکانیشییەوە هەر ئاوهابوو. لێ ئاسایشی نێوخۆو (قۆرخکردنی کاری سیاسی)، ئەرکی دەزگەی سیخوڕیی پاراستن بوو، کە ١٩٦٦ (ساڤاك)ی شا، وەك جامێکی وێنەی خۆی دایمەزراند. ئەو ئەنجومەنی سەرکردایەتی

---

هەروەها بڕوانە: "جەمال نەبەز: کوردستانو شۆڕشەکەی"، کوردۆ لەئاڵەمانییەوە کردوویە بەکوردی، دەزگەی چاپەمەنی ئازاد، ستوکهۆڵم، ١٩٨٥، ل٤٠ – ٤٢و ل٥٥.

شۆڕشەی ساڵانی ١٩٦٦ ـ ١٩٧٠ هێنرابووە مەیدانەوەو بۆخۆی جۆرە پارلەمانێك بوو، چیدی دانەنیشتو کۆنەبووەوە.

١٧. یەکێك لەسەرچاوە گرنگەکانی مێژووی مەڕوانییەکانی تۆمارە مێژووییەکەی سەدەی دوازدەهەمی (أبن ألآزرق ألفارقی) ییە.

ئەو بەشانەی تایبەت بەمەڕوانییەکانن لەمیسر چاپکرانو پاشان لەلایەن مامۆستای هێژا (محەمەد ئەمین بۆزئەرسەلان)ەوە تەرجەمەی تورکی کران. بڕوانە:
Ibn Ül- Ezrek, "Mervani Kürtleri tarihi", Istanbul, 1975.

"مێژووی کوردە مەڕوانییەکان" چەند بەشێك لەو نوسراوە، دەگەڵ تێبینیو سەرنجدا، لەگوتارەکەی ١٩٠٢ی Amedroz دایە. زانیاریی بێ لەوانە، لەگوتاری "کوردەکان"ی Minorskyو "مەڕوانییەکان"ی K. V. Zetterstеenدا دەبینین.

١٨. بڕوانە: (ابن ألآزرق، ١٩٧٥، ل ٦٩): کە عدود الدولة مرد، باد بەهێزتربوو، هەتا ژمارەی لایەنگرانیشی زێدی کرد.

١٩. دیاربەکر ئەوڕۆ تەنها نێوی باژێڕێکە، جاران نێوی ویلایەتێکی مەزن بوو، کە نامەدو میافارقینو ماردینو سەردەمێکیش جزیرە سەربەوبوونو لەخۆرهەڵاتەوە تا گۆلی ڤان دەکشا.

٢٠. بڕوانە: (أبن ألآزرق، ١٩٧٥، ل ٧٣).

٢١. بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٤- ٧٥، خەڵکی موسڵ مشووری ئەومیان خوارد کە باد بەپێی ڕێسای ئاینی ئیسلام بنێژرێت، ئەمەش نیشانەی ئەومیە کە چەندە ڕێزیان لێگرتووە.

٢٢. بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٥: "میر ئەبونەصر دەستەڵاتی خۆی پتەوو فراوانتر کرد، نامەد خۆی نەبێت، ئیدی گشت گۆشەو کەنارێکی ویلایەتی دیاربەکری خستەژێر ڕکێفی خۆیەوە. نامەی دەگەڵ گشت پاشاکاندا ئاڵوگۆڕ کرد، یانی نەك تەنها دەگەڵ قەیسەری بیزەنتی، بەڵکە دەگەڵ میری ئەرمەنو خەلیفەکانو بەهائولدەولەی بومیهیشدا. بەوجۆرە دەستەڵاتی چەسپاو کەس پرکێشی نەدەکرد لەڕوویدا راستبێتەوە".

٢٣. سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٨ ـ ١٢٠، دانەر دەڵێت: "بەوجۆرە شکۆی ناصرلدەولە پەرەیسەندو دەستەڵاتی فراوان بووو وڵاتەکەشی هێورو سەقامگیر".

٢٤. بڕوانە: (Amedroz, 1903, S. 133 - 134 ).

٢٥. بڕوانە Minorsky: "کوردەکان" لەئینسکلۆپیدیای ئیسلام چاپی یەکەمدا، ل ١٢١٨، کە دەڵێت: "بەشنەڤییەکان یەکێك لەهۆزە نێودارە رەوەندەکانی کورد بوون، خاکیان دەکەوتە ژوور کێوەکانی تۆرعابدینەوە".

٢٦. بۆ نموونە بڕوانە: O. Turan، ١٩٧٣، ل ٢٣١ ـ ٢٣٢، هەروەها سەرنجی ژمارە ٢٨.

٢٧. بڕوانە: (أبن ألآزرق، ١٩٧٥، ل ٨٢).

٢٨ـ ئەرمەنییەکان لەپشکی خۆرهەڵاتو ژووروی خاکی مەڕوانییەکاندا، لەخەرپووتو مووشو بەتلیسو دەوروبەری گۆلی ڤاندا، زۆربەبوون. لێ لەماردینو حەسەنکێفو میافارقینو ئامەد، ئاسوورییە یاقووبییەکان زێتربوون. جوو بەنێزیکە تەنها لەبازێڕەکان دەژیان، بەتایبەت بازێڕەکانی خۆرئاوا.

بڕوانە: (Turan, 1973, S. 232 ).

٢٩ـ ئەودەمانە کوردەکان تێکڕا میللەتێکی چیانشین بوون. "زێتر لەسەر ئاژەڵداریی‌و چەتەیی‌و راوو رووت دەژیان‌و کەمتر خەریکی کشتوکاڵ دەبوون". بڕوانە: (Turan, 1973, S. 236 ). Turan لەزمانی ئیبن جوبەیرەوە، کە گەڕۆکێکی سەدەی دوازدەهەمە، دەگێڕێتەوە گوایە لەو بازێڕانەی پێیدا تێپەڕیوە، وەکی نصەیبین‌و قۆچیشارو موسڵ، چەتەو ڕێگری کورد وەکی کوللەو سوننە وابوون.

٣٠ـ بڕوانە: (أبن ألآزرق، ١٩٧٥، ل ١٦٩)، لەتەرجەمە تورکییەکەدا زێتر زاراوە گشتییەکەی بەیلەقلەر <<میر>> بەکاربراوە. Amedroz لەپوختەکارییەکەیدا باسی ملك‌و ماڵ خەڵاتکردن دەکات.

٣١. بڕوانە: (أبن ألآزرق، ١٩٧٥، ل ١٦٩). ئەو ئەختینەیە دەبێت لەسەرتاسەری خاکی مەڕوانییەکاندا ساڵانە لە١٠٪ی تێکڕای داهات کۆکرابێتەوە، وەکی لەئەژمارەکانی دواتردا دەتوانرێت پەیی پێببرێت.

لەسەردەمی سەلجووقییەکاندا کەسێك دەکرا بەباجگری ئەو دەفەرە، کە بۆ سێ ساڵ فەرمانداریی، بەڵێنی یەك ملوێن دینار دەسکەوتی دەدا. بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٢.

٣٢ــ ئەمە بەهیچ جۆر پێچەوانەی ئەو راستییە ناوەستێتەوە کە گەلەك سەرەکهۆزو دەستەلاتداری لووت بەسەردا ژەنراوی نێوچەیی، لەڕەچەڵەکێکی نامۆن. بوونە غەوارە خۆی بۆخۆی چشتێکە، لێ تەنها ئەوکاتەی مرۆ بڕێك خەسڵەتی دیکەی تێدابێت، وەکی گەشکەیەکی سروشتکرد.

٣٣. لەبەندی پێشوودا سەرنجی خوێنەرم بۆ دیاردەیەکی ئاوها راکێشا، لێ لەئاستی ئاوێتەبوونێکی قووڵتردا. کاتێك ئەتاتورك زۆربەی سەرەکهۆزو شێخەکانی کوشت، یاخود دەربەدەریکردن، ژمارەی کێشەو هەڵای نێو هۆزەکان خۆیانو نێوان هۆزەکان، زێدیکردو زۆر بەئەستەم خەفەدەکران، چونکە کەسێکی خاوەنشکۆی بەوەجی ئەوتۆ نەمابوو تاڕادەی بەگوێکردن رێزی لێبگیرێت، (بڕوانە بەندی دووهەم، بەشی سێهەم).

٣٤. بڕوانە: شەرەفنامە، ل٣٨٢ی، دەقە فارسییەکەی.

٣٥. بۆ تێڕوانینە مێژووییەکە، بەپلەی یەکەم سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە:

١ــ شەرفنامە، گەر هیچی دی لەبەردەستاندا نەبووبێت، ئەوا پەنام بۆ تەرجەمەکەی Charmoy بردووەو لەوم راگوێزاوە، دەقاودەق راگوێزراوەکان لەنوسخە فارسییەکەوەن.

٢. ئەسکەندەر بەگی تورکمان: "عالەم ئارای عەبباسی".

٣. Hammer : "مێژووی ئیمپراتۆریّتی عوسمانی".

جگەلەوانە، ئەم سەرچاوە پلەدووانەش:

Sarwar, ،Hinz, 1936، Schmidt – Dumont 1970، Sumer 1976، Mazzaoui 1972 Parmaksizoglu 1973، Tansel 1969.

سەرچاوەکانی دی لەجێگەی خۆیاندا نێویان دەهێنرێت. لێکۆڵینەوەی ١٩٨٣ی Allouche درەنگ بڵاوکرایەوەو نەتوانرا هەڵسەنگێندرێت.

٣٦. بڕوانه: (Cahen ، ١٩٦٨، ل٣١٦).

٣٧ـ بڕوانـه: (Hinz ، ١٩٦٣، ل٥١)، (Cahen، ١٩٦٨، ل٣٦١ـ ٣٦٥)، (Mazzaoui، ١٩٧٢، ل١٠)، شەرەفنامە، لێرەو لەوێ.

٣٨. بڕوانه شەرەفنامە، II/ ١، ل٢٤٨ ـ ٢٥٢.

٣٩ـ لـه (تـاريخ الغيـاثى)دا کـه لەلایـەن Schmidt – Dumont ەوە ١٩٧٠ بەچاپ گەیەنـدراوە، لـەو لایەنـەوە نەباسـی هۆزێکی کـورد دەکـاتو نـەنێوی سـەرکردەیەکی کورد دەهێنێت. هەتا لەو سەرچاوانەشدا کە پەخشکەر نێویان دەهێنێت، دەبێت بـێ هوودە بەدوویاندا بگەڕێیت.

٤٠. بڕوانه: Hinz ، ١٩٣٦، ل٥١، ١٣٦ – ١٣٧، Woods 1976 ، ل١٠٤ـ ١١٤، شـەرەفنامە، لێرەو لەوێ، Minorsky، "کوردەکان".

٤١. بڕوانه: شەرەفنامە، II / 1، ل٢.

٤٢. بڕوانه: Schmidt – Dumont، ١٩٧٠، ل٧٨ ـ ٧٩.

Mazzaoui، ١٩٧٢، ل١١ ـ ١٢.

٤٣. بڕوانه: Hinz، ١٩٣٦، ل٥٣ ـ ٥٤، Schmidt – Dumont، ١٩٧٠، ل٧٤.

٤٤ـ دەربـارەی ژیـانی صـفی الـدینو هەڵوێـستە ئاینییـە توندڕەوەکـەی بڕوانـە: Sohrweide، ١٩٦٥، ل٩٦ ـ ١١٧، هەروەها بڕوانه: Mazzaoui، ١٩٧٢، ل٤٦ ـ ٥١.

٤٥. بەپێی گوتەی فەزلوڵلا ئیبن ڕۆزبەیان خونجی (کۆتایی سەدەی شازدەهەم)، کە سوننییەکی ئیمانـدارو دژێکی سەرسـەختی صـەفەوییەکان بـوو، گوایـە لایـەنگرانی شـێخ، ئاشـکرا شـێخ جونەیـدیان بـەخودا دانـاوە، خۆیـان بـەئیلاە نێـوبردووەو کوڕەکەشی بەکوڕی خودا (ئیبنـوڵلا). لەوەسـپو سـەنایدا گوتوویانـە: ئـەو هەمیـشە زیندووەو لەو زێتر چ خودایەکی دی نییە. بڕوانه: Minorsky، ١٩٥٧، ل٦٦.

٤٦. ئەو هۆزانە بریتـی بـوون لـە: ئوسـتاغلو، شـاملو، روملـو، تەقـەلو، زولقـەوادیر، ئەفشار، قاجارو فارساق. بڕوانه: Mazzaoui، ١٩٧٢، ل٨١، Sumer، ١٩٧٦، ل١٨ ـ ١٩، لێ ئـەو هۆزانـە گـشتیان قزڵبـاش نـیین. لـەبوارێکی دیـدا بڕێکـی دی نێـودەبرێن، بـۆ نموونە: قارەمانلو، بەیات، بەیبورتلو. دیارە نابێت واتێبگەین کە ئەوانە هەموویان

قزلّباش بوون، یاخود گشت لەگشتی قزلّباشان بەلایەنگرانی ئیسماعیل تێبگەین. تەکە (لەخوارووی خۆرئاوای ئەنەدۆڵ)، رووم (لەنێوەندی ئەنەدۆڵ)، شام (لەسوریا)، دەڤەری مەزنترو بەئاستەم لێك جودابوون، خەڵکەکانی موسڵمانی سوننی بوون، لەنێویاندا شیعەی ماقوول‌و شیعەی توندڕەویشیان تێدابوو. لەو شیعانە بڕێکیشیان قزلّباش بوون. بۆیە هۆزانی وەکی تەکەلوو، روملو.... هتد چەلێك دەیاندایە پاڵ صەفەوییەکان‌و هەندێك پاڵ عوسمانییەکان.

لەشەڕی چالّدیراندا، سەرکردەکانی زولقەدر چەندین جار ئەمبەرو ئەوبەریانکردو سەنگەریان گۆڕی. بڕوانە: (لیستەی نێوەکان لە Sarwar، ۱۹۳۹، ل۷۹ - ۸۰دا).

۴۷- بۆ نموونە بڕوانە: Sumer، ۱۹۷٦، ل۵۳ - ۵٦، زانیاریی زێتر لەبارەی چەمشکەزەکەوە، لەبەشەکانی ٦و ۱۱ی ئەم بەندەدا دەبینین.

۴۸- بڕوانە: Sarwar، ۱۹۳۹، ل۳۰ - ۳۹، Mazzaour، ۱۹۷۲، ل۷۸ - ۸۲.

۴۹- بڕوانە: Sarwar، ۱۹۳۹، ل٤۳ - ۵۷.

۵۰- ئەم بەیلەقە (میرنشینە) ساڵی ۱۳۷۸ دامەزرا، پاش ئەوەی سەرەکهۆزی تورك، زەینەددین قەرایە زولقەدر، مەرعەش‌و ئەلبستانی داگیرکرد. کوڕەکەی خاکەکەی فراوانترکرد. سوڵتانەکانی عوسمانی‌و مەملووکەکان، گەلەکجار دەستیان لەکاروباری ئەم میرنشینە وەردەداو هەوڵیاندەدا دابەستەی خۆیان بخەنە سەرتەخت.

ئەم میرنشینە هەرچەندە بەحسێب وابەستەی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی بوو، لێ جۆرە سەربەخۆییەکی لەق‌و لۆقی هەبوو، هەتا ساڵی ۱۵۱٤ سوڵتان سەلیم، عەلائولدەولەی دواهەمین میری کەنارخست، چونکە لەشەڕی چالّدیراندا نەچوو بەهاناوەو کۆمەکی نەنارد.

۵۱- ئوستاغلو یەکەمین هۆزی تورك بوو کە ساڵی ۱۵۰۰ دایەپاڵ شا ئیسماعیل، بڕوانە: Mazzaour، ۱۹۷۲، ل۸۱. واپێدەچێت محەمەد بەگ سەرۆکی بووبێت، یاخود یەکێك بووبێت لەسەرکردەکانی، بۆیە شا ئیسماعیل پلەو لەقەبی خانی پێبەخشیوە. بڕوانە: Sarwar، ۱۹۳۹، ل۵۲.

٥٢ـ بروانـە: Sarwar، ١٩٣٩، ل ٥٢ ـ ٥٤، ٧٢، شـەرەفنامە، لێرەو لـەوێ. دەربـارەی تاڵانکارییەکەی جزیـرە لەلایـەن محەمـەد خـانی ئوسـتاغلووەوە، بڕوانـە تەرجەمـەی ئـەو بەڵگەنامـە ئارامییانـەی سـەردەمەکە لـە A. Scher، ١٩١٠، ل١٢٢ ـ ١٢٦دا. تەرجەمەی بڕێك لەو بەڵگەنامانە لەبەشەکانی داهاتوودا دەدیترێن.

٥٣ـ لەبەشی داهاتوودا ئـەو حاڵەتـە دەتوێژینـەوەو روونـی دەکەینـەوە، بەتایبـەت بڕوانە ئەو بەشەی لەبارەی هەکارییەوەیە.

٥٤ـ ئەو سەرەکهۆزە کوردانە بریتی بوون لە: مەلیك خەلیفی حەسەنکێف، شاعەلی جزیرە، میرشەمسەددینی بەتلیس، میرداوودی خیزان، عەلی بەگی ساسون، میرشا محەمەدی شیرەڤیو ١٠ سەرەکهۆزەی دی، کە جگەلە دووانەکەی دواییان، ئیدی گشت لەگشتیان گیران. بڕوانە شەرەفنامە، II /1، ل٢٨٩ ـ ٢٩١.

٥٥ـ بڕوانە تەرجەمە فەرەنسەییەکەی A. Scher، 1910، ل١٢٢ ـ ١٢٦.

٥٦ـ بۆ نموونە بڕوانە: Sohrweide، 1965، ل١٤٥ ـ ١٥٨.

٥٧ـ بڕوانـە: سەرچـاوەی پێـشوو، ل١٦٢. هـەروەها بڕوانـە: Altindag، "سـەلیمی یەکەم"، لە Islam Ansiklopdeisiدا هەروەها بڕوانە: Tansel، 1969، ل٢٠ ـ ٣٩.

٥٨ــ وەك پێـشتر باسمـانکرد، بەبۆنـەی دانـانی محەمەدبەگـەوە بەحوکمـداری دیاربەکر، شا ئیسماعیل لەقەبی خانی پێبەخشی.

٥٩ـ بۆ زانیـاریی هوردتر لـەبارەی شـەڕی چاڵدیرانو پێشهاتەکانی لەوەبەرییـەوە بڕوانـە: Hammer، سەرچـاوەی پێـشوو، ل٢٩٢، Tansel، 1969، ل٣٠ــ ٦٧. کـورتتر بـەڵام هـوردترو پـڕ چـێژتر ئەوەکـەی Sarwarە، 1939، ل٧٢ ـ ٨٥. هـەروەها گوتارەکەی S. Altindag: "سـەلیمی یەکـەم"، لـە IslamAnsiklopedisiدا. لەتـەك ئەوانەدا، رووداوو پێشهاتەکانی نێو تخووبی ئیمپراتۆرێتی عوسمـانی زۆر بـەهوردی لەلایەن Sohrweideوە، ١٩٦٥، ل٦٤ ـ ١٣٨، شیکراونەوە.

٦٠ـ بڕوانە: شەرەفنامە II/ 1، ل٢٩٥.

٦١ــ بڕوانـە Hammer، سەرچـاوەی پێـشوو، بـەرگی دووهـەم، ل٤٣٢. سەرچـاوەی گـرنگ گێڕرانـەوەکانی ئیدریـسی بەتلیـسی خۆیـەتی لەدەستنووسـەکانی ئەبوفـەزلی

کوڕیـــدا: "زایەڵـــەی هەشـــت بەهەشـــت"، کـــە تەواوکـــەری مێـــژووی "هەشـــت بەهەشت"ەکەی ئیدریس خۆیەتی.

٦٢ـ ئـەم مـیرە کوردانـە چـالاکانە دژی قزڵباش جـەنگان: مـیر شـەرەفی بـەتلیس بـاژێڕی بەتلیـسی لەدەسـت سـەندنەوە. مـەلیك خـەلیلی حـوکمڕانی لەوەبـەری حەسەنکێفو سیعرد، ئەو دوو باژێڕەی لەژێرچەپۆك دەرهێنانـەوە. محەمـەد بـەگی ساسۆنو حـەزۆ، هـەرزەنی گرتـەوەو دژی قزڵباشـان جـەنگا. سـەیید ئەحمـەد بـەگی رفقـی، قـەڵاکانی ئەتـەكو میافـارقینی گرتـەوە. قاسـم بـەگی مەردیـسی، پـاڵووی ئـازادکردو ئـاڵای عوسمـانیی لەسـەردا چـەقاند. سـەعید بـەگی سـۆران کـەرکوكو ئەربیلی گرتەوە.

شـا عـەلی بـەگی جزیـرەو ئـەوانی دی، کە تێکـڕا بیـستو پێـنج سـەرۆکهۆز بـوون. بڕوانە Hammer، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی دووهەم، ل٤٣٢ ـ ٤٣٤.

شەرەفنامە نێوی ئەو سەرەکهۆزانە دەهێنێت کە لەئەستاندنەوەی بەتلیسدا پشتی میرشەرەفخانیان گرتووەو لەتەکیـدا دژی هێرشـی ئێـران وەسـتانەوە: محەمـەد بـەگی حەزۆ، میر داوودی خیزان، میرشا محەمەدی شیرەڤیو میری موکسو اینسپاییرد.

بڕوانە: شەرەفنامە، I/II، ل٢٩٧.

٦٣ـ بڕوانە بەنـدی دووهەم، بەشی حەوتەم.

٦٤ـ ئەو دەقە لەشەرەفنامەوە راگوێزراوە. بڕوانە: I/II، ل٢٩٦ ـ ٢٩٧.

٦٥ـ بڕوانە تۆمارە مێژووییەکەی ئەبولفەزڵی کوڕی ئیدریسی بەتلیسی، (هـەروەك سەرنجی ژمارە ٦١).

٦٦ـ هوردتر وەلـێ ناکامڵتر، پێشهاتەکانی ئـەودەمی کوردسـتان لـەم سەرچاوانەشدا دەبینین: Sarwar، 1939، Tansel، 1969، ل٧٨ـ ٧٩، Hammer، سەرچاوەی پێـشوو، ل٤٣٢ـ ٤٦١، شەرەفنامە، I/II، ل٢٩٤ ـ ٢٩٨و لێرەو لەوێ.

٦٧ـ خوتبە ئەو گوتـارە ئاینییەیـە کە لـەکاتی نوێـژی هەینیانـدا دەخوێندرێتـەوە لەو گوتەیەدا نوێژو نزاو پاڕانەوەی تێکەڵە بۆ پەیامبەرو چوار خەلیفەکەی پاشـیو

خەلیفەی ئەو سەردەمەش کە نوێژەکەی تێدا دەکرێتو ئەو ڕێبەرانەی بەدادوەر دەزانرێن.

نێوی هەر دەستەلاتدارێك لەخوتبەدا خوێنرابـاوە، وەکـی بانگهەلـدانی سەربەخۆبوونی تەواو لێکدەدرایەوە. دیارە دراو لەسککەدانیش هەر ئاوهایە.

٦٨. بڕوانە: شەرەفنامە، 2/I، ل١٨٤.

٦٩. بڕوانە: هەمان سەرچاوە.

٧٠. بڕوانە: هەمان سەرچاوە 2/I، ل١١٤. ١٣٢. بۆ پەیوەندییان دەگەلْ مەحموودیو دمبلیدا، بڕوانە: هەمان سەرچاوە، 1/II، ل١٥٨ ـ ١٧٧.

٧١. مێژووی ئەو نەستۆرییانە لەتوێژینەوە نایابەکەی ١٩٦١ی J. Josephدا پێشچاو خراوە. بەر لەکۆڕەوەکەیان ، ئەوانە پشکی زۆری دانیشتوانی هەکارییان پێکدەهێنا. Cuinet سالْی ١٨٧٠ ئەم ژمارانە بۆ سنجەقی هەکاری تۆماردەکات:

١٦٥٠٠٠ کورد، ٩٧٠٠٠ ئاسووری، لەوانە ٥٢٠٠٠ یان سەربەخۆن، (واتە لەژێر خانەی: سەربە چ هۆزێکە؟) نەستۆری دەنوسرا.

٧٢. بڕوانە: "کوردەکان" لەئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا، چاپی یەکەم، بەشی یەکەم.

٧٣ـ پاش جووتباقەکردن بەئیمپراتۆرێتی عوسمانییەوە، ڤان بووە ئەیالەتو لەلایەن والییەکەوە حوکم دەکرا کە سولْتان خۆی دایدەنا. ئەولیا چەلەبی لەسیاحەتنامەکەیدا دەگێڕێتەوە، فەرمانڕەوایی زۆربەی ئەو باژێڕانەی لەویلایەت گچکەتربوون، بەدەست خانەوادە دەستەلاتدارەکانی کوردەوە مانەوە، بڕوانە: بەرگی ٤ی سیاحەتنامە، ل١٢٢٦ ـ ١٢٢٨، چاپەکەی Temcl Kuranو Aktas. دەربارەی ئەو جۆرە دەستەلاتدارییە تیپانەو دەمەتەقێ لەسەری، بڕوانە بەشی حەوتەمی ئەم بەندە.

٧٥. بڕوانە: شەرەفنامە، 1/II، ل١ ـ ١٦.

٧٦ـ سەرچاوەی پێشوو، 1/II، 2. وەکی پێشان چەندین جار گوتمان، زۆری سەرەکهۆزە گەورەکان، یاخود کۆنفویدراسیۆنو میرنشینەکان، لەتوخمو تۆوی

هۆزەکەی خۆیان نیین‌و پێیان نامۆن. هەتا ئەگەر ئاوهاش نەبن، خۆیان بانگەشەی لەو بابەتەدەکەن.

بەتایبەت پاڵەوانانی مێژووی ئیسلام بەختیان چاکی دەهێنێت‌و بەخۆڕایی دەبنە بابەلبابی زۆر هۆز. ئەوەبوو خانەوادەی چەمشکەزەك بانگەشەیاندەکرد، کە گوایە لەتۆرەمەی عەباسییەکانن.

٧٧. هەرچەندە ناتوانرێت بگوترێت داخۆ چەندی رەشە خەڵکەکەی چەمشکەزەك شیعەبوون، لێ ژمارەیان زۆربوو . پێدەچێت میرحاجی ڕۆستەم بەگ لایەنگری سەفەویەکان بووبێت، چونکە لەشەڕی چاڵدیراندا دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەئاغاکاندا دابوویەپاڵ سەفەوییەکان. وەك لەبەرایییدا باسکرا، برێك لەو چەمشکەزەکانە پاش شەڕی چاڵدیران گەڕانەوە ژێرسایەو پایەی دەوڵەتی عوسمانی، ئەوانی دی لەئێران مانەوە. شەرەفخان باس لەهەزار خانەوادەیەکی چەمشکەزەك دەکات، کە قزڵباش بوون‌و لەئێران ماونەوە.

صەدساڵێك پاشتر، شا عەبباس وەکی یاساوڵی سنوور دەیاننێرێتە خۆراسان. ئێستاکە عەلەوییەکان لەدەڤەری چەمشکەزەکدا زۆربەی دانیشتووانن. بەگوتەی Dersimi، 1952، گوایە گشت لەگشتی دانیشتووانی عەلەویین، کە پێدەچێت زێدەڕەوی بێت. ئەو سەرژمێرەی Cuinet دەوروبەری ساڵی ١٨٧٠ کردوویە زۆر روون نییە، چونکە جۆری خانەکردنەکەی تەواو رۆشن نەکردۆتەوە: ئەرمەنی ١٠٪، قزڵباش ٥٠٪، موسڵمان ٢٠٪، کورد ٢٠٪. بڕوانە: Cuinet، 1891، 1894، II، ل٣٩٢.

# فەرهەنگۆك

أ

ئارمانج: ئامانج، نیاز

ئاری: نیشتەجێ، پێچەوانەی رەوەندو کۆچەر

ئاسنجاو: فلزات، هەرچی لەماددە رەقەکان دروستکرابێت وەکو

مس‌و زەردو فافۆن‌و تەنەکە..... هتد

ئاقار: مەڵبەند، نێوچە، دەڤەر، کافار

ئاکار: خووو رەوشت

ئاڵۆزی‌و باڵۆزی: پشێوی‌و ئاژاوە

ئاماڵ: مەیلەو شتێکی وێکچوو

ئاوردوو: سووتەمەنی

ئاوەز: هۆش

ئۆتاریتێر: دیکتاتۆر، تۆتالیتێر

ئەبستراکت: موجەڕڕەد، رەها

ئەرێتی: ئیجابی

ئەیاغ: قرپۆت، قرپۆڵ، کەم فەڕ

ئێلاخ: هاوینەهەوار، زۆزان، هەوار

ب

بازێڕ: شار، شارۆچکە

بریکار: وەکیل، جێگر

بنفەلە: کۆنەگاوری تازە موسڵمان، موسڵمانێکی بەڕەچەڵەك دیان

بۆرە پیاو: پیاوی رەمەکی، پیاوێك کە ناسراوو نێودارنەبێت، خەڵکە رەشۆکێکە

بەرۆگر: میراتگر، جێگرەوە

بەژ: خوێنبایی

بەگلەربەگی: میری میران

بەگەنکردن: پەسەندکردن، لێڕازیبوون

بەوەج: پیاوی بەرێزو بەنرخ، پیاوی خاوەنشکۆ

بەنێزیکە: تەقریبەن

بەینەت: ئەمەك، وەفا

بەیدەستکراو: دەستگیرکراو، ژێردەستخراو

بێئۆرت: بێئیعتیبار، کەسێك کە جێی باوەڕنەبێت

بێرەڤان: نێوبژیکەر

بیژۆك: شاز، هەرشتێك لەیاسا گشتییەکە لابدات

## پ

پڕکێشی: سووربوونو پێداگرتن، بوێری، جەسارەت

پشتێر: تەویلە، گەوڕ

پەنەمان: هەڵناوسان، هەڵتۆقین، ئەستووربوون

پەیجووری: توێژینەوە، لێکۆڵینەوە

پێکەڵپێك: تێکەلاو، ناوێتە

پێداهەڵقژان: بەگژداچوون، شالاو بۆبردن

پێوار: نادیار، گوم

پرینگانەوە: چریسکانەوە، درەوشانەوە، سڵنەکردنەوە، دوودڵی نەکردن، چاونەترسان

## ت

تاووڵ: رەشماڵ، چادر

تخووب: سنوور، کەوشەن، سەرحەد

ترۆپك: لوتكەی كێو، دوند

تڵین: وودم، ئیجازە، ڕێگەدان، هێشتن

تۆرەمە: رەچەڵەك، بنەچە، نەژاد

تۆڕی: پووچ‌و بێنرخ، هیچ‌و پووچ

تەڕیدە: چەتە، ڕێگر، جەردە

تەژە: زەلامی كەتە، زلحۆرت، چەتەوڵ

تەشقەڵە: گەڕ، شەڕپێفرۆشتن، شڵتاغ

تەقیلە: تەپلە، كلاو

تەوەر: چێوە، محیط

تۆرەڤان: زانا، دانا

تیزپێكردن: گاڵتەپێكردن

تێكەولێكە: بێ سەروبەری، كەس بەكەس نەبوون

تیمار: ئەو زەویانەی، یاخود ١٠٪ داهاتی ئەو زەویانەی دەوڵەتی عوسمانی لەبەرامبەر خزمەتی سەربازیدا بەئەفسەرانی دەدا.

تییان: ناڕاستەوخۆ

ج

جڤات: كۆبوونەوە، ڕێكخراو، نەقابە، جمعیە

جمكوت: قەرەباڵغ، ئاپۆڕەی خەڵك

جووتباقە: دادروونی دووكوت بەیەكدیدا. لەبنەچەدا بەدادروونی دووپارچە پێكگەیشتووەكەی كەناری كەوشی دەستدرووی جاران دەگوترا، كە بەكوتەچەرمێكی سێگۆشە، بەشی پێشەوەو پاشەوەیان پێكەوە دادەدروو تا چاك بەرگە بگرێت‌و هەڵنەوەشێتەوەو لەبەریەك نەڕەوێتەوە.

جەلۆ: شەللاتی، سەرسەری، گەندەپیاو، تۆڕی

## چ

چاتۆڵ: خێوەتی تەنکی هاوینە

چەتەوڵ: تەڕە، زەبەلاح، کەتەی ناقۆڵا

چێودار: ئاژەڵدار

## خ

خاپاو: خەڵەتێنراو، تەفرەدراو، فریو خواردوو

خاوە: باج، سەرانە، کەرانە

خرمژن: دەنگی خشڵ، خڕەو هاڕەو لەرزانە

خوداپێداو: تاقمی هەڵبژارتە، Elite

خورت: هێزدار، بەقەوەت

خۆرت: لاو، گەنج، جەحێڵ

خەڵف: لقەداری یەکساڵە، تازە نەمام

خیچاو: دۆڕاوی لەگەمەو کایە بەدەرنراو

## د

داپروسکاندن: داڕنینی دار لەبەرەگەی، رووتاندنەوە

داڕۆچکان: داهێڵان، داهێشتن

دژدار: قەڵاچی، ئێشکچی قەڵا

دژوێن: پیس، گەمار، چڵکن

دڵاوا: بەخشندەو دەستودڵ واڵا

دڵبژۆک: تەماحکار، چاوچڵێس، چاوچنۆک

دۆنادۆن: زیندووبوونەوەی گیان لەجەستەیەکی دیدا، "تناسخ الارواح"

دەرپێتێکەڵ: خزمایەتیو تێکەڵبوون لەڕێی ژنو ژنخوازییەوە

دەڤەر: نێوچە، مەڵبەند، ئاقار، کاڤار

دەمامك: رووپۆش، ماسك، قیناع

دەهۆ: فێڵو تەڵەکە، گزی

دەهۆباز: تەڵەکەباز، فێڵباز، گزیکەر

دیفەرە: چەرچی، وردەواڵا فرۆش

## ڕ

ڕچە: ڕێگەی زۆر باریك، کوێرەڕێ

ڕژد: چرووك، دەستنووقاو

هەورازی سەختی کووڕ

ڕژدو زەرد: شوێنی کووڕو ڕەقەنی بەزەحمەت کێڵراو

ڕۆمەت: ڕێز، حورمەت

ڕەمەکی: مرۆی ڕەشۆکی، کەسێك لەڕەشە خەڵکەکە

ڕەوکردن: کۆچکردن، هیجرەت

ڕەند: مێرخاس، پیاوی پیاوانە

ڕەنێوهێنان: پێگەیاند، پەروەردەکردن، بەکارهێنان

ڕێژەو: بڕشتی خەلە، بەرهەمی زۆر

ڕێسای ئاینی: مەراسیمی ئاینی، شەعائیری دینی

ڕیفۆرمیست: چارەسەرخواز

## ز

زاروزیچ: وەچە، نەوە

زرپ: قەبە، زلە، زەق

زرپو زۆپ: قەبەو دەرپەڕیو

زلحۆ: زەبەلاح، تەژەی ناقۆڵا

زۆزان: کوێستان، هەوارگەی ڕەوەندان

زەعامەت: تیماری برنجی، ئەو زەوییە زۆر پرفەڕانەی کە دەوڵەتی عوسمانی بەئەفسەرانی ددەدا.

زەق‌و زۆپ: هەڵامساو، قەبەو دەرپەڕیو

زەنوێر: نێوچەی تەڕو سازگاری کوێستان

زێد: نیشتمان، زاینگە

## س

سۆنگە: لەبەر، بەهۆی

سەرحەد: سنوور، تخووب

سەرگەڤار: سەرگەورەی خێزان، وەلی ئەمر

سەرنەوەرگردن: سەرشۆڕکردن، ملکەچکردن

سەقامگیر: بەرقەرار، جێگەی خۆگرتوو

سەهندە: سەرسەخت، سەرکەش، بزۆز

سیرمەخۆری: دزی‌و قاچوقووچ، بەرتیل خواردن

## ش

شایەن: تەرازوو

شپرێو: شپرزە، حاڵ پەرێشان

شلۆێ: لێڵ، لیخن

شۆفار: سیخوڕ، جاسووس‌و بەکرێگیراو، بەدگۆ

شەمماس: فەقێی فەلەیان

شەمزین: ژاکان، پەشۆکان

شیمانە: شێوا (لەکاری "دەشێت"ەوە، بۆ نموونە: ئەو هیوایە شێوای هاتنەدییە)، ئیحتیمال

غ

غەوارە: بێگانە، نامۆ

ف

فرچك: ڕاهاتنی منداڵ بەمژینی مەمکی دایك

فڕکردن: خواردنەوە، هەڵقوڕاندن

ڤ

ڤاقڕ: زەوی ووشکی بێ ئاوو بێ شینایی

ڤاوداکەوتن: دەنگۆ، واتەوات

ڤاودان: دەرکردن، ڕاوەدوونان، دەرپەڕاندن

ڤشڵە: بنکەو بارەگای پۆلیسو ژەندرمە

ڤووچ هەڵچوو: هەرەمی، دوندی

ڤەپێلك: توێکڵ، پەلك

ڤەرەبوو: خەرامان، بژاردنەوەی زیان

ڤنیاتکردن: سەبووری هاتن، ئاسوودەبوون

ك

کاڤار: دەڤەر، ئاقار، مەڵبەند، نێوچە

کاوەخۆ: لەسەرەخۆ، هێدی

کۆخت: کولێت، خانووی چکۆلەی هەژارانەی خراپی کولانەی مریشك ئاسایی

کۆنەپەرست: ڕەجعی

کۆنەخواز: هەلکورماو لەسەر رەوتو دابی کۆنینە، محافظ

کەندو لەند: شوێنی پڕ لەچاڵوچۆڵ، کۆسپو تەگەرە

کێبەرکێ: پێشبڕکێ، ململانێ

## گ

گراوی: دڵبەر، دڵخواز، ماشقە، حەزلێکراو

گلێنە: دەفری لەسواڵەت دروستکراو، هەرچی لەقوڕ دروستدەکرێت

گوردێر: حەریف، مێمڵ

گەڕاڵ: گەڕیدە، گەڕۆك

گەللەیی: بەکۆمەڵ، جەماعی، Kollekiv

گەو: ئاڵقە

## ل

لاشیپانە: چوارچێوەی دەرگا

لەلە: خزمەتچیی زارۆکان

## م

مزەخت: ئەرککێشان، مەسرەف

منەکردن: سۆراخکردن، عەوداڵبوون بەدووی شتێکدا

مۆرك: خەسڵەت، سیما

مۆرکردن: داخستنی شوێنێك بەتۆپزی لەلایەن دەزگەی دەوڵەتەوە، قفڵەکەی بەتاڵێك بەن دەپێچرێت و ئەوجا مۆمێکی سووری بەسەردا دەتاوێنرێتوە.

مەلەغان: داسێکی دەسك درێژە بەپێوە دروێنەی پێدەکرێت

میرغەزەب: جەللاد، جەللاب

## ن

نسکۆ: هەڵەنگوتن، لەتردان

نواڵ: نزار، جێگەی سێبەرو فێنك لەکێوان

نەتڵ: ملۆزم، مێمڵ

نەتم: کاتیی، مووەقەت

نەتەوی: دوژمن، ناحەز

نەستێلە: مەردو مێرخاس، پیاوی پیاوانە

نیرو ئامور: هەوجاڕ، گاسن

و

وودم: ئیجازە، تڵێن

ووشکەڕۆ: چۆڵی قاقڕو بێ ئاو

وولکە: مەڵبەند، مەیدان

ه

هانا: لەبەرپاڕانەوە بۆ بەئەنجامگەیاندنی مەرامێك

هزر: بیر، فکر

هۆبە: کۆمەڵە چادرو رستی دەواری رەوەندان

هۆزانڤان: شاعیر، بوێژ

هەراو: هەڵکشاو، گوشاد

هەڤۆت: تعالیم

هەڵۆەدا: ئاوارەی دووی شتێك، سەوداسەر

هەویا: هیواو ئاوات

# سەرچاوەکان


Abrahamian, E.: 1975,
European feudalism and Middle Eastern despotism, in: Science and Society 39, S. 120-156.

Adamson, D.G.: 1964,
The Kurdish War. London.

Aghajanian, A.: 1983,
Ethnic inequality in Iran: An overview, in: International Journal of Middle East Studies 15, S. 211-224.

Ahmad, F.: 1977,
The Turkish experiment in democracy, 1950-1975. London.

Ainsworth, W. F.: 1842,
Travels and researches in Asia Minor, Mesopotamia and Armenia. 2 vol. London.

Ainsworth, W. F.: 1888,
A personal narrative of the Euphrates expedition. London.

Akbal, F.: 1951,
1831 tarihinde Osmanlı İmparatorluğunda idarî taksimat ve nüfus, in: Belleten XV, 60, S. 617-627.

Aladağ, C.: 1976,
Millî mesele ve doğu'da feodalizm-aşiret. Ankara.

Alavi, H.: 1969,
Peasants and revolution, in: Miliband, R./ Saville, J., The Socialist Register 1969, S. 241-277.

Alavi, H.: 1973,
Peasant classes and primordial loyalties, in: Journal of Peasant Studies 1/1, S. 23-62.

Albayrak, S.: 1979,
Şeriat yolunda yürüyenler ve sürünenler. istanbul.

Algar, H.: 1976,
The Naqshbandi order: a preliminary survey of its history and significance, in: Studia Islamica 44, S. 123-152.

Algar, H.: 1978,
Said Nursi and the Risala-i Nur, In: Islamic Perspectives: Studies in honour of Sayyid Abul A'la Mawdudi. London. S. 313-333.

Algar, H.: 1985,
Der Nakşibendi-Orden in der republikanischen Türkei, in: Blaschke, J./Bruinessen, M. van (Hg), Islam und Politik in der Türkei. S. 167-196.

Allouche, A.: 1983,
The origins and development of the Ottoman-Safavid conflict (906-962 / 1500-1555). Berlin.

Amedroz, H. F.: 1903,
The Marwanid Dynasty at Mayyafariqin in the Tenth and Eleventh Centuries A.D., in: Journal of Royal Asiatic Society, S. 123-154.

Anderson, P.: 1974,
Passages from Antiquity to Feudalism. London.

Anschütz, Helga: 1984,
Die syrischen Christen vom Tur 'Abdin. Würzburg.

Apak, Rahmi: 1964,
İç ayaklanmalar, 1919-1921. Ankara.

Arberry, A. J.: 1950,
Sufism: an account of the mystics of Islam. London.

Arfa, H.: 1966,
The Kurds. An historical and political study. London.

Avcıoğlu, D.: 1974,
Millî kurtuluş tarihi. 3 vol. Istanbul.

Aydemir, S. S.: 1974/5,
Tek Adam. Mustafa Kemal. 3 vol. Istanbul.

Aydemir, S. S.: 1975/76,
ikinci adam. 3 vol. Istanbul.

Aydinlik: 1977,
Kürt millî meselesi: Komünist Enter-

nasyonal belgelerinde Türkiye dizisi. Istanbul.

Babinger, F.: 1927,
Geschichtsschreiber der Osmanen und ihre Werke. Leipzig.

Badger, G. P.: 1852,
The Nestorians and their rituals, with the narrative of a mission to Mesopotamia and Coordistan in 1842-1844 and a late visit to those countries in 1850. 2 vol. London.

Barkan, Ömer Lütfi: 1943,
XV ve XVIıncı asırlarda Osmanlı imparatorluğunda zirai ekonominin hukuki ve mali esasları. I: Kanunlar. Istanbul.

Barkan, Ömer Lütfi: 1958,
Essai sur les données statistiques des registres de recensement dans l'Empire ottoman aux XVe et XVIe siècles, in: JESHO 1, S. 9-36.

Barkan, Ömer Lütfi: 1980,
Türkiye'de toprak meselesi. Istanbul.

Barth, Frederick: 1953,
Principles of Social Organisation in Southern Kurdistan. Oslo.

Barth, Frederick: 1954,
Father's Brother's Daughter Marriage in Kurdistan, in: Southwestern Journal of Anthropology 10, S. 164-171.

Barth, F.: 1959a,
The land use pattern of migratory tribes of South Persia, in: Norsk Geografisk Tidskrift 17, S. 1-11.

Barth, F.: 1959b,
Segmentary opposition and theory of games: a study of Pathan organization, in: Journal of the Royal Anthropological Institute 89, S. 5-21.

Barth, F.: 1962,
Nomadism in the mountain and plateau areas of Southwest Asia, in: UNESCO, The Problems of the Arid Zone. Paris. S. 341-355.

Batatu, Hanna: 1978,
The Old Social Classes and the Revolutionary Movements of Iraq. Princeton N.J.

Beck, Peter J.: 1981,
"A tedious and perilous controversy": Britain and the settlement of the Mosul dispute, 1918-1926, in: Middle Eastern Studies 17/2, S. 256-276.

Beldiceanu, N.: 1957,
La crise monétaire ottomane au XVIe siècle et son influence sur les principautés roumaines, in: Südost-Forschungen XVI/1, S. 70-86.

Beldiceanu, N.: 1976,
Le Monde Ottoman des Balkans (1402-1566). London.

Benedictsen, Age Meyer/ Christensen, Arthur: 1921,
Les dialectes d'Awroman et de Pawä. Kopenhagen.

Beşikçi, Ismail: 1969a,
Doğu Anadolu'nun duzeni. Istanbul.

Beşikçi, Ismail: 1969b,
Doğu'da değişim ve yapisal sorunlar (Göçebe Alikan aşireti). Ankara.

Beşikçi, Ismail: 1972,
Kürtlerin "Mecburi iskanı". Ankara.

Bidlisi, Sharaf Khan: 1860-62,
Scheref-Name, ou Histoire des Kourdes par Scheref, Prince de Bidlis, publiée par V. Véliaminof-Zernof. St. Petersbourg.

Biegel, L. C.: 1972,
Minderheden in het Midden Oosten. Deventer.

Birken, A.: 1976,
Die Provinzen des osmanischen Reiches. Wiesbaden.

Bittner, M.: 1896,
Der Kurdengau Uschnûje und die Stadt Urumije. Reischeschilderung eines Persers, im Originaltexte herausgegeben übersetzt und erläutert, in: Sitzungsberichte der phil-hist. Kl. der Kaiserlichen Akademie der Wissenschaften (Wien), Band CXXXIII, Abhandlung 3.

